سەرباری ئەوەی بەڵگەنامەکان (لەسەرکردایەتی گشتی حیزب لەسمۆلینسك، لەلایەن دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیاوە ئاشکرا کرا، دواتر کەوتە دەستی هێزە داگیرکەرەکانی ئەمریکا لە ئەڵمانیا) لە دوو سەد هەزار لاپەڕەی بەڵگەنامە پێکهاتبو، هەرچەندە ئەو بەڵگەنامانەی دەربارەی ساڵانی 1929 1937 لەبەردەستدایە بەڵگەنامەی تەواون، هەروەها ئەو بەڵگەنامانە ژمارەیەکی بێشومار مادەی دەربارەی پرۆسەی پاکتاوکردنی رەگەزی لەساڵانی 1929ـ1937 تیایە کە پۆلبەندکردنیان زۆر زەحمەتە، کەچی نەژمارەی قوربانییەکان و نە ئامارێکی ئەوتۆی تیایە کەشایانی بایەخ پێدان بێت. بۆیە هەرجارەی بەڵگەنامەکان ئاماژە بەژمارەیەك بکەن، ناتەباییەکی زۆری تیا بەدیدەکرێت، چونکە رێکخراوە جوداکان ژمارەی جیاوازیان پێشکەش کردوە، تەنها شتێك کەبەدڵنیاییەوە دەتوانین لەو بەڵگەنامانە بەدەستی بهێنین، زۆرێك لەو ئامارانە ئەگەر بونی هەبێت ، بەفەرمانی حکومەت دەستی بەسەرا گیراوە[3] لەبەرامبەر ئەوەشدا، ئەو بەڵگەنامانە باس لەپەیوەندیی بەشە جیاجیاکانی دەسەڵات ناکەن، "نێوان حیزب، سوپا و لیژنەی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ N.K.V.D ، هەروەها دەربارەی هێڵەکانی پەیوەندیی و فەرمانەکانی سەرکردایەتی هیچ شتێکی تیانیە. بەکورتی ئەم بەڵگەنامانە لەسەر پەیکەری سیستمی رێکخستن هیچ شتێکمان پێنالێن، هەر بەو جۆرەی کە دەربارەی ئەڵمانیا نازی زانیارییەکی زۆرمان پێدەدەن[4] بەدەستەواژەیەکی دی، ئەوەی بەراستی دەزانین، بڵاوکراوە رەسمییەکانی سۆڤێت زیاتر بۆ مەبەستی پروپاگەندە بەکاردەهێنران و هەرگیز جێگەی بڕوا نەبون، بۆیە وادەردەکەوێت سەرچاوەی بڕواپێکراو و ئامار هەرگیز بوونیان نەبوبێت.

مەسەلەی هەرە ترسناك و جدی ئەوەیە ئایا توێژەرەوەیەك دەتوانێت دەربارەی تۆتالیتاریزم لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات، بەبێ ئەوەی شۆرشی چین لەبەرچاونەگرێت. ئەمرۆ، لەدوای تێپەربونی بیست و پێنج ساڵ بەسەر دامەزراندنی دیکتاتۆریەتی کۆمۆنیزمدا، زانیاریمان لەسەر روداوەکانی رابردو

وهەنوکـەی چـین لـەرووداوی سـییەکانی سـەدەی بیـستەمی روسـیا کـەمترو نادڵنیاترە، بەشێکی لەبەر ئەوەی سەرەتا چین لەدوای شۆڕش توانی تەنانەت لەروسـیاش سـەرکەوتوانەتر خـۆی لەچـاودێرە بیابانیـەکان بـەدوور بگرێـت، بەشەکەی دی، بەخاتری ئەوەی باڵێکی هەڵگەڕاوەی حیزبی کۆمۆنیستی چین لەئاسـتێکی بـەرزدا نـەیتوانی لەتێگەیـشتنی رێـڕەوی دیکتاتۆریـەتی چـین، هاوکاریمان بکات: بێگومان ئەم دیاردەیەش دەلالەتێکی زۆری تیا بەدیدەکرێ. لەدوای تێپەربونی (17) ساڵ، برێك بەڵگەنامەی باوەڕپێکراو کە لەسـەر چینی کۆمۆنیـست لەبەردەسـتە، ئـەوە دەریـدەخات لـەنێوان ئـەم وڵاتـەو روسـیای کۆمۆنیستدا جیاوازی زۆر لەبەرچاو هەیە. شۆرشـی چین لـەدوای تێپەڕاندنی قۆنـاغی یەکـەمی کـە تـا سەرئێـسقان قۆنـاغێکی خوێنـاوی بـو. ژمـارەی قوربانییەکان لەسەرەتای ساڵانی یەکەمی دیکتاتۆرییەتدا خۆی لە (15) ملیون کوژراو دەدا، واتـە دەکاتـە 3٪ دانیشتوانی چین لەسـاڵی 1949دا، بەرێـژەی سـەدی لەزیانـەکانی "شۆرشـی دوەمـی" سـتالین زۆر کـەمتر بـو. لـەدوای لەناوچونی هـەمو ئۆپۆزیـسیۆنێکی رێکخـراو، زیـادەرۆیی لـەتیرۆرو قـەتلوعام کردنی خەڵکانی بێگوناە بەدینـەدەکرا، دەسـەلات، ئۆپۆزیـسیۆنی بە "دوژمنی بابـەتی objective enemy" پۆلبەنـد نـەدەکرد، هـەروەها سـەرەڕای زۆریـی دانپیانـانی ئاشکراو دانیشتنەکانی رەخنـە لـەخۆگرتن، کەچـی تـاوانی گـەورە ئـەنجام نـەدرا. گوتـارە بەناوبانگەکـەی "مـاو" لەسـاڵی 1957 دەربـارەی "چارەسـەرێکی دادوەرانـەی ململانێکـانی نێـوان خـەڵك"، کـەزۆرجار بەهەڵـە بەناوی "با وازبهێنین سەد گوڵ بپشکوێ" دەناسرێتەوە، کۆنوسی بەرگریکردن لەئازادی نەبو، بەڵکو لەدوای مردنی لینین .ەوە تاکە بەشدارییەکی بنەڕەتی و گەوهەری بو لەتیورەی مارکسیزمدا: ئەم بەشـدارییە نـەك هـەر دان بەململانێی نێـوان چـینەکاندا دەنێـت، بـەڵکو لـەوەش گـرنگتر، ململانێـی نێـوان گـەل و دەسـەلاتیش، تەنانـەت لەسـایەی دیکتاتۆرییـەتی کۆمۆنیزمـدا بـەڕەسمی دەناسـێت. ئنجـا چـۆنێتی مامەڵـەکردن لەگـەڵ ئۆپۆزیـسیۆندا لەشـێوەی

"راستکردنەوەی فیکر"دا بو، ئەمەش ڕێوشوێنێك بو لەلایەن دەسەڵاتەوە دەگیرایەبەر لەپێناوی لەقاڵبدان و لەقاڵبدانەوەی مێشك و كەم تازۆریش بەرۆکی هەمو دانیشتوانی دەگرتەوە. بەڵام ئێمە هەرگیز نازانین چۆن ئەو هەمو کردەوانە لەژیانی ڕۆژانەی خەڵکی چیندا ئەنجامدەدرا، هەروەها نازانین چ کەسێك ئەم پرۆسەیەی ئەنجام داوە و چ کەسێك لەدەرەوەی ئەم پرۆسەیەدا بوە. هەرگیز زانیاریمان لەسەر ئەنجامەکانی "مێشك شۆردن" نیە: ئایا ئەم مێشك شۆردنە بەردەوام بوە و لە واقیعدا گۆڕانکاری هەستپێکراو (ملموس) لەسەر کەسایەتی ئەو کەسانە هەبوە کە مێشکیان شۆردراوە یا تەنها کارێکی سرووتی پەتی بوە؟ ئەگەر باوەڕ بە ڕاگەیاندە فەرمییەکانی ڕێبەرانی چین بکەین، دەبێ بڵێین تەنها شتێك کە ئەم شێوازەی بەرهەمهێنا، ڕیاکاری بو لە ئاستێکی بەربڵاودا کە ڕێگەی بۆ "شۆرشی چەواشە" خۆشکرد. ئەگەر مێشك شۆردن تیرۆر بێت . بەدڵنیاییەوە تیرۆرە . ئەوا جۆرە تیرۆرێکی جیاوازە ، دەرئەنجامەکەیشی هەر چییەك بێت، نابێتە مایەی دروێنەکردنی دانیشتوان، چونکە بەرژەوەندی نەتەوەیی National interest و خۆشگوزەرانی هەمو دانیشتوان، چەشنی کاروباری دەرەوە، پێوەرێکی یەکلاکەرەوەی کاروباری ناوخۆ بو: ئەمەش دەرفەتی لەبەردەم گەشەسەندنی وڵات واڵا کرد تا بەئاشتی و بەبێ پارمەتی دەرەکی گەشەبکات و دووربخاتەوە لەدوبارەبونەوەی کارەساتی برسێتی و لافاو کە زۆرجار وڵاتانی ئاسیا بەدەستییەوە دەناڵێنن. لەراستیدا ڕژێمی کۆمۆنیستی چین بەسەرکەوتویی سودی لەتوانای بنەماڵەی کاریەدەستە کۆنەکان وەرگرت وئاستی زانکۆ و زانستی بەپێشکەوتویی هێشتەوە، ئەمە سەرباری ئەو ئاژاوەو پشێوییە زۆرەی کەلە شۆڕشی کولتوریدا کەوتەوە. هەرچەندە هێندێك سیمای تۆتالیتاریزم لەسیاسەتی دەرەوەی چیندا گەشەیسەند، وەك سووربون لەسەر گێڕانەوەی خاتر بۆ ستالین و نکۆڵیکردن لەهەوڵەکانی ڕوسیای سەردەمی خرۆچۆف لەسەر چاوخشاندنەوەی بەتۆتالیتاریزمدا، چونکە بەلادانی دادەنا، هەوڵی

سیخورەکانی چین بۆ ئەوەی بزوتنەوە شۆڕشگێڕە بیانییەکان بەلای خۆیاندا رابکێشن و رێکخستنەوەی کۆمێترن بەرابەرایەتی پەکین. هەرچەندە ئەو شتانە نیشانەگەلێکی ئارامبەخش نەبون، بەلام لەسالانی دواتردا پشتگوێ خران. بەهەرحاڵ، شتێکی زۆر ئاشکرایە "فیکری" ماوتسی تۆنگ بەو شێوازە گەشەینەکرد کەستالین بۆی کێشابو، چونکە ئەو شۆڕشگێڕێکی شێلگیر بو نەك خوێنرێژ، هەستی نەتەوەخوازی لەهەستانەوەی شۆڕش لەولاتانی کۆلۆنی ئەوەندە بەرجەستەو بەهێز بو تا بتوانێت لەچینی کۆمۆنیست سنورێك بۆ بالادەستی گشتگیر دیاریبکات. رەنگە هێندێك پێیان وابێت ئەمانە دژایەتی لەو خەمانە دەکەن کە لەم کتێبەدا گوزارشتی لێکراوە، بۆیە بەئاسانی لابردنی دیکتاتۆرییەتی چینی لەنێو دیاردەکانی بالادەستی گشتگیردا شایانی ئەوەیە پشکنینی لەسەر بکرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو دژوارییە ترسناکەی بەرامبەرمان گەشەیدەکردو گەورە دەبو و نەیدەهێشت توێژینەوەیەکی جدی لەسەر ئەم مەسەلانە بکەین، بەرەو پوکانەوەو نەمان دەچو. چونکە "ئەنتی ئایدۆلۆجیا"ی رەسمی کە لە سەردەمی شەڕی ساردەوە بەمیراتی بۆمان مابووە تا تەوژمی دژە کۆمۆنیستی کە لەلای خۆیەوە دەیویست ببێت "بەرێکخستنێکی نێودەوڵەتی ، هەوڵیدەدا لەرێگەی روانگەی ئایدۆلۆجیاوە ئاگاداری هەمو شتێك بێت و لەرووی رێبازی سیاسیشەوە گشتگیر بێت"، کارئاسانی لەمەسەلە تیوری و پراکتیکییە سیاسییەکان نەدەکرد. ئایدۆلۆجیای رەسمی وامانلێدەکات کە وێنایەکمان لەسەر شێوە بەدیهاتوەکانی حوکمرانی کۆمۆنیزم هەبێت، بۆ ئەوەی لەجیاکاریی نێوان جۆرە جیاوازەکانی دیکتاتۆریەتی کۆمۆنیزمی تاك حیزبی کە لەدونیای واقیعدا روبەروی دەبینەوەو نێوان رژێمی تۆتالیتاری دووربکەوینەوە. هەڵبەتە گرنگ نیە چین لەروسیای کۆمۆنیست جیاواز بێت یا روسیای ستالین لەئەڵمانیای هیتلەری جیاواز بێت. ئەگەر ئارەزویەکی زۆری مەیخواردن و لێنەهاتویی کەپێگەیەکی زۆر بەرفراوانی لەروسیای سالانی

بیستو سییەکانی سەدەی بیستەمدا هەبوبێتو تائەمڕۆش بەردەوام بێت، ئەوا لەمێژووی ئەڵمانیای نازیدا هیچ ڕۆڵێکیان وازی نەکردوە، بەڵکو پێچەوانەکەی لەو دوو وڵاتەدا ڕاستە. لەکاتێکدا کاری دزێوی سەرشێتانە لەئۆردوگاکانی گرتنو قەڵاچۆکردندا گەیشتبوە ڕادەیەك کەوەسفکردنو ناو لێنانی مەحاڵ بو، کەچی دزێوی لەئۆردوگاکانی ڕوسیادا کارێکی ئاوارتەیی (استثناء)بو، چونکە زیندانییەکان لەئەنجامی پشتگوێ خستنو فەرامۆشکردن دەمردن نەك بەئەشکەنجەدان. گەندەڵی کە تاوانێکی سەرەکی ئیدارەی ڕوسیا بو، تەنها لە دوا ساڵەکانی تەمەنی ڕژێمی نازیدا بوونی هەبو ، بەڵام لانی کەم، بەرووکەش لەچینی دوای شۆڕش هەرگیز بەدینەکرا. بۆیە دەتوانین چەندین جیاوازی لەمجۆرە بژمێرین کەمانایەکی گەورەیان هەیەو بەشێکی دانەبڕاو لەمێژووی نەتەوایەتی ئەو وڵاتانە پێکدەهێنێت، بەڵام ڕوناکییەکی ڕاستەوخۆ ناخاتە سەر شێوەی ڕژێمەکە. بێگومان ڕژێمی دیسپۆتیزم لەهەریەك لەئسپانیا، فرەنسا، ئینگلتراو پروسیا بەتەواوەتی جیاواز بون، کەچی سەرەڕای ئەوەش شکڵی ڕژێمەکان لەو وڵاتانە یەك شت بو. لەناوکۆی بابەتەکەماندا، پێمان وایە خاڵی یەکلاکەرەوە لەوێدایە کە ڕژێمی تۆتالیتاری جیاوازی لەگەڵ دیکتاتۆرەکانو هەمو جۆرە حوکمێکی دیسپۆتیزمدا هەیە. بەڵام جیاکاری لەنێوان ڕژێمی تۆتالیتاریو باقی ڕژێمەکانی دی لەتوانای ئێمە بەدەرە، بۆیە بەدواداچونی بۆ "بیریاران" بەجێدەهێڵین. ئەوەی بەلامانەوە گرنگ بێت ئەوەیە: باڵادەستی گشتگیر تاکە ڕژێمە کە هەمو پێکەوە ژیان لەگەڵیا، ئەستەم دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەبینین چەندین هۆمان لەبەردەستە بۆ ئەوەی وشەی "تۆتالیتاری" بەوپەڕی وریاییو ئاگاداری بەکاربهێنین، بەودیوییشدا چەندین هۆی دیکەمان هەیە بۆ ئەوەی زۆر دوودڵ بین. ئەمڕۆ، ئێمە لەچیندا یەکەمین پرۆسەی پاکتاوکردن لە سەرتاسەری حیزبدا دەبینین کە هاوکاتە لەگەڵ

هەرەشەی قەتلوعامی ئاشکرادا. ئەگەر ئەو هەڕەشانە ئەنجام بدرێ، زۆر بە باشی دەتوانن هەمان بارودۆخی روسیای ستالینی فەراهەم بکەن، ئەو باروخەی کە شارەزاییمان لەسەری هەیە. ئێمە هۆیەکانی ئەم گۆڕانە لەناکاوە نازانین "هەروەك دەوترێ زۆرترین گەورە فەرمانبەرانی بەئەزمونی چینیشی سەرسام کرد" (ماکس فرانکل لەرۆژنامەی نیویۆرك تایمز. 26/حوزەیران/1966)، هەرچەندە نازانین ئەوە دوا کێشمەکێش بو دەربارەی جێنشین کە زۆر بەوردی شاردرایەوە یا ئەنجامی کارەساتەکانی چین بو لەبواری پەیوەندییە نیودەوڵەتییەکاندا. بەڵام بانگەشەی سەرشێتانەی دەسەڵاتدارانی چین لەبارەی بوونی " شۆرشێکی چەواشەی بۆرجوزای" کە بوونی نەبو، ئەو شۆڕشەی هەروەك دەگوترا لەلایەن "کۆنەپەرستەکانی" ناو حیزب و "مارە زەنگدارەکان" و "گژوگیای ژەهراوی روناکبیرانەوە بەهێز دەکرێ، دەتوانێت بەئاسانی هەمان گۆڕانکاری لەرژێمدا دروست بکات هەروەکو چۆن "شۆرشی دوەم"ی روسیا کۆتایی بەدیکتاتۆرییەتی لینین هێنا و فەرمانڕەوایی تۆتالیتاری ستالینی دروستکرد. هەر چۆنێك بێت، ئەم تێبینیانە لەخەملاندن تێناپەڕێت، بەڵام لەواقیعدا شارەزاییمان لەسەر بارودۆخی چین لە رەشترین رۆژگاری روسیا کەمترە. رەنگە کارێکی بوێرانە بێت کەسێك کۆشش بکات بۆ ئەوەی شێوەی ئێستای رژێمی چین شیتەڵ بکات، چونکە ئەو رژێمە هێشتا بەتەواوەتی شکڵی خۆی وەرنەگرتوە.

بەڵام لەبەرامبەر کەمی و بێمتمانەیی سەرچاوەی نوێی زانیاریدا، کەچی هێشتا لێکۆڵینەوەی بەردەوام و هەمەچەشن لەماوەی (15) ساڵی رابردودا دەربارەی هەمو جۆرەکانی دیکتاتۆرییەتی نوێ ئەنجام دەدرێ، ئیدی چ تۆتالیتاری بێت یا نا. ئەمەش بەشێوەیەکی تایبەتی بەسەر ئەڵمانیای نازی و روسیای سۆڤێتیدا پیادە دەبێت. ئەمرۆ بابەتێکی زۆر لەم بارەیەوە لەبەردەستە کە لێکۆڵینەوەکانی داهاتو دەربارەی هەمان بابەت دەبێ پشتیان پێببەستێت، بۆیە هەوڵێکی زۆرمدا کتێبە کۆنەکانی خۆم بەم سەرچاوانە

تەواوبکەم. لەکاتێکدا تاکە سەرچاوەیەك لەسەر ئەم بابەتە، جگە لەچەند نمونەیەك کە بەئەنقەست لامبردوە، یادەوەری چەند فەرمانەدەیەکی سەربازی‌و گەورە بەرپرسی نازی بو لەدوای تەواوبونی جەنگ. ئەو واقیعەی ئەمجۆرە پاساوە بەراست نازانێت، بەگوێرەی پێویست قابیلی تێگەیشتنەو نابێت لەبەرچاو نەگیرێت. کەموکورتی ئەو یادەوەرییانەی سەبارەت بەرووداوە راستەقینەکان‌و ئەو رۆڵەی نوسەران لە رووداوەکاندا وازییان کرد، بەراستی مایەی سەرسوڕمانەو جگە لەبەهایەکی سایکۆلۆجی هیچ جۆرە بەهایەکی دی بۆ ئێمە نیە.

تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە بەڵگەنامەکانەوە هەبێت، نوسینی ئەم کتێبە لەسەردەمێکی زووتردا، زۆر زیاتر لەوەی عەقل وێنای دەکات، روبەروی دژواریی بۆتەوە، ئەم خاڵە لەبارەی بەڵگەنامەکانی هەر دوو نمونەی تۆتالیتاریزمی نازی‌و بۆلشەفیزمیش راستە. یەکێك لەسەیرترین ئەدەبیاتی تۆتالیتاریزم، ئەوەیە کە هەمو هەوڵی هاوچەرخەکان لەنوسینی مێژوودا سەرکەوتنیان بەدەستهێناو لەرووی زەمەنیشدا خۆیان راگرت، ئەمە لەکاتێکدا دەبوایە بەپێی گشت رێسا زانستییەکان خۆی رانەگرتایە، ئەویش لەبەر کەمیی سەرچاوەی باوەرپێکراو و پابەندبونی لەرادەبەدەری (ئەو لێکۆڵینەوانە) بەهەڵچون‌و سۆزدارییەوە. بەهەرحاڵ گەشتی ژیانی هیتلەر لەنوسینی کۆنراد هایدن Konrad Heiden وگەشتی ژیانی ستالین لەنوسینی بۆریس سیڤارین Boris Souvarine کەلە سییەکانی سەدەی بیستەمدا نوسراوە، لەهەمو روویەکەوە لەهەر دوو گەشتە کلاسیکییەکەی ئالان بولۆك Alan Bullock و ئیزاك دویچەر Issac Deutscher کە لەسەر هەردوو سەرکردەکە نوسراون، وردترو گرنگترن. بێگومان گەلێك هۆ لەپشت ئەم دیاردەیەوە هەیە، بەڵام بەدڵنیاییەوە یەکێکیان ئەو واقیعە سادەیەیە کە بەڵگەنامەکان لەهەردوو حاڵەتەکەدا، قسەی گەورە بەرپرسە هەڵهاتوەکان‌و شاهیدەکانی دی دەسەڵمێنێت‌و تەکانیان تەواو دەکات.

با کێشەکان کەمێك بەزبری بخەینەروو: ئێمە پێویستیمان بەگوتارە نهێنییەکەی خرۆچۆف نەبو تا بزانین ستالین قەتلوعامی کردوە، یا ئەو پیاوەی کەنۆرجار دەوترا " تارادەی شێتی بەدگومانە" بڕوای بەهیتلەر هەبوە. بەلاَم ئەوەی پەیوەندی بەم خالَەوە هەبێت و بڕواو متمانەی ستالین بەهیتلەر دەسەلمێنێ، ئەوەیە کەستالین شێت نەبوە، بەلَکو گومانی لەو کەسانە هەبوە کەدەیویست لەناویانبەرێت یا خەریکی لەناوبردنیان بو، واتە هەمو ئەو کەسانەی بەرزترین پلەوپایەیان لەحیزب و حکومەتدا هەبو، بۆیە لەدوای ئەمە شتێکی ئاسایی بو متمانە بەهیتلەر بکات، چونکە ئەمەی دوایی خراپی ئەوی نەدەویست. بەلاَم ئەوەی پەیوەندیی بەخالَی یەکەمەوە هەبێت، لێدوانەکانی خرۆچۆف مایەی سەرسوڕمان بو، چونکە . بەحوکمی ئەوەی خۆی و گوێگرەکانی بەفاکتە مێژووە راستەقینەکانەوە پەیوەندیداربون . بابەتە شاردراوەکانی زۆر زیاتر بون لەو بابەتانەی کە ئاشکرای کردبو، ئەمەش ئەو دەرئەنجامە نائومیدکارانەی لەگەلَ خۆیدا هێنا کە زۆرێك لەخەلَکی (بەدلَنیاییەوە ئەو پسپۆرانەشیان لەنێواندا بو کەعاشقی بڕوا هێنان بون بەسەرچاوە رەسمییەکان) تاوانەکانی رژێمی ستالین بەهەند وەرنەگرن، هەرچەندە ئەم تاوانانە بەتەنها تاوانبارکردن و کوشتنی سەدان یا هەزاران کەسایەتی سیاسی و ئەدەبی نەبون تا لەدوای مردنیان خاتریان بۆ بگێڕنەوە، بەلَکو تاوانەکانی گەیشتە قەلاچوکردنی چەندین ملیۆن مرۆڤ، کە هیچ کەسێك بەخودی ستالینیشەوە ناتوانێت بەتاوانی "دژە شۆڕش" تاوانباریان بکات. بۆیە خرۆچۆف چەند تاوانێکی سەردەمی ستالینی ئاشکرا کردوە، کەچی تێکڕای تاوانەکانی رژێمی پەردەپۆش دەکرد، لێرەوە نەوەیەك لەروناکبیرە لاوەکانی روس لەدژی ئەم دۆخە راپەڕین و هەولَیان دەدا سەرکردەکانی ئێستا شەرمەزار بکەن. ئێستا . ئەوانەی لەسەردەمی ستالیندا فێری سیاسەت بوون و مومارەسەی حوکمیان دەکرد . لەبەر بودەلَەیی و پەردەپۆش کردنی راستییە دزێوو ناشیرینەکان، دەتوانین بلَێین لەدۆخی یاخیبونێکی بەردەوام و کراوەدا

بون. ئەو خەڵکانە هەمو شتێکیان لەسەر پرۆسەی "پاکتاوکردنی بەکۆمەڵ، دورخستنەوەو لەناوبردنی میللەت دەزانی"[5] ئەو تاوانانەی خرۆچۆف دانپیاناون . گومانی سەرشێتانەی ستالین لەهەمو کەسێك . سەرەکیترین دیاردەی تیرۆری تۆتالیتاری دەشاردەوە، واتە تیرۆری تۆتالیتاری لەدوای لەناوبردنی ئۆپۆزیسیونی ریکخراویش هەر دەمێنێت، ئەمە لەکاتێکدا خودی تۆتالیتار زۆر باش دەیزانی چیدی هۆیەك نیە لێی بترسێ. بەدرێژایی مێژووی روسیا ئەم راستییە بونی هەیە. لەراستیدا ستالین گەورەترین پەلاماری لەناوبردنی لەساڵی 1928دا دەست پێنەکرد، کاتێك دانیپیانا کە "دوژمنی ناوخۆ" خۆی لەبۆسە بۆداناوە، بەراستی ئەودەمە بەڵگەیەکی لەبەردەست بو تا لێی بترسێت . ستالین بەتەواوەتی دەیزانی کە بوخارین بەجەنگیزخانی بەراورد دەکات، تەنانەت لەو قەناعەتەشدا بو کە سیاسەتی ستالین " وڵات بەرەو برسێتی، وێرانەیی و رژێمی پۆلیسی" دەبات[6]، بەکردەوەش هەر ئەوە رویدا . بەڵکو ستالین لەساڵی 1934دا دەستی بەپرۆسەی پاکتاوکردن کرد، لەدوای ئەوەی کۆنە ئۆپۆزیسیونەکانی والێکرد " دان بەگوناهەکانی خۆیاندا بنێن"، خودی ستالین حەڤدەمین کۆنگرەی حیزبی بە "کۆنگرەی سەرکەوتوەکان" ناو زەدەکردو رایگەیاند: "لەم کۆنگرەیەدا شتێك نیە هەوڵی سەلماندنی بدەین و واشدەردەکەوێت چیدی کەسێك نەماوە شەڕی لەگەڵدا بکەین"[7] پێدەچێت نە سیمای ئاهەنگئامێزی (احتفالی) کۆنگرەی بیستەم و نە ئەو گرنگییە سیاسییە چارەنوسسازەی کۆنگرە بۆ روسیا و بزوتنەوەی کۆمۆنیستی بەگشتی هەیبو، لەم لێکۆلینەوەی ئێمەدا جێگەی پرسیار نەبێت. بەڵکو گرنگی کۆنگرەی ناوبراو زیاتر بایەخی سیاسی هەبو تا شتێکی دی، بۆیە نابێت ئەو تیشکانەی سەرچاوە رەسمییەکان لەدوای مردنی ستالینەوە دەیخستنە سەر روداوەکانی رابردو، لەگەڵ تیشکی هەقیقەتدا تێکەڵ بکرێت.

تا ئەو جێیەی شارەزاییم لەسەر سەردەمی ستالین هەیە، پێموایە بەڵگەنامەکانی سمۆلینسك کەفینسود چاپیکردوە و پێشتریش ئامارەم پێداوە،

تاكە سەرچاوەی گرنگ‌و بڕواپێكراو بێت، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە تاكو ئێستا چاپێكی دی بەرفراوانترو ڕێكخراوتری بەدوادا نەهاتوە. سەرباری پشت بەستن بەكتێبەكەی فینسود، كەچی هێشتا مرۆ پێویستی بەزانیاری زیاتر هەیە بۆ ئەوەی لەشەڕی كورسی دەسەڵاتی ستالین لە دەیەكانی 1920دا تێبگات: ئەمرۆ زۆر باش دەزانین پێگەی كە حیزب روبەروی هەڕەشەو مەترسی دەبێتەوە[8]، نەك لەبەر ئەوەی رۆحی ئۆپۆزیسیۆنی ئاشكرا وڵاتی تەنیبو، بەڵكو لەبەر ئەوەی حیزب ببو بەكانگای گەندەڵی‌و ئیدمان. ئێمە بەدڵنیاییەوە دەزانین كە دژە سامییەتی ئاشكرا زۆرجار هاوڕێی هەمو بانگەوازێكی ئازادیخوازانە بوە[9] هەروەها دیسانەوە لەلای ئێمە شاراوە نیە كەپڕكێشی لایەنی ئابوری سوسیالیستی‌و لەناوبردنی كوڵاك لەواقیعدا بەربەستێك بو لەبەردەم سیاسەتی ئابوری نوێی لینین دا، كەلەگەڵیدا هەمو پەیوەندییەكی ئاشتی نێوان میللەت‌و حكومەتیش پچڕا[10] هەمو كەسێك دەزانێت كە چینی جوتیاران بەیەكدەستی دژی ئەو رێوشوێنانە وەستانەوەو رایانگەیاند "مردنیان پێباشترە تا پەیوەندی بەكۆلخۆزەوە بكەن"[11]، هەروەها جوتیاران لەپێناوی ئەوەی روبەروی كوڵاك ببنەوە، بەیەكدەنگی رەتیان كردەوە خۆیان بە جوتیاری دەوڵەمەند، مامناوەندی‌و هەژار پۆلبەند بكەن[12]: "لێرەدا خەڵكانێكی زۆرزان‌و فێڵباز لە كۆلاكەكاندا هەیە، بیر لە تێوەگلانمان دەكەنەوەو روبەروی نەهامەتێكی زۆرمان دەكەنەوە"[13]، هەروەها بارودۆخی شارەكانیش زۆر لەگوندەكان باشتر نەبو، كارگەران هاوكاری سەندیكا حیزبییەكان رەتدەكەنەوەو سەركردەكانیان بە "ئەهریمەنە تێرەكان"و "سیخورە نەگریسەكان"و شتی دی لەو بابەتە وەسفدەكرد[14]

فینسود لەبەرامبەر ئەم واقیعەدا تێبینییەكی دروستی هەبو، بەوەی بەڵگەنامەكان زۆر بەروونی دەریدەخەن كە نەك هەر "بێزارییەكی گشتی‌وقوڵ" لەلایەن خەڵكییەوە بەرامبەر بەحوكم نەبوە، بەڵكو تێبینی ئەوەش دەكات كە "ئۆپۆزیسیونێكی رێكخراویش" لەدژی سەرجەم دەزگاكانی رژێم بەتەواوەتی

بزر بو. بەڵام ئەوەی فینسود لێی بێئاگا بوە، بەرای من لەلایەن توێژەرانیشەوە پشتگیری لێدەکرا، بوونی دەست پێشخەرییەکی حەتمی ستالینە بۆ دەسەڵات گرتنەدەست و گۆڕینی بەدیکتاتۆرییەتی تاك حیزبی و سەپاندنی باڵادەستی گشتگیر: ئەو دەست پێشخەرییەش پێویستی بەدواداچونی سیاسەتێکی نوێی ئابوری هەبو، هەروەك لینین بیری لێکردبووەو سەرەتاکانی دارشتبو(15) بۆیە ئەو رێوشوێنانەی ستالین گرتییەبەر لەناوکۆیی یەکەم پلانی پینج ساڵەییدا کە ساڵی 1928 نەخشەی بۆ کێشابو، ئەو دەمەی بەتەواوەتی حیزبی کۆنترۆڵ کردبو، سەلماندی کە گۆڕینی چینەکانی کۆمەڵ بەجەماوەرو نەهێشتنی هەمو هاوکارییەك لەنێوان گروپەکاندا، دوو مەرجی سەرەکی باڵادەستی گشتگیرن.

بەڵام سەبارەت بەقۆناغی رەهای ستالین لەساڵی 1929 بەدواوە، بەڵگەنامەکانی سمۆلینسك جەخت لەسەر ئەوەدەکاتەوە کە ئەو سەرچاوانەی پێشتر شارەزاییمان لەسەری هەبوە، جێگەی بڕواو متمانەی کەمتر بون. راستی ئەوەش لەو کەلەبەرە نامۆیانەوە دەردەکەوێت کە تێیکەوتوە، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندی بەدراوە Data. ئامارییەکانەوە هەیە، چونکە نەبونی ئەو زانیاریانە زۆر بەسادەیی ئەوە دەسەلمێنێ کە رژێمی ستالین لەم لایەنەشەوە وەك هەمو لایەنەکانی دی بەرامبەر بەوانی دی یەکگرتو بوە: بەهەر حاڵ، هەر کارێك لەگەڵ دیدوبۆچونی رەسمی ناتەبا بوایە، یا گومان لەناتەبایی بکرایە. وەك دراوەکانی بەروبوم، رێژەی تاوانەکان، ئەو ئاکامە راستەقینانەی لەچالاکی " دژە شۆرش" دەکەوتنەوە، بەوەی لەگەڵ پیلانە ئەفسانەییەکانی دواتردا جیاوازییان هەبوە. بەناواقیعی وەسف دەکراو لەسەر ئەو بنەمایەش مامەڵەی لەتەکدا دەکرا. بەراستی هەمان بێزاری رژێمی تۆتالیتاری لە هەموجۆرە فاکتو واقعێك، پێویستی دەکرد ئەو دراوو زانیاریانەی لەهەمو گۆشەیەکی ئەو وڵاتە گەورەیە گرد دەکرایەوە، لەجیاتی ئەوەی رەوانەی مۆسکۆ بکرێت، لەرێگەی بڵاوکراوەکانی پراڤداو ئیڤیستا یا هەر ئۆرگانێکی دی لەمۆسکۆ، بەناوچە جیاجیاکانی وڵاتدا بڵاودەکرایەوە، بەجۆرێك کە هەر مەڵبەندو ناوچەیەکی

یەکێتی سۆڤێت داتای ئاماری رەسمیو جیاوازیی تایبەت بەخۆی بەهەمان شێوە بەدەست دەهێنا کە بەنزیکەیی هەمان پێوەری هەبو کە لە پلانی پێنج ساڵەیی وەریدەگرت[16]

لێرەدا زۆر بەخێرایی ئەو خاڵە تەکاندەرو هوروژێنەرانە دەهێنمەوە کە سەرەتا تەنها هەستی پێدەکرا، بەڵام ئەمرۆ بە بەڵگەنامەی کۆنکریتی دەسەلمێنرێت. زۆرجار بەگومان بوین لەوەی کە بونیادی رێکخستنی رژێم، رێکخستنێکی تاك بونیاد بوە، بەڵام ئەمرۆ بەدڵنیاییەوە دەزانین رژێم هەرگیز تاك بونیاد نەبوە، بەڵکو " بەهوشیاریو بریاری پێشوەخت لەسەر تەوەرەی کۆمەڵێك ئەرك دەسورێتەوە کە بەردەوام یەکتر دەبڕنو دووهێندە یا هاوتا دەبن"، ئەم بونیادە بێشکڵە قێزەونە، بەهۆی هەمان پرەنسیپی فوهرەر کەسپەرستی . پایەداربو، کە لە ئەڵمانیای نازییەوە وەریگرتبو[17]. هەروەها ئێستا بۆمان رونبۆتەوە نەك حیزب، بەڵکو پۆلیس، باسکی حکومەتی مەدەنی بو، کە "جموجوڵی کردەیی لەدەرەوەی توانای حیزب بو، چونکە حیزب نەیدەتوانی جموجوڵیان کۆنترۆڵ بکات"[18] بۆیە بەتەواوەتی لەوەش تێدەگەین کە ئەو خەڵکانەی رژێم بەملیۆنی لێدەکوشتن، ئەوانەی بەزمانی بۆلشەفیکەکان " دوژمنی بابەتی" بون، " تاوانبار بون بەبێ ئەوەی تاوانیان کردبێت"[19] خودی ئەم توێژە تازەیە (بەجیاوازی لەگەڵ دوژمنانی راستەقینەی پێشوی رژێم . فەرمانبەرانی تیرۆریستی حکومەت ، بۆمبهاوێژەکانو چەتەو رێگرەکان) لەدژی ئەو تاوانانەی دەرهەقیان دەکرا هەمان پەرچەکرداری پاسیفیزمانەیان هەبو(السلبیە passivism)[20] کە قوربانییەکانی تیرۆریزمی نازی دەیاننواند. بێگومان "بێشوماری راپۆرت نوسین لەسەر یەکتر- الوشایات المتبادلة" لەکاتی هەڵمەتە گەورەکانی پاکتاوکردندا بەئەندازەی پاڵپشتی کردن لەپێگەی سەرکردەی تۆتالیتار، ئاسەوارێکی کارەساتباریشی لەسەر خۆشگوزەرانی ئابوریو کۆمەڵایەتی

هەبو. بەڵام ئەمڕۆ هەمومان دەزانین کە ستالین بەدەستی ئەنقەست "ڕێرەوی ئـەم زنجـیرە لەیـەکتر نوسـینە کارەسـاتبارەی"[21] والاکـرد، کاتێـك لـە 29/تەموز/1936 ڕایگەیاند: "ئەو خەسڵەتەی لەم هەلومەرجەدا مرۆڤ دەکاتە بۆلشەفیك، دەبێ توانای ئەوەی هەبێت چۆن شتی شاراوە دەدۆزێتەوە، بەو شـێوەیەش دوژمـنی حیـزب بناسـێتەوە"[22] ئەمـە لەکاتێکـدا ئـەو "دوا چارەسـەرەی" هیتلـەر پێشنیازی کرد هاومانای ئەمـەی خوارەوەیـە :"دەبـێ بکوژێـت"، دەسـتەبژێری حیزبـی نازیـشی ناچـار دەکـرد جێبـەجێی بکـات ، هەرچی ستالینیش بو جاڕنامەی "هـەمو کەسێك دەبێت گەواهی درۆ بدات" کردبـو بەرێـسای کـاری هـەمو ئەنـدامانی حیزبـی بۆلـشەفیك. تـەنها نیگایـەك بـەبارودۆخی کردەیـی کاروبـارو شـێوازی ڕوداوەکـانی ناوچـەیەکی یـەکێتی سـۆڤێت بەسـە بـۆ ئـەوەی هـەمو جـۆرە گومانێـك دەربـارەی نادروسـتی تێـوری بەیـەقین بگۆڕێـت، کە بـەپێی ئـەو تێورییـە تیرۆری دەیـەکانی دوەمو سـێیەمی سـەدەی بیستەم، " بەهایـەکی قورسـی پـڕ ئێشوئازار" ی بەپیشەسازیکردن و پێشکەوتنی ئابوری وڵات بو[23] بەڵام تیرۆر شتێکی لـەوجۆرەی لێنەکەوتەوە. ئەو دەرئەنجامانەی لەتیرۆر کەوتەوە بریتی بو لە دژایەتیکردنی کۆلاك، گۆڕینی کـار بـەکاری بەکۆمـەڵ و هەڵمـەتی پاکتـاوکردنی گـەورە، نـەك پێـشکەوتنی ئابوری و بەپیشەسازی کردنی وڵات، بەڵکو بەپێچەوانەوە، برسێتی، پشێوی و بـارودۆخی بەرهـەمهێنانی خۆراك، نزمبونـەوەی ئاستی گەشـەی دانیـشتوان و ناکـامی لەگەشەکردن و ئاوەدانکردنـەوەی دەشتاییە بەرفراوانـەکانی سـیبریای لێکەوتەوە. بەڵگەنامەکانی سمۆلینسك بەدوورودرێژی ئەو ڕێبازە نیشاندەدا کە حکومـەتی سـتالین پـشتی پێدەبەسـت لـەپێناو وێرانکردنـی ئـەو تـەکنۆلۆجیا و بەڕیوەبردنـە چـالاکەی وڵات کە لـەدوای شـۆرشـی ئۆکتـۆبـەر بەدەسـتی هێنـابو. لەراسـتیدا ئـەو شـتانە "باجێـك"ی گـەورەی ناراسـتگۆیی بـو لـەپێناوی ئاوالەکردنی دەرگای کار لەحیزب و دەوڵەت بۆ توێژە جیاوازەکانی میللەت، کە زۆرجـار لـەڕووی سیاسـییەوە خـەڵکانێکی نەخوێنـدەوار بـون، باجێـك تـەنها

زیانەکانی ئێشوئازار نەبو[24] لەراستیدا بەهای فەرمانرەوایی تۆتالیتار زۆر گەورەبو، بەجۆرێك تاکو ئێستاش بەتەواوەتی لە ئەڵمانیا و روسیا هەقی خۆی پێنەدراوە.

پێشتر ئاماژەم بەرێبازی رزگاریخوازانەی دوای مردنی ستالین کرد. لەساڵی 1958دا، هێشتا دڵنیانەبوم لەوەی کە "توانەوەی بەستەڵەك . کسر الجلید" تەنها کرانەوەیەکی کاتی بوە یا جۆرە فێڵێکی تایبەت بەقەیرانی جێنیشین بو، کە لە سوککردنی سانسۆری تۆتالیتار دەچو لەکاتی شەڕی جهانی دوەمدا. تەنانەت تا ئەمرۆش ناتوانین ئەوە دیاری بکەین کە ئەم ریبازە دوا رێبازەو قابیلی پاشگەزبونەوە نیە، بەڵام هەرگیز ناتوانین بە هەڵوێستێکی کاتی دابنێین، بۆیە هەرچۆنێك هێڵی سیاسی سۆڤێتی بخوێنینەوە، بەوەی لەساڵی 1953ەوە زۆر فێڵبازانەیەو زۆرجاریش شێوێنەرو گۆمڕاکەرە، ئەوا بەدڵنیاییەوە ئیمپراتۆرییەتی دیۆئاسای پۆلیس پاکتاوکرا، زۆربەی ئۆردوگاکانی گرتن داخران، دەسەڵاتداران هەڵمەتی پاکتاوکردنی نوێ لەدژی "دوژمنانی بابەتی" ئەنجام نادەن و ململانێی نێوان ئەندامانی "سەرکردایەتی بەکۆمەڵ" ئەمرۆ لەرێگەی داگرتنی پلەو پایەو نەفیکردن چارەسەر دەکرێ، تا لەرێگەی دادخوازی جیاوازو دانپیانان و کوشتنەوە. بێگومان ساڵانی دوای مردنی ستالین زۆر لەنمونەکەی ستالین دەچێت کە لە دوای مردنی لینینەوە گرتیەبەر: بۆ جاری دوەم حوکمی سیانی زیندوکرایەوە کە بە "سەرکردایەتی بەکۆمەڵ" دەناسرێتەوە، ئەوەش دەستەواژەیەکە خودی ستالین لە ساڵی 1925 دایهێنا و لەدوای چوار ساڵ لەپیلانگێران و ململانێ لەپێناوی دەسەڵاتدا، کەچی ساڵی 1957، خرۆچۆف لەکودەتایەکی وەك کودەتاکەی ساڵی 1929ی ستالین حوکمی گرتە دەست. لەراستیدا کودەتاکەی خرۆچۆف لەرووی هونەرییەوە لەرێبازی سەرداره کۆچکردوە ریسواکەی دەچێت. بەهەر حاڵ، ئەویش پێویستییەکی زۆری بەهێزێکی دەرەکی هەبو تا لەناو هەرەمی حیزبدا دەسەڵات بگرێتە دەست، بۆیە پاڵپشتی مارشاڵ جۆکۆف و سوپای

بەکارهێنا، هەروەکو ستالین لەپێش ئەو بەسی ساڵ، لەیەکەم ململانێیدا بۆ دەسەڵات گرتنە دەست پەیوەندیی خۆی لەگەڵ پۆلیسی نهێنیدا بەکارهێنا[25] لەحاڵەتی ستالیندا حیزب نەك پۆلیس دەسەڵاتی رەهای هەبو، هەمان حاڵەتیش لەسەردەمی خرۆچۆفدا وەك خۆی مایەوەو حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتی لەساڵی 1957ەوە دەسەڵاتێکی بێ چەندوچونی لەهەمو بوارەکانی ژیانی سۆڤێتدا هەبو[26] چۆن ستالین لەپاکسازی ریزەکانی پۆلیس و کادرەکانی و پاکتاوکردنی فەرماندەکانیان دردۆنگی نەکرد، خرۆچۆفیش بەهەمان شێوە هەڵسوکەوتی ئەوی پیادە کرد، بەوەی چۆکۆڤ لەکۆمیتەی سەرکردایەتی و کۆمیتەی نێوەندی حیزب دەرکرد کە لە دوای کودەتاوە پێیان گەیشتبو، هەروەها لەفەرماندەیی گشتی سوپاش دەکرا.

بێگومان کاتێك خرۆچۆف داوای هاوکاری لەجۆکۆف کرد، ئیدی سەرکەوتنی سوپا بەسەر پۆلیسدا بوە واقیعێکی حاشاهەڵنەگر لەیەکێتی سۆڤیتدا. ئەمەش یەکێك لەئاکامە خۆبەخۆییەکانی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەتی پۆلیس بو، کەپێشتر دەسەڵاتی بەسەر بەشێکی گەورەی پیشەسازیی و کان و زەوییەکانی سۆڤیتدا هەبو، گۆردرا بەدەسەڵاتی کارگێری، ئەوانەی لەناکاو خۆیان لەدەرەوەی جدیترین پێشبڕکێکارانی ئابوری بینییەوە. سەرکەوتن و باڵاکردنی خۆبەخۆی سوپا بوە کارێکی یەکلاکەرەوەو کۆتایی: سوپا کۆنترۆڵکردنی ئامرازەکانی توندوتیژی بەتەواوەتی لەبەردەست بو، بۆیە دەیتوانی جڵەوی ململانێیەکانی ناوخۆی حیزب بکات. خرۆچۆف لەهاورێ حیزبیەکانی خۆی زووتر لەئاکامی کردەوەکانی تێگەیشت، ئەوەش بەڵگەی زیرەکی و ژیری خرۆچۆف بو. بەڵام ئاکامی گواستنەوەی دەسەڵات لەدەستی پۆلیسەوە بۆ دەستی سوپا کارێکی زۆر پڕ بایەخ بو، ئیدی پاڵنەرەکانی خرۆچۆف هەرچییەك بوبێت. بێگومان باڵادەستی پۆلیسی نهێنی بەسەر دەزگای سەربازیدا سیمایەکی رژێمە دیسپۆتیزمەکانە و تایبەت نیە بەرژێمی تۆتالیتاریزم. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکەوتنی باڵادەستی پۆلیس بەتەنها

وەلامدانــەوەی پێداویــستییەکانی رژێمــی توتالیتــاری نیــە لەســەرکوتکردنی دانیــشتوانی نــاوەوەی ولاتــدا، بــەڵکو لەگــەڵ بانگەشــەی ئایــدیۆلۆجیی لەبالادەســتیی بەســەر تــەواوی گــۆی زەمینیــشدا هاوئاهەنگــە. شــتێکی بەڵگەنەویــستە ئەوانــەی پێیــان وایــە تــەواوی ســەرزەمین، ســەرزەمینی ئارەزووەکانی ئایندەیانە جەخت لەسەر رەگەزی توندوتیژی ناوخۆیی بکەن و نەك بەسوپا، بەڵکو بەشێوازی پۆلیسی و خەڵکانی سەر بەپۆلیس حوکمی سەرزەمینە فەتح کراوەکانیشیان بکەن. بەمشێوەیە نازییەکان بەمەبەستی حوکم کردن و لەپێناوی بەرێوەبردنی سەرزەمینە فەتح کراوەکان لەدەرەوەی ولات سودیان لەتیمە تایبەتەکانی دەستەی پاراستن . (S.S) وەردەگرت، کەلە بنەرەتدا لەهێزێکی گەورەی پۆلیسی ئەڵمانیا بو، سەرئەنجام لەپێناوی ئامانجێکی پیرۆزدا پێویستە سوپا و پۆلیس لەژێر سەرکردایەتی S.Sدا لەیەکبدرێن (دەمج بکرێن).

لەلایەکی دی، بەڵگەی هاوسەنگی ئەم دەسەلاتە نوێیە لەکاتی سەرکوتکردنی سەربازیی شۆرشی مەجەرستاندا بەجوانی ئاشکرابو. سەرکوتکردن و هاڕینی خوێناویی شۆڕش زۆر دڵرەقانە و ترسناك و چالاك بو، بەلام ئەوەی پێی هەستا یەکەکانی سوپا بو، نەك پۆلیس، سەرکوتکردنێکی ئەوتۆ بو لەگەڵ هیچ چارەسەرێکی نمونەیی ستالیندا نەدەگونجا. ئەگەر چی ئەم ئۆپراسیۆنە سەربازییە لەسێدارەدانی سەرکردە و زیندانیکردنی هەزارانی دی لێکەوتەوە، بەلام نەبوە مایەی دورخستنەوەی بەکۆمەڵی خەڵکی و قەلاچۆکردنی دانیشتوانی ولات. لەبەر ئەوەی ئۆپراسیۆنێکی سەربازی رووت بو، دەستی پۆلیسی تیا نەبو، بۆیە سۆڤێت توانی یارمەتی پێویست رەوانەی ئەو ولاتە تێکشکاوە بکات و رێگە لەبرسێتی بگرێت و نەهێڵێت ئابوری ولات لەسالی دوای شۆڕشدا بەتەواوەتی داڕوخێت. بێگومان کارێکی لەوجۆرە و لەهەمان هەلومەرجدا هەرگیز بەفیکری ستالیندا نەدەهات، بەڵکو زۆر بەئاسانی پشتی تێدەکرد.

بەلام روونترین نیشانە لەسەر ئەوەی کە لێرە بەدواوە ناتوانرێ بەمانای وشە یەکێتی سۆڤێت بەرژێمێکی تۆتالیتار وەسف بکرێ، زیندوبونەوەیەکی دەوڵەمەندو خێرای هونەرو ئەدەب بو لەدوا دەیەی سەدەی بیستەمدا. بێگومان هەوڵدان بۆ گێڕانەوەی خاتر بۆ ستالین و سەرکوتکردنی ئارەزوی ئازادی بیروراو ئازادی بیرکردنەوە لەلای خوێندکاران، نوسەران و هونەرمەندان، هەرگیز ناتوانێت بەبێ گێرانەوەی تیرۆرو دامەزراندنی رژێمێکی پۆلیسی، سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. ئەوەی رون و ئاشکرایە، هێشتا دەسەلاتداران هەمو جۆرە ئازادییەکی سیاسی، هەر لە ئازادی ئینتماوە تا ئازادی بیرکردنەوەو ئازادی بیروراو رادەربڕین لەخەڵکی سۆڤێت قەدەغە دەکەن. لەراستیدا وادەردەکەوێت هیچ شتێك نەگۆڕابێت، بەلام لەواقیعدا هەمو شتێك گۆڕانی بەسەرا هاتوە. لەکاتی مردنی ستالیندا کەشکۆڵی نوسەران و ئەدیبان بەتەواوەتی خالی بو، کەچی ئەمرۆ ئەدەبێکی تەواو بەشێوەی دەستنوس دەستاودەست دەکات، هەروەها هەموجۆرە هونەرێکی وێنەکێشانی هاوچەرخیش لەستۆدێوی نیگارکێشەکاندا تاقیدەکرێتەوە، تەنانەت بەبێ ئەوەی نمایش بکرێن، ناوبانگیان پەیدا کردوە. ئەوەی لێرەدا پەیوەندی بەم کارەوە هەبێت لەگرنگی جیاوازی نێوان سانسۆری دیسپۆتیزم و ئازادی کاری کولتوری کەم ناکاتەوە، بەلام ئەوەی پێویستە سەرنجی بۆ رابکیشرێت جیاوازی لەنێوان ئەدەبی نهێنی و نەبونی ئەدەبدا، لەوە دەچێت یەکێك بەراورد لەنێوان سفرو یەك دا بکات.

لێرە بەدواوە، ئەندامانی ئۆپۆزیسیۆنی روناکبیران دادگایی دەکرێن (ئەگەرچی بەنهێنیش بێت)، ئەو خەڵکانە دەتوانن لەنێو هۆڵی دادگادا بەرگری لەخۆیان بکەن و حیساب بۆ پشتیوانی دەرەوە بکەن، لەجیاتی ئەوەی دان بەتاوانەکانیاندا بنێن، بەرگری لە بێتاوانی خۆیان بکەن، ئەمەش پەیوەندی بەنەمانی بالادەستی گشتگیرەوە هەیە. هەردوو نوسەر "دانییل" و "سیتیافیسکی" لە کانونی دوەمی ساڵی 1961دا بە حەوت و پێنج ساڵ زیندانی و کاری قورس حوکمدران، لەبەر

ئـەوەی بابـەتێكیان لـەدەرەوەی وڵات بڵاوكردبـووەوە كەلـەناو یـەكێتی سـۆڤێتدا بڵاوكردنەوەی قەدەغە بو، بۆیە بەپێی هەمو پێوەرێكی سیستەمی دەستوری، رژێم كـارێكی دزێـوو ناشیرینیان كـردوە، بـەڵام ئـەوەی وتیـان لەهـەمو قوژبنێكی جهـان دەنگـی دایـەوەو تەنانـەت لەبیرچونەوەشـی زۆر زەحمـەت بـو. ئـەو دوو نوسـەرە لەفەرامۆشخانەی سەركردە تۆتالیتارەكانـدا لەبەرچاو ون نـەبون. هەنوكە روداوێك دەهێنینەوە كە كەمتر زانراوە، رەنگە بۆ سەلماندنی بۆچونەكەمان باشترین بەڵگەی قاییلكەر بێت، ئـەویش ئەوەیـە خرۆچـۆف هـەوڵێكی زۆر بەرخوازانەیـدا كودەتایـەك لەدژی رێبازی كرانەوە بكاتو بارودۆخەكە بۆ سەردەمی تۆتالیتارییەت بگێرێتەوە، بـەڵام ئـەو هەوڵـەی توشـی شكـستێكی گـەورە بـو. خرۆچـۆف لەسـاڵی 1957دا یاسایەكی بەناوی "یاسای نوێ لەدژی مشەخۆرە كۆمەڵاتیەكان" خستە بەردەست كـە بەپێی ئـەم یاسـایە رژێـم دەیتـوانی پرۆسـەی دورخستنەوەی بەكۆمـەڵ، كـاری زۆرەملـێ، جۆرێـك لەكۆیلایـەتی لەسـەر ئاسـتێكی بـەرفراوانو شـەپۆلێكی نـوێی راپۆرتنوسینی بەكۆمەڵ (الوشايات الجماعية) دەست پێبكاتـەوە . ئەمـەش مـەرجێكی سـەرەكی باڵادەسـتی گـشتگیرە . تـەنها میللـەت لەئەنجومەنـە گـشتییەكاندا ئـەو دەسەڵاتەی هەیە مشەخۆرەكان لـەنێو ریزەكـانی خۆیـدا هـەڵاوێرد بكـات، بـەڵام ئـەو یاسـایە لەلایـەن یاسـادانەرانی سـۆڤێتەوە روبـەروی نارەزاییـەكی تونـد بویـەوە، تەنانەت لە پێش جێبەجێكردنی، وازی لێهێنرا[27] بەوتەیەكی دی، هەر ئەوەندەی خەڵكی یەكێتی سۆڤێت لەمۆتەكەی حوكمی تۆتالیتار رزگاریان بو، ئیدی روبەروی دژواری، مەترسـی و سـتەمی زۆری دیكتـاتۆری تـاك حیزبـی بونـەوە. ئـەوەی بەتـەواوەتی دروسـتە، فـۆرمی ئـەم دیـسپۆتیزمە هاوچـەرخە هـیچ گرەنتییـەكی سیستەمی دەستوری لێسەوز نابێت، چونكە "بەپێی گریمانـەكانی ئایدیۆلۆجیای كۆمۆنیستی، لەدوا دەرئەنجامی شیتەڵكاریدا، هەمو دەسەڵاتێك لەیەكێتی سۆڤێتدا نارەوایـە"[28]. رەنگـە وڵات بـەبێ هـیچ ئـاژاوەو پـشێوییەكی گـەورە دوبـارە بكەوێتـەوە ژێـر دەسـەڵاتی تۆتالیتاریزمـەوە، هـەروەها ئـەوەش راسـتە كـە

ترسناکترین شێوە تازەکانی رژێم کە شیکردنەوەی رەگەزو بنەما مێژووییەکانی بابەتی ئەم باسە پێکدەهێنێت، بەوشێوەیەی لەدوای مردنی هیتلەر لەئەڵمانیا لەناوچون، لەروسیا لەدوای مردنی ستالین لەناونەچون.

ئەم کتێبە چارەسەری تۆتالیتاریزم دەکات، باس لەبنەماو رەگەزەکانی دەکات، ئەمە لەکاتێکدا قۆناغەکانی دواتر لە لەئەڵمانیاو روسیادا لەم کتێبەدا ئەوەندە لەبەرچاو گیراون کە روناکییەك بخاتە سەر رووداوەکانی پێش ئەو قۆناغە. بۆیە ئەوەی لەم ناوکۆیەدا سەرنجمان رادەکێشێت قوناغی دوای جەنگی جهانی دوەمە کە ستالین دەسەلاتی تیا گرتەدەست، نەك قۆناغی دوای مردنی. چونکە ئەم هەشت ساڵە، لە1945 تا 1953 راستیی رووداوەکانی دوای ساڵی 1935 دەسەلمێنێ‌و دەیکاتە مایەی قەناعەت‌و بڕواپێهێنان، نەك رەتیبکاتەوە یا شتێکی لێبگۆڕێت. لەراستیدا ئەو رێوشوێنانەی لەدوای سەرکەوتن لەپێناوی چەسپاندنی بالادەستی گشتگیر لەیەکێتی سۆڤێتدا گیرانەبەر، لەدوای ئەو پشوە کاتییەی لەسەردەمی جەنگدا حوکمفەرما بو، چەشنی ئەو رێوشوێنانەی کە حوکمی تۆتالیتاری لە ولاتانی پاشکۆدا بەرقەرار کرد بەتەواوەتی تەباو گونجاو بون لەگەڵ رێسای ئەو گەمانەی پێشتر پێمان دەزانی. بەلام بە بۆلشەفیك کردنی ولاتانی پاشکۆ پێویستی بەگرتنەبەری چەندین هەنگاوی یەك لەدوای یەك هەبو، کەبەدامەزراندنی بەرەی میللی‌و پەیکەری پارلەمانی وەك روکارێك دەستی پێدەکردو زۆر بەخێرایی بۆ دامەزراندنی سەقامگیرکردنی دیکتاتۆرییەتی تاك حیزبی دەگوێزرایەوە، ئنجا لەتەقەلایەکی بەرچاودا، دەستکرا بەپاکتاوکردنی ئەو سەرکردەو ئەندامە حیزبیە میانرەوانەی بەشداری کردنی خۆیان لەحکومەتی پێشودا راگەیاندبو. لەدوا گەمەدا سەرکردە کۆمۆنیستە نیشتمانپەروەرەکان، ئەوانەی مۆسکۆ بەهەق‌و ناهەق سڵی لێدەکردنەوە، لەداوانامەی هەڵبەستراودا لەسەر دەستی گەندەڵترین‌و خوێڕیترین کەسی هەمان حیزب، کەسانێك کە هەرگیز کۆمۆنیست نەبون، بەڵکو تەنها سیخوری مۆسکۆ بون، روبەڕوی گرتن‌و ریسواکردن‌و

ئەشکەنجەدان و کوشتن بونەوە. تەنانەت هەروەکو دەوترێ مۆسکۆ هەمو قۆناغەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری تا لەدایکبونەوەی دیکتاتۆرییەتی تۆتالیتاری دوبارەکردەوە. بەڵام ئەو داستانەی لەدزێویدا وەسف ناکرێ، لەدوتوێدا نەبایەخێکی گەورەی هەبو، لەگەڵ هاوشێوەکانیشی جیاواز نەبو: ئەوەی لە وڵاتێکی پاشکۆ رویدەدا، لەهەمان کاتدا لەهەمو وڵاتانی پاشکۆدا تا رادەیەك رویدابو، هەر لە کەنارەکانی دەریای باڵتیکەوە تا دەریای ئادریاتیك، تەنها ئەو وڵاتانەی بەشێك نەبون لە وڵاتانی پاشکۆ، روداوەکان رێڕەوێکی جیاوازیان گرتەبەر. وڵاتانی ناوچەی باڵتیك راستەوخۆ بە یەکێتی سۆڤێتەوە لکێنران و چارەنوسیان لەچارەنوسی وڵاتانی پاشکۆ خراپتر بو: تەنها لەسێ وڵاتی بچوکی باڵتیکدا (لیتونی، ئیستوانیا و لیتوانیا) پێنج سەد هەزار کەس راگوێزران و شالاوێکی گەورەی موستەوتنی روسی لەشوێنیان نیشتەجێ کران، دانیشتوانە رەسەنەکەش لەسەر خاکی خۆیاندا هەڕەشەی بەکەمایەتی بونیان لێدەکرا[29] لەبەرامبەر ئەوەشدا لێکدان (دمج)ی ئەڵمانیا رۆژهەڵات بە وڵاتانی پاشکۆوە لێکدانێکی لەسەرخۆ بو، تەنها لەم دوایانەدا ئەنجام درا، واتە لەدوای تەواوبونی دیواری بەرلین بەماوەیەکی دورودرێژ: ئەڵمانیای رۆژهەڵات تا دیرۆکێ وەك وڵاتێکی داگیرکراو مامەڵەی لەتەکدا دەکراو حکومەتێکی بەکرێگیراوی وەك حکومەتەکەی کیسلینگ بەریوەیدەبرد.

لەناوکۆی بایەخدانمان بە گۆڕانکارییە ناوخۆییەکانی یەکێتی سۆڤێت، بەتایبەتی گۆڕانکارییەکانی دوای 1948 گرنگییەکی فرەی هەیە، واتە ئەو ساڵەی "جدانۆف"ی بەشێوەیەکی نادیار تیا مرد و "کێشەی لینینگراد"ی تیا بەرجەستە بو، بەحوکمی ئەوەی دەلالەتێکی گەورەی لەسەر لێکۆڵینەوەکەمان هەیە. لەم ساڵەدا، ستالین بۆ یەکەمین جار لەدوای هەڵمەتی پاکتاوکردنە مەزنەکەی بەفیعلی دەسەڵاتی گرتەدەست، زۆرێك لە گەورە بەرپرسانی لەسێدارەدا، بەپێی زانیارییەکانی ئێمە، لەسێدارەدانی ئەو کەسانە رەنگە ئاماژەیەك بوبێت بۆ دەستپێکردنەوەی هەڵمەتێکی نوێی پاکتاوکردن

لەسەرتاسەری نیشتماندا. ئەگەر مردنی ستالین نەبوایە، ئەو هەڵمەتەی کە بە "پیلانی پزیشکان" ناوزەدە کرابو، رەهەندی بەرفراوانتری لەخۆدەگرت. ناوەرۆکی ئەوەش بریتی بو لەوەی تیمێکی پزیشکی کە زۆربەیان یەهودی بون بەپیلانی " لەناوبردنی کادرە بەرزەکانی یەکێتی سۆڤێت تاوانبار کرابون"[30] ئەوەی لەنێوان ساڵی 1948و کانونی دوەمی ساڵی 1953 لەروسیا رویدا، کاتێك " پیلانی پزیشکان" ئاشکرا بو، تارادەیەکی زۆرو بەشێوەیەکی بەدو نەگریسانە لەقۆناغی سییەکانی سەدەی بیستەم دەچو، کە رێگەی بۆ هەڵمەتی پاکتاوکردنی گەورە خۆشدەکرد: مردنی جدانۆفو هەڵمەتی پاکتاوکردنی لینینگراد چەشنی مردنی کیرۆف لەساڵی 1932دا نهێنیئامێز بو، کەراستەوخۆ جۆرێك لە ئامادەکاریی پاکتاوکردنی "پاشماوەی ئۆپۆزیسیۆنە دێرینەکانی ناو حیزب"[31]ی بەدوای خۆیدا هێنا. ناوەرۆکی ئەم تاوانبارکردنە پروپوچەی لەدژی پزیشکەکان دارێژرا، بەوەی دەیانەوێت سەرکردەکانی وڵات بکوژن، ئەو تومەتە لەناخی ئەوانەی شێوازی ستالینیان دەزانی هەستێکی ترسناکی دەبزواند: تاوانبارکردنی دوژمنێکی وێناکراو بەتاوانێك کە خۆی دەیەوێت پێی هەستێت. (باشترین نمونەش لەسەر ئەو روداوە، لەوکاتەی ستالین، تۆخۆچوفسکی بەدەست تێکەڵکردن لەگەڵ ئەڵمانیا تاوانبارکرد، خۆی دەیویست پەیماننامە لەگەڵ نازییەکاندا ببەستێت).

شتێکی حەتمییە کە دەوروبەرەکەی ستالین ساڵی 1952، زیاتر ئاگایان لە مانا راستەقینەکانی وشەکانی ستالین بو تا سییەکانی هەمان سەدە، بۆیە تەنها دەقی تاوانبارکردنەکە ترسێکی گەورەی لەنێو سەرجەم گەورە بەرپرسەکانی رژێمدا بڵاودەکردەوە. رەنگە هەر خودی ئەو ترسە گەورەیەش باشترین راڤەکردنی ئەگەری مردنی ستالینو ئەو هەلومەرجە ئاڵۆزەی چواردەوری بێت، هەروەها لەگەڵ ئەو خێراییە بەرچاوەی گەورە بەرپرسەکانی رژێمی لەچەند مانگی یەکەمی قەیرانی جێنشینیدا والێکرد لەناو حیزبێکدا ریزەکانیان رێکبخەن کەململانێو دەسیسەو سەرچڵی دایرزاندبون. هەرچەندە

زانیارییەکی ناچیزمان لەسەر ئەم داستانە هەیە، بەڵام بەشی ئەوە دەکات پشتگیری لەم قەناعەتە پەسەندکراوەم بکات کە "پرۆسەی کونبونی کەشتی"، چەشنی پرۆسەی پاکتاوکردنی گەورە، نە چەند روداوێکی لێکدابڕاو بو، نە لادانێك کە بارودۆخێکی زۆر نامۆ دروستی کردبێت، بەڵکو لەدامەزراوەی ترس و تۆقاندنەوە سەرچاوەی گرتبو کە لەماوەی دیاریکراودا پێویستی دەکرد دوبارە دەربکەوێتەوە، هەڵبەتە مەگەر سروشتی خودی رژێم گۆڕانکاری بەسەرابێت.

بەرجەستەترین رەگەزی کارەساتبار لەدواهەمین پرۆسەی پاکتاوکردندا کە ستالین لەدواساتەکانی تەمەنیدا بەرنامەرێژی بۆ کردبو، وەرچەرخانێکی ئایدیۆلۆجی یەکلاکەرەوە بو، بەوەی یەهود بەپیلانگێڕی نێونەتەوەیی لەقەڵەم دەدا. زەمینەسازی ئەم تاوانبارکردنە ساڵانێك بو لەرێگەی زۆرێك دادخوازی (دعاوی) لەهێندێك وڵاتی پاشکۆی روسیا رێگەی بۆ خۆشدەکرا: وەك دادگای "راجك . Rajk" لەمەجەرستان، کێشەی "ئاناپاوکەر . Anapauker" لەرۆمانیا، دادگای "سلانسکی . Slansky"، لەساڵی 1952 لەچیکوسلۆڤاکیا. بەهۆی ئەو رێوشوێنانەوە گەورە بەرپرسەکانی حیزب لەسەر بنەچەی یەهودی و بۆرجوازییان جیادەکرانەوە، بۆئەوەی بتوانرێ بەزایونیزم تاوانبار بکرێن، بەمشێوەیە ئەو تاوانبارکردنەی سەرەوە هێدی هێدی گۆڕا تا ئەو گروپانەشی گرتەوە کەهیچ کاریگەرییەکی زایۆنیزمیان لەسەر نەبو (بەتایبەتی لیژنەی هاوبەشی دابەشکردنی یەهودییەکانی ئەمریکا)، ئەو کارانەش بۆ ئەوەبو تا نیشانی بدەن کە هەمو یەهودییەك زایۆنیزمەو گروپە زایۆنیزمەکانیش (بەرگری لەبەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزمی ئەمریکا دەکەن)[32] هەڵبەتە "تاوانی" زایۆنیزم شتێکی تازە نەبو، بەڵام کاتێك پەلامارەکان جەختی لەسەر یەهودییەکانی یەکێتی سۆڤێت دەکردەوە، ئیدی گۆڕانێکی دی پڕ لەمانا رویدا: یەهودییەکان پێیان وابو زیاتر بە"هاوڵاتیبونی جهانی کۆزمۆپۆلیتیزم" تاوانبار دەکرێن، تا بەزایۆنیزم تاوانبار بکرێن، ئەو

تاوانبارکردنانـــەی بـــەردەوام دوبارەدەبونـــەوە لـــەو دروشمانـــەوە سەرچـــاوەی دەگرت و بەسەر یەهودییەکاندا دادەبارین، ئەو نەخشانەی دەوڵەمەند دەکرد کە نازییـــەکان دژی پیلانگێـــڕی جهـــانی یـــەهود پلانیـــان بـــۆ دانـــابو، تـــا وایلێهـــات لەراسپاردەی پیرانی زایۆنیزم دەچو. هەنوکە، بەتەواوەتی بۆمان رونبۆتەوە کە ئەم رێبازە ئایدیۆلۆجیا نازییە چ کاریگەرییـەکی قوڵ و مەزنی لەناخی ستالین هـــەبوە . ئامـــاژە سـەرەتاییەکانی ئـەم کاریگەرییـــەش لـەکاتی واژوی (توقیـــع) ستالین و هیتلەردا لەسەر پەیماننامەی نێوانیـان بەدیارکەوت. ئـەو کاریگەرییـە لەو بەها ئاشکرایە دەردەکەوت کە هەڵمەتەکانی پروپاگەندە لەروسیا و وڵاتـانی پاشـــکۆ پێیدەبەخـــشی، چـــونکە هەســـتی دژایـــەتیکردنی یـــەهود لـــەو وڵاتانـــە بەردەوام لەلای خەڵکی پەسەند دەکرا. لەلایەکی دی، نمونەی ئەو پیلانگێڕییە جهـــانی و هەڵبەســـتراوە، لـــەرووی ئایدیۆلۆجییـــەوە ســـەرزەمینێکی ســـەرەکی گونجـــاوتر لـــە "وۆڵ ســـتریت" (مەبەســـت لـــە ســـەرمایەداری و ئیمپریالیزمـــە) دەبەخشێت بەو کەسـانەی بەرخوازییـەکی تۆتالیتاریزمیـان هەیە. دانپیانـانی ئاشـــکراو بێـــشەرمانەی ســـتالین کـــە لـــە دیـــدی جهانـــەوە نیـــشانەی تـــەواوەتی نازییەتـــە، دوا پاداشـــتی ســـتالینە بـــۆ هـــاورێ کۆچـــکردو و نەیارەکـــەی لەبالادەســـتی گـــشتگیردا کـــە روداوەکـــان نەیانهێـــشت رێکـــەوتنێکی هەمیـــشەیی لەگەڵدا مۆر بکات، ئەمەش توشی غەموخەفەتێکی زۆری کرد.

ســـتالینیش چەشـــنی هیتلـــەر مـــرد، پـــێش ئـــەوەی دەرفـــەتی ئـــەوەی هـــەبێت ئەرکە ترسناکەکەی تەواو بکات، ئەو رۆژەی مـردن بـەرۆکی گـرت، ئـەو مێژووە کۆتایی پێهات کە ئەم کتێبە دەیگێڕێتەوە و هەروەها ئەم روداوانـەش هەوڵـدەدا لەناوەوە لێی تێبگات و راڤەی بکات

حوزەیران/ 1966 ـ تشرینی دوەم/ 1971

هانا ئەرندت

# پەراوێزەکان

1ـ ئەو واقیعەی کە رژێمی تۆتالیتاری سەرباری تاوانە ئاشکراکانی، پشت بە پاڵپشتی جەماوەر دەبەستێت، دڵەراوکێیەکی زۆر دروست دەکات. لێرەوە ئەوەندە جێگەی سەرسوڕمان نیە کە لێکۆڵەران بەپشت بەستن بەبڕوای ئەفسوناوی پروپاگەندەو شۆردنی مێشكو سیاسەتمەدارانیش بەنکوڵی لێکردنیان، ئەو راستیە قبوڵ ناکەن وەك چۆن ئادنەر بۆ نمونە چەندین کەڕەت ئەم واقیعەی بەتەواوەتی رەتکردۆتەوە. بڵاوبونەوەی راپۆرتی نهێنی دەربارەی رای گشتی ئەڵمانیا لەسەردەمی جەنگدا (لە 1939 تا 1944) لەلایەن دەزگای هەواڵگری نهێنی ئەڵمانیاوە S.S زۆر پڕ سود بو ( Meldungen aus dem Reich Auswahl aus den Geheimen Lageberichten des Sicherheitsdienstes der S.S 1939 – 1944 ,Berlin 1965). سەرەتا ئەم راپۆرتە رونیدەکاتەوە کە میللەت ئاگاداریيەکی تەواوی لەسەر هەواڵە بەناو نهێنییەکان هەبو (قەتڵوعامی یەهودییەکانی پۆڵۆنیا، خۆئامادەکردن بۆ پەلاماردانی روسیا، هتد)، دوەم، ئەوەشی دەردەخست " تا چ رادەیەك قوربانییەکانی پروپاگەندەی هیتلەری دەیانتوانی رای سەربەخۆی تایبەت بەخۆیان هەبێت" لاپەڕەی 18 . 19 بەهەر حاڵ، ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت زانیاری لەسەر کرەوەکان کاری نەکردە سەر پشتگیریکردنی رای گشتی لەرژێمی هیتلەری. کارێکی حەتمییە کە پشتگیریکردنی جەماوەر لە تۆتالیتاریزم لە بێئاگایی تەواو و مێشك شۆردنی جەماوەرەوە سەرچاوەی نەگرتبو.

2ـ زۆرجار لێکۆڵینەوەو بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامەکان، هەر لەسەرەتاوە، بەچالاکی تاوانەکانەوە پەیوەستن، بەگشتیش هەڵوێردکردن، بەمەبەستی بەدواداچونی تاوانبارانی جەنگ ئامادە دەکرێ. سەرئەنجام، زۆرێك لە مادە پڕ بایەخەکان فەرامۆشکران. بەڵام ئەو کتێبەی بە ژمارە (1) ئاماژەی پێدراوە، ئاوارتەیەکی زۆر دڵخۆشکارانەی ئەم رێسایەیە.

3ـ بڕوانە "مێرل فینسود"، سمۆلینسك لەژێر کۆنترۆڵی سۆڤیتە، کامبردج، 1958، ل210،306،365 هتد، وەرگێڕاوە فرەنسییەکەی: "Smolenxk al`heure de staine" .Fayard 1967. (Note de l`editeur)

4. هەمان سەرچاوە، ل73، 93.

5. پێویستە لێکۆڵیار سەرباری تێکرای قوربانییەکانی پلانی پێنج ساڵەی (1928 . 1933) کە بە 9 . 12 ملیۆن کەس دەخەملێنرێت، قوربانییەکانی هەڵمەتی پاکتاوکردنە مەزنەکەش بخاتە پاڵیان کە بە (3) ملیۆن کوژراو،و5 . 9 ملیۆن دەستبەسەرو دورخراوە دەخەملێنرێ. (لەم بارەیەوە، بگەڕێرەوە بۆ پێشەکییە گرنگەکەی رۆبەرت. ت. تاکر . Tucher بەناونیشانی "ستالین، بوخارین و مێژوو وەك پیلانێك" لەچاپی نوێی کتێبی دەستنوسی دادگاییەکانی مۆسکۆ لە ساڵی 1938، "دادگاییەکانی پاکتاوکردنی مەزن"، نیویۆرك، 1965). بەڵام ئەو خەملاندنانە لەژمارەی راستەقینە کەمترن. چونکە ژمارەی کوژراوە بەکۆمەڵەکانی لەبەرچاو نەگرتوە کە هیچمان لەسەری نەدەزانی تا هێزی داگیرکاری ئەڵمانیا لەشاری ڤینتسیا ئەو گۆڕە بەکۆمەڵەی دۆزییەوە کە ئێسك و پروسکی هەزاران کەسی تیابو، ئەوانەی لەنێوان ساڵی 1937 و1938 کوژرابون. (بڕوانە جۆن. ئەی. ئەرمسترۆنگ. سیاسەتی تۆتالیتاریزم. حزبی کۆمۆنیست لە یەکێتی سۆڤێتدا لەساڵی 1934ەوە تا هەنوکە. نیویۆرك، 1960، ل65). بەهەر حاڵ ئەم ئاشکراکردنە نوێیە لە هەمو کاتێکی دی زیاتر هەر دوو رژێمی نازی و بۆلشەڤ وەك دوو نمونەی لێکچو دەردەخات. دەتوانرێ لەرێگەی دادگاییکردنی سینیافسکی و دانیالەوە ئەوەش ببینرێ کە واقیعی کوشتاری بەکۆمەڵی سەردەمی ستالین تا چ ئەندازەیەك چەقی ئۆپۆزسیۆنی هەنوکە پێکدەهێنێت، نیویۆرك تایمز ماگازین لە17/نیسانی/1966 چەندین بڕگەی لێ بڵاوکردۆتەوە، منیش لێم وەرگرتوە.

6. Tucker, op.cit, p. xv11 – xv111.

7. لە میرڵ فینسودا هاتوە، "چۆن روسیا حوکم دەکرێ"، کامبردج، 1959، لاپەڕە 516. عەبدولرەحمان ئەڤیۆرخانۆف . Abdurakhman Avtorkhanov لە کتێبی "حوکمی ستالین" کە لە ژێر ناوێکی خوازراودا (ئۆرالۆڤ . Uralov) لە لەندەن بڵاوبۆتەوە، باس لەوە دەکات، لیژنەی نێوەندی حیزب لەساڵی دا 1936 ، لەدوای یەکەمین نمایشی دادگا، کۆبونەوەیەکی نهێنی گرێدا. لەو کۆبونەوەیەدا بوخارین، ستالینی تاوانبار کرد بەوەی حیزبی لینینی بۆ دەوڵەتێکی پۆلیسی گۆڕیوە، ئەو وتانەشی لەلایەن دوو لەسەر سێی ئەندامانی حزبەوە پشتگیری لێکرا. بەڵام ئەو خاڵەی گوایە لیژنەی نێوەندیی پشتگیری لە بوخارین کردوە، زۆر نابەجێیە، تەنانەت ئەگەر ئەو پشتگیریکردنەش راست بێت، ئەوا کۆبونەوەکە لەکاتێکدا ئەنجام دراوە کە هەڵمەتی پاکتاوکردن گەیشتبوە چڵەپۆپە، ئەمەش مانای بونی ئۆپۆزسیۆنێکی رێکخراو ناگەیەنێت، بەڵکو پێچەوانەکەی راستە. هەروەکو فینسود بەدروستی ئاماژەی پێکردوە "بێزارییەکی گشتی"، بەتایبەتی لەنێو جوتیاراندا

ولاتی تەنی بو، تا ساڵی 1928، "لەسەرەتای پلانی پێنج ساڵەیدا، خۆپیشاندانەکان کەم نەبون"، بەلام ئەم رەوتە ئۆپۆزیسیۆن ئامێزە بەشێوەیەکی هەستپێکراو (ملموس) فۆرمێکی بەرەنگاربونەوەی رێکخراوی لەدژی رژێم وەرنەگرت. ساڵی 1929 یا 1930 "هیچ دەست پێشخەرییەکی رێکخراو لەگۆرەپاندا نەبو"، تەنانەت ئەگەر بشڵێن پێشتر ئۆپۆزیسیۆن هەبوبێت. (بروانە سمۆلینسك لەسایەی دەسەلاتی سۆڤیتدا، ل 449).

8ـ هەروەکو فینسود ئامازەی پێکردوە (سەرچاوەی ناوبراو، ل38)، "سەرکەوتنی حیزب شتێکی سەیر نیە، بەڵکو زیاتر لەوەدایە حیزب توانیوێتی بەهەر جۆرێك بوە بەردەوام بێت"

9. هەمان سەرچاوە، ل49. ئەو راپۆرتەی ساڵی 1929 ئامادەکراوە ئامازە دەکات بەوەی کە لە یەکێك لە کۆبونەوەکاندا، حاڵەتێکی تەقینەوەی توند لەدژی یەهود لەئارادا بوە، " کۆمسۆمۆڵە (لاوان) ئامادەبوەکان بێدەنگییان هەڵبژارد... بۆیە چاودێرەکان پێیان وابو هەمو لەسەر لێدوانەکانی دژی یەهود رازین"

10. هەمو راپۆرتەکانی ساڵی 1926 ئامازە دەکەن بە ئاچیزی "بەناو خۆپێشاندانەکانی دژ بەشۆرش و ئاگربرێکی کاتی نێوان رژێم و گوندنشینەکان" ئەگەر مرۆڤ راپۆرتەکانی ساڵانی 1929 و 1930، لەگەڵ راپۆرتەکانی ساڵی 1926 بەراورد بکات، بۆی دەردەکەوێت راپۆرتەکانی دوایی "لە راگەیاندنی بەرەی جەنگ دەچێت". ل 177

11. هەمان سەرچاوە، ل 252.

12. هەمان سەرچاوە، بەتایبەتی لاپەرە240و446.

13ـ هەمان سەرچاوە. هەمو ئەمجۆرە لێدوانانە لەراپۆرتی "پۆلیسی نهێنی سۆڤیت"ەوە Guepeou وەرگیراون. بەتایبەتی بروانە ل248. بەلام ئەوەی مایەی سەرنجراکێشانە، لێکۆڵیار لەدوای ساڵی 1934 و سەرەتای پاکتاوکردنە مەزنەکەوە، ئەو تێبینیانە کەمتر دەبیستێت.

14. هەمان سەرچاوە، ل310.

15ـ بەگشتی لەم ناوکۆیەدا ئەمجۆرە نوسینانە پشتگوێ دەخرێن، چونکە ئەم دەستپێشخەرییە لەروی قەناعەتەوە درکی پێدەکرێت، بەلام لەرووی مێژوییەوە بێبەڵگەیە، بەوەی لەکاتی لینینەوە، بگرە تا ستالینیش دەسەلاتی گرتەدەست پێشکەوتنێك رویداوە، ئەگەر چی پێشکەوتنێکی نارێکخراویش بێت. راستە ستالین بەردەوام بە دەستەوازەکانی لینین دەدوا، تەنانەت وادەردەکەوت کە تاکە جیاوازی نیوانیان تەنها دڵرەقی یا شێتی ستالین بێت. ئەگەر چی ئەم مەسەلەیە فیلێکی بەئەنقەستی ستالین بێت یا نا . بەپێی وەسفەکەی تاکر کە وەسفێکی دروستیکردوە، ل16ـ ئەوا راستییەکەی ئەوەیە کە ستالین

چەمکێکی تازەی ستالینیانەی بە چەمکە کۆنەکەی لینین بەخشی... جیاوازی سەرەکی سوربونی بو لەسەر " پیلانگێڕی وەك نیشانەیەکی ئەم سەردەمە، ئەوەش هەرگیز سوربونی لینینی نەبو"

16. بڕوانە فینسود، بەتایبەتی ل365.

17. هەمان سەرچاوە، ل71و93، لەکارە پڕ ماناکان ئەو نامانەی مرۆڤ دەیبینێت کەلە هەمو ئاستەکانی دەوڵەتەوە دەرچوەو ئاراستەی کراوە، پێداگرتنە لەسەر پابەندبون بەهاوڕێ ستالینەوە نەك رژێم و حیزب یا دەوڵەت. لێکچونی هەر دوو رژێمی ستالینی و هیتلەری لە وتەکانی ئیلیا ئیهرنبۆرگ و روناکبیرە ستالینیەکانی دی بە روونی دەردەکەوێت کە هەوڵدەدەن پاساو بۆ رابوردویان بهێننەوە یا هەستی خۆیان بەرامبەر هەڵمەتی پاکتاوکردنە مەزنەکە دەردەبڕن: "ستالین هیچ شتێکی دەربارەی پیادەکردنی بێبەزەییانەی توندوتیژی لەدژی کۆمۆنیست و دەستەبژێری روناکبیرانی سۆڤێتی نەدەزانی"، ئەو شتانەیان لە "ستالین دەشاردەوە، ئەگەر کەسێکیش بیخواستایە ئەو شتانە بەستالین بڵێت، ئەوانە نەیاندەهێشت"، بۆیە لەدوا جاردا ستالین تاوانبار نیە، بەڵکو سەرکردەکانی پۆلیسی نهێنی تاوانبار بون. پێویست ناکات ئەوەش بڵێین کە نازییەکان لەدوای شکستی ئەڵمانیا هەمان شتیان دەوتەوە. (guotecl from Tucker ,op.cit, p.x111).

18. هەمان سەرچاوە، ل166

19ـ ئەم وشانە ساڵی 1936 لەبانگەوازی کەسێکەوە وەرگیراوە کە وشیاری چینایەتی نەبوە، "نامەوێت تاوانبارێکی بێتاوان بم" ل229.

20. راپۆرتێکی گرنگ لە "لیژنەی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ OGPU" (1930)، ئاماژە بەم "پاسیڤیزمە کامڵە" تازەیەو بێهەستییە ترسناکە دەکات کە پیادەکردنی هەرەمەکی کوێرانە خستویەتیە دڵی خەڵکانی بێگوناهەوە. ئەو راپۆرتە گوزارشت لە گەورەیی جیاوازی دەکات لەنێوان دەستگیرکردنی دوژمنانی رژێم، "کاتێك دوو سەرباز هاورێیەتی دەستگیرکراوێکیان دەکرد، لەگەڵ گرتنی بە کۆمەڵ، بەجۆرێك سەربازێك کۆمەڵە خەڵکێك بە بێدەنگی و بەبێ ئەوەی کەسیان هەوڵی راکردن بکات، دەدایە پێش خۆی" (ل248).

21. هەمان سەرچاوە، ل135

22ـ هەمان سەرچاوە، ل57ـ58. سەبارەت بە کەشوهەوای ئەو هیستریا گەورەیەی لێکخوێندنی بەکۆمەڵە (الوشايات الجماعيە)، بەتایبەتی بڕوانە ل222و229. نوکتە خۆشەکەی لاپەڕە 235 یش ئەوە دەگێڕێتەوە چۆن هاورێیەکی حیزبی تەنها گەیشتبوە ئەو دەرئەنجامەی کە "هاوڕێ ستالین دەربارەی لایەنگرانی ترۆتسکی و زینۆڤیف رێچکەیەکی

ئاشـتیخوازانەی گرتۆتەبـەر"، ئـەو تاوانبارکردنـەش بەلایـەنی کەمـەوە مانـای دەرکردنـی یەکسەری لەحیزب دەگەیاند. بەلام بەخت یاوەری نەکرد... هەر بەزوویی هاورێیەکی دی ئەو پیـاوەی کـە خـۆی لـە سـتالین زیـاتر بەسـتالینی دەزانـی بـە "تەڵەکـەبازێکی سیاسـی" تاوانبارکرد، ئیدی کەسی یەکەم دەمودەست دانینا بەتاوانەکەی خۆیدا.

23. شتێکی سەیرە خودی فینسودیش بەهەمان دەرئەنجام دەگات و لەو فرە بەڵگەنامانەی بەردەستی بەناراستەیەکی پێچەوانە هەنگاو دەنێت. بڕوانە دوا بەشی، بەتایبەتی لاپەڕە 453. هەروەها سەیرتر ئەوەیە کە ئەم خویندنەوە خراپە بۆ حەتمییەتی رووداوەکان زۆرێك لەپسپۆڕەکانیش کـە لـەو بـوارە کـار دەکـەن، بەشـداری تیـا دەکـەن. بێگومـان هـیچ کامیـان ئەوەنـدەی ئیـزاك دویـچەر لەگەشتی ژیانیدا پاساو بۆ ستالین ناهێنێتەوە، کەچی زۆرێکی دیبـان هـەر سـووربون لەسـەر ئـەوەی "کـارە بێبەزەییانەکـەی سـتالین هـەوڵی ئەفرانـدنی هاوسـەنگییەکی نـوێی هێـز بـو" (ئەرمیـستڕۆنگ، ل64)، بەمەبەسـتی دەسـتەبەر کردنـی "چارەسەرێکی دڵڕەقانە، بەلام یەکانگیر بەرامبەر بە هێندێك ململانێی سەرەکی لەئەفسانەی لینینیزمدا" (ریـچارد لوێنتـالْ لـە کتێبـە زۆر بـە نرخەکـەی "کۆمۆنیزمی جهانی، داڕوخـانی ئیمانێکی تۆکمە"، نیویۆرك، 1964، ل64). لەنێو پاشماوەی مارکسیزمیشدا ئاوارتەیەکی ناچیز هەیە لەبابەت ریچارد. ت. تاکر (ل27) کە زۆر راشکاوانە دەڵێت: "رژێمی سۆڤیێتی، بـەبێ پاکتـاوکردنی گـەورە، کـە لـە راسـتیدا پرۆسـەیەکی بـەرفراوان بـو بـە مەبەسـتی لێکترازاندنی کۆمەڵگەی سۆڤیێتی، بەهێزترو ئامادەتر دەیتوانی وەلامی مەینەتییە رەشەکانی جـەنگی سەرتاسـەری بداتـەوە" تـاکر پێیوایـە ئەمـەش وێنـای مـن لەسـەر تۆتالیتـاریزم دەڕوشێنێت، بەلام بەدیدی من ئەم مەسەلەیە بەباشی حاڵی نەبوە. لەراستیدا بێئۆقرەیی بەمەرجێکی سەرەکی وەزیفەی بالادەستی گشتگیر دەژمێردرێت، بالادەستییەك زیاتر لەسەر ئەفسانەی ئایدۆڵۆجیا بونیات نراوەو ئەوە دەردەخات کە بزوتنەوەیەکی جیاواز لە حیزب، دەسەلاتی گرتۆتە دەست. بەلام ئەو تایبەتمەندییەی ئەم رژێمەی پێدەناسرێتەوە، ئەوەیە قوربانی دەدا بەدەسەلاتی راستەقینەی، واتە هێزی مادیو خۆشگوزەرانی ولات لەپێناوی دەسەلاتی رێکخستندا ، رێك وەك ئەوەی رژێم بەخاتری بەرژەوەندی یەکانگیری ئایدیۆلۆجیا قوربانی بەهەمو راستیە بابەتییەکان دەدا. شـتێکی ئاشـکرایە لـە سـایەی ململانێـی نێـوان هێـزی مـادیو دەسـەلاتی رێکخستندا یـا لـەنێوان واقیعو خەیاڵدا، یەکـەم بـەقوربانی دووەم دەکـرا ، هـەروەکو لـە جـەنگی جهـانی دووەمدا لەروسیاو ئـەڵمانیا روویـدا. ئەمـەش بـەمانای بەهەند وەرنەگرتنی دەسەلاتی بزوتنەوەی تۆتالیتاری نیە. تیرۆر ئاتۆقرەییەکی بـەردەوام بـو بەشـداری لەرێکخسـتنی شێوازی ولاتـانی بلـۆکی سـۆڤیتدا کـرد، ئەمـە لەکاتێکـدا ئـۆقرەیی

لەئێستای روسیای سۆڤێتی و لیبرالییەتەکەیدا، بەشداریان لە بەرجەستەکردنی هێزی مادی ئیستایدا کرد، کەچی لەلایەکی دی، ئەو هێزەی لەچاودێریکردنی بلۆکدا لەدەستدا.

24ـ بڕوانە وردەکارییە گرنگەکانی (فینسود، پێشتر باسکراوە، ل 345ـ355) پەیوەست بەهەڵمەتی 1929، ئامانجی ئەو هەڵمەتە لابردنی "مامۆستا کۆنەپاریزەکان" بو، سەرباری نارەزایی ئەندامانی حیزب و لاوان . کۆمسۆمۆڵ .و خوێنکاران، ئەوانەی "هۆیەکیان بۆ گۆڕینی مامۆستا بەتوانا ناحیزبییەکان" نەدەبینی، بۆیە لەدوای ئەو نارەزاییانە، لیژنەی نوێ بەخێرایی کەوتە لێخوێندنی زۆرێك لەو توخمانەی ویژدانی چینایەتیان نەبو لەنێو رێکخراوەکانی خویندکاراندا. یەکێك لەئامانجە سەرەکییەکانی هەڵمەتی پاکتاوکردنی مەزن، ئاوەڵەکردنی دەرگای پیشەیی بو لەبەردەم نەوەی نوێدا.

25ـ ئەرمسترۆنگ ، پێشتر باسکراوە، ل319، پێیوایە گرنگی دەستێوەردانی مارشاڵ چوکۆڤ لەململانێی ناوخۆی حیزبدا "تا رادەیەکی زۆر زیادەڕەوی پێوەکراوە"،و سورە لەسەر ئەوەی خرۆچۆف " بەبێ پێویستیی بە دەستێوەردانی سەربازی سەرکەوت"، چونکە لەلایەن "حیزبەوە پشتگیری لێدەکرا. بەڵام ئەم قسانە لەسەر ئەرزی واقیع راست نەبون. بەڵکو پێچەوانەکەی راست بو، چونکە زۆرێك لەچاودێرە بیانییەکان بەهۆی ئەو پشتگیرییەی سوپا لەدژی حیزب پێشکەش بەخرۆچوفی کرد، بەو دەرئەنجامە نادروستە گەیشتن کە سەربازەکان بەردەوام لەسەر حیسابی حیزب پێیان لەسەر دەسەلاتی خۆیان دادەگرت، وەك ئەوەی یەکێتی سۆڤێت خەریك بو لەدیکتاتۆرییەتی حزبەوە دەگۆڕا بۆ دیکتاتۆرییەتی سەربازی.

26ـ هەمان سەرچاوە، ل320.

27ـ هەمان سەرچاوە، ل325.

28ـ هەمان سەرچاوە، ل339.

29ـ بڕوانە ڤ . ستانلی ڤاردیز "چارەنوسی کۆمارەکانی باڵتیك لە یەکێتی سۆڤێتدا"، گۆڤاری Foreign Affairs، نیسانی 1966

30ـ ئەرمسترۆنگ، ل235.

31ـ فینسود، ل56.

32ـ ئەرمسترۆنگ، ل236.

# بەشی یەکەم
# کۆمەڵگەی بێچین

"پیاوانی تەندروست نازانن هەمو شتێك لەتوانادایە"

داڤید روسیە

## 1 . جەماوەر

بەشێوەیەکی گشتی گرنگترین خەسڵەتی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، ئەوەیە کە ئەو بزوتنەوانە زۆر بەخێرایی لەبیردەچنەوەو بەسانایيش دەتوانرێت شتێکی دی لەجێگەیان دابنرێت، ئەم مەسەلەیە دەربارەی ناوبانگی ڕێبەرانی ئەو بزوتنەوانەش راستییەکی زۆرتری تیایە. ئەوەی ستالین لەماوەی چەندین ساڵ لەهەوڵدانی جدیو پڕ کێشمەکێشو ململانێیەکی توندی ناوخۆو خراپ بەکارهێنانی ناوی ڕێبەرەکەی پێش خۆی. واتە بەخشینی ڕەوایەتی بەخۆی وەکئەوەی میراتگری سیاسی لینین بێت. بەدەستی هێنابو، جێنیشینەکانی ستالین هەوڵیاندەدا بەبێ سودوەرگرتن لەناوی سەرکردەکەی پێش خۆیان بەدەستی بهێنن. لەگەڵ ئەوەشدا ستالین لەماوەی سی ساڵ حوکمڕانیدا، دەزگایەکی پروپاگەندەی گەورەی لەبەردەست بو، کەیارمەتی دەدا ناوو ناوبانگی بەنەمری بهێڵێتەوە، ئەو دەزگایەی لەسەردەمی لینیندا بونی نەبو. هەمان شتیش لەسەر هیتلەر پیادە دەبێت، چونکە بەدرێژایی ژیانی خۆی وادەردەخست مایەی شەیداییەکی ئەوتۆیە کە کەس ناتوانێت خۆی لەبەرامبەریدا رابگرێت[1]، بەڵام لەدوای تێکشانو مردنی بەتەواوەتی فەرامۆش کرا، تەنانەت لەنێو ریزی گروپە فاشیستو نازیزمە نوێیەکانی ئەڵمانیاشدا رۆڵێکی ئەوتۆی وازینەدەکرد. بێگومان سیمای ئەم ناپایەدارییە نەك هەر پەیوەندی بەپشتێکردنی جەماوەرو ئەو ناوروناوبانگەوە هەیە کە خۆی لەسەری راگرتبو، بەڵکو پەیوەندی بەجوڵەی بەردەوامی سەرشێتانەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکانیشەوە هەیە: بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، بەئەندازەی جوڵەو بەو ئەندازەیەی دەوروبەرەکەیان دەجوڵێنن، لەسەر کورسی دەسەڵات

دەمێننــەوە. بەدیوێکــدا، خــودی ئــەم ناپایەدارییــە، بەمانایــەك لــەماناکان، گەواهییــەکی وروژێنــەری بــەخۆنازینی ســەرکردە لەناوچــوەکانە، لــەوەی توانیویانــە ڤایرۆســی تایبــەتی تۆتالیتــاری لــەناخی رەعیەتەکــەیان بــچێنن و لەناویاندا بیتەنێننەوە، ئەگەر بوونی کەسایەتی تۆتالیتار یا هزری تۆتالیتار راست بێت، ئەوا وزەی نامۆیی خۆسازان و نەبونی بەردەوامی، بەدڵنیاییەوە دەبێتە دوو خەسڵەتی سەرەکی زاڵ لەکەسایەتی ناوبراودا. مرۆڤ هەڵە دەکات گەر پێی وابێت ناسەقامگیری و فەرامۆشکاری جەماوەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەفــەنتازیای تۆتالیتــار رزگــاری بــوە، کــە زۆرجــار لەگــەڵ پەرســتنی کەســێتی هیتلەر یا پەرستنی کەسێتی ستالیندا یەکدەگرێتەوە، رەنگە پێچەوانەی ئەم مەسەلەیەش راست بێت. هەروەها هەڵەی گەورەتر ئەوەیە مرۆڤ بەبیانوی ئەو ناپایەدارییــە لەبیربــچێتەوە کــە رژێمــی تۆتالیتــاری بەدرێــژایی حــوکمرانی و ســەرکردە تۆتالیتارەکــانیش بەدرێــژایی تەمــەنیان، تــا دوا ئەنــدازە "جــەماوەر پشتیوانیان لێدەکات"[2] بۆیە دەبینین هیتلەر بەشێوەیەکی یاسایی و بەپێی رێسای زۆرینــە بەدەســەلات گەیشت[3]، ئەگــەر هیتلــەرو ستالین رەزامەنــدی و متمانــەی جــەماوەرێکی زۆروزەوەنــدیان لەپــشت نەبوایــە، نەیانــدەتوانی رێبەرایەتی جەماوەرێکی بەرفراوان بکەن و بەرامبەر زۆرێك لەقەیرانی ناوەکی و دەرەکی خۆیان رابگرن. ئەگەر جەماوەر پشتگیری لەستالین و هیتلەر نەکردایە، روودانی دادخوازییە نمایشییەکانی مۆسکۆو هەڵمەتی پاکتاوکردنی "روهم . Rühm"یش لەتواناادا نەدەبو. لەم ناوکۆیەدا، ماوەیەك ئەو باوەڕە لەئارادا بو کە هیتلــەر کرێگرتەیــەکی پیشەساز کارەکانی ئەڵمانیا بوە، ئەوەی ستالینیشی لەشەڕی جێنشینی لینیندا سەرخست، پیلانێکی ئەگریسی پەتی بو. بەڵام ئەو دوو بیروباوەڕە ئەفسانە بون و زۆرێك لەواقیعەکان، بەتایبەتیش جەماوەری هەر دوو سەرکردەکە بەرپەرچیان دەدایەوە[4] هــەروەها ناتوانرێ ئەو جەماوەرەی کە هەیانە بدرێتە پاڵ ئەو سەرکەوتنەی کە هەڵمەتی پروپاگەندەی درۆزنانە بەدەستی هێنابو، ئەو پرۆپاگەندەیەی بەباشی دوانەی نەزانی و گێلێتی لێك

مـارەدەکرد. چـونکە هەڵمـەتی بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان ، هـەروەکو خوویـان پێوەگرتـوە، هێنـدەی فێڵبـازو درۆزنانەیـە، ئەوەنـدەش راشـکاوانەو بێپـەردە دەدوێـت، ئەمـە لەکاتێکـدا ئەوانـەی چـاویان لـە دیکتاتۆرییـەتی تۆتالیتـاری بڕیوە، بەشێوەیەکی گشتی بە شـانازی کردن بەتاوانەکانی رابردوی خۆیـان‌و بـەوردی باسـکردنی تاوانـەکانی ئاینـدەیان، دەسـت بەپیـشەکەی خۆیـان دەکەنەوە. نازییەکان "لەو باوەڕەدا بون کە شەڕەنگیزی ئەم سـەردەمە هێـزی راکێـشانی نەخۆشـی هەیـە"[(5)] دەربەسـتبونی بولـشەفیکەکان لـە دەرەوەو ناوەوەی روسیا لەسەر بەرەسمی نەناساندنی پێوەرە مۆڕاڵە باوەکان، ببو بە شـاوتاری پروپاگەنـدەی کۆمۆنیـست‌و چـەندین کـەڕەتیش بەتاقیکردنـەوە روونبۆتـەوە کـە بـەهای تاوانـەکانی راگەیانـدن‌و رقلێبونەوەیـەکی زۆریـان لـە پێـوەرە رەوشتیەکان، بەتـەواوەتی لەبەرژەوەنـدی پـەتی (بەرژەوەندی کەسـی) دابڕاوە، بەرژەوەندییەك کە وێنا دەکرێ چالاکترین‌و گرنگترین هۆکاری دەرونی سیاسەت بێت.

شەیدایی کوێرانە بەشەڕەنگیزی‌و تاوان لەزەینی خەڵکی هەرچی‌و پەرچیدا شتێکی نوێ نیە. زۆرجار دەرکەوتوە کە هەرچی‌وپەرچی "بەچاوی ستایشەوە تەماشـای کردەوەی توندوتیـژی دەکـات‌و دەڵێـت: هەرچـەندە ئـەوەش کـارێکی ناشایستەو ناشیرینە، بەڵام بەدڵنیاییەوە کارێکی زۆر بوێرانەیە"[(6)] هۆکـاری گرنگ لەسەرکەوتنی تۆتالیتاریزمدا خۆنەویستی راستگۆیانەی لایەنگرانێتی: هەرچەندە دەشێت مرۆڤ لەوە تێبگـات بۆچـی قەناعـەتی نـازی یـا بولـشەفیکێك لەقنابێت، کاتێك تاوان دەرهەق بەخەڵکانێك دەکرێ کە سەر بەبزوتنەوە نـین یـا دوژمنایـەتیان لەگەڵـدا هەیـە، بـەڵام ئـەوەی مایـەی سەرسـوڕمانە تەنانـەت نێوچاوانیش گـرژ ناکـەن، کاتێـك دێوەزمـە دەسـتدەکات بەراوکردن‌و کوشـتنی نەوەکانی خۆی، یا کاتێك خۆیشی دەبێتە قوربانی چەوسانەوەو تەنانەت لەو کاتەشدا کە بەناهـەق تاوانبـار دەکرێـت یـا لـەحیزب دەردەکرێت‌و بەرەو کاری قـورس یـا ئۆردوگـای گـرتن پـەلکێش دەکـرێ، دیـسانەوە توشـی بـەدگومانی

نابێت، بەڵكو بەپێچەوانەوە، ئەوەی دونیای شارستانی سەرسام دەكات، ئەوەیە كەئامادەیی تیایە یارمەتی تاوانباركارەكانی بداتو داوای لەسێدارەدانی خۆی بكات، بەمەرجێك ئەندامێتی لەبزوتنەوە لێنەسەنرێتەوە[7] رەنگە مایەی ساوێلكەیی بێت مرۆڤ پێی وابێت ئەو باوەڕە سەرسەختەی بەرامبەر بە هەمو ئەزمونێكی كردەیی خۆی راگرتو بەرژەوەندی تاكەكەسی پوچەڵ كردەوە، گوزارشتێكی پەتی لەئایدیایەكی بەپەرۆش دەكرد. هەر ئایدیایەك، چ مناڵانە بێت یا قارەمانانە، بەردەوام لەقەناعەتو بڕیاری شەخسییەوە سەرچاوە دەگرێو ملكەچی ئەزمونو بەڵگەهێنانەوە دەبێت[8]. دەمارگیریی بزوتنەوە تۆتالیتارییەكان، بەپێچەوانەی هەمو جۆرە ئایدیالیزمێك (المثالیة) لەساتەوەختێكدا لەناودەچێت كە بزوتنەوە واز لە لایەنگرە دەمارگیرەكانی دەهێنێتو پشتیان تێدەكات، هەروەها هەمو قەناعەتێك لەناخیاندا دەكوژێت كە رەنگە لەدوای شكستی خودی بزوتنەوەكەش هەر بمێنێتەوە[9] بەڵام ئەم هەڵوێستە لەچوارچێوەی بزوتنەوەیەكی سیستماتیكدا جیاوازی هەیە، چونكە تا بزوتنەوەكە خۆی رابگرێت، ئەندامە توندرەوەكانیشی نە لەرێگەی ئەزمونو نە لەرێگەی ئەرگیومێنتەوە بڕوایان پێی لەقنابێت، لەبەر ئەوەی ئاوێتەبونو ملكەچی رەهایان بۆ بزوتنەوە، هەمو جۆرە بەهرەیەكی دەرس وەرگرتن لەئەزمون لەمرۆڤدا لەنێودەبات، تەنانەت ئەگەر ئەو ئەزمونە لەقورسی ئەشكەنجەدان یا لەترسی مردنیشەوە بێت.

ئامانجی بزوتنەوە تۆتالیتارەكان رێكخستنی جەماوەر بوەو لەم كارەیشاندا سەركەوتوبون . بەپێچەوانەی حیزبە كۆنەكانەوە كە لەسەر بەرژەوەندی دامەزرا بونو گرنگیان بەچینەكان دەدا، زۆربەیان لەنەتەوە ئەوروپاییەكان دامەزرابون، هەروەها بەپێچەوانەی حیزبەكانی وڵاتانی ئەنگلۆ. ساكسۆنیشەوە كە گرنگیان بە هاوڵاتیانی خاوەن بەرژەوەندی دەدا، لەگەڵ كاریگەری رەئی گشتی لەسەر رەوتی كاروباری ناوخۆدا. هەر چەندە گروپە سیاسییەكان وابەستەن بەژمارەی

ڕێژەیی لایەنگرەکانیانەوە ، بەڵام تەنها بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پشت بەهێزی ژمارە دەبەستن، بەجۆرێك کە ڕژێمی تۆتالیتاری ئەستەمە لەو وڵاتانەی ژمارەی دانیشتوانیان کەمە، بتوانێت خۆی رابگرێت[10]، تەنانەت ئەگەر هەلومەرجێکی زۆر لەباریش بۆ ئەوجۆرە بزوتنەوانە هەبێت. لەدوای جەنگی جهانی یەکەم شەپۆلێك لە بزوتنەوەی نیمچە تۆتالیتاریو تۆتالیتاری، کیشوەری ئەوروپای گرتەوە، کە دژایەتییەکی توندی دیموکراسیان دەکردو پشتگیریان لەدیکتاتۆرییەت دەکرد، هەروەها بزوتنەوە فاشیزمەکانیش هەر لەئیتاڵیاوە تا بەنزیکەیی هەمو وڵاتانی ئەوروپای ناوەراستو رۆژهەڵاتی گرتەوە (لەکاتێکدا بەشی چیك لەچیکوسلۆڤاکیادا ئاوارتەیەکی بەرجەستەبو)، لەگەڵ ئەوەشدا، مۆسۆلینی دەستەواژەی "دەوڵەتی تۆتالیتاری" پێخۆش بو، بەڵام هەوڵی نەدا رژێمێکی تۆتالیتاری سەرتاپاگیر دامەزرێنێت[11]و تەنها بەسەقامگیرکردنی دیکتاتۆرییەتی تاك حیزبی قاییل بو. لەپێش جەنگی جهانی دوەمدا دیکتاتۆرییەتی ناتۆتالیتاری لەرۆمانیا، پۆڵۆنیا، وڵاتانی باڵتیك، مەجەرستان، پورتوگالو ئسپانیای فرانکۆ لەئارادا بو. بەڵام نازییەکان کە بەهەستی غەریزەییان لە جیاوازی نێوان ئەو دیکتاتۆرییانە تێدەگەیشتن، دەربارەی کەموکورتی هاوپەیمانە فاشیزمەکەیان زیادەرەویان لە راڤەکردنەکانیان دەکرد، کەچی سەرسامی راستەقینەیان بەرامبەر بەرژێمی بولشەڤی روسیا (بەحیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیاشەوە)، بەبێ کەموزیاد هاوتای رقلێبونەوەی رەگەزەکانی میللەتانی ئەوروپای رۆژهەلات بو[12] بەتەنها "ستالینی بلیمەت"، تاکە پیاوێك بو کە مایەی رێزو ستایشی هیتلەر بو[13] لەبەرامبەر ئەوەشدا ئەگەر تەماشای ستالینو رژێمەکەی بکەین، هەرچەندە بەئەندازەی رژێمی ئەڵمانیا، بەڵگەنامەی دروستمان لەسەریان نیە (رەنگە هەرگیز دەستیشمان نەکەوێت)، بەڵام لەگوتارەکەی خرۆچۆف لەبەرامبەر کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستدا تێدەگەین کە ستالین تەنها بڕواو متمانەی بەپیاوێك هەبوە، ئەو پیاوەش خودی هیتلەر بو[14].

ئەوەی گرنگ بێت، دیکتاتۆرە ناتۆتالیتارەکان لەهەمو وڵاتە ئەوروپییە بچوکەکاندا لەدوای بزوتنەوە تۆتالیتارەکانەوە سەریان هەڵدا: کەواتە، وادەردەکەوێت کە تۆتالیتاریزم ئامانجێکی زۆر بەرخواز (طموح) بوە، تەنانەت ئەگەر لەدوای ریکخستن و ئامادەکردنی جەماوەریشەوە دەسەڵات بگرێتەدەست، ئەوا بچوکی وڵات ئەو کەسانەی ناچار دەکرد کە خولیایی ئەوەیان هەیە ببن تۆتالیتار، لەگەڵ نەخشەی گونجاوتردا هاوئاهەنگی بنوێنن، وەك دیکتاتۆرییەتی چینایەتی یا دیکتاتۆرییەتی حیزب. لێرەشدا راستییەکی زۆر ساکار هەیە: ئەو وڵاتانە ژمارەی پێویستی مرۆڤیان نەبو تا رژێمێکی باڵادەستی گشتگیر دابمەزرێنن، هەروەها نەیشیاندەتوانی بەرگەی ئەو زیانە مرۆییە مەزنەبگرن کە لەمجۆرە حکومەتانە دەکەوێتەوە[15]. کاتێك ستەمگەرانی ئەو وڵاتە بچوکانە هیوابڕاو بون لەوەی کە بتوانن وڵاتانی فرە دانیشتوان داگیربکەن، ئیدی بۆ ئەوەی ئەو رەعییەتە کەمەش لەدەست نەدەن کە حوکمیان دەکەن، ناچاربون شێوازێکی تارادەیەك میانڕەو هەڵبژێرن.

لەبەر هەمان هۆ نازیزم تاپێش هەڵایسانی جەنگی جهانی دوەم و بڵاوبونەوەی لەسەرتاسەری ئەوروپا لەرادەی کۆنکرێتی و لەئاستی خوێنرێژیدا لە روسیای هاوتای دواکەوتوتر بو، بەڵکو خودی میللەتی ئەڵمانیاش ژمارەی دانیشتوانی ئەوەندە زۆر نەبو تا رێگە بەمجۆرە رژێمە بدات بەتەواوەتی گەشەبکات. لەراستیدا ئەڵمانیا تەنها لە حاڵەتی بردنەوەی شەڕدا، دەیتوانی رژێمێکی تەواو تۆتالیتار بەخۆیەوە ببینێت، تەنانەت لەو حاڵەتەشدا قوربانییەکانی ئەو حکومەتە تەنها "رەگەزە نزمەکان" نەدەبون، بەڵکو خودی ئەڵمانییەکانیش دەبوایە ئەو دەرئەنجامە تاڵە بچێژن کە هیتلەر خۆیی دایرشتبو[16] هەر چۆنێك بێت، لەدوای ئەوەی پەلامارەکانی رۆژهەڵات، جەماوەرێکی زۆروزەوەند و ئۆردوگای گرتن و قەڵاچۆکردنی بۆ ئەڵمانیا دەستەبەر کرد، ئنجا توانی رژێمێکی تۆتالیتاری راستەقینە دامەزرێنێت. (بەپێچەوانەوە، مەترسی رژێمی تۆتالیتاری بەشێوەیەکی ترسناك لە وڵاتە

ستەمگەرە تەقلیدیەکانی رۆژهەلات، لەبابەتی هیندو چین گەورەتربو، چونکە لەو ولاتانە ئامێرو سەرچاوەی کەرەستەی خاو بۆ ئەوەی بکرێت بەسوتەمەنی رژێمێکی بالادەستی گشتگیر لەبن نایەت، ئەو رژێمەی لە کەلەکەکردنی دەسەلات و لەناوبردنی مرۆڤ کۆڵ نادات، ئەو هەستە زاڵەی لەکن "مرۆڤی جەماوەریی" هەیە بەوەی بەکەڵکی هیچ شتێك نایەت . بەتەواوەتی لەئەوروپا دیاردەیەکی نوێ بو ، ئەوەش لەبێکاری خەڵکی و گەشەسەندنی دیموگرافییەوە سەرچاوەی دەگرت کەلەم 150 ساڵەی دواییەدا روبەروی بۆتەوە . لەئەنجامی چەندین سەدە لە بێبەها کردنی ژیانی مرۆڤ لەو ولاتانەدا رەواج و برەوی هەبوە). مرۆڤ ناتوانێت میانڕەویی حوکمکردن یا گرتنەبەری شێوازێکی کەم خوێناویتر لەدەسەلاتدا بۆ ترسێکی پەتی لەراپەرینی جەماوەر بگێڕێتەوە، بەڵکو کەمیی دانیشتوان هەڕەشەیەکی جدی لەبەردەم بالادەستی گشتگیردا پێکدەهێنێت. لەراستیدا رژێمی تۆتالیتاری، وەك رژێمێکی تایبەت بە بزوتنەوەی تۆتالیتاری لەحاڵێکدا دەشێت لەبار بێت کەجەماوەرێکی زۆرو زەوەندی لەبەردەست بێت یا بەبێ ئەوەی ببێتە مایەی کەمبونەوەیەکی ترسناکی دانیشتوان، بتوانرێت بەکاربهێنرێ.

لەهەر جێگەیەك جەماوەر هەبێت و لەبەر هەر هۆیەك لەهۆیەکان ئارەزویەکی زۆری رێکخستنی سیاسی تیا بەدیبکرێت، بزوتنەوە تۆتالیتارەکانیش ئەگەری بونیان هەیە. هوشیاربون لەئاست بەرژەوەندی هاوبەشدا جەماوەر یەکناخات و ئەو لۆجیکە چینایەتییە تایبەتەیشی نیە کە بەدواداچونی ئامانجی وردو دیاریکراوو قابیلی بەدیهاتن، گوزارشتی لێبکات. دەستەواژەی (جەماوەر) لەسەر خەڵکانێك پیادە دەبێت کە بەهۆی ژمارەیانەوە بێت یا بەهۆی کەمتەرخەمییانەوە یا بەهۆی هەر دوکیانەوە، ناتوانن بچنەریزی ئەو رێکخراوانەوە کە لەسەر بەرژەوەندی هاوبەش دامەزراون . ئیدی چ حیزبی سیاسی بێت، یا ئەنجومەنی شارەوانی یا رێکخراوی پیشەیی و سەندیکایی بێت. جەماوەر بەشێوەیەکی بەهێز لەهەمو ولاتێکدا هەیەو زۆربەی ئەوخەڵکە

بێلایەنــەش پێکــدەهێنێت کــە لــە رووی سیاســییەوە کەمترخــەمن، ئەوانــەی بەدەگمەن دەنگ دەدەن و ئینتمایان بۆ حیزبێك نیە.

ئەوەی دەسپێکی بزوتنــەوەی نــازی لەئەڵمانیا و بزوتنــەوە کۆمۆنیستەکانی ئــەوروپا لــەدوای ســاڵی 1930 جیادەکاتــەوە، ئەوەیــە کــە ئەندامــەکانیان لــەو جەماوەرە کەمتەرخەمەوە بۆ ناو ریزەکانیان رادەکێشا، ئەو خەڵکانەی لەلایەن تێکــرای حیزبــەکانی دی رەتدەکرانــەوەو لەبــەر گێــل و گــەوجێتی پــشتگوێ خرابون. سەرئەنجام زۆربەی ئەندامەکانیان لەو خەڵکانە پێکهاتبون کەپێشتر دەرفــەتیان نــەبو لەســەر گۆرەپــانی سیاســی بەدیارکــەون. ئەمــەش رێگــەی خۆشــکرد پرۆگرامــی نــوێ لــە بانگەشــەی سیاســی بەدەربکــەوێت و گــوێ بەبڕوبیانوی ئۆپۆزیسیونەکانیش نەدرێ، بۆیە ئەم بزوتنەوانە بەتــەنها خۆیــان لــەدەرەوەی شێوازو رەتکردنــەوەی ئــەو حیزبانــە نەدەبینییــەوە، بــەڵکو بــەرەو رووی زۆرێــك لــەو خەڵکانــەش چــون کــە هــەرگیز دەســتی حیزبــەکانیان پێڕانەگەیشتبو، ژیانی حیزبایەتی گەندەڵی نەکردبون. لەبەر ئەوەی بزوتنــەوە تۆتالیتارەکــان بەرپەرچــی بەڵگــەی ئۆپۆزیــسیونەکانیان نەدەدایــەوە، بــەڵکو لــەجیاتی باوەرپێهێنــان هەرەشــەی مردنــی سیــستماتیکی و لــەجیاتی قەناعــەت پێکــردن بــەزمانی تــیرۆر ئاخاوتنیــان دەکــرد. بانگەشــەی ئەوەشیان دەکــرد کــە جیاوازییــەکان لەسەرچــاوەی قــوڵ و سروشــتییەوە هەڵــدەقوڵێن و رەگوریــشەی کۆمەڵایــەتی یــا دەرونییــان هەیــەو لەلایــەن تاکەکــەس و لۆجیکــەوە چــاودێری ناکرێن. رەنگە لەحاڵەتی رازیبون بەپێشبڕکێی راستگۆیانەی نێوان حیزبەکانی دی، ئەم رەوشــەش ببوایــە بــەخاڵی لاوازبونیــان، بــەڵام نــەدەبوە خــاڵی لاوازیــان، چونکە دڵنیابون لەوەی سەروکاریان لەگەڵ خەڵکانیکدا هەیە کە بەڵگــەو هــۆی تایبەتی خۆیان بۆ دژایەتی هەمو حیزبەکانی دی هەیە.

ســەرکەوتنی بزوتنــەوە تۆتالیتارەکــان لــەنێو جــەماوەردا، زەنگــی کۆتــایی دوو وەهــم بــو، واتــە دیمکراســییەت بەگــشتی و بەشــێوەیەکی تایبــەتیش حکومــەتی نەتەوەیی و سیستمی حیزبایەتی لە وڵاتانی ئەوروپا. وەهمی یەکەم، پێیوابو نەبێ

زۆرینـەی میللـەت بەشـدارییەکی چـالاك لەحوکمـدا بکـەن و سـەرجەم تاکـەکان هاوسـۆزییان لەگـەل ئـەم یـا ئـەو حیزبـدا هـەبێت. بەپێـچەوانەشەوە، بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان نیـشانیاندا کـە ئـەو جـەماوەرەی لـەرووی سیاسـییەوە بێلایـەن و کەمتەرخەمـە زۆر بەئاسـانی دەتوانێـت لـە وڵاتێکـی دیموکراسـیدا ببێـت بەزۆرینـە: لەئەنجامدا، دیموکراسییەت دەتوانێت بەپێی ئەو رێسایانە کار بکات کە بەکردەوە تەنها کەمایەتی دانییپیادەنێت. وەهەمی دوەم کە بزوتنـەوە تۆتالیتارەکان بەتونـدی هێرشیان دەکـردە سـەر بێبایـەخ کردنـی جـەماوەر بـو، ئـەو جـەماوەرەی بەراسـتی بێلایەنـەو لـەژیانی سیاسـی نەتـەوەدا تـەنها تابلۆیـەکی سـەرەکی بێدەنگ و بێزمـان پێکـدەهێنێت. ئـەمرۆ، بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان شـتێك نیـشان دەدەن کـە هـیچ ئۆرگانێك لەو ئۆرگانانـەی رای گشتی پێکدەهێنێت، نـەیتوانیوە ئاشکرای بکـات: سیستمی دیموکراسی زیاتر پشت بە بێدەنگی پەسەندکردن و لێبوردن دەبەستێت کە توێژە کـەڕوڵاڵ و کەمتەرخەمەکانی دانیشتوان دەریـدەبڕن تـا پـشت بـە دەزگـا و رێکخـراوە دیـارو لەبەرچـاوەکانی وڵات ببەسـتێت. ئنجـا بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان ئەو رۆژەی پارلـەمانیان داگیرکـرد، سیـستمە دیموکراتـەکان تـەنها پەرچـەکردارێکی شلۆقیان پێشاندا: بزوتنەوە تۆتالیتارەکان توانیان قەناعەت بەزۆربـەی هـەرە زۆری دانیشتوان بێـنن کـە زۆرینـەی پارلەمانـەکان سـاختە بـوەو وەك پێویـست لەگـەڵ راسـتیەکانی وڵات گونجـاو نـەبوە، بـەوەش توانیـان لـە رێگـەی هـەمان دەزگـای سیـستمی دیموکراسـیەوە، شـکۆمەندی مرۆڤایـەتی و متمانـەی ئـەو رژێمانـە لەنێوبەرن کەبڕوایان بەرێسای زۆرینە هەبو.

زۆرجـار توێـژەران ئاماژەیـان بـەوە کـردوە کـە بزوتنـەوە تۆتالیتارییـەکان سودیان لەبزوتنەوە دیموکراسییەکان وەرگرتوەو لەپێناوی لەناوبردنی خـودی دیموکراسـیەتدا، زیادەڕەویـشیان کـردوە. بـەڵام ئـەم کێـشەیە پەیوەنـدی بەلێهاتویی ئەهریمەنانەی سەرکردەکان یا کاڵفامی مناڵانەی جەماوەرەوە نیـە. هەرچـەندە راسـتە ئازادییـە دیموکراسـییەکان لەسـەر بنـەمای یەکسانی نێـوان هەمو هاوڵاتیان بەرامبەر بەیاسا دامەزراوە، بەڵام مانا و ئەرکی ئۆرگـانیی خـۆی

وەرناگرێت تاوەکو هاولاتیان نەچنە ریزی ئەو گروپانەوە کە نوێنەرایەتیان دەکەن یا هەرەمێکی کۆمەلایەتی و سیاسی پێکنەهێنن. بەهەر حاڵ داڕوخانی سیستمی چینایەتی کە تاکە لقبەندی کۆمەلایەتی و سیاسی باوی نەتەوەکانی ئەوروپا بو، بەیەکێك لەروداوە کارەساتبارەکانی مێژوی نزیکی ئەڵمانیا دادەنرێ[18] هەروەکو چۆن ئەو داروخانە هەلێکی لەبارو گونجاوی دەسپێکی نازیزم بو، نەبونی لقبەندی کۆمەلایەتیش لەنێو ژمارەیەکی بێشوماری دانیشتوانی گوندنشینەکانی روسیا (ئەو جەستە زل‌و شل‌و شێواوەی لەهەمو پەروەردەیەکی سیاسی بێبەشەو هەر فیکرێکیش رەتدەکاتەوە کەشایانی گەورەیی کارکردن بێت) بۆ کودەتاکەی بولشەفیکەکان بەسەر رژێمی دیموکراسی کیرنیسکیدا زۆر پێویست بو[19]. بەلام ئەو هەلومەرجەی ئەڵمانیا کە بەر لەقۆناغی هیتلەر پێی تێپەری، بەڵگە بو لەسەر ئەو مەترسیانەی کە رۆژئاوا بەشێوەیەکی نادیار روبەروی دەبووە، لەگەڵ تەواو بونی جەنگی جهانی دوەمدا، هەمان داروخانی کارەساتبار لەسیستمی هەمو ولاتە ئەوروپاییەکاندا، هێشتا هەر دوبارە دەبووە، بەلام روداوەکانی روسیا زۆر بەڕونی ئاراستەی کودەتا شۆڕشگێرە حەتمیەکانی لە ولاتانی ئاسیا دیاریدەکرد. بەکردەوەش جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبو، بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پشت بەنەخشی نازیزم یا بۆلشەفیزم ببەستن‌و جەماوەر بەناوی رەگەز یا بەناوی چینەوە رێکبخەن، یا خۆیان واپێشان بدەن کە یاساکانی ژیان یا سروشت یا دیالکتیك یا ئابوری دەگرنەبەر.

کەمتەرخەمی بەرامبەر بەکاروباری گشتی و بێلایەنی لەبواری سیاسیدا، بەتەنها دوو مەرجی گەشەسەندنی تۆتالیتاریزم نین. کۆمەڵگەی بۆرجوازی، کە لەسەر پێشبرکێ و خاوەنداریێتی دامەزراوە، بوە مایەی دابڕان و تەنانەت ورووژاندنی دوژمنایەتیش بەرامبەر بەژیان، نەك لەناخی چینە کۆمەلایەتییە چەوساوەکاندا، ئەوانەی لەبەریوەبردنی چالاکانەی ولاتدا دوردەخرێنەوە، بەڵکو لەناخی خودی نەوەی چینی بۆرجوازیشدا هەمان کاریگەری هەبو.

لەدوای قۆناغێکی خاکی دوورودرێژی پڕ لە ساختە، چینی بۆرجوازی بەبێ ئەوەی هەوڵبدات حوکمی سیاسی بگرێتەدەست، وەك چینێکی بالأدەست مایەوە (ئارەزومەندانە فەرمانڕەوایی بۆ چینی ئۆرۆستۆکرات بەجێهێشتبو)، سەردەمی ئیمپریالیزم هات: لەم سەردەمەدا بۆرجوازی دەنگی لێبەرزکردەوەو دوژمنایەتی گەورەی لەدژی دەزگا باوەکان راگەیاندو دەستی کرد بەرێکخستنی ریزەکانی خۆیو داوای دەسەلأتی سیاسی کرد. دورەپەرێزیی لە رابردوداو سوربونی دواتری لە قۆرخکردنی دیکتاتۆرییەت لەسەر ئاستی بەریوەبەردنی کاروباری دەرەوەی نەتەوە، یەك رەگوڕیشەیان هەیە: شێوەو فەلسەفەی ژیان بەجۆرێکی زۆر دیاریکراو دەربارەی سەرکەوتن یا شکستی تاکەکەس لەکێبەرکێیەکی بێبەزەییانەدا تەوەرەی دەبەست، بەجۆرێك کەوا هەستدەکرێت ئەرکو بەرپرسیارێتی هاولأتیان تەنها کاتو وزە بەفیڕۆدانە. کەواتە وادەردەکەوێت ئەو هەڵوێستانەی بۆرجوازییەت سودێکی زۆر بەشکڵەکانی دیکتاتۆرییەت دەگەیەنێت، بەجۆرێك "کەسێکی بەتوانا" دەتوانێت بەرپرسیارییەکی پڕ لە دەردەسەری لەبەڕیوەبەردنی کاروباری گشتیدا لەئەستۆ بگرێت، ئەمەش بەربەستێکی راستەقینە لەبەردەم ئامانجەکانی بزوتنەوە تۆتالیتارەکاندا دروستدەکات کە هیچ جۆرە لێبوردنێکی بەرامبەر بەتاکگەرایی نیە، ئیدی بۆرجوازی بێت یا شتێکی دی. کەرتە گەوجو ناکاراکانی کۆمەڵگەی بۆرجوازی، چەند نەفرەت لەبەرپرسیارێتی مەدەنییان بکەن، هێشتا هەر بەکەسایەتی خۆیانەوە پابەند دەبن، چونکە لەحاڵەتێکدا کەسایەتی خۆیان دەدۆڕێنن، ئیدی هەمو هیوایەکی بەرگرییو خۆڕاگری لەنێو گێژاوی کێبەرکێی مانەوەدا لەدەست دەدەن.

کارێکی زۆر زەحمەتە مرۆڤ بتوانێت جیاوازییە قوڵەکانی نێوان رێکخراوە هەرچیوپەرچییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو نێوان بزوتنەوە جەماوەرییەکانی سەدەی بیستەم دەستنیشان بکات. لەراستیدا سەرکردە هاوچەرخەکانی تۆتالیتاریزم لەرووی دەرونییو عەقڵییەوە هیچ جیاوازییەکییان لەگەڵ

ڕێبەرانی هەرچیو پەرچی پێشودا نەبو، ئەوانەی تا رادەیەکی زۆر پێوانە ڕەوشتیو ڕێبازە سیاسییەکانیان لەپێوانەو ڕێبازی سەرکردە بۆرجوازییەکان دەچو. لەگەڵ ئەوەشدا، بەئەندازەی ئەوەی تاکگەرایی ڕێبازی بۆرجوازی جیادەکاتەوە، ڕێبازی هەرچیو پەرچیش دیاریدەکات، کەواتە بزوتنەوە تۆتالیتارەکان دەتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کە یەکەم حیزب بون دژایەتی بۆرجوازییان کردوە، بۆیە هیچ یەکێك لە سەرکردە بۆرجوازییەکان یا هەرچیوپەرچییەکانی سەدەی نۆزدەهەمو ڕێکخراوی دەیەمی کانونی یەکەم کە دەستیاری لویس ناپلیونی کردو نە هیچ یەکێك لەچەتە خوێنرێژەکانی مەسەلەی درایفۆسو نە چەکدارێکی کۆمەڵەی "سەد ـ ڕەش" ـ پۆگرۆم pogroms . بکوژانی یەهودییەکانی روسیاو نە سەرکردەیەکی بزوتنەوە راسیزمەکانی سلاڤیا یا راسیزمەکانی ئەڵمانیا، نەیانتوانی ئەندامەکانیان والێبکەن هەمو پێداویستیو ئارەزوە کەسایەتییەکانیان لەدەست بدەنو هەرگیز پێیان وانەبو هیچ ڕێکخراوێك بتوانێت شوناسی تاکەکەس، نە لەکاتی ئەنجامدانی کارێکی بەکۆمەڵی قارەمانانەو نە بەشێوەیەکی بەردەوام، لەنێوبەرێت.

بەهەق پەیوەندی نێوان کۆمەڵگەی چینایەتی سەرمایەدارییو ئەو جەماوەرەی لەداروخانی ئەم کۆمەڵگەیەوە پەیدا دەبێت، هەمان پەیوەندی نێوان بۆرجوازییو ئەو هەرچیوپەرچییانە نیە کە بەرجەستەی بەروبومێکی ئاست نزم دەکات لەبەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا . بەڵام جەماوەر لەیەك خەسڵەتدا لەهەرچیوپەرچی دەچێت، ئەویش هەردوکیان نامۆن بەلقبەندی کۆمەڵایەتی (التفریعات الاجتماعیە)و نوێنەرایەتی سیاسی دروست. هەرچیوپەرچیو جەماوەر میراتگری پێوەرو هەڵوێستی چینی بالادەست نین . هەڵبەتە بەشێوەیەکی ئاوەژو لەسروشتی بۆرجوازی . بەڵکو پێوەرو هەڵوێستی گشت چینەکان بەرامبەر بەکاروباری گشتی دەردەبڕنو دەیشێوێنن. بەهەر حاڵ پێوەری کەسایەتی مرۆڤی جەماوەری بەتەنها لەلایەن چینەکەی خۆیەوە

کەماوەیەك ئینتمای بۆی هەبوە، دیارینەکرێت، بەڵکو بەشێوەیەکی سەرەکی لەو بڕواو کاریگەرە ناهوشیارەوە سەرچاوە دەگرێ کە هەمو چینەکانی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ناوەکی (ضمني)و ئاماژەیی بەشداری تیا دەکەن.

ئەگەر چی ئەندامێتی لەچینێکی کۆمەڵگەی بۆرجوازیدا، سنورێکی داخراوو دیاریکراوی نیەو چەشنی پلەوپایەو چینەکانی کۆمەڵگەی فیودالیزم هەرگیز تاك لەرووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە دەستنیشان ناکرێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا لەسەر ئەو چینە ئەژمار دەکرێ کە تێیدا لەدایك دەبێتو تەنها ئامادەکاری ئاوارتە یا چانسو بەخت دەتوانێت بیگۆرێت. پێگەی کۆمەڵایەتی لەسروشتی بەشداری تاك لەسیاسەتدا یەکلایی دەکرێتەوەو جگە لەو بارودۆخەی مەترسییەکی نیشتمانی راستەقینە دروستدەکاتو تیایدا تاك ناچار دەبێت بەدەر لەئینتمای چینایەتی یا حیزبی وەك وڵاتپەروەرێك رەفتار بکاتو هەرگیز بەشێوەیەکی راستەوخۆ روبەروی کاروباری گشتی نابێتەوە، لەبەریوەبەردنی کاروبارەکانیشدا هەست بە بەرپرسیارێتی ناکات. کاتێك چینێك رۆڵێکی گرنگتر لە کۆمەڵدا وازیدەکات، هێندێك لەئەندامەکانی دەردەکەون، ئەوانەی شارەزاییان لەزانستو پەروەردەدا هەیە، بۆ ئەوەی سیاسەت بکەن پیشەو لەبەرامبەری ئەو پیشەیەشدا موچە وەربگرن (یا بەبێ موچە ئەگەر دەرامەتێکی تایبەت بەخۆیان هەبێت)، تا وەك پیاو ماقوڵی نوێنەرایەتی چینەکەیان بکەن لەپارلەماندا. بەڵام زۆرینەی میللەت لەدەرەوەی حیزبو هەمو ریکخراوێکی سیاسی جیاواز دەمایەوەو کەسیش گرنگی بەو مەسەلەیە نەدەداو هیچ چینێکیش ئەو مەسەلەیەی لەچینێکی دی بەجدی وەرنەدەگرت. بەدەستەواژەیەکی دی، ئینتما بۆ چینێك، لەگەڵ پابەندبون بە پەیوەندییە بەکۆمەڵو دیاریکراوەکانی ئەو چینەو هەڵوێستی نەریتانەی بەرامبەر بەسیاسەت، جۆرە هاولاتییەکی دەخستەوە، چ وەك تاکەکەسو چ وەك کەسایەتی، بەرامبەر بەحوکمرانی وڵاتەکەی هەست بە بەرپرسیارێتی

نەکات. ئەم خەسڵەتە ناسیاسییە کە سیمای دانیشتوانی دەوڵەتی نەتەوەیی پێدەناسرێتەوە، تەنها کاتێك گرنگی پێدرا کە سیستمی چینایەتی داڕوخاو لەگەڵ خۆیدا هەمو هێڵە بینراوو نەبینراوەکانی ئەو تۆرەی پچڕاند کە میللەت بەجەستەی سیاسیەوە دەبەستێتەوە.

داڕوخانی سیستمی چینایەتی بەشێوەیەکی میکانیکی بەمانای داڕوخانی سیستمی خودی حیزبایەتیش دێت، لەبەر ئەوەی ئەو حیزبانە زیاتر لەسەر بەرژەوەندی دامەزرابون، بۆیە نەیاندەتوانی نوێنەرایەتی بەرژەوەندی چینێك لەچینەکان بکەن. مانەوەی ئەو حیزبانە بوە مایەی بایەخی ئەندامانی چینەکانی پێشو بەوەی هیوایەك بۆ بەدەستهێنانەوەی پێگەی جارانیان پەیدابکەن، هەرچەندە هیوایەکی لاوازیش بێت، بۆیە کۆبونەوەیان لەبەر بونی بەرژەوەندی هاوبەش نەبو، بەڵکو بۆ ئەوەی پێگەی جارانیان بەتەواوەتی بەدەست بهێننەوە. دەرئەنجام حیزبەکان لەشێوازی پروپاگەندەیاندا زیاتر گرنگیان بەزانستی دەرونناسی و ئایدیۆلۆجیا دەداو لەچارەسەر کردنی کێشە سیاسیەکانیاندا زیاتر پاساویان دەهێنایەوەو ئارەزویەکی زیاتریشیان بۆ تاسەو سۆز هەبو. ئیدی ئەو حیزبانە بەبێ ئاگایی پاڵپشتی خەڵکە بێلایەنەکەیان لەدەستدا، ئەوانەی بایەخیان بەسیاسەت نەدەدا، چونکە پێیان وابو هیچ حیزبێك گرنگی بە بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان نادات، ئنجا یەکەم نیشانەی داڕوخانی سیستمی حیزبایەتی لەسەر ئاستی کیشوەری ئەوروپا جیابونەوەی ئەندامە کۆنەکان نەبو لەحیزبەکانیان، بەڵکو بێتواناییان بو لەوەی نەوەی نوێ بهێننە ناو حیزبەوە، لەگەڵ لەدەستدانی رەزامەندیو پشتیوانی بێدەنگی جەماوەری رێکنەخراو کە دواجار دورکەوتنەوەی خۆی لەحیزبەکان ئاشکرا کردو دەرفەتی گوزارشت کردنی ئەوەشیان بۆ رەخسا تا ئۆپۆزیسیونێکی توندوتیژی نوێ رابگەیەنن.

لەگەڵ داڕوخانی ئەو دیوارانەی چینەکانی دەپاراست، ئەو زۆرینە بێدەنگەی کە هێشتا لەسایەی حیزبەکاندا سەرخەویان دەشکاند، گۆڕدرا

بەجەماوەرێکی گەورەی بێقەوارەو تورە. ئەو زۆرینەیەی هیچ خاڵێکی هاوبەشیان لەنێواندا نەبو، جگە لە هوشیارییەکی لێڵ و نادیار کە هیواو ئومید بەئەندامبون لە حیزبەکانی دی کایەیەکی بێسودە، دەرئەنجام، لەروانگەی ئەوانەوە بەرێزترین و روناکبیرترین و بەتواناترین ئەندامیان لە نوێنەرایەتی کردنی کۆمەڵدا جگە لە خەڵکانێکی گێل و گەوج شتێکی دی نەبون، هەمو بەتواناکانیش نەك هەر بەدرەوشت بون، بەڵکو گەمژەو فێڵبازیش بون. ئیدی، مرۆڤ بەلایەوە گرنگ نەبو چۆن ئەم هاوکارییە نێگەتیڤە ترسناکە لەدایك دەبێ و بەچ جۆرێك ئەم واقیعە سەپێنراوەو هێزە بالادەستەکانیش بێزراوو نەفرەتلێکراوبون: وەك بێکارێك لەحیزبی سوسیال دیموکرات، موڵکدارێکی بچوك کە لە موڵکەکەی بێبەش کرابو لە حیزبی سەنترالیست یا حیزبی راسترەو، یا وەك ئەندامانی پێشوی چینە نێوەنجی و بالاکان لەحیزبی راسترەوی پەرگیری نەریتی. ژمارەی ئەو خەڵکەش کە بەگشتی لەدوای جەنگی جهانی یەکەمەوە، کلۆڵ و بێهیوا بون، هاوکات لەگەڵ هەڵئاوسان و بێکاری لەدوای شکستی سەربازی کۆمەڵگەی لێکدەترازاند، لەهەر یەك لە ئەڵمانیا و نەمسا زیادیان دەکرد. تەنانەت ئەگەر تەماشای ئەو دەوڵەتانەش بکەین کەپێش جەنگی جهانی یەکەم دروست بون، رێژەیەکی گەورەی لەو بابەتە لە هاولاتیانی دەبینری کە لایەنگیریان لەبزوتنەوە توندرەوەکان دەکرد، لەکاتی جەنگی جهانی یەکەمیشدا جەماوەرێکی زۆر بۆ نمونە لەفەرەنسا و ئیتاڵیا پشتیوانیان لەو بزوتنەوانە دەکرد.

سایکۆلۆجیای "کەسی جەماوەری" لەئەوروپا لەنێو کەشوهەوای داڕوخانی کۆمەڵگەی چینایەتیدا گەشەی دەکرد. ئەم واقیعە، بەشێوەیەکی یەکرەنگ، رۆتینی و ئەبستراکت بوە چارەنوسی هەمو تاکەکانی جەماوەر، ئەمەش نەبوە بەربەرستێك تا ئەو کەسانە خۆیان بەخەڵکانێکی دۆڕاو نەزانن و دونیاش بە دونیایەکی ستەمگەرو نادادگەر نەبینن. بەهەرحاڵ، ئەگەرچی ئەو

سەختی و دژوارییە ناخی زۆرێك لە تاكەكانی جەماوەری گرتبووەوە، بەلام پەیوەندییەكی هاوبەشی لەنێوان ئەو تاكانە دروست نەدەكرد، چونكە ئەو ئێشوئازارە لەسەر هیچ بەرژەوەندییەكی هاوبەشی ئابوری، كۆمەلایەتی و سیاسی دانەمەزرابو. دەرئەنجام، گۆشەگیری هاوكات بو لەگەڵ لاوازی ویست لەغەریزەی مانەوەدا، ئەمەش لە خۆنەویستییەوە بەدیار دەكەوێت، بەمانای ئەوەی بوون و نەبوونی تاك هیچ گرنگییەكی نەبێت و هەستكردن بەوەی مرۆڤ دەكرێ بەقوربانی، چیدی گوزارشتی لەئایدیای تاكەكەس نەدەكرد، بەڵكو دیاردەیەكی جەماوەرگەرا بو. تەنانەت ئەو وتە نەستەقەش كە دەڵێت هەژاران و چەوساوەكان جگە لەكۆت و پێوەندەكانی دەستیان شتێكی دی لەدەست نادەن، لەسەر مرۆڤی جەماوەری پیادە نەدەبو، لەبەر ئەوەی زیاد لەكۆتێكی بەدبەختییان لەدەست دابو، بەوەش سەرچاوەی هەمو دڵەراوكێ و غەموخەفەتێك كە ژیانی مرۆڤ پڕ لەدەردەسەری و تەنگوچەڵەمە دەكات، واتە وازهێنان لەخۆشگوزەرانی تایبەتی خۆیان، وشك دەبێت. بەرادەیەك ئەگەر پشتكردنیان لەسەروەت و سامان لەگەڵ ڕێڕەوی قەشەیەكی مەسیحی بەراورد بكەین، ئەوا دەبینین قەشەكە لە كاروباری ئەم دونیایەدا زیاتر ڕۆچوە. هیملەر Himmler بەتەواوەتی شارەزای عەقڵی ئەو كەسانە بو كە ڕێكیدەخستن، بۆیە بەم شانەی خوارەوە، نەك تەنها پیاوانی پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیای وەسفدەكرد، بەڵكو ئەو توێژە پانوپۆڕەشی وەسفدەكرد كە پیاوەكانی خۆی لەنێویاندا هەڵبژاردبو: ئەو كەسانە هەرگیز بایەخ بە"مەسەلەكانی ڕۆژ" نادەن، بەڵكو بایەخ بە"مەسەلەگەلێكی ئایدیۆلۆجی ئەوتۆ دەدەن كە دەیان و سەدان ساڵ بایەخیان دەمێنێت، بە جۆرێك كە كارمەندێكی دەستەی پاراستن.... تێدەگات هەوڵ بۆ ئەركێكی مەزنتر دەدا كە هەر دوو هەزار ساڵ جارێك نمونەی دوبارە دەبێتەوە"[20] كەڵەكەبونی ئەم ژمارە مەزنەی تاكەكان، بەپێی وتەكەی " سیسیل ڕۆدس" لەچل ساڵی ڕابردودا، عەقلییەتێك بەرهەمدەهێنێت كە كێشوەرو سەردەمەكان تێدەپەڕێنێت.

ژمارەیــەك لەبەرجەســتەترین فەیلەســوف و سیاســەتمەداری ئــەوروپی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە پێشبینی لـەدایك بونی "مرۆڤی جەماوەر" و ســەردەمی جــەماوەریان كردبــو. ســەبارەت بەپێــشینەكانیش (القــدماء) ئــەدەبیاتێكی زۆر دەربــارەی رەفتــارو ســایكۆلۆجیای جــەماوەر ئــەم چــەمكە ئاســایی و بــاوەی رونكردبــوەوە و یارمــەتی گــشتاندنی دابــو، زۆر بــەوردیش جیــاوازی لــەنێوان دیموكراســی و دیكتاتۆرییــەت و حــوكمی هەرچی وپەرچــی و ستەمگەری دیــاریكردبو. ئــەو نوســەرانە رێگــەیان لەبــەردەم هێنــدێك بیریــاری رۆژئاوایی خۆشكرد، ئەوانەی هوشیارییەكی سیاسی باش و هەستێكی مرۆیی بــەرزیان هــەبو، بــەبێ ئاگــایی كتــێبی فریودەرانــە دەربكــەن، ئەوانــەی گومــان لەراستیان دەكرێ، زۆریش رەشبین و توندوتیــژن. لەگــەڵ ئەوەشــدا، كاتێك ئــەو پێشبینیانە هاتنــەدی و دیــاردەی پیشبینی نــەكراو ئاشــكرابون، ئیــدی زۆرێــك لــەماناكانیان لەدەســتدا، وەك لەدەســتدانی تــەواوی گرنگیــدان بــە بەرژەوەنــدی كەســێتی[21]، كەمتەرخەمییــەكی تێكــەڵ بەگاڵتــەجاری و جاڕســی و بێــزاری بەرامبــەر بــەمردن یــا بەرامبــەر بــە بــەڵا و كارەســاتە شەخــسییەكانی دی، ئارەزویــەكی زۆر بــەوەی وێنــا هــەرە زەیــنی و ئەبستراكەكان بكرێــت بەرێسای ژیان و رقلێبونەوەیەكی تەواو لە هەمو رێسا عەقلیە دروستەكان.

بەپێــچەوانەی پێــشبینییەكانەوە، جــەماوەر نــە بەرهــەمی هەلومــەرجێكی یەكسانی گەشەكردو بو، نە بەروبومی گەشــەكردنێكی وشیاریی گشتیش بو، ئەمــە ســەرباری دابــەزینی ئاســتی زانــستی و ســاكاركردن و بەگــشتیكردنی ناوەرۆكەكەی. (ئەمریكا وێنەیەكی نمونەییە، بەجۆرێك هەلومەرجی كاركردن و ئاســتی فێربــون، لەگــەڵ گــشت كەموكورتییــەكانی لەهــەمو وڵاتێكــی دی ئــەم دونیایە كەمترین نوێنەرایەتی سایكۆلۆجیای جەماوەر دەكات). هــەر بــەزوویی ئاشــكرا بــو كــە خەڵكــە هــەرە وشــیارو گۆشــكراوەكان بەشــێوەیەكی تایبــەت ئاشنایەتی لەگەڵ بزوتنــەوە جەماوەرییەكان پەیــدا دەكــەن، چونكە تاكگەرایی

هەستیارو لێهاتو لەنێو جەماوەردا، نەك تەنها خودی خۆی وندەکات، بەڵکو زۆرجار کارئاسانیشی بۆ دەکات.

ئەم واقیعە حەتمییە ناموێیی و پێشبینی نەکردنی بەجۆرێك بو کەرەخنەگران دەیانگێڕایەوە بۆ سیمای نەخۆشیانە morbidityو هیچگەرایی nihilism لە بەرهەمی بیریارانی هاوچەرخ و مازۆچیزمی Masochism نمونەیی روناکبیران، یا جۆرێك لە ئاوەژویی (تعاکسی) نێوان رۆح و زیندەیی (حیوی)و "دوژمنایەتی نێوان رۆح و ژیان" لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بیریارانەی کە زیاد لە پێویست بێزرابون، نمونەیەکی زەق و قسەکەرێکی ئاشکراو راشکاوی دیاردەیەکی زۆر سەرتاپاگیرتر بون. بەئەتۆمبونی (Atomization) کۆمەڵایەتی و تاکگەرایی بەشێوەیەك پێش بزوتنەوە جەماوەرییەکان کەوتبون، دەبوە مایەی ئەوەی خەڵکانی بێسەروبەرو نارێکخراو، تاکی سەرچڵ و کەللەرەق، ئەوانەی رەتیاندەکردەوە دان بەرایەڵ و پەیوەندیو ئەرکە کۆمەڵایەتییەکاندا بنێن، بەرەو بزوتنەوە تۆتالیتارەکاندا بڕۆن، تەنانەت زۆر ئاسانترو خێراتر لەوەی حیزبە تەقلیدییەکان دەربارەی راکێشانی ئەندامە کۆمەڵایەتی و ناتاکگەراکانی تاقیکردبوەوە.

لەراستیدا جەماوەر لەدەسپێکی توێژە لێکترازاوەکانی کۆمەڵگەوە گەشەیدەکرد کە بونیادی پێشبڕکێکارو یەکێتی تاکگەرایی تەنها لەرێگەی ئینتمای چینێك لە چینەکان دیاردەکرا. بەڵام سیمای سەرەکی مرۆڤی جەماوەر دڵرەقی و دواکەوتویی (backwardness) نیە، بەڵکو گۆشەگیری و سستی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی تەندروست سیمای سەرەکی پێکدەهێنێت. ئەو جەماوەرەی لەکۆمەڵگەیەکی چینایەتی دەوڵەتی نەتەوەیی ئەوتۆوە گەشەیکردبو کە درزوکەلەبەرەکانی گەیشتبوە ئاستێك تەنها هەستێکی ناسیونالیستی توندرەو پێکەوەی دەلکاند، بۆیە شتێکی سروشتی بو لەیەکەمین ئەزمونی نائومێدی تازەیاندا، ئارەزویەکی ناسیونالیستی

توندرەوانەیان هەبێت، بەڵام سەرکردە جەماوەرییەکان بەپێچەوانەی غەریزەو ئامانجە تایبەتییەکانیان تەنها لەبەر هۆی دیماگۆگی رووت ملیان دابو[22]

ناسیونالیزمی خێڵەکی Tribal nationalism و هیچگەرای توندوتیژ نە لەرووی ئایدیۆلۆجییەوە کەڵکی بۆ جەماوەر هەبو، نە لەتایبەتمەندییەکانیشی بو، بەڵکو لەخزمەت و شایستەی هەرچیوپەرچی بون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، سەرکردە جەماوەرییە بەتواناکانی سەردەمی ئێمە تائێستاش زیاتر لەناوجەرگەی هەرچیوپەرچییەوە هەڵدەقوڵێن تا لەناوجەرگەی جەماوەرەوە سەرهەڵبدەن[23] گەشتی ژیانی هیتلەر باشترین نمونەی ئەم بوارەیە، ئەمە لەکاتێکدا ئەوەی لەسەر ستالین گرنگ بێت لەدەزگایەکی پیلانگێری حیزبی بولشەفیکەوە دەرچوە کە لە کەسانی خوێڕیو شۆڕشگێڕ پێکهاتبو. بەڵام حیزبەکەی هیتلەر لەبنەرەتدا بەتەواوەتی لەخەڵکانی نەگونجاو، دۆڕاوو سەرەڕۆ پێکهاتبون، بەراستی ئەو سوپایە نوێنەری "قەرەجە چەکدارەکان"[24] بو، کە جگە لەدیوی ئەودیوی کۆمەڵگەی بۆرجوازی شتێکی دی نەبو، هەر لەمروەشەوە، دەبوایە بۆرجوازی ئەڵمانیا بەباشترینو سەرکەوتوترین شێواز بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکاریان بهێنێت. لەراستیدا، نازییەکان بەتەواوەتی بۆرجوازی ئەڵمانیایان هەڵخەڵەتاند، هەروەکو باڵی " روهم . شلایخەر"یش لەلایەن سوپای ئیمپراتۆڕەوە فریودرا: بۆرجوازییەکان پێیان وابو کە هیتلەریان وەك عەرابێك بەکارهێناوە، یا تیمەکانی پۆلیسی ئەڵمانیا کەلە پێناوی هەڵمەتی پروپاگەندەی سەربازیو مەشقی بەرگریکردن سودیان لێوەرگرتون،دەبێ وەك کارگوزاری خۆیان تەماشایان بکەنو لەدامەزراندنی دیکتاتۆرییەتی سەربازیشدا دەستیارییان بکەن[25] ئەوانە بەگوزارشتە تایبەتەکانی خۆیانو بەپێی دەستەواژەی فەلسەفەی سیاسی تایبەت بەهەرچیوپەرچی تەماشای بزوتنەوەی نازیزمیان دەکرد[26] و پشتیوانی سەربەخۆو هەرەمەکی جەماوەریان لەسەرکردەی هەرچیوپەرچییەکان پشتگوێ دەخست، هەروەها لەدروستکردنی شێوەی نوێی ڕێکخستندا،

بایـــەخیان بـــەلێهاتویی ســـەرکردە راســـتەقینەکان نـــەدەدا. هەرچی وپەرچـــی بەحوکمی ئـەوەی داینـەمۆی جەماوەرە، هـەرگیز کرێگرتـەی بۆرجوازیی و هـیچ کەسێکی دی نەبو، بەڵکو تەنها کرێگرتەی جەماوەربو.

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان زیاتر پێویستیان بەهەلومەرجێکی تایبەت هەبو کە تیایـدا جـەماوەر پارچەپارچـەو لـێکترازاو بێـت، تـا کۆمەڵگەیـەکی جـەماوەری بێبونیـاد. ئەوحاڵەتـەش لـە بەراوردکردنی نـازیزمو بۆلـشەڤیزم بەتـەواوەتی بـۆ روندەبێتەوە کە لـە دوو هەلومـەرجی دوو وڵاتـی زۆر جیاواز سـەریان هەڵدابو. کاتێك ستالین لەپێناوی ئەوەی دیکتاتۆرییەتی شۆڕشـگێڕی لیـنین بەرژێمێکی تـەواو تۆتالیتـاری بگۆڕێـت، ناچـار بـو بەشـێوەیەکی دەسـتکرد کۆمەڵگەیـەکی گەردیلـەیی بخوڵقێنێـت، کەچـی هەلومـەرجێکی مێـژوویی لـە ئـەڵمانیا رێگـەی لەبـەردەم نازییـەکان خۆشـکرد بـۆ ئـەوەی دیکتاتۆرییـەتی تایبـەت بـەخۆیان دروست بکەن.

ســـەرکەوتنی ســـاناو سەرســـوڕهێنەری شۆڕشـــی ئۆکتۆبـــەر لـــە وڵاتێکـــدا بەدەســـت هـــاتبو کـــەبیروکراتی ســـتەمگەرو ســـەنتراڵیزم فـــەرمانڕەوایی بەســـەر جـــەماوەرێکی بێکەســـایەتیی و بێبونیـــادەوە دەکـــردو پاشمـــاوەی فیـــودالیزمی گونـدەکانو چـینی سـەرمایەداری تـازە پێگەیـشتوی شـاریش هێـشتا خۆیـان رێکنەخستبو. هەر ئەمـەش لینینـی والێکرد کە بڵێـت لـەهیچ وڵاتێکی دی ئـەم دونیایـە جگـە لـە روسـیا دەسـەڵات گرتنەدەسـت ئەوەنـدە سـانا نـەبوەو زۆر زەحمەتیش پارێزگاری لێدەکرێ، چونکە هەم لاوازی چینی کارگەری روسیای دەزانیی و هەم سیمای پڕ لەپشێوی وڵاتیش هەلومـەرجێکی کۆمەڵایـەتی لـەباری بۆ گۆڕانکـاری کتـوپڕ خولقانـدبو. لینین نـە غـەریزەی سـەرکردەی جـەماوەریی تیابو، نە گوتار بێژێکی ئاگرینیش بو، بەڵکو سوربو لەسەر ئەوەی بەئاشکراو لە بەرامبەر خەڵکیدا دان بەهەڵەکانیدا بنێتو شیتەڵیان بکات، ئەوەش لەگەڵ رێـسا دیماگۆگییـە بێناوەرۆکەکانـدا نـاکۆك بـو. بـەڵام هـەمو جیاوازییـەکی کۆمەڵایـەتی لـەبارو نیـشتمانییو پیـشەیی دەوڵەمەنـد کـرد کـە دەتوانێـت

بونیادێکی دیاریکراو بەکۆمەڵگەی روسی ببەخشێت و نەوەکانی نەتەوەش تەبەنی بکەن، هەروەها لەو باوەرەشدا بو کە سەرکەوتنی شۆرش پەیوەندی بەو جۆرە لقدارییەوە هەیە. لینین بەسەندنەوەی زەویوزار لەموڵکدارە گەورەکان، رەوایەتییەکی شەرەنگیزانەی بەجوتیاران بەخشی. بەوشێوەیە دەرفەتی ئەوەی بۆ لوا کە بۆ یەکەمین و دواهەمینجار لە روسیا چینێکی ئازاد لەجوتیاران دامەزرێنێت ، ئەو چینەی لەسەردەمی شۆرشی فرەنساوە تا ئەو ساتە وەختە تۆکمەترین کۆڵەکەی نەتەوە رۆژئاواییەکان بو. لینین هەوڵیدا پێگەی چینی کارگەرانیش قایمبکات بەوەی یەکێتی سەندیکای سەربەخۆ دامەزرێنێت. هەروەها بەرامبەر بەدەرکەوتنییێکی شەرمنانەی چینی مامنێوەندیش لێبوردەیی نیشاندا، ئەو چینەی بەری "ئابوری سیاسی نوێ" بو کە خودی لینین لەدوای تەواوبونی شەری ناوخۆ هێڵکاری بۆ کردبو. لەپاڵ ئەوانەشدا لینین تایبەتمەندی زیاتری هێنایە گۆرێ، بۆیە تا توانی پاڵپشتی لە رێکخستنی نەتەوەکان دەکرد، بەڵکو هێندێك جار داهێنانی تیا دەکرد، بەوەش هەستی نیشتمانی و وشیاری جیاوازی مێژوویی و کولتوری، تەنانەت لەنێو ریزی خێڵە سەرەتاییەکانی یەکێتی سۆڤێتدا زیاتر کرد. لەو شتانەی سەرەوەش ئەوەمان بۆ روندەبێتەوە کە لینین لەچارەسەرکردنی ئەو خاڵانەی پەیوەندییان بەلایەنی پراکتیکی سیاسەتەوە هەیە، زیاتر پێرەوی لە سروشتی سیاسیانەی خۆی دەکرد وەك پیاوی دەوڵەت تا ئەوەی پێرەوی لە بیروباوەری مارکسیزمانە بکات. بەهەر حاڵ، سیاسەتەکەی لینین ئەوە دەسەلمێنێت کە بەردەوام ترسی لە بێبونیادی کۆمەڵایەتی و بێبونیادی دی هەبوە تا ترس لە گەشەکردنی ئارەزوی نەفرەت لێکراو و ناپەسەندی نێو نەتەوە تازە رزگاربوەکان یا تەنانەت ترس لەدەرکەوتنی چینی بۆرجوازی نوێش لەنێو چینە تازە سەقامگیربوەکانی چینی نێوەنجی و جوتیاراندا. بێگومان لینین ئەو کاتە تامی گەورەترین شکستی چێشت کە لەگەڵ هەڵایسانی شەری ناوخۆدا، دەسەڵاتی باڵا کەوتە دەستی بیرۆکراتییەتی حیزب کە ئەو لەبنەرەتدا

دەیخواســـت لەدەســـتی ســـۆڤێتەکاندا چـــڕبێتەوە، بـــەڵام شـــوێنەوارە کارەساتبارەکانی ئـەو گۆڕانکارییانـەی سـەرەوە لەسـەر رەوتـی شـۆڕش، هـەر چۆنێك بێت، بەزەرورەت بەرەو تۆتالیتـاریزمی نـەدەبرد. دیکتاتۆرییـەتی تـاك حیزبـی تـەنها چینێکی نـوێی خسته پـاڵ چینەکانی دی وڵات کە لـە حاڵـەتی پێشکەوتندا بـو، ئـەوەش چینی بیرۆکراتـی بـو، کـە لـە روانگـەی رەخنـەگرە سوسیالیستەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبـەرەوە "دەوڵـەتی بەموڵکی تایبـەتی خـۆی دەزانـی"[27](مـارکس). بەهـەر حـاڵ لـەکاتی مردنـی لینینـدا هـیچ یـەکێك لـەو شێوازانە دانـەخرابو. شـکڵگرتنی چینەکانی کرێکـاران، جوتیـاران و نێوەنجی بـــەزەرورەت ئـــەو ململانـــێ چـــینایەتییەی لێنەدەکەوتـــەوە کـــە کۆمەڵگـــەی سـەرمایەداری ئـەوروپای پێدەناسرێتەوە، چونکە هێشتا کشتوکاڵ دەیتوانی لەســەر پایــەی سۆسیالیــستی، هــەرەوەزی یــا کــەرتی تایبــەت گەشــەبکات، هــەروەها ئــابوری میللــی، هێـشتا ئــازاد بــو لــەوەی پێــڕەوی لــە نەخــشەی سۆسیالیستی یا سەرمایەداری دەوڵەت یا چالاکی ئازاد بکات. هیچ یەکێك لەو دەستپێشخەرییانەش نەیدەتوانی خۆبەخۆ بونیادی نوێی وڵات لەناوبەرێت.

کەواتە کاتێك ستالین هەوڵیدەدا وڵات بەرەو رژێمێکی تۆتالیتار بەرێت، ئەو هــەمو چـین و نەتــەوە نوێیانــەی لەبەردەمــدا بــو. ســتالین بەمەبەســتی ئــەوەی کۆمــارێکی پارچــە پارچــەو بێناســـنامە دامــەزرێنێت، دەبوایــە پاشمــاوەی دەسەڵاتی سۆڤێتەکان لەناوبەرێت، چونکە وەك ئۆرگانێکی سـەرەکی نوێنـەری میللـەت، هێشتا رۆڵـی کاریگـەری لـە کۆمەڵگـە وازیـدەکردو بەربەسـتێکیش بـو لەبەردەم دەسەڵاتی رەهـای حیزبدا. هـەروەها بەمەبەسـتی لاوازکردنـی سۆڤێتە نیشتمانییەکان، شانەی بۆلشەفیکی دروستکرد، ئەو شانانەی تـەنها بەرپرسە پایەبڵندەکانی لیژنەی نێوەندی دەچـونە ریزەکانیانـەوە[28] لەسـاڵی 1930دا دواهـەمین شـوێنەواری دەزگـا کۆنـەکانیش لەبەینچو، ئەمـەش بـواری لەبـەردەم بیرۆکراتییـەتی سـەنترالیزمی تۆکمـە خۆشـکرد کـە لـە هـیچ شـتێکدا ئـارەزوی بەروسیکردنی لە ئارەزوی رژێمـی تـزاردا جیاواز نـەبو، جگـە لـەوەی بیرۆکراتـە

تازەکـان بەپێـچەوانەی بیرۆکراتییـەتی رژێمـی تـزاری ترسـی لەپـەروەردەو خوێندەواری نەبو.

کەواتـە، رژێمـی بۆلـشەفیکی پێـی نایـە قۆنـاغی لـەنێوبردنی چینەکانەوە، سەرەتا بەپاساوی ئایدیۆلۆجی و چینایەتی کەوتـە گیانی چینە موڵکدارەکان، واتـە چینی نێوەنجی نوێی شارەکان و جوتیارەکان. جوتیارەکان لەبەر زۆری ژمارەو توانـای داراییـان بـەتواناترین چینی یـەکێتی سـۆڤێتیان پێکـدەهێنا، لەبەرئـەوەش پێویـست بـو لـەناوبردنیان لـە لـەناوبردنی هـەمو گروپـەکانی دی کاملترو دڵرەقانەودڕێوانەتر بێت، بۆیە ستالین بەبیانوی سەندنەوەی زەویـوزار لەکۆلاکـەکان و بەهـەرەوەزی کردنـی زەوییـەکان لەرێگـەی برسـیکردن و راگواسـتنەوە کەوتـە پاکتـاوکردنی جوتیـاران. کارەکـان لەسـەر هـەمان شـێواز بـەردەوام بـو تاچـینی نێـوەنجی و چـینی جوتیـاران لەسـەرەتای سـییەکاندا بەتـەواوەتی پاکتـاوکران، ئەوانـەی لـەنێو ملیۆنـان کـوژراو یـا لـەنێو زینـدانیانی حوکمـدراو بـەکاری قـورس و راگوێزراوەکـانیش نـەبون، لـەوە گەیـشتبون " کـێ خـاوەن بریـارە" و دەیـشیانزانی ژیـانی خۆیـان و خێزانـەکانیان مـەرجی هاوڵاتیبونیـان نیـە، بـەڵکو کەوتبونـە بـەر بـەزەیی میزاجـی رژێمێـك کـە لەبەرامبەریدا، بەبێ یارمەتی ئەو گروپەی کە بەرێکەوت ئینتمایـان بۆی هـەبو، هەستیان بەتەنهایەکی رەها دەکرد.

بەهەرحاڵ، هیچ کەس ناتوانێت لەرێگەی ئامار یا سەرچاوەی بەڵگەنامەکانـەوە بـەوردی ئـەوە دەستنیـشان بکـات لـەچ ماوەیەکـدا بەهـەرەوەزیکردنی کـشتوکاڵ، چینێکی لەجوتیارانی نوێ زیندوکردەوە کە لەسـەر بەرژەوەنـدی هاوبـەش دامـەزرا بێـت، دیـسانەوە هـەر بـەهۆی زۆریـی ژمـارەو پێگـەی جیاکـاری لـەئابوری وڵاتـدا مەترسـییەکی نـوێی چـاوەروانکراو لەسـەر فـەرمانڕەوایانی تۆتالیتـاری دروسـتدەکات. بـەڵام ئـەو کەسـەی بتوانێـت بەشـێوەیەکی بـاش "سەرچـاوەی رەسمی" تۆتالیتار راڤەبکات، دەزانێت ئەو ماوەیـە دوو سـاڵ پێش مردنـی ستالین بو، کاتێك پێشنیازی هەڵوەشـانەوەی کۆلخۆزەکـانی کـرد تـا بەیەکـەی گـەورەتری

بگۆڕێت. بەڵام مردن بواری نەدا پلانەکەی جێبەجێ بکات. ئەمجارەیان رەنگە قوربانیەکان زۆر گەورەتر بوایەو ئاکامی ئابوریشی لەپاکتاوکردنی جاری یەکەمی چینی جوتیاران زۆر کارەساتبارتر دەبو. بەڵام شتێکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نیە ئاماژە بەسەرکەوتنی ئەم هەوڵەی ستالین بکات، هەرچەندە دڵەڕاوکێیەکی بەجێ لەم پێشنیازەشدا هەیە، چونکە لایەنێك دەتوانێت چینێك لەناوبەرێت، ئەگەر ژمارەی پێویست لەئەندامەکانی بکوژێت.

ئنجا لەنێوبردنی چینی کرێکاران دەستی پێکرد. کرێکاران وەك چینێك زۆر لەچینی جوتیاران لاوازتر بون و لەچاوئەوانیشدا بەرگرییەکی ناچیزیان کرد. لەراستیدا کارگەران لەکاتی هەڵایسانی شۆڕشدا دەستیان بەسەر کارخانەکاندا گرت، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو جوتیارانەی دەست بەسەر زەویوزارە کشتوکاڵییەکانیاندا گیرابو، هەر زوو لەلایەن حکومەتەوە، بەبیانوی ئەوەی دەوڵەت تەنها دەوڵەتی پرۆلیتارە، دەست بەسەر کارخانەکاندا گیرا. گشتاندنی سیستمی ستاخانۆڤی "Stakhanovite system" کە لە سەرەتای سییەکانەوە لەکارخانەکان پیادە کرابو، هەمو جۆرە هاوکاریو وشیارییەکی لەنێوان کرێکاراندا لەنێوبرد، یەکەم بەهۆی چاودێرییەکی دڕندانەوە، دوەم بەهۆی توندوتۆڵکردنی ئەو پەیوەندییە کاتییەی کە بنەماڵەی ئۆرۆستۆکراتی ستاخانۆڤی پێکەوە گرێدەدا، پانتایی کۆمەڵایەتی لەنێوان خۆیانو کارگەری ئاسایی لەپانتایی نێوان کارگەرانو ئیدارەی کارخانە توندترو گەورەتر کرد. ئەم پرۆسەیە تا ساڵی 1938 بەردەوام بو، واتە تا ئەو کاتەی تیانوسی تاکەکەس هێنرایە کارخانەکانەوە، بەوەش سەرجەم چینی کرێکاران بو بە سوپایەکی گەورەی کۆیلایەتی.

لەسەروی ئەو رێوشوێنانەشەوە پاکتاوکردنی ئەو کەسایەتییە بیرۆکراتانە ئەنجامدرا کە بەشدارییەکی بێوێنەیان لەجێبەجێ کردنی پاکتاوکردنەکانی پێشودا کردبو. ستالین لەساڵی 1936 تا 1938، واتە ماوەی دوو ساڵ، ئنجا لە ئۆرۆستۆکراتە ئیداریو سەربازییەکانی کۆمەڵگەی سۆڤیێتی رزگاری

بو، ئیدی هەمو بوارەکانی کۆمەڵگە، نوسینگە، کارخانە، دەستەی ئابوریو کولتوری، حکومەت، حیزبو نوسینگە سەربازییەکان، کەوتنە دەست خەڵکانی تازە، "نزیکەی نیوەی خەڵکە ئیداری، حیزبیو ناحیزبیەکان کەنارگیر کران"، پەنجا دەرسەدی ئەندامانی حیزبو "بەلانی کەمەوە (8) ملیون کەسیش"[29] پاکتاوکران.

هەروەها پاسپۆرتی ناوخۆش خرایە پاڵ ڕێوشوێنەکانی دی تا ئەو کەسانەی لەشارێکەوە ڕێگەیان پێدەدرێ بۆ شارێکی دی ئۆغر بکەن، ناونوس بکرێن بۆ ئەوەی لەنێوبردنی بیرۆکراسیەتی حیزب وەك چینێك بەتەواوەتی سەربگرێ. بەڵام سەبارەت بەبارودۆخی یاسایی، بیرۆکراسییەکانیش وەك فەرمانبەرانی دی حیزب، لەئاستی کرێکاراندا بو، بۆیە بیرۆکراسیەت بوە بەشێك لەو جەماوەرە بێشومارەی بەکاری قورس مەحکوم بون، پێگەو بارودۆخیان وەك چینێکی جیاکاری کۆمەڵگە بوە بەشێك لە رابردو. کاتێك هەڵمەتی پاکتاوکردن بەگەورە بەرپرسانی پۆلیس کۆتایی هات . ئەوانەی ڕێکخستنی پاکتاوکردنەکەیان لەعۆدە بو- ئیدی گەورە کادرەکانی دەزگای هەواڵگری روسیاش، ئەوانەی لە چاندنو ڕێکخستنی ترسدا رۆڵیان هەبو، نەیاندەتوانی لەوە زیاتر خۆیان فریو بدەن کە تیمەکەیان نوێنەری تاکە دەسەلاتی حوکمرانی وڵاتە.

بەڕاستی هیچ یەکێك لەو قوربانیە گەورانەی رۆحی مرۆڤ لە "لۆجیکی دەوڵەتدا" بەمانا دێرینەکەی وشە، بەڵگەیەکی گونجاوی نەبو. چونکە هیچ یەکێك لەو توێژە کۆمەلایەتییە پاکتاوکراوانە دژایەتی رژێمیان نەدەکرد، تەنانەت لەماوەیەکی چاوەڕوانکراویشدا پێشبینی ئەوەیان لێنەدەکرا دژایەتی رژێم بکەن. ساڵی 1930 کاتێك ستالین لە وتەیەکیدا لەبەردەم کۆنگرەی شازدەهەمینی حیزب رایگەیاند، هەمو لادانێکی چەپگەراو راستگەرا، لادانو سەرپێچی کردنە لەقانون، ئۆپۆزیسیۆنی رژێم بەشێوەیەکی کاراو سیستماتیك بوونی نەمابو، بۆیە ئەستەم بو ئۆپۆزیسیۆنێکی لاواز پشت بەهیچ چینێکی

ئەودەمەی کۆمەڵگەی روسی ببەستێت[30]. تیرۆری دیکتاتۆری . جیاوازی لەگەڵ تیرۆری توتالیتاردا هەیە، بەوەی تەنها هەڕەشە لەئۆپۆزیسیۆنی راستەقینە دەکات، نەك هاولاتی بێوەی یا ئەوانەی رەئی سیاسیان نیە. لەپێش مردنی لینینیشەوە، ئەوەندە توندو بەسام بو بەشی سەرکوتکردنی هەمو چالاکییەکی سیاسی دەکرد، ئیدی چ نهێنی بێت یا ئاشکرا. لەبەرامبەر ئەوەشدا، دەستێوەردانی بیانی کە هەوڵیدەدا هاوپەیمانی لەگەڵ یەکێك لەتوێژە کۆمەلایەتییە نارازییەکانی روسیا ببەستێت، مەترسی لەسەر دەوڵەت نەبو، ئەمە سەرباری ئەوەی رژێمی سۆڤێتی لەساڵی 1930ەوە لەلایەن زۆربەی حکومەتەکانی ئەودەمەوە دانپیانرابو، ئەمەش رێگەی بۆ خۆشکرد رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی، ئابوری‌و هی دی لەگەڵ ولاتانی دی ببەستێت (ئەو بارودۆخە یاساییە لەبارەی بۆ دەوڵەتی سۆڤێتی هەڵکەوت، ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی رژێمی ستالین هەمو توانایەکی دەستێوەردانی بۆ بەرژەوەندی خودی یەکێتی سۆڤێت، لەباربردبو. ئێمە ئەمڕۆ لەوە تێدەگەین ئەگەر هیتلەر داگیرکەرێکی ئاسایی بوایە، نەك فەرمانڕەوایەکی تۆتالیتاری پێشبڕکێکار، بەلایەنی کەمەوە، لەلایەن خەڵکی ئۆکرانیاوە پشتگیری لێدەکرا).

سەرباری ئەوەی لەنێوبردنی چینەکان لەرووی سیاسییەوە بێکەڵك‌و پوچ بو، بەلام بەمانای وشە لەسەر ئاستی ئابوری سۆڤێت کارەستبار بو. ئاکامی " برسێتی دەستکرد" لەساڵی 1933 تا سالانێکی دورودرێژیش لەسەرتاسەری ولاتدا هەستی پێدەکرا، هەروەها پیادەکردنی سیستمی ستاخانۆڤی لەساڵی 1935، لەگەڵ هەڵپەکردنی هەڕەمەکی لەبەرهەمهێنانی تاکەکەس‌و کەمترخەمی‌و رقلێبونەوەیەکی تەواو لەکارکردنی بەکۆمەڵ، "ناهاوسەنگییەکی شپرزەی" لەپیشەسازی تازەپێگەیشتوی روسیادا بلاوکردبوەوە[31] لەکۆتاییدا، لەئەنجامی پاکتاوکردنی بیرۆکراسی، واتە چینی بەڕێوەبەرو ئەندازیارانی کارخانەکان، دەزگا پیشەسازییەکانی ولاتی لەو ئەزمون‌و

شارەزاییە کەمەش بێبەشکرد کە پسپۆڕە تەکنیکییە تازەکانی روس پێیگەیشتبون.

هەر لەدێر زەمانەوە تا هەنوکە، یەکسانی نێوان هاولاتیان کەڵکەڵەیەکی سەرەکی رژێمە ستەمگەرو زۆردارەکان بوە، بەلام رژێمی تۆتالیتار تینوێتی بەو یەکسانیە ناشکێت، بۆیە هێندێك پەیوەندی کۆمەلایەتی ناسیاسی وەك پەیوەندی خێزانی و خەمی کولتوری، لەنێو هاولاتیاندا دەهێلێتەوە. ئەگەر تۆتالیتاریزم پێداویستییە تایبەتەکانی بەجدی وەربگرێت، دەبێ کارەکانی بگەیەنێتە پنتێك کە "بۆ هەتاهەتایە لەبێلایەنی گەمەی شەترەنج رزگاری بێت"، واتە لەهەمو چالاکییەکی سەربەخۆ رزگاری بێت. بەلام ئەوانەی دۆستایەتی "شەترەنج بەخاتری شەترەنج" دەکەن و پاکتاوکارەکانیان بەدروستی بەلایەنگرانی "هونەر بۆ هونەر"[32] بەراوردیان کردبون، هێشتا لەو کەسانە نەبون بەرامبەر بە کۆمەڵگەی جەماوەری بەرگرییەك نیشان بدەن، چونکە لێکچونی تەواوەتی جەماوەرێکی جیاواز یەکێك لەمەرجە سەرەکییەکانی تۆتالیتاریزم پێکدەهێنێت. لەدیدی سەرکردە تۆتالیتارەکانەوە، ئەو کۆمەڵگەیەی خۆی بەگەمەی شەترەج بەخاتری شەترەج سەرقاڵ دەکات، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ چینی جوتیاراندا نیە کە کشتوکاڵ بۆ خۆی دەکات، لەدوایشدا مەترسی لەو کەمتر نیە. لەم بارەیەوە پێناسەکەی هیملەر بۆ ئەندامی دەستەی پاراستن، وەك نمونەی مرۆڤێکی نوێ، لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا " کار بەخاتری خودی کار"[33] ئەنجام نەدات، بەتەواوەتی لەشوێن خۆیەتی.

بەئەتۆمیبونی کۆمەڵگەی سۆڤێتی لەرێگەی بەکارامەیی بەکارهێنانی هەڵمەتی پاکتاوکردنەوە هاتەدی، کەزۆرجار بەفیعلی پێش لەنێوبردنی گروپەکانیش دەکەوت. لەپێناوی ئەوەی هەڵمەتەکانی پاکتاوکردن هەمو پەیوەندییەکی کۆمەلایەتی و خێزانی تاکەکەسی تۆمەتبار لەنێوبەرێت، بەشێوازێك ئەنجامدەدرا کە هەرەشەی لەچارەنوسی تۆمەتبارو هەمو پەیوەندییەکانی دەکرد، لەناسیاوە

ئاسـاییەکانییەوە دەسـتی پێـدەکردو بـەهاوڕێو کەسـوکارە هـەرە نزیکـەکانی کۆتـایی دەهـات. ئاکـامی "گونـاهی هاودەسـتی" میکـانیزمێکی زۆر سـاکارو زیرەکانە بو، بۆیە کاتێك کەسێك تۆمەتبار دەکرا، ئیدی هـەمو هـاوڕێ دێرینـەکانی خۆیەخۆ دەگـۆڕان بـەدوژمنی سەرسـەختیو تـەنها بـۆ ئـەوەی خۆیـان رزگـار بکـەن راپـۆرتیـان لێیدەنوسـیو بەڵگـەی درۆی ئـەوتۆیان هەڵدەبەسـت کـەبوونی نـەبو تـا راستی راپۆرتەکەیان بسەلمێنن، ئەوەش تاکە رێگـەی سـەلماندنی بڕواو متمانـەی خۆیـان بـو. لەبەرامبـەر ئەوەشـدا، هـەوڵیان دەدا ئـەوە بسەلمێنن کـە پەیوەنـدییان لەگەڵ ئەو تاوانبارە یا هاوڕێیەتی کردنی تەنها بەمەبەستی سیخوڕیکردن بوەو بۆ ئەوەی خەبەری لێبدەن کـە تێکدەر، ترۆتسکی یـا سـیخوڕێکی بیـانی یـا فاشیسـت بـوە. لەبـەر ئـەوەی شایسـتەیی خـەڵکی "بـەژمارەی راپـۆرت نوسـین بـو لـەهاوڕێ نزیکـەکانی"(34)، بۆیـە شـتێکی بەڵگەنەویـستە مـرۆڤ بەوپـەڕی وریاییـەوە هـەنگاوبنێتو ئەوەنـدەی بـۆی دەکرێـت خـۆی لەهـەمو پەیوەندییـەکی شەخـسی بپارێزێت: مەبەست ئەوە نیە بیروڕا نهێنییەکانت، لەکن ئەوانی دی ئاشکرا بێت، بـەڵکو کارکردنـە بـۆ سـڕینەوەی (لەچوارچـێوەی ئـەو گریمانەیـەی بـڕوای بەحەتمییـەتی خەموخەفەتـەکانی ئاینـدە هەیـە) ئـەو کەسـانەی کـە رەنگـە بەرژەوەندییـەکی ناچیزیان لـە راپـۆرت نوسـیندا هـەبێت، بەڵکو راسـتتر، ئەوانـەی ئارەزوویـەکی زۆریـان لـە وێرانکردنـت هەیـە، چـونکە ژیانیـان بـە بـچوکترینو سـادەترین بیـانو دەکەوێتـە مەترسـییەوە. لـەدوا شیتەڵکاریـشدا، سـەرکردە بۆلـشەفیکەکان لەرێگـەی گەیانـدنی ئـەم تەکنۆلۆجیایـە بـەدوا سـنوری نائاسـایی خـۆی توانیـان کۆمەڵگەیـەکی ئـەتۆمیو لـێکترازاو دروسـت بکـەن کـە تـا هەنوکـە وێنەی نەبینراوەو گەورەترین کارەساتو روداوی مێژووش نەیتوانیوە ئەمجۆرە بارودۆخە بخوڵقێنێت.

بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان لـەو رێکخستنە جەماوەرییانـەوە دروسـتدەبن کـە خەڵکانی پەرشوبڵاوو گۆشەگیر لەخۆی دەگرێت، بـەڵام ئـەو خەسڵەتە دیارەی لەهەمو حیزبو بزوتنەوەکانی دی جیادەکاتەوە، دەبێ هـەر تـاکێکی تێکۆشـەر

دڵسۆزییەکی بێسنورو بێمەرج و نەگۆڕی بەرامبەر بەبزوتنەوەکەی هەبێت.
لەراستیدا سەرکردەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پێشئەوەی دەسەڵات بگرنە دەست کاریان لەسەر چەمکی دڵسۆزی کردوە. بەشێوەیەکی ئاسایی، بەر لەوەی رێکخستنەکانی وڵات بەکردەوە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتیان ئەو خواستانە گەڵاڵە دەکرێ، ئەوەش لەو بانگەشە ئایدۆلۆجییەوە سەرچاوە دەگرێ کە رێکخستنەکانیان لەکاتی گونجاوو دیاریکراودا توانای هەیە سەرجەم رەگەزی مرۆڤایەتی بگرێتەوە. لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوای تۆتالیتاری، بزوتنەوەی تۆتالیتاری ئامادەو فەراهەم ناکات (ئەم حاڵەتە بۆ روسیا دروستەو لەگەڵ ئەڵمانیای نازیزمیدا ناکۆکەو ناتەبا دەکەوێتەوە)، بۆیە پێویستە بزوتنەوەی تۆتالیتاری لەدوای جێگیربونی فەرمانڕەوای تۆتالیتاری رێکبخرێ و هەلومەرجی گەشەکردنیشی بەشێوەیەکی دەستکرد بخوڵقێنرێ، بەمەبەستی ئەوەی دڵسۆزییەکی تەواو . دڵسۆزی تاکوکۆمەڵ . لەتوانادا بێت، ئەوەش بنەمایەکی سەرەکی باڵادەستی گشتگیرە. ئەمە لەکاتێکدا دڵسۆزییەکی لەو جۆرە تەنها لەمرۆڤی تەواو گۆشەگیر چاوەڕواندەکرێ، مرۆڤێك لەهەمو پەیوەندییەکی خێزانی، برادەرایەتی، هاوڕێیەتی یا لەهەمودۆست و ناسیاوێکی داماڵرابێت و تەنها لەرێگەی ئینتمای بۆ بزوتنەوە یا حیزب هەستدەکات لەم جهانەدا جێگەیەکی هەیە.

وەلائی تەواو کاتێك لەتوانادا دەبێت کە سەرڕاستی و دڵسۆزی لەهەمو ناوەرۆکێکی هەستپێکراو (ملموس) پۆچەڵ بکرێتەوە، نەبادا لەئەنجامی گۆڕینی ناوەرۆك، بەشێوەیەکی سروشتی گۆڕانکارییەك لەجۆری وەلا بێتەئاراوە. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان هەر یەکەیان بەشێوازی خۆی تا ئەو شوێنەی لەتوانایدا بێت، خۆی لە بەرنامەی حیزبی رزگار دەکات، بەرنامەیەك کە ناوەرۆکێکی تایبەتی دیاریکراوی هەبێت و لەقۆناغەکانی پێش قۆناغی ناتۆتالیتاریەت بەمیراتی بۆی مابێتەوە. چونکە هەمو ئامانجە سیاسییە دیاریکراوەکان بەراشکاوی جەخت لەسەر مافی سەروەرێتی بەسەر جهاندا

راینەگەیەنێت، هەمو بەرنامەیەکی سیاسی چارەسەری کاروباری تایبەت بکات بەدەر بێت لە "لەو مەسەلە ئایدیۆلۆجیانەی کە دەبێتە جێی بایەخی نەوەکان"، ئیدی هەرچی چۆنێك درێژدادڕی لەبەیانەکانیاندا بکەن، بە بەربەستێك لەبەردەم تۆتالیتاریزم دەژمێردرێت. کاتێك هیتلەر سەرپەرشتی ڕێکخراوێکی بزوتنەوەی نازی دەکرد کە لەسەر بنەمای چەند پاڵنەرێکی ئاڵۆزو کەمێك لێکترازاو دامەزرابو، وەك حیزبێکی بچوکی نەتەوەپەرستی توندڕەو، دەیویست بزوتنەوەکە لەبەرنامەی پێشوی حیزب رزگار بکات، بەبێ ئەوەی بیگۆڕێت یا بەشێوەیەکی رەسمی لایبەرێت، بەڵکو زۆر بەسادەیی رەتیدەکردەوە لەسەری بدوێت، یا گفتوگۆ لەسەر زۆرێك لەوخاڵانەی بکات کە ناوەرۆکێکی تاڕادەیەك میانڕەو و شێوازێکی رازاوەو پڕ دەنگەدەنگیان هەیەو زۆر بەزوویی سەردەمیان بەسەر دەچێت[35] لەم بارەیەشەوە ئەرکی ستالین بەجۆرێك دژوارو ترسناك بو کە وێنا ناکرێت. چونکە ئەو بەرنامە سوسیالیستییە بیست و پێنج مادەیەی ئابوریناسێکی نەزان بەیارمەتی سیاسییەکی سەرلێشێواوی شێتۆکە[36] بۆ حیزبی بۆلشەفیکیان دانابو، بارگرانییەکی تاقەت پڕوکێن بو[37] بەلام ستالین لەدوای لەنێوبردنی باڵەکانی حیزبی بۆلشەفیك، ئەویش بەردەوام لەرێگەی گرتنەبەری هێڵی ماریێچ ئاسا لەحیزبی کۆمۆنیست و راڤەکردنەوەو بەرکارهێنانی لەرادەبەدەرو نابەجێی فۆرمەکانی مارکسیزم، بەهەمان دەرئەنجام گەیشت. دوبارەکردنەوەی بێسنوری نوسینەوەی مارکسییەت، بیروباوەری مارکسیزمی لە هەمو ناوەرۆکێکی پوچەڵ کردەوە، ئیدی نەدەکرا پێشبینی ئەوە بکرێ مارکسیزم مرۆڤ بەچ ئاقارو کردەوەیکدا دەبات. بۆیە باشترین شارەزایی پەیدا کردن لەمارکسیزم و لینینیزمدا هیچ رۆڵێکی لەسەر رەفتاری سیاسی نەبو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، تەنها دوبارەکردنەوەی وتەکانی شەوی پێشوی ستالین لەرۆژی دواتردا، نیشانەی پەیرەوی کردن بو لە پرۆگرامی حیزبدا، بەلام ئاکامی سروشتی ئەوەش بریتیە لەهەمان حاڵەتی باری مەعنەوی، هەمان گوێڕایەڵی قوڵ و خەمساردی هەر هەوڵێك کە تاکەکەس پێی هەڵدەستێت لەپێناوی پەیبردن بەو کارەی ئەنجامیداوە، ئەوەش

لەم چەند وشە داهێنراوەی هیملەردا دەردەکەوێت کە بەپیاوانی هەواڵگری خۆی دەوت: "شەرەڤ من، دڵسۆزی منە"[38]

نەبون یا لەبەرچاونەگرتنی بەرنامەی حیزب، نیشانەی تۆتالیتاریزم نیە. یەکەم کەس خودی مۆسۆلینی بو کە پێی وابو بەرنامەو پلانی سیاسی پارچە وەرەقەیەکی بێسودەو پەیمانێکی جارزکارە لەگەڵ شێوازی بزوتنەوەو دەسپێکەکانی یەکناگرێتەوەو فەلسەفە سیاسیە فاشیستیەکەیشی لەسەر چالاکیگەرا . النشاطوية . Activism .و سروش وەرگرتن لەخودی ساتەوەختی مێژوو بونیات نابو[39] سەبارەت بەنیازیش چلێسی دەسەڵات، تێکەڵ بەنەفرەتی (چەنەبازی)، زۆرجار لە تایبەتمەندێتی هەمو رێبەرانی هەرچیوپەرچی بوە، بەڵام لەگەڵ پێوەرەکانی تۆتالیتاریزمدا یەکناگرێتەوە. ئامانجی راستەقینەی فاشیزم تەنها دەسەڵات گرتنەدەستەو دەستەبژێری فاشیزمیش بێچەندوچون سەرکردایەتی وڵات بکات، ئەمە لەکاتێکدا تۆتالیتاریزم قاییل نابێت لەرێگەی ئامرازی دەرەکییەوە فەرمانڕەوایی بکات، واتە لەمیانەی دەوڵەتو بەپشت بەستن بەئامێری توندوتیژی، چونکە تۆتالیتاریەت بەهۆی ئایدیۆلۆجیا سەیرو بێهاوتاکەیو ئەو رۆڵەی لەدەزگای فشاردا وازیدەکات، ئامرازی کۆنترۆڵکردنو تیرۆرکردنی لەدەرونی مرۆڤدا ئاشکرا کرد. واتە ئەو ئامرازانەی سەرەوە هیچ پانتاییەك لەنێوان فەرمانڕەواو فەرمانبەر ناهێڵنەوەو سیستمێك بەدیدەهێنێن کە تیایە توانا و ئیرادەی توانا، هەروەکو ئێمە لێی تێدەگەین هیچ رۆڵێك وازیناکەن، یا بەتەنها رۆڵێکی لاوەکی وازیدەکەن. سەرکردەی تۆتالیتاری فەرمانبەرێکی جەماوەرەو رێبەرایەتیان دەکات، کەسێك نیە تینوی دەسەڵات بێتو بییەوێت ویستی ستەمگەریو هەرەمەکی بەسەر رەعیەتەکەیدا بسەپێنێت. لەبەر ئەوە سەرکردە تەنها فەرمانبەرێکە، بۆیە لەهەر ساتێکدا دەتوانرێت بگۆڕدرێتو یەکێکی دی لەجێگەی دابنرێت، بەهەمان ئەندازە کە جەماوەر پێوەی پەیوەستن، ئەویش

بەئیرادەی جەماوەرەوە پابەندە کەخۆی نمونەیەکی بەرجەستەیانە. جەماوەر بەبێ ئەو نمایندەیەکی دەرەکی نابێت و کۆمەڵە کەسێکی بێقەوارەو کەسایەتیان لێدەردەچێت، هەروەها بەبێ جەماوەریش سەرکردە کەسێکی ترۆیە. هیتلەر کە پەی بەو پەیوەندییە زیندوەی نێوان جەماوەرو سەرکردە بردبو، لەگوتارێکیدا بۆ پۆلیسی ئەڵمانیا ئەم حاڵەتەی بەمشێوەیە رایگەیاند: "ئێوە هەرچییەك بن، لەرێگەی منەوە هەن، منیش هەرچییەك بم، لەرێگەی ئێوەوە هەم"[40]

لەراستیدا ئارەزویەکی زۆرمان بۆ بەهەند وەرنەگرتنی ئەم لێدوانانە هەیەو بەهەق و ناهەق رەتیدەکەینەوە کارکردن بەپێی بریار دەرکردن یا جێبەجێ کردنی دیاریدەکرێ، هەروەکو زۆرجار لە نەریتی سیاسی و مێژووی رۆژئاوا رودەدا[41] ئەم بیرۆکەیە پێشتر بە بەردەوامی گەلاڵە دەکرا، بەوەی کەسێکی خاوەن فیکرو ویست لەسەنتەری سەرکردایەتیدا هەبێت، پاشان فیکرو ویستی خۆی بەسەر تیمێکی بێفیکرو ئیرادە لەرێگەی قاییلکردن، دەسەلات یا توندوتیژییەوە بسەپێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هیتلەر لەوباوەرەدا بو "خودی فیکر تەنها بەپێی دەرکردن و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان بونی هەیە"[42] کەواتە هیتلەر دەیویست تەنانەت لەبواری تیوریشەوە جیاوازی لەنێوان فیکرو کارو فەرمانرەواو فەرمانبەردا نەهێڵێت.

بزوتنەوەی سۆسیال ناسیونال و بۆلشەفیك هەرگیز دامەزراندنی سیستمێکی نوێیان رانەگەیاند، هەروەها ئەوەشیان بلاونەکردەوە کە بەدەسەلات گرتنە دەست و چاودێری کردنی دەوڵەت ئامانجەکانیان هاتۆتەدی. لەبەر ئەوەی بیرۆکەکەیان دەربارەی کۆنترۆڵکردن لەرێگەی دەوڵەت و دەزگای توندوتیژییەوە نایەتەدی، بەڵکو لە "جوڵەو جوڵەیەکی بەردەوام"، بەتایبەتی کۆنترۆڵکردنی هەمو قۆناغەکانی ژیانی یەکە بەیەکی تاکەکان دێتەدی[43] دەسەلات گرتنە دەست لەرێگەی توندوتیژییەوە ئامانج نیە، بەڵکو ئامرازێکی ئامانجە، چونکە دەسەلات گرتنەدەست لە هەر ولاتێکی ئەم جهانە قۆناغێکی

ئینتقالییەو پشتیوانی لێدەکرێ، هەرگیز کۆتایی ئامانجی بزوتنەوە نیە. ئامانجی کردەیی بزوتنەوە رێکخستنی زۆرترین ژمارەی خەڵکە لەچوارچێوەی رێکخستنەکانیداو بیانخاتە حاڵەتی جوڵەیەکی بەردەوامەوە، بەلام ئامانجی سیاسی لەسەر کۆتایی بزوتنەوە، زۆر بەسادەیی بونی نیە.

## 2. هاوپەیمانییەکی کاتیی لە نێوان هەرچی وپەرچی و دەستەبژێر

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان نەك تەنها بۆ هەرچی وپەرچی، بەڵکو بۆ دەستەبژێری کۆمەڵگەش مایەی سەرنج راکێشانێکی زۆر بون، بۆیە ئەم واقیعە بۆ ئێمە لەدڵسۆزیی بێچەندوچونی ئەندامانی ئەو بزوتنەوانەو پیشتیوانی جەماوەر لەرژێمە تۆتالیتارەکان دەردەناکترو تاڵتربو. جێگەی داخە بە بیانوی بودەڵەیی هونەرمەندان یا ساویلکەیی روناکبیران، ئەو لیستە سەرسوڕهێنەرەی گەورە پیاوان پشتگوێ بخرێ کە زۆرجار تۆتالیتاریزم بەلایەنگرانی خۆی و هاورێی خەبات و ئەندامانی حیزبی دەزانێت.

ئەم کێشکردنەی بزوتنەوە بەرامبەر بەدەستەبژێر، بەئەندازەی پەیوەندی ئاشکراو حەتمی نێوان هەرچی و پەرچی و بزوتنەوە، بەیەکێك لە کلیلە گرنگەکانی تێگەیشتن لەو بزوتنەوانە دەژمێردرێت (ئەگەرچی ئەم رەفتارە لەپێشئەوەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان دەسەلات بگرنە دەست راستی زیاتر تیایە تا دوای دەسەلات دەگرنەدەست). لەراستیدا ئەم شەیدایی و کێشکردنە کەشوهەوایەکی گشتی ئەوتۆ دیاریدەکات کە تۆتالیتاریزم تیایە گەشەدەکات. لێرەدا پێویستە ئەوەش وەیادبهێنرێتەوە کە سەرکردەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان و لایەنگرانیان لەو جەماوەرەی رێکیدەخەن، دێرینترن، بەجۆرێك کە جەماوەر لەرووی بەدواداهاتنی زەمەنییەوە، ناتوانێت چاوەروانییەکی زۆر بکێشێت تا سەرکردەکان لەناو جەرگەی کۆمەڵگەیەکی بودەڵەوە دەربکەون، کە خۆیان بەرچاوترین بەرهەمی ئەو کۆمەڵگەیە پێکدەهێنن. بەلام ئەوانەی

بەئارەزوی خۆیان کۆمەڵگەیان بەجێهێشت لە پێشنەوەی چینەکان داڕوخێن، ئامـادەبون بەهاوڕێیـەتی ئـەو هەرچی وپەرچـییانەی کـە نـزمترین بەرهـەمی حـوکمی بۆرجـوازی بـون، پێـشوازی لـەو جـەماوەرە بکـەن. تەنانـەت ئەگـەر ئـەمڕۆش تەماشـای سـەرکردە تۆتالیتاریـستەکان و سـەرکردەی بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان بکـەین، دەبیـنین هێـشتا خەسـڵەت و سـیفاتی جیاکـاری هەرچی وپەرچـی دەنـوێنن، ئەوانـەی شـارەزاییەکی تـەواومان لەسـەر دەرون و فەلسەفەی سیاسییان هەیە، هەرچەندە نازانین ئەگەر "کەسێکی جەماوەری" دەسـەڵات بگرێتەدەسـت چـی رودەدا، ئەگەرچـی رەنگـە پەیوەنـدی تونـدوتۆڵ و خاڵی هاوبەشی زیاتری بەوردەکارییە حیساب بۆ کراوەکەی هیملەرەوە هەبێت تـا دەمـارگیری هیـستریانەی هیتلـەر، هـەروەها زیـاتر لـە ساردیی مۆلۆتـۆفی سەرسەخت وخرف بچێت تا لەستالینی تاوانبارو کین لەدڵ و هەوەسباز.

لەمڕووەشـەوە، بـارودۆخی ئـەوروپای دوای جـەنگی جهـانی یەکـەم بەشێوەیەکی بنـەرەتی لەگـەڵ بـارودۆخی جـەنگی جهـانی یەکـەم زۆر جیـاواز نـەبو. لـە بیـستەکانی سـەدەی بیـستەمدا دارشـتن و رێبەرایـەتی کردنـی ئایدۆلۆجیا و بزوتنەوەکانی فاشیزم و بۆلشەفیزم و نازیزم لەلایـەن نەوەیەکـەوە بـو کـە پێـی دەوتـرا نـەوەی سـەنگەر، واتـە لەلایـەن خەڵکانێکـەوە کـە لـەپێش جەنگـدا گـەورە ببـون و بەشـێوەیەکی زۆر باشـیش ئـەو قۆناغـەیان لـەیادبو، هـەروەها سـەبارەت بـە ئـەمڕۆش، نەوەیـەك کەشـوهەوای گـشتی سیاسـی و کولتـوری تۆتالیتـاریزم، دیاریـدەکات کـە زۆر بـاش پـەی بەسـەردەمی پێشوی خۆیـان دەبـەن. ئەمـەش کتومـت بەسـەر فەرەنـسادا پیـادە دەبێـت، چـونکە داروخـانی سیـستمی چینایەتی لـەدوای جەنگی جهانی دوەمەوە رویـدا، نـەك جـەنگی جهـانی یەکـەم. رێبـەرانی بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان چەشـنی هەرچی وپەرچی و سەرچڵەکانی سـەردەمی ئیمپریـالیزم، لـەو راستیەدا لەگەڵ روناکبیرە لایـەنگرەکان خـاڵی هاوبەشـیان هەیـە کـە هـەردوکیان لـە دەرەوەی

سیستمی چینایەتی و نەتەوەیی کۆمەڵگەی ئەوروپای پێشکەوتو پێگەیەکیان هەبو، تەنانەت پێشئەوەی ئەو سیستمەش داروخێت.

کاتێك رێزگرتنی ساختە دەبێتە ئەڵتەرناتیڤی نائومێدی ئاژاوەگێڕی، ئیدی ئـەم داروخانــە دەرفــەتێکی کەموێنــە بــۆ دەســتەبژێرو هەرچی وپەرچـــی دەرەخــسێنێت. ئەمــەش کــارێکی حەتمییــە ســەبارەت ســەرکردە نوێکـانی جەماوەر، ئەوانەی بەپێی پیشەکەیان رۆڵی هەرچی وپەرچی سەردەمی رابردو وازیدەکـەن: شکـست و ناکـامی لـەژیانی پیـشەیی و کۆمەڵایـەتی، بودەڵـەیی و کارەسـات لـەژیانی تایبەتیـدا. لەکاتێکـدا سـەرکردە دیـارو بـەرێزی حیزبـە کۆنـەکان زۆر بەساویلکەیی ئاماژەیان بەژیانی پڕ لەشکستی ئەو سەرکردانە دەکرد لەپێـشئەوەی تێکـەڵاوی سیاسـەت بـن، هـەر خـودی ئـەو شکـستەش بـــەهۆکارێکی یەکلاکـــەرەوەی خۆشەویـــستی و پـــشتگیریی جـــەماوەرییان دەژمێـردرا. ئـەم راسـتیەش ئـەوە دەسـەلمێنێت کـە کەسـایەتی سـەرکردەکان چارەنوسی جەماوەری سەردەمەکەیان بەرجەستە دەکەن، ئارەزوی قوربانیـدان بەهـەمو شـتێك لـەپێناوی بزوتنـەوەدا، پـەیمان و بـەڵێنی وەفاداری بەرامبـەر بە قوربـانی کارەسـاتەکان، ورەی بـەرزو نـەگۆڕیان بـەوەی هـەرگیز بـۆ ژیـانی ئاساییان نەگەرێنەوەو رق و بێزاریان لەرێزگرتن، بەتەواوەتی لەراستگۆییانەوە بو، لەبەرخوازی راگوزەرییانەوە سەرچاوەی نەدەگرت.

لەلایـەکی دی، دەسـتەبژێر زۆر لـەو نەوەیـە لاوتـر نـەبو کـە ئیمپریـالیزم تـا رادەی زیادەڕەوی سودی لێوەردەگرتن، ئەویش لە رێگەی هاندانیان بەپیشەی پــڕ جۆش وخرۆشــی بــێ رێــزو بێسەنگ: قومـاربـازی، سـیخوری، سەرچـڵی، ئەسپسواری شمشێر بەدەستی بریقەداروقرتێنەرو ئەژدیها کوژەکـان. زۆر جار ئــەو خەڵکانــە وەك لۆرانــسی عــەرەب لــە "خــود وێرانکــردن" گوزارشــتیان لەئارەزوەکانی خۆیان دەکردو رقێکی زۆریشیان لەهەمو پێوەرو هێزە باوەکـان دەبوەوە، ئەگەر چی هێشتا یادی " رۆژانی ئاسودەیی زێرینیـان" دەکردەوە، بەڵام ئەوەشیان هەر لەیادبو کە چەند لەو هیواو ئاواتە بێزاربون، هـەروەها ئـەو

رۆژەی جەنگی جهانی هەلایسا، واقیعی پڕپەرۆش و جۆش وخرۆشی خۆیان نەشاردەوە. کاتێك لەساڵی 1914 رەشبگیری هەمو ئەورووپای گرتەوە بەتەنها هیتلەرو دۆڕاوەکانی وەك هیتلەر نەبون لەناخی دڵەوە سوپاسگوزاری خوداوەند بون[44]. ئەو خەڵکانە سەرزەنشتی خۆیان نەدەکرد کە چەند پارویەکی چەوری هەڵمەتی پروپاگەندەی نیشتمانپەرستی و راڤەکردنێکی درۆزنانە بون دەربارەی سیمای جەنگی بەرگری لەخۆکردن. کەواتە دەستەبژێر بەو هیوا مەستانەوە بەرەو جەنگ رۆیشت کە هەرچی شتێك دەزانن هەر لەکولتورەوە تا چنینی ژیان رەنگە لە " گێژەڵوکەی پۆلایین"دا لەنێوبچێت (ئەرنست یۆنگەر). بەپێی وشە دانسقە هەڵبژێراوەکانی "تۆماس مان" جەنگ جۆرێك لە "تۆبە"و "پاکبونەوە" بو، جەنگ "بۆ شاعیر زیاتر مایەی سروشبخەشە، نەك سەرکەوتن". بەپێی دەستەواژەی خوێندکارێکی ئەو سەردەمە "گرنگ ئەوەیە مرۆڤ هەمیشە ئامادەیی قوربانیدانی تیابێت"، یا بەپێی گوزارشتی کرێکارێکی گەنج "لای مرۆڤ وەك یەك وایە چەند ساڵێك زیاد یا کەم بژێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە پاساوێکی بۆ ژیان هەبێت"[45]. بەدڵنیاییەوە پێشئەوەی روناکبیرێکی نازی هەڵوێستی خۆی دەربرێت: "هەر جارێك گوێم لە وشەی کولتور بێت، دەمانچەکەم دەردەهێنم"، شاعیران بێزاری خۆیان لە " بودەڵەیی ئەم کولتورە" راگەیاندو لەسەر هەمان شێوازی شیعرییان دەیانوت "ئەی بەربەری، رەشپێست و سورپێست، ئێوە هەموتان کولتور بخەنە ژێر پێتانەوە"[46].

گوزارشت کردن لەو بێزارییە توندوتیژەی سەردەمی پێش جەنگ و هەوڵ وکۆششی ریفۆرمیستەکان (هەر لە نیچەو سۆرڵەوە بیگرە تا یۆنگەر، برێخت، مالرۆ، هەر لە باکۆنین و ناکاییڤ ەوە تا ئەسکەندەر بلۆك)، وەك نوقومبون لەهیچگەرایی، هاوتای لەبەرچاونەگرتنی ئەو واقیعەیە کە لە کۆمەڵگەیەکی ئاخنراو بەجهانبینی و پێوەری ئەخلاقی بۆرجوازی، نەفرەتکردن تاچەند دەتوانێت ئاراستەکراو بێت. بەڵام بەهەق "نەوەی سەنگەر" بەپێچەوانەی

ئامۆژگاری ڕێبەرە ڕۆحییەکانیەوە بەتەواوەتی ئارەزوی دەکرد جهانی ئاسودەگی ساختە، کولتوری ساختەو ژیانی ساختە بەچاوی خۆی ببینێت. ئەم ئارەزوە هێندە توندوبەهێز بو کە لە ڕاشکاویو دەنگدانەوەیدا هەمو هەوڵەکانی پێشوی تێپەڕاند، هەر لەهەوڵو کۆششەکانی نیچەوە بەگۆڕینی بەهاکان تا دەگاتە ڕێکخستنەوەی ژیانی سیاسی لەنوسینەکانی سوریڵو زیندوبونەوەی ڕەسەنایەتی مرۆۆ (باکۆنین)، یا شەیدایی و سەرسام بون بەژیان لەبێگەردی سەرچڵییە نامۆکانی رامبۆ. بۆیە وێرانکردنی بێبەزییانەو ئاژاوەو کاولکردنی گشتی پێشەنگی بەها باڵاکانی کۆمەڵگە بون(47)

ئەوەی دروستیی ئەو هەستە پشتڕاستدەکاتەوە، ئەوەیە کە ژمارەیەکی کەم لەنوێنەرانی ئەو نەوەیە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی واقیعانەدا جۆش و خرۆشیان لەئاست جەنگدا کز بو. ئەوانەی لەشەڕی سەنگەر ڕزگاریان ببو، خەڵکانێکی ئاشتی پەروەریان لێدەرنەچوبو، بەڵکو گیرۆدەی جۆرە ئەزمونێك بون کە پێیان وابو بەتەواوەتی لەدەوروبەرێکی نەفرەتاوی دوریان دەخاتەوە. ئەو کەسانە بەیادەوەری ژیانی چوار ساڵ سەنگەرەوە پابەندبون، وەکئەوەی هەمان یادەوەری پێوەرێکی بابەتی دەستەبژێرێکی نوێ پێکبیهێنێت. ئەوانەی تەنانەت کەڵکەڵەی ئەوەشیان لەمێشکدا نەبو ڕوویەکی ئایدیاڵ بەو ئەزمونە ببەخشن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، جەنگپەرستان یەکەم کەس بون کە پێیان وابو شەڕ لە سەردەمی ئامێردا ناتوانێت فەزیلەت، چەشنی ڕۆحی سوارچاکی، ئازایەتی، شەرەف و پیاوەتی بەرهەم بهێنێت(48)، جەنگ لەم سەردەمەدا تەنها ئەزمونی وێرانەییو هەستی سوکایەتیئامێز بەدیاری بۆ مرۆۆ دەهێنێ کە جگە لە دگانی زۆر بچوك لە دنگەی کوشتارگەیەکی مەزن شتێکی دی نیە.

ئەم نەوەیە جەنگ وەك دەسپێکردن و سەرەتایەکی مەزنی داڕوخانی چینەکان و گۆڕینی بەجەماوەر یاددەکاتەوە. جەنگ بەهەمو جەورو ستەمێکی خوێنرێژانەیەوە بوە هێمای مردن "یەکسانییەکی مەزن"(49)، لەدواییشدا بوە باوکێکی ڕاستەقینە بۆ سیستمێکی نوێی جهانی. بەهاکانی لەبابەت

سەوداسەری وەکیەکی و دادوەریو ئارەزوی تێپەڕاندنی سنوری تەسكو پۆچی چینایەتیو وازهێنان لەدەسکەوتو حوکمی پێشوەختی گەوجانە، لەجەنگدا ئامرازی رزگاری بو لە هەڵوێستی باوکانەی کۆن کە زۆرجار لەبەزەیی بەرامبەر چەوساوەو نەدارەکان بەدیار دەکەوت. لەرۆژگارێکدا کوێرەوەری تیایدا گەشەبکاتو نائومێدی تاکەکەس گەورەتر بێت، زەحمەتە مرۆڤ بەرگری لە بەزەییەك بکات کاتێك دەبێتە عیشقێکی دێوانەیی رێگر، بەئەندازەی ئەوەی مرۆڤ رەتیبکاتەوە خۆی بەهاولاتییەکی جهانی بزانێت، کە بەدڵنیاییەوە بەزەیی لە کوێرەوەری زیاتر کەرامەتی مرۆڤ دەکوژێت.

هیتلەر لە سالانی یەکەمی چالاکی سیاسیدا، کاتێك پەیبرد بەوەی کە چاککردنی بارودۆخی ئەوروپا (لەدوای جەنگی جهانی یەکەم) هەڕەشەیەکی زۆر جدی لە بەرخوازی هەرچیوپەرچی دەکات، لە زیندوکردنەوەی هەستی "ئەوەی سەنگەر" دەستوبردی کرد[50] خەمساردی مرۆڤی جەماوەری لەشێوەی ئارەزوییەك لە بێئاگاییو غافڵبون خۆی دەنواندو بەچەشنی ئامێرێکی ددانەدار کاریدەکرد، وەك ئارەزوییەکی بێخەوشی ئەوتۆ کە هەر گۆڕانکارییەك، گشت وەکیەکییەکی درۆزنانەو ئەرکێکی دیاریکراوی پێشوەخت لە کۆمەڵگەدا دەسڕێتەوە. جەنگ وەك "مەزنترین کاری جەماوەری" هەستی پێدەکرا کە هەمو جۆرە جیاوازییەکی تاکەکەس لەبەیندەبات، تەنانەت ئێشوئازاریش کە بەشێوەیەکی ئاسایی تاکەکان لەرێگەی چارەنوسی تایبەت بەتاك لەیەکتری جیادەکاتەوە، بەناوی " ئامرازی پێشکەوتنی مێژوو"[51] گوزارشتی لێدەکرا. بەلام ئەو جەماوەرەی کە دەستەبژێر تامەزرۆ بو پاش جەنگ تیایە نوقوم بێت، هەرگیز پەرۆشی جیاوازییە میللیەکان نەبو. شتێکی بێوێنە بو کە جەنگی جهانی یەکەم هەمو هەستێکی نیشتمانپەروەرانەی راستەقینەی لەبەینبرد، بەشێوەیەك کە لەنێوان هەر دوو جەنگی جهانیدا، پەیوەست بون بەنەوەی سەنگەرەوە گرنگتر بو تا پەیوەستبون بە ئەڵمانی یا فەرەنسیبونەوە[52] تەنانەت نازییەکانیش هەمو پروپاگەندەکانی خۆیان لەسەر

بنەمای هاوڕێیەتی بێسنورو بنەمای چارەنوسی هاوبەش راگرتبو، توانیان زۆرێك لە رێکخراوەکانی جەنگاوەرە دێرینەکانی ئەوروپا بۆ خۆیان رابکێشن و سەلماندیان تاچەند دروشمە میللیەکان بێمانا و پروپوچن، تەنانەت لەنێو ریزی "راستڕەوەکان" یشدا ئەو دروشمانەیان بەکاردەهێنا لەبەر ئەوەی مانای توندوتیژیی لەخۆ گرتبو تا لەوەی ناوەڕۆکێکی نەتەوایەتی تایبەتیان هەبێت.

لەم کەشوهەوا کولتورییەی ئەوروپای دوای جەنگ، هیچ رەگەزێك بەدیناکرێت کە بەتەواوەتی نوێ بێت. پێشتریش باکۆنین وتبوی :"من نامەوێت خۆم بم، بەڵکو دەمەوێت ئێمە بین"، ئەمە لەکاتێکدا نیچایڤ Nechayev مژدەبەخشی ئەنجیلی "مرۆڤی نەفرەت لێکراو" بو، مرۆڤێك کە "بەرژەوەندی کەسێتی، کاروباری تایبەتی، هەست یا پەیوەندی، موڵکداری، تەنانەت بەتەواوەتی ناوێکی تایبەت بەخۆیشی"(54) نیە. ئەوجۆرە غەریزانە لە دژی مرۆڤایەتی، لیبرالییەت، تاکگەرایی و کولتور بو، غەریزەگەلێك کە نەوەی سەنگەر وروژاندبوی، بەشێوازێکی پڕ دەنگەدەنگ و بەروح ستایشی توندوتیژی دەکردو هێزو دڵڕەقی بەرز رادەگرت. بەهەرحاڵ، پێشتر دەستەبژێری ئیمپریالیزم بەشێوەیەکی گەوجانەو پڕ لە ژاوەژاو، بەڵام "زانستیانە" سەلماندیان کە ململانێی گشت لەدژی گشت پرەنسیپێکی گەردونیە، فراوانخوازی پێشئەوەی ئامرازێکی سیاسی بێت، پێداویستییەکی دەرونییە، بۆیە دەبێت مرۆڤ گوێڕایەڵی ئەم یاسا گەردونییە بێت(55). شتی نوێ لەبەرهەمەکانی نەوەی سەنگەر بەرزیی ئاستی ئەدەبی و جۆش‌وخرۆشی قوڵی کارەکانیان بو. نوسەرانی پاش جەنگ سەبارەت بەزانستی جیناسی پێویستیان بە بەڵگەی زانستی نەبو، بەدەگمەن بۆ بەرهەمەکانی گۆبینۆ یا هۆستون ستیوارت چامبرلاین Stewart chamberlain دەگەڕانەوە کە سەر بەنێوەندی کولتوری نارۆشنگەری بون. بەرهەمەکانی مارکیز دوساد (56)- یان دەخوێندەوە نەك کتێبەکانی داروین. ئەگەر چی ئەوانە باوەڕیان بەیاسا جهانییەکان هەبو، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەرگیز بەپێی ئەو یاسایانە رەفتاریان

نەدەکرد. بەدیدو بۆچونی ئەوان، توندوتیژی، توانا و دڕندایەتی فەزیلەتێك بو بۆ ئەو کەسانەی پێگەی خۆیان لەدونیادا گومکردوە، بۆیە سەرسامی تیورەی دەسەلاتێك بون کە بەئاسودەیەکی رەها بۆ دونیایان بگێڕێتەوەو دوبارە پەیوەندیی پێوەگرێبدەن. ئەوانە بەبێ لەبەرچاوگرتنی تیورە یا ناوەرۆك، لایەنگرییەکی کوێرانەیان لەهەمو شتێك دەکرد کە کۆمەڵگەیەکی بەرێز ئەفەرۆزی دەکرد، دڵرەقیان تا ئاستی فەزیلەتێکی رەسەن بەرزدەکردەوە چونکە دژی هیومانیزم و لیبرالیزمی کۆمەلایەتی بون.

ئەگەر ئەم نەوەیە بە بیریارە ئایدیۆلۆجیستەکانی سەدەی بیستەم بەراورد بکەین، زۆر خاڵی هاوبەشی لەنێوانیاندا بەدیدەکەین و تەنها راستگۆیی و جۆش وخرۆشی ئەم نەوەیە جیاوازی سەرەکی نێوانیان پێکدەهێنێت. ئەو کەسانە لە ناخەوە توشی نائومێدی ببون، زیاد لەپێویستیش سەرقاڵی دڵەڕاوکێ و گومانی کاروبارەکان بون، لە ناخەوە زیاتر لەپیامبەرانی ویستی چاکەو برایەتی توشی پۆخڵەواتی ببون. نەیاندەتوانی لەدەستی نامۆیی رابکەن و لەتوانایشیاندا نەبو لەنێو گەلانی نامۆو هەوەسبازدا ببن بە "بکوژانی ئەژدیها". بۆیە راکردن لە نائومێدی، سوکایەتی پێکردن، چەپاندن و تورەبونی رۆژانە کارێکی ئەستەم بو، رۆتین و دۆگمای ئەم کولتورە ساختەیەش بە وشەی جیاکار دەرازایەوە، ئەگەر ئەو کەسانە بشتوانن مل بۆ نەریتی ولاتێکی سەیروسەمەرە بدەن، ئەوەش هەر لەو هێڵنجدانە بەردەوامە دوریان ناخاتەوە کە ئەم پێکهاتەیە هەمیشە سروشی پێدەبەخشی.

ئەم دەستەوەستانە لە دەربازبون لەدونیایەکی بەرفراوان و ئەو هەستەی وا لەخەڵکی دەکات بکەونە داوی کۆمەڵگەوە، زۆر جیاوازتر بو لەو هەلومەرجەی کە مۆرکی بە ئیمپریالیزم بەخشی، پشێویی بەردەوام و ئارەزوی توندوتیژی دەخستەپاڵ سەودای فەرامۆشی و خود گومکردن. رۆچونی ویست لە هێزی وێرانکاری بانمرۆڤ لە ئاوێتەبونی خۆبەخۆی پڕوپوچی ئەو ئەرکە کۆمەلایەتیە باوەی رزگار دەکات کە پێشوەخت دیاریکراوە، هەروەها بەشداری لە

وێرانکردنی کاری هەمان سیستمیش دەکات، مادامەکی ئەو خودە رۆچوە توانای گۆڕانکاریی ریشەیی لە رۆڵو سروشتی لەدەستداوە، وەك ئاوێتەبون لە بزوتنەوەی ناسیونالیستی عەرەبی یا سروتی گوندێکی هیندییە سورپێستەکان. بۆیە خەڵکی هەستیان دەکرد چالاکیگەرای بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بەرەو خۆی رایاندەکێشێت، چونکە بزوتنەوەکان لەلایەك لەسەر چالاکی، لەلایەکی دی لەسەر هێزی هەرە پێویست جەختیان دەکردەوە. ئەم ئاوێتە سەیرو نامۆیەش کتومت لە ئەزمونی جەنگی "نەوەی سەنگەر" دەچو، واتە ئەزمونی چالاکی بەردەوام لە چوار چێوەی چارەنوسێکی مەرگ هێندا.

هەر چۆنێك بێت ئەو چالاکیگەراییە وەڵامێکی نوێی ئەو پرسیارە دێرین و شپرزەکارانەی :"من کێم؟"ی دەدایەوە، کە لە کاتی قەیرانەکاندا زۆر بەتوندی گەلاڵە دەکرا. ئەگەر پێشتر کۆمەڵگە بەمشێوەیە پێی لەسەر وەڵامدانەوە دابگرتایە: "تۆ ئەوەی کە دەبێت بەرووکەش وابیت" چالاکیگەراکان لە دوای جەنگ بەمشێوەیە وەڵامیان دەدایەوە: "تۆ کردەوەکانی خۆتی"، بۆ نمونە ئەو پیاوەی (Charles Lindergh) بۆ یەکەمجار بەفرۆکە ئۆقیانوسی بڕی {لەشانۆگەری "فڕین بەسەر چیا خۆشمەزەکاندا" برێخت Der Flug der Lindburghs} . لەدوای جەنگی جهانی دوەم سارتەر بەشێوەیەکی ساکار ئەم وەڵامەی گۆڕی بۆ: "تۆ تەنها ژیانی خۆتی" (دانیشتنی نهێنی Huis Clos). بەلام بەهای گونجاوی ئەم وەڵامانە لە گرنگی دیاریکردنەوەی ناسنامەی کەسێتی نیە، بەڵکو دواجار رێگەی پێدەدا لە ئاوێتەبونی کۆمەڵایەتی و فرەیی ئەو ئەرکانە رابکات کە قابیلی ئاڵوگۆڕەو کۆمەڵگە دەیسەپێنێت. ئەوەی دەربارەی ئەو شتانە گرنگ بێت، ئەنجامدانی کارێکی قارەمانانە یا تاوانکارانەیە کە قابیلی پێشبینی نەبێت و تەنها ئەو کەسەی پێی هەڵدەستێت، دەتوانێت دیاری بکات.

چالاکیگەرای . Activism بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، کە تیرۆر بەسەر هەمو جۆرەکانی دی چالاکی سیاسی پەسەند دەکات، دەستەبژێری روناکبیران و

هەرچی‌وپەرچی وەکیەك بەلای خۆیدا راکێشا، چونکە ئەم تیۆرە جیاوازییەکی ریشەیی لەگەڵ تیرۆری تیمە شۆڕشگێڕەکانی پێشودا هەبو. تیرۆریزم بەتەنها سیاسەتی هەڵاوێردن نەبو، بەوەی کردەی تیرۆریستی تاکە ئامرازێکی لابردنی هێندێك کەسایەتی بەرجەستەی سیاسی بێت، ئەوانەی بەخاتری سیاسەتیان یا پێگەیان، بوبن بەهێمای سەرکوتکردن. ئەوەی سەرنجی ئەم نەوەیەی بەلاخۆیدا رادەکێشا ئەوەیە کە لە ئەنجامی رەنگدانەوەی حاڵەتی نائومێدی‌و رقوکینەیەکی کوێرانە، تیرۆر ببو بەجۆرێك لە فەلسەفە ، هەروەها جۆرێك لە سەرنجخوازی سیاسی کە خاوەنی وشەگەلێکی بۆمب ئاسا بو کە بەجۆش‌وخرۆشەوە چاودێری جاڕدانی کردەوە شکۆمەندەکانی دەکردو لەپێناوی ئەوەی کۆمەڵگەیەکی ئاسایی دان بەبونیدا بنێت، ئامادە بو گیانی خۆی بەخت بکات. هەمان رۆح‌و هەمان گەمە، گوبلزی هاندا لەپێش شکستی ئەڵمانیا بەماوەیەکی دورودرێژ بەدەنگێکی تێکەڵ بەچێژو خۆشی رابگەیەنێت، لەحاڵەتی شکست هێنانی نازیدا دەزانن چۆن دەرگاکان لەپشتی سەری خۆیانەوە بەجۆرێك دادەخەن کە مرۆڤایەتی تا چەندین سەدە لە بیریان نەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا، رەنگە بتوانین لە کەشوهەوای پێش توتالیتریزم پێوەرێکی شایستە بۆ جیاکاری لەنێوان دەستەبژێرو هەرچی‌وپەرچی بدۆزینەوە، ئەوەی هەرچی‌وپەرچی دەیخواست‌و گۆبلز زۆر بە وردی گوزارشتی لێدەکرد، گەیشتن بە مێژوو بو، ئەگەرچی بە بەهای خود وێرانکردنیش بێت. لە کەشوهەوای پێش تۆتالیتریزمدا قەناعەتی توندوتۆڵ‌و راستگۆیانەی گۆبلز: " مەزنترین خۆشبەختی کە مرۆڤی هاوچەرخ هەستی پێبکات، ئەوەیە کە خۆی بلیمەت بێت یا خزمەتکاری بلیمەتێك بێت"[57]، شایستەی هەرچی‌وپەرچی بو، نەك جەماوەر یا دەستەبژێری لایەنگری بزوتنەوە. بەپێچەوانەوە دەستەبژێر ئەوەندە باوەڕێکی پتەوو جدیان بە بەخشندەیی هەبو، نکۆڵیان لە بلیمەتی دەکرد. بەهەر حاڵ گشت ئەو تیورییە هونەرییانەی لە بیستەکانی سەدەی

بیستەم چاویان هەڵهێنابو، بێهودە هەوڵیان دەدا ئەوە بسەلمێنن، کە بەری هونەرێکی بەرجەستە، بەرهەمی لێهاتویی تەکنیكو لۆجیکەو توانای هێنانەدی مادەیان هەیە[58] هەرچی‌وپەرچی، نەك دەستەبژێر شەیدای "هێزی درەوشاوەی نێوبانگ" بون، (ستیفان زویگ . Stefan zweig) بەپەرۆشەوە بلیمەتپەرستی قبول دەکرد کە میراتییەکی جهانی بۆرجوازی بو. بەمشێوەیە هەرچی‌وپەرچی سەدەی بیستەم لەسەر شێوازی نمونەی سەدەی نۆزدەهەم دەرۆیشتن، ئەوانەی ئاشکرایان کرد کە کۆمەڵگەی بۆرجوازی "بەشێوەیەکی نائاسایی" دەرگای بۆ بلیمەت، دودەکیو یەهود خستۆتە سەرپشت، تا پێشوازی لە لێهاتویی ئاسایی بکات. رقی دەستەبژێر لە بلیمەتی، تینوێتی بۆ بەخشندەیی، لە رۆحێکەوە سەرچاوەی دەگرت کە جەماوەرو هەرچی‌وپەرچی درکیان پێی نەدەکرد، ئەو رۆحەی بەپێی وتەکەی رۆبسپیر مەزنی مرۆڤ لە ئاست بچوکی گەورەکان پشتراست دەکاتەوە.

سەرباری ئەو جیاوازییەی نێوان دەستەبژێرو هەرچی‌وپەرچی، کەچی دەستەبژێر بەبێ دودڵی شادمانو خۆشحاڵ دەبو بەوەی کە دزەکان لە کۆمەڵگەیەکی پێشکەوتودا لەرێی تیرۆرەوە وەك خۆیان بە یەکسانی قبوڵ دەکرێن. دەستەبژێر پێیوانەبو وێرانکردنی شارستانێتی نرخێکی زۆر قورسە بۆ ئەو کەسانەی لە رابردودا بەناهەق دورخراونەتەوە تا لەرێگەی بەکارهێنانی هێزەوە ماف خۆیان وەربگرنەوە، لە بینینی ئەوەشدا چێژیان وەردەگرت. ئەوانە، هەرگیز تورە نەدەبون کە دەیانبینی رژێمە تۆتالیتارەکان لەمێژوودا ساختەکاری ترسناك ئەنجامدەدەنو ئەو ساختکارییە ئاشکرایەی مێژووش بەخراپی لە راگەیاندنەکانیان بەکاردەهێنن. بەهەرحال ئەو رژێمانە قەناعەتی تەواویان بەوە هەبو کە دارشتنی مێژووی کلاسیکی، مێژوویەکی ساختەی تەواوە، بەوەی خەڵکە هەژارو ستەمدیدەکانی لە یادەوەری مرۆڤایەتی ئاوارتەکردوە. ئەوانەی سەردەمەکەیان رەتیکردبونەوە، لەمێژوودا لەیادچوبونەوە. لەو ساتەوەختەی ئیمان بەجهانێکی دی نەمابو، ئەو ستەمەی

له سوکایەتی بیرچونەوە زیاتر بو، ویژدانی هەستیاری دەهەژاند. لەراستیدا کاتێك هەمو هیوایەك بەهاوسەنگی تەرازوی دادپەروەری لەنیودەچێت، ستەمی رابردو، چەشنی ستەمی هەنوکە لەتوانابەدەر دەبێت. هەوڵ و کۆششەکانی مارکس بۆ نوسینەوەی مێژووی جهان لەسەر بنەمای ململانێی چینایەتی، تەنانەت ئەو کەسانەشی بەلای خۆیدا راکێشا کە باوەڕیان بەدروستی تێزەکەی نەبو، چونکە نیازی ئەسڵی مارکس دۆزینەوەی شێوازێك بو تا لەرێگەی ئەو شێوازەوە سەرگوزشتەی ئەو کەسانەی مێژووی رەسمی فەرامۆشی کردبون، نەقشێکی لە یادەوەری نەوەکانی ئایندەدا هەبێت.

هاوپەیمانێتی کاتیی نێوان دەستەبژێرو هەرچی‌وپەرچی زۆرجار لەسەر ئەو چێژە راستەقینەیە بونیات نرابو کە دەستەبژێر لە رێگەی هەرچی‌وپەرچییەوە تەماشای وێرانکردنی کۆمەڵگەی پێشکەوتوی دەکرد. ئەوەش کاتێك دەهاتەدی کە سەرکارەکانی پۆڵا Barons بەناچاری مامەڵەیان لەگەڵ هیتلەر دەکردو بە بانگهێشتەکانی رازی دەبون، واتە لەگەڵ هەمان ئەو کەسەی کە پێشتر بەئارەزوی خۆی وازی لەوەزیفە هێنابێت و بیەوێت لەرێگەی وێنەکیشانی بیناوە ژیان بگوزەرێنێ. هەروەها رەنگە لەرێگەی فێڵ و گزی و کردەی ساختەکاری ئاشکراو بازاڕییشەوە (سوقی) بێتەدی کە بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لە هەمو بوارەکانی ژیانی کولتوریدا ئەنجامیان دەدا، ساختەکارییەك کە بتوانێت هەمو رەگەزە پروپوچ و ناشایستەکانی مێژووی ئەوروپا لە تابلۆیەکی زۆر بەرجەستەو گونجاودا دابنێت.

تەنانەت ئەگەر کاروبارەکان لەو ئاستەشدا سەقامگیر بوایە، ئەوا دیسانەوە ئەو کەسانە چێژیان لەوە وەردەگرت کە دەیانبینی بۆلشەفیزم و نازیزم دەستیان بە لابردنی سەرچاوە ئایدیۆلۆجییەکانیان کردوە، ئەو سەرچاوانەی لەلایەن نێوەندە رەسمییەکان و زانکۆو شوێنەکانی دی رێزو بایەخیان پەیداکرد بو. بەڵام ئەوانەی خۆیان بۆ "نوسینەوەی" مێژوو تەرخان کردبو، سروشیان لە پیلانی سێ سەد خێزانی وەردەگرت، نەك مادەی دیالیکتیکی مارکس، پەنایان بۆ "پرۆتۆکۆڵی پیرانی

زایونیزم" دەبرد، نەك زانستخوازی نێوداری "گۆبینۆ، و چامپرلن"،و پەنایان بۆ ئەدەبی نهێنی لەسەر جۆزێت (یەسوعییەت . Jesuits)و تیمەکانی ماسۆنیەت دەبردو کاریگەری کنیسەی کاسۆلیك و رۆڵی بزوتنەوە ئۆپۆزیسیۆنەکانیان لەدژی دەستێوەردانی ئەکلیرۆس لە ولاّتانی لاتینی زمان، لەبەر چاونەدەگرت. ئامانجی سەرەکی بونیاتنانەوەی مێژوو، ریسواکردنی مێژووی رەسمی و بەدەرخستنی قەڵەمڕەوی دەسەلاّتی نهێنی بو کە لەبەرامبەریدا، واقیعیەتی مێژووی زانراوو دەستەبەست و هەستپێکراو تەنها روکارێك بو بە مەبەستی فریودانی میللەت.

رقلێبونەوەی دەستەبژێر لە تۆمارکردنی مێژووی رەسمی، هاورێی ئەو قەناعەتەیان بو کە مێژوو جگەلە روداوی هەڵبەستراو شتێکی دی نیە، چی زیانێکی هەبو لەلایەن ئایدیۆلۆجیستە کاڵفامەکانی بزوتنەوەی تۆتالیتارەوە بەخرایی بەکاربهێنرێت، بەتەنها (رقلێبونەوەو قەناعەت) جێگەی کێشکردن (التجانب) نەبو، بەڵکو باشترو شیاوترە شەیداییەکی ترسناك و تێکدەریش بخرێتە پاڵیان کە لە درۆی شاخدارەوە دژی راستییەکی ترسناك سەرچاوەی گرتبو، سەرئەنجامیش دەبێتە واقعێکی حاشاهەڵنەگر، بەجۆرێك کە گومان دەبرێت مرۆڤ بتوانێت بەئارەزوی خۆی رابردوی بگۆڕێت و جیاوازی لە نێوان راستی و درۆ وەك مەسەلەیەکی بابەتی نەهێڵێت و تەنانەت راستیش دەتوانێت بەتواناو زرنگی و فشارو دوبارەکردنەوەیەکی بەردەوامەوە وابەستە بێت. ئەوە لێهاتویی هیتلەرو ستالین نەبو لە هونەری درۆکردندا، بەڵکو واقیع ئەوانی والێکرد کە بتوانن بۆ پشتیوانی لەدرۆکانیان جەماوەر لەیەکەیەکی بەکۆمەڵی پڕ لەشکۆمەندی رێکبخەن. روناکبیران کە دەیانبینی واقعێکی بزوت لەنێو سەرە ملیۆنیەکەی بزوتنەوە پشتیوانی لەو درۆو دەلەسانە دەکات و بە مەبەستی کارکردن سروشی لێوەردەگرن، ئیدی پێیانوابو ئەو درۆو دەلەسانە لەلایەن خودی مێژووە پشتیوانی لێدەکرێ.

بەپیرەوەچونی دەستەبژێر بەرەو بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لە پێشنەوەی دەسەلاّت بگرنە دەست، سەرچاوەی سەرسوڕمان بو، چونکە بۆ چاودێرێکی

دەرەکـی بیروبـاوەری بابـەتی تۆتالیتـاریزم، بـە حـوکمی ئـەوەی بیروبـاوەڕێکی هەڕەمـەکی و پڕوپۆچـە لـە کەشـوهەوای گـشتی پـێش تۆتالیتـاریزم رونـترو ئاشـکراتر بـو. لەراسـتیدا ئـەو بیروباوەرانـە جیاوازییـەکی قوڵیـان لەپێودانگـە پەسـەندکراوە گشتییەکاندا هەیـە، ئیـدی چ کولتـوری یـا فیکـری یـا ئـەخلاقی بێـت. بۆیـە دەتـوانین بـەو دەرئەنجامـە بگـەین کـە تـەنها نـەبونی بنەمایـەکی پێویـستی پەیوەسـت بـەفیکر، "خیانــەتی پیــاوانی ئـاینی" (ج. بینـدا) یـا ماسۆشـییەتی شـێواو، دەتوانێـت چـێژ وەرگـتنی دەسـتەبژێر لـەقبوڵکردنی بیروبـاوەری هەرچیوپەرچـی راڤــەبکات. ئەوانــەی بــەناوی مرۆڤدۆسـتیو لیبرالیزمەوە قسەیان دەکرد هەستیان بە نائومێدییەکی تاڵدەکردو ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەزمونە هاوچەرخەکاندا لەدەست دابو، زۆرجار شتێکیان لەبیردەچووە: لــەو کەشـوهەوایەی هــەمو بــەهاو پێـشنیازە کلاسـیکییەکان دەبـن بەهــەڵمو لەنێودەچن (لەدوای ئەوەی ئایدیۆلۆجیاکانی سەدەی بیستەم یەك لەدوای یەك شکستیان هێناو رەونەقیان نەما)، بەواتایەك لە واتاکان بۆ خەڵکی ساناتر بو پێشنیازی بێناوەرۆك قبوڵ بکات، تا قبوڵکردنی ئەو راستیە کۆنانەی ببوونە وشکە موقدەسی پروپوچ. لەراستیدا هیچ کەسێك دەسەڵاتی ئەوەی نەبو ئەو پروپوچیو قسە هەلەقانە بەهەند وەربگرێ. بازارەکی (Vugarity) هاوڕێ لەگەڵ رەتکردنـەوەی گاڵتەجارانـەی پێودانگـە شایـستەو قبوڵکراوەکـانی کۆمەڵگـە، قبــــوڵکردنی بێپـــــەردەی پۆخڵەواتـــەکانو ســــوکایەتی کـــردن بەهــــەمو خۆپێشاندەرێکی لەگەڵ خۆیدا هێنا، ئەوجۆرە سوکایەتی پێکردنە بەئاسـانی ئـەو پێوەرانـەیان بەشـیوازی ژیـانێکی ئازایانــەو نــوێ دەگــۆڕی. ئەوانــەی نــەفرەتێکی دێرینیــان لــەبۆرجوازی هــەبو، کاتێــك هەڵوێـستو قەناعــەتی جەماوەریان پەسـەند دەکـرد، بەویـستی خۆیـان وازیـان لـەو کۆمەڵگەیـە هێنـا لەراستیدا هەمان هەڵوێستو قەناعەتی بۆرجوازی بو، لەدوای ئەوەی لەپۆخڵی پاککرانـەوە . تـەنها بودەڵـەییو بێزێزیـان دەستنیشان دەکـرد، نـەك گۆڕانکـاری لەناوەرۆکدا بکەن(59)

زۆرجار بۆرجوازی خۆی بە پاسەوانی نەریتە رۆژئاواییەکان دەزانیٚ و هەمو مەسەلە ئەخلاقییەکان تێکەڵدەکات، بەوەی بە ئاشکرا ئەو رەندانە (فضائل) نمایش دەکات کە نەك لەژیانی تایبەتی و بازرگانیدا خاوەنیان نەبو، بەڵکو لەواقیعیشدا سوکایەتییان پێدەکات. بۆیە کارێکی شۆرشگێرانە بو، کاتێك بۆرجوازی دڵرەقی و سوکایەتی کردن بە بەها مرۆڤایەتییەکان و پابەند نەبونی بەئەخلاقەوە قبوڵ دەکرد، چونکە بەلانی کەمەوە ئەو دووروویيەی لەبەینبرد کە کۆمەڵگە خۆی لەسەر راگرتبو. ئەزمونێکی مەزنە بۆرجوازییەت لەچوار چێوەی ئەو پێوەرە ئەخلاقیە نەگریسەی قابیلی رەنگدانەوەیە، هەڵوێستی پەرگیری بگرێتەبەرو لەناخیدا دەمامکی دڵرەقی هەڵگرێت، کاتێکیش هەمو دونیا بەشێوەیەکی حەتمی ئەزپەرست دەبێت، ئەو وەك خۆشەویست دەردەکەوێت، شەرەنگێزی بەسەر دونیایەکدا پەخشدەکات کە سەروەری شەرەنگێزی تیانیە، بەڵکو سوکایەتی پێکردنی تیایە. دەستەبژێری روناکبیر لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا شتێکی ناچیزیان لەسەر پەیوەندی نێوان بۆرجوازی و هەرچی وپەرچی دەزانی، بۆیە دڵنیابون کە دەتوانریٚ گەمە کۆنەکەی "بۆرجوازی سەرسام بکە" تا کۆتایی وازی بکەن، هەڵبەتە ئەگەر کەسێك بتوانێت بەپێشاندانی وێنە کاریکاتۆرو گاڵتەمێزەکانی خۆی کۆمەڵگە توشی شۆك بکات.

لەو دەمەدا، کەس پێشبینی نەدەکرد کە قوربانی راستەقینەی ئەوجۆرە گاڵتە پێکردنە خودی دەستەبژێر دەبێت، نەك بۆرجوازی. روناکبیرانی پێشەنگ بێئاگابون لەوەی سەریان نەك بەدیوار، بەڵکو بەدەرگای کراوەدا دەکێشن، لە دوای سەرکەوتنێکی گەورە، ئیدی نەیاندەتوانی بانگەشەی کەمایەتییەکی شۆرشگێر بکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەو سەرکەوتنە دەیسەلماند کە گوزارشت لەرۆحی سەردەم دەکەن، رۆحێکی نویٚ رێبەری جەماوەر دەکات. لەم بارەیەشەوە لەئەڵمانیای پێش نازیدا ئەو پێشوازییە گەرمەی لە نمایشنامەی بریٚخت " ئۆپێرای چوار پولەکەیی . Lopera de Quatsous کرا، مانایەکی زۆر تایبەتی

دەگەیانـــد. لـــەو نمایـــشنامەیەدا چـــەتەکان وەك پیـــشەکارە بـــەریزەکان و پیشەکارەکانیش وەك چەتە بەدیاردەکەوتن. لەکاتیکدا پیشەکارە بەریزەکانی نیو تەماشـاکاران، وا تەماشـای ئـەم نمایـشنامەیان دەکـرد کـە درکیکـی قـولی بـو بارودوخی جهان هەیە، هەرچیوپەرچییەکانیش بەکاریکی هونەری چەتەگەرییان لەقەلەم دەدا، نمایشنامەکە لایەنی گالتەئامیزی لەدەست دابو. ئەو دەستەواژەیەی ئەکتەرەکان لەسەر شانو دەیانوتەوە ( Erst kommt das fressen , doun kommt die moral، واتـە لەپیشدا نـان، پاشـان ئـەخلاق) لەلایـەن هـەمو تەماشـاکارانەوە، لەبەر هوی جیاواز، چەپلەریزان دەکرا. هەرچیوپەرچی چەپلەیان بو لیدەدا بەخاتری ئەوەی دەقاودەق گوزارشـتی لیـان دەکـرد، بورجـوازی چەپلەی بو لیدەدا چونکە بەنەگریـسی خـوی هەلخەلـەتابو، لـەو شـلەژانەی بەرامبەریـشی بەتـەواوەتی شـەتەك ببـو، بویـە لـە بـەیانکردنی ئـەو ریـسواییەی ژیانیـان پیـی لیـوان لیـو بـو، پەنـدیکی قولیان وەرگرتبو، دەستەبژیریش چەپلەی لیدەدا بەخاتری ئەوەی ئاشکراکردنی نەگریـسی و بودەلـەیی، نـەك هـەر نایـابترین دیمـەنی ئـەو شـانوگەرییە، بـەلکو کاکلەکەیشی بو. تەنانەت کاریگەری شانوگەرییەکە بەتەواوەتی بەپیچەوانەی ئەو شـتەوە بـو کـە بریخـت چـاوەروانی لیـی دەکـرد. ئیـدی بورجـوازی توشـی شـوك نـەدەکرد، چـونکە چـەپلەیان بـو شـتیك لیـدەدا کـە شـانوگەرییەکە لـە فەلـسەفە شاراوەکەیاندا ئاشکرای کردبو، جەماوەرگەرای ئەم فەلسەفەیەش بەلگە بو لەسەر ئەوەی کە زور دەمیکە خاوەنی حەقیقەتن، بەجوریك کە تاکە دەرئەنجامی سیاسـی لـە "شورشـی" بریختـدا هانـدانی مروڤـە بو ئـەوەی دەمـامکی نەگریـسی و ریاکـاری فریبدات و بەئاشکرا بەپیودانگی هەرچیوپەرچی قاییل بیت.

لـەدوای تیپـەربونی دە سـال بەسـەر ئـەو نمایشنامەیەدا، پەرچـەکرداریکی دی لەوجورە لەبەدحالی بون بەرامبـەر بەشـانوگەری "پوچـی لـەپیناوی قەتلوعامـدا" لـە نوسینی " فیردنـاند سیلین . Ferdinand Celine" دەرکەوتـەوە کە تیایـە پیشنیازی لـەناوبردنی هـەمو یـەهودی کردبـو. ئـەم شـانوگەرییە "ئەندرییـە جیـد"ی شـادمان کردبو، بویـە لەسـەر لاپـەرەکانی روژنامـەی N.R.F – Nouvelle Revue Francaise

حیزبی نیشتمانی شۆڕشگێڕی فرەنسا، شادمانی خۆی دەربڕی، نەك لەبەر ئەوەی سیلین کوشتنی یەهودییەکانی فرەنسای دەوێت، بەڵکو ڕێز لە دانپیانی ئەو ئارەزووەی دەگرێ، هەروەها چێژی لەو دژایەتیە دڵڕفێنەی نێوان ڕەقی سیلین و ئەدەبی نەگریسیش وەردەگرت کە نێوەندە ڕێزدارەکانی ئەورووپا مەسەلەی یەهودییەکانیان پێی ڕوپۆشدەکرد. کەواتە، ئارەزوی ئاشکراکردنی بوەڵەیی، ئارەزوویەك بو لەنێو دەستەبژێردا ڕەتنەدەکرایەوە و تەنانەت چەوسانەوە و ئازاردانی فیعلی یەهودییەکانیش لەلایەن هیتلەرەوە، لەو ساتەوەختەی سیلین دوا شانۆگەری دەنوسی ئەو چێژەی نەدەشێواند. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پەرچەکرداره زیاتر بۆ بێزاری لە یەهود دۆستی philoemitism لیبراڵەکان دەگەڕایەوە تا نەفرەتکردن لەیەهودییەکان. هەمان ئامادەکاری زەینی دیاردەیەکی مەزنی پڕ بایەخ ڕاڤەدەکات: بیروڕای هیتلەرو ستالین دەربارەی هونەرو چەوسانەوەی هونەرمەندە مۆدێرنەکان، هەرگیز کێشی هونەرمەندە پێشەنگەکانی بەرامبەر بە بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لەنێونەبرد، ئەمەش ئاماژە بەنەبونی هەستێکی واقعییانەی دەستەبژێرو خۆنەویستی شێواویان دەکات، واتە هەمان ئەو دوو خەسڵەتەی کە تا ئاستێکی بەرز دونیای ساختەو بزری بەرژەوەندی کەسی جەماوەر بەرجەستە دەکات. تاکە دەرفەتی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان و یەکێك لە بەڵگەنامەکانی هاوپەیمانی کاتی لە نێوان دەستەبژێری ڕوناکبیرو هەرچیوپەرچی ئەوەیە، مەسەلەی ئەم دوو توێژە کە لە واقیعدا بە ڕەنگدانەوەی مەسەلەو هێزی جەماوەریش دەژمێردرێت، بەشێوەیەکی سەرەکی ئاوێتەی یەکتری بون.

کێشکردنی ڕاشکاوانەی هەرچیوپەرچی و کەمتەرخەمی جەماوەر لەسەر دەستەبژێرو سیحری بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لەسەر دەستەبژێر پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و نزیکیان لەنێواندا هەبو، بەوەی ئەو بزوتنەوانە لاف و گەزافی ئەوەیان لێدەدا کە جیاوازیان لە نێوان ژیانی تایبەتی و گشتیدا نەهێشتوە، ناماقوڵییەکی تەواو و نهێنیئامێزیان بۆ کەسێتی مرۆڤ گێڕاوەتەوە.

لەو دەمەی بەلزاك تیشكی خستە سەر ژیانی تایبەتی كەسایەتیە ناودارەكانی كۆمەڵكەی فرەنسی و شانۆگەری "پایەكانی كۆمەڵگە" لەنوسینی ئیبسن Henric Ibsen، شانۆكانی ئەوروپای داگیركردبو، مەسەلەی جووت مۆڕاڵی ببو بە بابەتێكی سەرەكی كە شانۆگەرییە تراجیدی و كۆمیدی یا رۆمانەكان (روایات) چارەسەریان بۆ دەدۆزییەوە. هەروەها جووت مۆڕاڵ وەك چۆن بۆرجوازییەت پیادەی دەكرد، نیشانەیەكی گەوهەری بو لەسەر "روحێكی جیدی . Lesprit de Serieux" هەمیشە گەورە، بەلاّم هەرگیز راستگۆ نەبو. جیاوازی نێوان ژیانی تایبەتی و ژیانی گشتی یا كۆمەلاّیەتی هەرگیز پەیوەندی بەجودایی ئاراستەكراوی نێوان قەڵەمڕەوی كەسێتی و گشتییەوە نەبو، بەڵكو رەنگدانەوەیەكی دەرونی ململانێی باوی نێوان بۆرجوازی و هاولاّتیان بو كە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بالاّدەست بو، واتە ململانێی نێوان ئەو مرۆڤەی حوكم دەردەكات و هەمو دەزگا گشتییەكان لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەكاردەهێنێت و نێوان هاولاّتییەكی بەرپرس كە گرنگی بەكاروباری گشتی دەدا وەكئەوەی پەیوەندی بەهەموانەوە هەبێت. لەم بارەیەوە، فەلسەفەی سیاسی لیبرالی والێكدەدرێتەوە كە زیادبونی بەرژەوەندی تاكەكەس پەرجوئاسا خێری گشتی زیاتر دەكات، ئەمەش بەعەقلاّنیكردنێكی بێپەروایانەی بەرژەوەندی تایبەتە بەبێ ئەوەی خێری گشتی لەبەرچاوبگرێ.

بەهەر حاڵ بزوتنەوە تۆتالیتارەكان بەدەستی ئەنقەست و ناكۆك بە گیانی چینایەتی حیزبە ئەوروپاییەكان كە زۆرجار رازی دەبون نوێنەرایەتی برێك بەرژەوەندی بكەن و دژ بەو "خۆپەرستی"یەی پێیوایە چەمكی بەرژەوەندی رەگەزەكانی كۆیەكی پەتی پێكدەهێنێت، سەركەوتووترینیانی وانیشانەدا كە هەڵگری " جهانبینی . Weltauschawng یەكە رێگەی پێدەدا مرۆڤ وەك گشتێك كۆنترۆڵ بكات(60) رێبەرانی هەرچی‌وپەرچی لەگەڵ ئەم داوا گشتیەدا، بۆ تەنها كەرەتێكیش، جگەلە لەدارشتنەوەی فەلسەفەی سیاسی بۆرجوازی بەشێوەیەكی ئاوەژو، هیچی دییان نەكرد. چینی بۆرجوازی لەرێگەی فشاری

کۆمەڵایەتی و زۆرجاریش بەهۆی خراپ بەکارهێنانی ئابوری لەدژی دەزگا سیاسییەکان، ڕێگەی هەموار کردبو، چونکە هەمیشە بۆرجوازی لەو بڕوایەدا بو کە ئەندامانی دەسەڵاتی گشتی و بینراو، بەرژەوەندی و کاریگەری تایبەت دەیانبزوێنێت، ئیدی چ ئەو بەرژەوەندی و کاریگەرییانە نهێنی بێت و ناگشتی. بەم مانایەش، مرۆڤ پێیوایە فەلسەفەی سیاسی بۆرجوازی هەمیشە تۆتالیتاری بوە، هەروەها بۆرجوازی باوەڕی بە بوونی ناسنامە بۆ سیاسەت، ئابوری و کۆمەڵگە هەبوە، دەزگا سیاسییەکانیش بەتەنها وەك ڕوپۆشێك بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکان بەکار دەهێنران. جووت مۆڕاڵ کە بۆرجوازی بانگەشەی بۆ دەکرد و بەرز ڕایدەگرت، جیاوازیکردن لەنێوان ژیانی گشتی و تایبەتی، جۆرە دەستبەرداربونێك (تنازل)بو لە بەرژەوەندی دەوڵەتی نەتەوەیی کە بێهودە هەوڵیدەدا پاریزگاری لەو دوو بوارە جیاوازە بکات.

تائێستاش دەستەبژێر بەمانای وشە گیرۆدەی پەرگیرییە (التطرف Radicalism). ئەو پێشبینییە گەشبینەی مارکس کە سەرئەنجام دەوڵەت لەنێو دەچێت و بوار بۆ کۆمەڵگەیەکی بێچین دەرەخسێت، نە زۆر رادیکالانەو نە زۆریش پەیامبەرانە بو. ئەگەر بیردایف (Nikolai Berdyaef) لەم وتەیەیدا لەسەر هەق بوبێت کە "شۆڕشگێڕانی ڕوس      هەمیشە تۆتالیتار بون"، ئیدی کێشی (جاذبیة) ڕوسیای سۆڤێتی لەسەر هاوڕێیانی بیریاری نازی و کۆمۆنیست هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە"شۆڕشی ڕوسیا، شۆڕشێکی ئاینی و فەلسەفی بو، نەك بەتەواوەتی پەیوەندی بەکێشمەکێشی لایەنی کۆمەڵایەتی و سیاسی ژیانەوە هەبێت"[61] لەراستیدا گۆڕانی چینەکان بەجەماوەرو داروخانی شکۆمەندی دەزگا سیاسییەکان و دەسەڵاتیان لە وڵاتە ئەوروپاییە ڕۆژئاواییەکاندا هەلومەرجێکی لەبابەت ڕوسیای خوڵقاند. ئنجا ڕێکەوتیش نەبو کە شۆڕشگێرە ئەوروپاییەکان لەدەمارگیری شۆڕشگێڕیدا پشتیان بەنمونەی ڕوسیا دەبەست، لەجیاتی ئەوەی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی و سیاسی

بگۆڕن، خوازیاری لەناوبردنی ریشەیی هەمو بیروباوەرو بەهاو دەزگا باوەکان بون. بەلآم هەرچیوپەرچی سودێکی زۆریان لەم حاڵەتە تازەیە وەرگرتو هاوپەیمانییەکی کاتییان لەنێوان شۆڕشگێڕانو تاوانبارانـدا بەست، هاوپەیمانییەك کە لە مێژبو لە نێوان تیمە شۆڕشگێڕەکانی روسیای تزاریدا پایەدار بو، بەلآم هێشتا لەشانۆی ئەوروپادا بەئاشکرا خۆی دەرنەخستبو.

هاوپەیمانێتی شێواوو پڕ بە ئازاری نێوان هەرچیوپەرچیو دەستەبژێرو تەبایيو یەکگرتنەوەی بەرخوازییە سەیرەکانیان، رەگوریشەی لەو واقیعەوە هەڵهێنجاوە کە ئەم توێژانە یەکەمین توێژ بون لە بونیادی دەوڵەتی نەتەوەییو چوارچێوەی کۆمەڵگە دورخرابونەوە. ئەگەر چی دەستەبژێرو هەرچیوپەرچی بەشێوەیەکی کاتی بەئاسانی یەکیان گرتبو، چونکە هەر لایەکیان هەستی دەکرد چارەنوسی سەردەمەکەی خۆی بەرجەستە دەکاتو جەماوەرێکی بێشوماریش پێڕەوییان لێدەکەن، درەنگ یا زوو زۆربەی گەلانی ئەوروپاش لایەنگیریان لێدەکەنو ئامادەن پەیوەندی بەشۆڕشەکەیانەوە بکەن.

بەلآم دواتر دەرکەوت هەر دوو توێژەکە هەڵە بون. هەرچیوپەرچی، دزگەلێك بون درێژکراوەی چینی بۆرجوازی، ئومێدەوار بون جەماوەری داماو هاوکاریان بکات بۆ ئەوەی دەسەلآت بگرنەدەستو پاڵپشتیان بکەن بۆ ئەوەی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان سەربخەن، تا بتوانن لایەنە کۆنەکانی کۆمەڵگەی بۆرجوازی لابەرن، روحێکی دزێتی بێپەروا لەجێگەیان بکەن حاکم بەسەر کۆمەڵگەدا. بەلآم کاتێك تۆتالیتاریزم گەیشتە دەسەلآت هەر بەزوویی تێگەیشت کە رۆحییەتی بێهودەیی خەسڵەتی هەرچیوپەرچی نییە، روحییەتێکی داهێنەرانەی لەوجۆرە بە تەنها هەرەشە لە بالآدەستی بەسەر مرۆڤەوە دەکات. لەلایەکی دی، بێویژدانی تایبەت نەبو بەهەرچیوپەرچییەوەو دەکرا لەماوەیەکی تارادەیەك کورتدا فێرببێت. جەماوەرێکی گێلی هاوکار بە ماشینی بێبەزەیی ستەمگەرو قەلآچۆکەر، باشترین کەرەسەی خاوەو ئامادەییان تیایە، تەنانەت دەست بۆ گەورەترین تاوان بەرێت، کە لە قەوارەدا

له تاوانی ئاسایی گەورەتر بێت، بەمەرجێك ئەو تاوانانە بەرێکوپێکی ئەنجام بدرێن و بەڕوکەش شێوەی کاری رۆتینی لەخۆبگرێت.

کەواتە رێکەوت نەبو، ئەو ناڕەزاییە دەگمەنانەی لە بەرامبەر دلڕەقی بەکۆمەڵی نازییەکان لەدژی یەهودو میللەتانی ئەوروپای رۆژهەلات دەربڕا، لەلایەن سەربازو هیچ توێژێکی دی لەجەماوەرە بەرێزە گێلە هاوکارەکانی کۆمەڵگەوە نەبو، بەڵکو بەدیاریکراوی لەلایەن هاورێ سەرەتاییەکانی هیتلەرەوە بەرزەبووە، ئەوانەی نوێنەری نمونەیی هەرچی وپەرچی بون[62]

بەلام ئەگەر بمانەوێت قسە لەسەر هیملەر بکەین، بەتواناترین پیاوی ئەڵمانیا لەدوای ساڵی 1936، ئەوا بەتەواوەتی وازی هێنا لەوەی بچێتە ریزی "لەشکری قەرەجەکان"ەوە، ئەو لەشکرەی تا ئاستی نیگەرانی لەدەستەبژێری روناکبیر دەچێت. خودی هیملەر کەسێك بو لە ئاسایی، ئاساییتر بو، واتە لەهەر سەرکردەیەکی سەرەتایی بزوتنەوەی نازیزم گێلە پیاوتر بو[63] چونکە نە وەك گۆبلز ئاسا قەرەج بو، نەوەك وەك سترایخەر Streicher سادی بو، نە چەشنی رۆزنبرگ عەقلی لەدەست دابو، نەوەك هیتلەریش دەمارگیر بو، یا وەك گۆرینگ سەرچڵ بو. بەڵکو لە چوارچێوەی بالادەستی گشتگیردا توانایەکی مەزنی لەرێکخستنی جەماوەردا هەبو، بۆیە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە زۆرینەی خەڵکی قەرەج و رەگەزپەرست و سەرچڵ و سادی و گێل و تێکشکاو نیە، بەڵکو لەپێش هەمو شتێکدا خاوەن ویژدان و خێزانی نمونەیین.

گێلە پیاو ئەو کەسەیە لەنێو ژیانی تایبەتیدا، گۆشەگیر دەبێت و خۆی بۆ خێزان و پێشخستنی پیشەکەی تەرخاندەکات: ئەمەش دوا بەرهەمی بیروباوەری بۆرجوازییە کە دابەزینی دەگاتە ئاستی ئەوەی بەلای بەرژەوەندی تایبەتی خۆیدا دایبشکێنێت. لەراستیدا گێلەپیاو بۆرجوازییەکە پەیوەندی بەچینەکەیەوە پچڕاوە و بوە بە مرۆڤێکی پەرت و بەرهەمی داروخانی چینی بۆرجوازیە. مرۆڤی جەماوەریی کە هیملەر ریزو تاکەکانی رێکدەخست و ئامادەی دەکرد بۆ ئەوەی دزێوترین تاوانی بەکۆمەڵ لەمێژوی مرۆڤایەتیدا

ئەنجام بدات، زیاتر لە گێلەپیاو دەچو تا لە هەرچیوپەرچی. بۆرجوازی لەنێو ویرانەی دونیای خۆیدا تەنها بیر لە ئارەزوەکانی خۆی دەکاتەوەو ئامادەیە بە بچوکترین جوڵەو فشار قوربانی بەهەمو شتێك بدات . بیروباوەر، شەرەف، کەرامەت . بۆیە لەنێوبردنی پیرۆزیو ئەخلاقی تایبەتی ئەو کەسانەی تەنها بیر لە پاراستنی ژیانی خۆیان دەکەنەوە، لە هەمو شتێك ساناترە. نازییەکان لەدوای چەندین ساڵ لەدەسەلاتو جێبەجێ کردنی میتۆدەکەیان بەشێوەیەکی لەسەرخۆو جێگیر، رێکوراست رایانگەیاند: "ئەو کەسەی هێشتا لەئەڵمانیا خۆی بە کەسێکی تایبەت دادەنێت، کەسێکی خەوتوە...."(64)

لەلایەکی دی، پێویستە لەسەرمان بەرامبەر ئەندامانی دەستەبژێر دادخوازبین، ئەوانەی جاربەجار بەهۆی شەیداییانەوە بەرەو بزوتنەوە تۆتالیتارەکان هەڵدەخلیسکان، یا ئەوانەی بە هۆی مەزنیی هێزو توانای فیکریانەوە بەوە تاوانبار دەکران کە سروش بەخشی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بون: چونکە کلۆڵو نائومێدەکانی سەدەی بیستەم، هەرگیز کاریگەرییان لەسەر تۆتالیتاریزم نەبو، ئیدی شتێکیان کردبێت یا نا. بەڵکو تەنها لە سەرەتادا رۆڵیان هەبو، ئەو کاتەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان دونیای دەرەوەیان ناچار دەکرد بیروباوەرەکەیان بەهەند وەربگرێت. بەڵام لەدوای ئەوەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان دەسەلاتیان گرتە دەست، تەنانەت لەپێشئەوەی رژێم تاوانی درزێویش ئەنجام بدات، هەمو ئەو گروپە لایەنگرانەی رامالی. دەستپێشخەری فیکری، رۆحیو هونەری بە ئەندازەی دەستپێشخەری هەرچیوپەرچی بۆ تاوانکردن مەترسی لەسەر توتالیاتریزم هەیە، هەروەها هەردوکیان مەترسیان زۆر لەئۆپۆزیسیۆنی سیاسی زیاترە. چەوسانەوەی بەردەوامو سیستماتیکیانەی سەرکردە تازەکانی جەماوەر بەرامبەر هەمو چالاکییەکی فیکری بالا، لەوە قوڵترە تەنها هەستێکی سروشتییان بێت بەرامبەر ئەو شتانەی لێ تێناگەن. چونکە بالادەستی گشتگیر بەرامبەر هەر دەستپێشخەرییەکی ئازاد لەهەمو بوارەکانی هەبوندا لێبوردەیی نیە، بۆیە

لەدواجاردا شتێکی سروشتییە بەرامبەر هەر چالاکییەکی پێشبینی نەکراو لێبوردە نەبێت. کاتێک تۆتالیتاریزم بەدەسەڵات دەگات هەمو لێهاتویەکی راستەقینە، چەند هاوسۆزبن لەگەڵیدا، بەو خەڵکە ساویلکەو گێلانە دەگۆڕێتەوە کە گێلی و نەبونی رۆحی داهێنەرانەیان باشترین گرەنتی وەفادارییانە(65)

## پەراوێز

1ـ زۆرجاران ئاماژە بەو "ئەفسونی جادوگەرانە" دراوە کە هیتلەر دەیدا بە گوێی گوێگرەکانیدا، دوا شتێك لەم بارەیەوە لەلایەن پەخشکارانی ئەڵمانەوە بڵاوکرابێتەوە، بریتیە لە Hitlers Tischgesprache – Hitler's Table Talks، بۆن، 1951 (وتەکانی سەرخوانی هیتلەر، چاپی ئەمریکا، نیویۆرك، 1953، هێندێکی وەکخۆی دەهێنمەوە، هەروەکو چۆن لە چاپە ئەڵمانییەکەیدا هاتوە). ئەم شەیداییە . ئەم کێشە (الانجذاب) سەیرە بە شێوازێك کە قابیلی بەرپەچدانەوە نیە لە کەسی هیتلەرەوە دزەی دەکرد . جەخت لەسەر: "ئیمان بەخۆبوونی ئەم پیاوە دەمارگیرە" دەکاتەوە (پێشەکی کتێبی جیرارد ریتەر، ل14)، هەروەها دلوەرییە یەکلاکەرەوە دەستکردەکانیشی دەربارەی هەمو شتێکی ئەم دونیایەو بیروڕاکانی . ئیدی چ پەیوەندی بەکاریگەری زیانبەخشەکانی جگەرە کێشانەوە بێت یا بە سیاسەتی ناپلیۆنەوە دەکرێ لە ناوکۆی ئەم ئایدۆلۆجیا گشتگیرەدا پلەبەند بکرێ.

شەیدایی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، بۆیە سەرچاوەی ئەو شەیداییەی دەوروبەر بۆ هیتلەری هەبو، هەر دەبێ لەرێگەی دەوروبەرە تایبەتەکەیشیەوە لێی تێبگەین. کۆمەڵگە هەمیشە ئارەزوی ئەوەی تیایە بانگەشەی کەسێك قبوڵ بکات، تا ئەو جێگەیەی کە شێتێك خۆی بەدانا دەزانێت، رەنگە بەخت یاوەری بێت، خەڵکیش بڕوای پێبکات. لە کۆمەڵگەی هاوچەرخدا کە توانای جیاکاری لە دەستداوە، ئەم ئارەزووە بەهێزترە، بەجۆرێك ئەگەر کەسێك بیروباوەرێکی هەبێت و بتوانێت بە ئاوازێکی پڕ لە قەناعەت پێشکەشی بکات، ئیدی زۆر بەزەحمەت شکۆمەندی خۆی لەدەست دەدا، ئەگەر چی چەندین کەرەت هەڵە کوشندەکانیشی ساغ بوبێتەوە. لەبەر ئەوەی هیتلەر بە باشی لە شێواوی و پشێوی بیروباوەرە جوداکانی سەردەمی هاوچەرخ بەئاگا بو، بۆیە ئەوەشی ئاشکرا کردبو کە بە لایەنگیری کردنێکی سەرسەختانە لە یەکێك لە بیروباوەرە جیاوازەکان، دەتوانرێ بە باشترین شێواز رێگە لە دڵەڕاوکێ بەرامبەر بیروباوەرە جیاوازەکان و بێهودەیی هەمو شتێك بگیرێت (ل 281). ئەم دەمارگیرییە رەهایە کۆمەڵگە شەیدا دەکات، چونکە لەو زەمەنەی گوزارشت لە خۆی دەکات، کۆمەڵگە لە شێواوی ئەو بیروباوەرانە رزگاری دەبێت کە بەردەوام بەرهەمی دەهێنێت. لە هەمو رویەکەوە ئەم "بەهرە"ی شەیداییە، تەنها

مانایەکی کۆمەڵایەتی هەیە. هەمان لایەنی کۆمەڵایەتی لە "وتەکانی سەر خوانی هیتلەر" زۆر بەروونی بەرچاودەکەوێت، چونکە لێرەدا هیتلەر رۆڵی کۆمەڵگە وازیدەکات، بەوەی تەنها قسە بۆ هاوەڵەکانی ناکات، بەڵکو قسە بۆ فەرماندەکانی هێزی بەرگری دەکات کە زۆربەیان کەمو زۆر بە کۆمەڵگەوە پەیوەست بون. هەڵەیەکی کوشندەیە گەر پێمان وابێت سەرکەوتنەکانی هیتلەر بۆ "توانا سیحرییەکەی" دەگەڕێتەوە، چونکە لەگەڵ ئەو شەیداییەشدا، تەنها دەیتوانی رۆڵی کەسێك وازیبکات کە کەسایەتییەکی بەرجەستەی نێو دانیشتنەکانی هەبێت.

2. لەم بارەیەوە بڕوانە سەرنجەکانی کارلتۆن. ج. هـ هایز، سەبارەت "تازەیی تۆتالیتاریزم لە مێژووی شارستانی رۆژئاوا"دا، کۆڕێك دەربارەی دەوڵەتی تۆتالیتاری، 1939، لە کارەکانی کۆمەڵەی فەلسەفەی ئەمریکا، فیلادلفیا، 1940، جلدی 82 (LXXXII).

3. لە واقیعدا ئەمە "یەکەمین شۆڕشی مەزنی مێژووە لە ساتەوەختی دەسەڵات گرتنە دەستدا، سود لە مادە یاساییە رەسمیە باوەکان وەردەگرێ (هانز فرانك)، Recht und verwaltung "ماف و حکومەت"، 1939، ل8

4. باشترین لێکۆڵینەوە دەربارەی هیتلەرو کارنامەکەی، لێکۆڵینەوەی ژیاننامەی هیتلەرە کە ئالان بۆلۆك، پێی هەستاوە، هیتلەر، لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ستەمگەری، لەندەن، 1952 ئەم لێکۆڵینەوەیە وەك نەریتێکی بریتانی نایاب دەربارەی رەوتی سیاسەت، بەشێوەیەکی وەسواسی، وردەکاری لە هەمو سەرچاوەکانی بەردەستی دەکاتو تابلۆیەکی کۆگرد (جامع) لەسەر کەشوهەوای سیاسی باوی هاوچەرخ دەکێشێت. لە پێناوی ئەو وردەکاریانەشدا، ئەم چاپە پەردە لەسەر کتێبە نایابەکانی کۆنراد هایدن هەڵدەماڵی، بەتایبەتی Der Fuhrer، یا بەدەسەڵات گەیشتنی هیتلەر، بۆستن، 1944 . هەر چەندە گرنگی بەرهەمەکەی هایدن لەوەدایە کە راڤەیەکی گشتی روداوەکان دەکات. بەلام بۆ زانینی کارنامەی ستالین، باشتر وایە بڕوانینە "بۆریس سۆڤارین، ستالین، لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانە لە بۆلشەفیزم" نیویۆرك 1939، وەك بەرهەمێکی کلاسیکی هێشتا گرنگی خۆی لە دەست نەداوە، ئەمە لە کاتێکدا بەرهەمەکەی ئیسحاق دویچەر، ستالین: ژیاننامەی سیاسی، نیویۆركو لەندەن، 1949، ئەم بەرهەمە بەهۆی دەوڵەمەندی بەڵگەنامەکانی و تێڕوانینە وردو قوڵەکانی لەسەر ململانێی ناوخۆی حیزبی بۆلشەفیك، ناتوانرێ پشتگوێ بخرێ. بەلام لەنگیو خەوشی ئەم کتێبە ئەو راڤەکردنەیە کە ستالین وەك کرامۆیل، ناپلیۆنو رۆسپێر، دەناسێنێت.

5. فرانز بۆرکینۆ، دوژمنی تۆتالیتاری، لەندەن، 1940، ل231.

6. لە چاپە ئەڵمانیەکەی کتێبی "پرۆتۆکۆڵەکانی پیرانی زایۆنیزم" وەرگیراوە.

**Die Zionistishen Protokolle mit Eimen Vor – Und Nachwort Von Theodor Fritsch , 1924, p.29.**

7- بێگومـان ئـەم مەسـەلەیە لەسـەر تۆتالیتـاریزم پەیوەسـتە بـە تایبەتمەنـدی هەمـەرەنگی روسیاوە. هەر لە یەکەمین ساتەوەختی دادگاییکردنی ئەندازیارە بیانیەکان لە یەکێتی سۆڤێت، هاوسۆزی کۆمۆنیستی وەك ئامرازێك بۆ خۆتاوانبارکردن بەکاردەهێنرا: "بەرپرسانی زینـدان هەمیشە سوربون لەسەر ئەوەی دانبنێم بە خراپەکارییەکدا کە هـەرگیز ئەنجامم نەدابو. کاتێك داواکەیانم رەتدەکردەوە، پێیان دەوتم هـەروەکو خۆت دەڵێیت لایـەنگری لە حکومـەتی سۆڤێت دەکەیت، کەواتە وتەکانت بە کردەوە بسەلمێنە، چونکە حکومـەت پێویستی بە دانپیانانی تۆ هەیە" راپۆرتی ئەنتوان مـسیلیڤا، لـوغزی روسـیا، 1940، ل153 ترۆتـسکی سـەبارەت بـەم رەفتارە باشترین راڤـەی تیوری دەکات: "ئێمـە تـەنها لەگەڵ حیزبدا دەتوانین لەسەر هـەق بین، چـونکە مێـژوو هـیچ رێگەیـەکی دی بـۆ لەسـەر هـەقبونمان نەهێـشتۆتەوە. ئینگلیزەکـانیش پەندێکیان هەیە، دەڵێت، وڵاتەکەم چ لەسەر هەق بێت یا نا، لەهەمو شتێکی دی لام پەسەندترە، بـەڵام لەمـەڕ کـردەی بڕیـار وەرگـرتنی تـاك، راڤـەکردنێکی مێـژوویی زۆر باشـترمان بـۆ دەسـت نیشانکردنی هەق و ناهەق هەیە، ئەویش ئەوەیە کە حیزبەکەم هەمیشە لەسەر هەقە"

(Souvarine, op. cit, p. 361)

8. نوسەری نازی ئەندریاس پیلینیك، بە ئاشکرا ئـەوە رەتدەکاتـەوە کە دەستەی هێرش لـە پێناوی "ئایدیاڵ"دا بجەنگێت یا "ئەزمونێکی ئایدیاڵی" بیجولێنێت، بەڵکو "ئـەزمونی سـەرەکی بەرهەمی خودی ئەبەرد بو"

**Gemeinschaft und Staatswissenschaft, dans Zeitschrift fur dir Gesamte staats wissenschaft, Band 96.**

لـە رێگـەی ئـەو نوسـینە بێـشومارانەی کـە بەشـێوەی گوتـاری هـەجو لـە نێوەنـدی سـەرەکی تـەڵقینی ئایـدیۆلۆجیای (Hauptarmt Schulungsant) تایبـەت بـە دەسـتەی پاراسـتن بڵاودەبووە، زۆر بە وریاییەوە پەرێز لە وشەی ئایدیالیزم دەکرا. نازییـەت داوای ئایـدیالیزمی لە ئەنـدامانی دەسـتەی پاراسـتن نـەدەکرد، بـەڵکو داوایـان لێـدەکرا لـە "هـەمو مەسـەلە ئایدیۆلۆجیاکانـدا، سەرسـەختییەکی لـۆجیکی پێـشان بـدەن و درێـژە بـە نەبـەردێکی سیاسـی بێبەزەیانە بدەن. (ڤرنەر بێست، ئەمە پۆلیسی ئەڵمانییە، 1941، ل99) ( .Werner Best

**Die Deutsche polizei, 1941,p.99**

9. لەم بارەیەوە، ئەڵمانیای دوای جەنگ، گەلێك نمونەی روون و درەوشاوە بەدەستەوە دەدا زۆر سەیر بو کە سەرباری ئەو تەڵقینە ئایدیۆلۆجیا رەگەزپەرستییەی جەماوەرێکی بەرفراوانی گرتبـووە، کەچـی سـەربازە رەشپێستەکانی ئـەمریکا بـەبێ هـیچ رۆحێکـی دوژمنکارانە لەلایـەن خەڵکی ئەڵمانیاوە پێشوازی دەکران. هەروەها ئەو واقیعەش مایەی سەرسوڕمان بو کە دەستەی پاراستنی چەکداری ئەڵمانیا "waffen- ss" لە دوا رۆژەکـانی بـەرگری ئـەڵمانیا لـە بەرامبـەر هاوپـەیمانان تـا "دوا سـەرباز" شـەڕی نـەکرد، ئـەم یەکـە تایبەتـە نازییـە "لـەدوای قوربانیـە مەزنەکانی لە ساڵانی پێشودا کە زیانەکانی زۆر لە زیانەکانی سوپا زیاتر بو، وەك هەر یەکەیەکی

مەدەنی دی، ملکەچی خۆی لەبەرامبەر ئەو بارودۆخە نالەبارو خراپەدا نیشاندا" (کارڵ، ئۆ، پاتێل، Die s.s, dans, Viertelijahreshafte fur Zeitgeschichte, janvier 1954).

10ـ رژێمەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات لە بەرژەوەندی مۆسکۆ حوکم دەکەن‌و وەك کارگوزارێکی کۆمۆنیزمی نێونەتەوەیی (کۆمێنترن) کار دەکەن، چونکە بە درێژکراوەی ئەو بزوتنەوە تۆتالیتارییە دەژمێردرێن کە مۆسکۆ سەرکردایەتی دەکات‌و حکومەتێکی ولاتپارێز نین. بەلام یۆگسلاڤیای تیتۆ تاکە ولاتێکی ئاوارتەیە کە پەیوەندی لەگەڵ مۆسکۆ پچڕاند، رەنگە درکی بەوە کردبێت کە ئەو ئامرازە تۆتالیتارانەی سروشێکی روسیان هەیە، بە بەهایەکی قورس لەسەر گەلی یۆگسلاڤیا تەواو بێت.

11ـ کەمی دادگاییکردنە سیاسیەکان‌و تا رادەیەکیش بێبایەخیان ناتۆتالیتاریتی دیکتاتۆرییەتی فاشیزم دەسەلمێنێت. لە ساڵە پڕ چالاکییەکانی ئەم رژێمەدا، کە ساڵی 1926 تا 1932 دەگرێتەوە، دادگا تایبەتەکانی نەیاری سیاسی، تەنها حەوت حوکمی لە سێدارەدانی راگەیاندوە، حوکمی لە دە ساڵ زیاتر زیندانی بۆ 257 کەس‌و لە دە ساڵ کەمتر بۆ 1300 کەس دەرکردوە‌و حوکمی دوورخستنەوەی بۆ ژمارەیەکی زیاتریش دەرکردوە، بە درێژایی ئەو ماوەیەش تەنها 12000 کەس دەستگیر‌و ئازاد کراون، ئەمجۆرە رێوشوێنە دادوەرییانە لە سایەی حکومەتی تیرۆری نازی یا بۆلشەفیکیدا بەدیناکرێ. بڕوانە ا. کۆهن. برامستید، دیکتاتۆرییەت‌و پۆلیسی نهێنی، تەکنیکی چاودێریکردن لە رێگەی ترسەوە، لەندەن، 1945، ل51.

12ـ تیۆریستەکانی نازیزم هەمیشە جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە ناتوانرێ "دەوڵەتی مۆڕاڵی" مۆسۆلینی وەك "دەوڵەتی ئایدیۆلۆجی" هیتلەر بەیەك بزانرێت. ( Gotfreld Neese, dans Zeitschrift fur die Gesamte staats wissenschaft – 1938 Band 98 < die verfassangsrechliche Gestaltung der Ein. parte).

گۆبڵز دەربارەی جیاوازی نێوان فاشیزم‌و ناسیونال سۆسیالیزم دەڵێت: "فاشیزم هیچ پەیوەندییەکی بە حیزبی ناسیونال سوسیالیزمەوە نیە. فاشیزم دەریادەیەکی رووکەشییە (سطحي)، ئەمە لە کاتێکدا ناسیونال سوسیالیزم ریشەیی کار دەکات" رۆژمێری گۆبڵز، 1942 . 1934، لە نوسینی لویس لۆخنەر، نیویۆرك، 1948، ل71 " دوچە وەك هیتلەر یا ستالین، شۆڕشگێڕ نیە. ئەو زۆر بەمیللەتی ئیتاڵیاوە پەیوەستە. ئەوەش خەسڵەتێکی شۆڕشگێڕی ئینتەرناسیونالی پێنابەخشێت (هەمان سەرچاوە، ل468).

هیملەریش ساڵی 1943 لە کۆنگرەی فەرماندە پایە بڵندەکان، لە وتەیەکیدا گوزارشتی لە هەمان دیدوبۆچۆن دەکرد: "فاشیزم‌و ناسیونال سوسیالیزم بە شێوەیەکی بنەرەتی لە یەکتری جیاوازن لە هیچ روویەکەوە ناتوانرێ ئەو دوو بزوتنەوەیە وەك دوو بزوتنەوەی رۆحی‌و ئایدیۆلۆجی پێکەوە بەراورد بکرێ" بڕوانە کۆهن. برامستید، سەرچاوەی پێشو، پاشکۆی ا.

لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، هیتلەر دانینا بە بوونی نزیکایەتی نێوان بزوتنەوەی کۆمۆنیستیو نازیزمدا: " لە بزوتنەوەکەماندا، دوو لایەنی ناکۆك بەیەکدەگەنەوە، کۆمۆنیستەکانی باڵی چەپو ئەفسەرو خوێنکارانی باڵی راست. ئەم دوو باڵە لە هەمو لایەنەکانی دی چالاکتر بون ... بەڵام کۆمۆنیستەکان ئایدیاڵیستی بزوتنەوەی سوسیالیستی بون". بڕوانە هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل147. رۆهم، فەرماندەی دەستەی هێرش لە کۆتایی بیستەکاندا، بەبێ دوودڵی ئەو بیروباوەرە باوە دووبارە دەکاتەوەو دەنوسێت: "زۆر کاروباری هاوبەش لە نێوان ئێمەو کۆمۆنیستەکاندا هەیە، ئێمە رێز لە راستی قەناعەتو ویستی قوربانیدانیان دەگرین لە پێناوی کێشەکەیاندا، ئەمەش، ئێمە لەگەڵ ئەواندا یەکدەخاتەوە"

Ernest Rohum, Die Geschichte eines Hochverarters, 1933. (volkasausgabe, P.273).

جەنگی جهانی دوەم خەریك بو نازییەکان والێبکات دان بەیەکسانی نێوان خۆیان روسەکاندا بنێن. هیتلەر لە ئایاری 1943دا لە کۆنگرەی ئەفسەرانی رایخو سەرکردەی تیمە گەرۆکەکاندا، بەمشێوەیە قسەکانی دەستپێکرد، "لەم جەنگەی دواییەدا دەوڵەتی بۆرجوازیو شۆڕشگێڕی روبەروی یەکدەبنەوە. تێکشکانی دەوڵەتە بۆرجوازییەکان بۆ ئێمە کارێکی سانا بو، چونکە لە تێروانینو پەروەردەدا لە ئێمە زۆر نزمتر بون. ئەو دەوڵەتانەی خاوەن ئایدیۆلۆجیان لە دەوڵەتە بۆرجوازییەکان توندترو چالاکترن ئێمە لە رۆژهەڵاتدا روبەروی دوژمنێك دەبینەوە کە بە ئایدیۆلۆجیا چەکدارە، ئەگەر چی ئایدیۆلۆجیایەکی هەڵەو خراپیشە.." (رۆژژمێری گۆبلز، ل 355). ئەم هەڵسەنگاندنە لەسەر سەرنجو تێبینی ئایدیۆلۆجیا نەك سەربازی، راوەستابو. گۆتفرید نیسە لە کتێبی حیزبو دەوڵەت، 1936، فۆرمێکی رەسمی دا بە ململانێی بزوتنەوە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات: "بەرەی یەکگرتوی رژێم هەر لەحیزبی میللی ئەڵمانیا (ئەوپەری راست) تا وەکو سوسیال دیموکرتەکان، لە خۆی دەگرێت. بەڵام حیزبی کۆمۆنیست دوژمنی دەرەکی رژێم بو. لە دوای تێپەربونی چەند مانگی یەکەم لە ساڵی 1933، چارەنوسی رژێم لە جەنگێکی دەستەویەخەدا لە دژی حیزبی کۆمۆنیزم بریاری لەسەر دەدرێ"، ل76.

13. زۆرێك لەو نمونانەی لەبەردەستە ئەوە دەردەخەن کە هیتلەر بە پێچەوانەی هێندێك لەو خورافاتانەی لە دوای جەنگ دروستکرابون، هەرگیز بە پەرۆش نەبوە لەدژی بۆلشەفیزم بەرگری لە رۆژئاوا بکات، بەڵکو هەمیشە ئامادە بو لەپێناوی وێرانکردنی رۆژئاوا هاوپەیمانی لەگەڵ "سورەکان"دا ببەستێت، تەنانەت لەو دەمەشدا کە ململانێی تاڵی لەدژی روسیای سۆڤیەتیدا هەبوە. "وتەکانی سەر خوانی هیتلەر" ل113، 95، 108، 385.

14. ئەمرۆ ئێمە ئەوە دەزانین کە چەندین کەرەت ستالین لە هێرشی هیتلەر بۆ سەر یەکێتی سۆڤێت ئاگادار کراوەتەوە. تەنانەت کاتێك مولحەقی سەربازی سۆڤێت لە بەرلین ستالینی لە

ئانوساتی هێرشی نازی ئاگادار کردەوە، کەچی هەر باوەڕی نەدەکرد هیتلەر پەیمانشکێنی بکات (بڕوانە وتارەکەی خرۆچۆف لەسەر ستالین، ئەو دەقەی ئیدارەی حکومەت دابەشیکرد، نیویۆرک تایمز، 5/ حوزەیران/ 1956).

15. ئەم زانیاریانەی خوارەوە کە سۆڤارین لە لاپەڕە 669ـ ی کتێبەکەیدا دەیگێڕێتەوە زۆر ڕون و ئاشکرایە: "بەپێی ئاماری دەبلیو کریڤیتیسکی کە باشترین سەرچاوەی بڕوا پێکراوی دەزگای پۆلیسی GPU سۆڤێتی لەبەردەست بوە، لە جیاتی 171 ملیۆن دانیشتوان کە بۆ ساڵی 1937 پێشبینی کرابو، تەنها 145 ملیۆن کەس مابونەوە، واتە بەپێی ئەو پێشبینیە نزیکەی 30 ملیۆن کەس لە یەکێتی سۆڤێت کەمی کردبو" لێرەدا پێویستە ئەوەش بە یاد بهێنینەوە کە ئەم روداوە لە دوای لەناوبردنی کۆلاک رویدا کە نزیکەی 8 ملیۆن قوربانی لێکەوتەوە. "کۆمۆنیزم لە بواری کردەوەدا" بڵاونامەی کۆماری ئەمریکا، واشنتن، 1946، ل149

16. دەکرێ زۆرێك لەو ئەخشانەی پشت بە بەڵگەنامە ئەسڵییەکان دەبەستن لە کتێبی "ئامێلکەی کینە"ی لیۆن پۆلیاکۆڤ بەدیبکرێ، پاریس، 1951، بەشی 8، هەڵبەتە تەنها ئەوانەی پەیوەندییان بە لەناوبردنی میللەتانی نائەڵمانییەوە هەیە، بە تایبەتی ئەو گەلانەی ڕەچەڵەکی سلاڤیان هەیە. بەڵام ناتوانرێ خودی میللەتی ئەڵمانیاش لەم چەکە وێرانکەرەی ئەڵمانیا ئاوارتەبکرێ، ئەمەش لەو خشتە تەندروستییەی خودی هیتلەر دایرشتبو، بەجوانی ئاشکرا دەبینێت. هیتلەر لەو خشتەیە پێشنیاز دەکات ئەو خێزانانەی نەخۆشی دڵ و سنگیان هەیە لە باقی میللەتی ئەڵمانیا جیابکرێنەوە، ئەوەش وەك ڕێخۆشکەرێك بۆ ئەوەی لە قۆناغی داهاتودا پاکتاوی جەستەیی بکرێن. ئەم بەرنامەیە و هێندێك پرۆژەی دی دەبوایە لە ئەڵمانیای سەرکەوتویی دوای جەنگ جێبەجێ بکرێ، ئەم پەخشنامەیە وەك ڕاپۆرتێك بۆ سەرکردە ناوچەییەکانی Hess Nassau ڕەوانە کرابو لە گفتوگۆیەکەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە فەرمانگەیی گشتی فۆهرەر ئەنجام درابو، سەبارەت بەو کارڕاییانەی پێویست بو "لە پێش ... لە دوای کۆتایی هاتنی سەرکەوتوانەی جەنگ" پشتی پێببەسترێت، بڕوانە هەڵبژاردنی بەڵگەنامەکان، "پیلانگێڕی و دوژمنایەتی نازییەکان"، واشنتن، 1946، جڵدی 711،ل175.

ئەم کارەش پێویستی بە دەرکردنی "یاسایەکی سەرتاسەری" هەبو کە بەپێی ئەو یاسایە "دەسەڵاتێکی دەستوری" بە پۆلیس ببەخشێت و دەسەڵاتەکانی ئەوەندە فراوان بکات تا بتوانێت خەڵکی بێگوناه بگرێت و ڕەوانەی ئۆردوگا زۆرەملێکانیان بکات. (بڕوانە پۆڵ ورنەر، س. س. ستاندار تێنفۆهرەر لە Deutsches Jugendrecht، هفت، 4، 1944).

دەربارەی "سیاسەتی پاسیڤانە بەرامبەر بە گەلان" کە هەمان ئامانجە بەدیهاتوەکانی هەڵمەتی پاکتاوکردنی بۆلشەفیزمی هەیە، دەبێ مرۆڤ هەمیشە ئەوەی لە یادی بێت کە "هەرگیز لە تواناداا نیە ئەم پرۆسەی هەڵبژاردنە ڕابگیرێت"

Himmler, "Die Schutzstaffel, dans Grundlagen, Aufbau und (Wirtschsftsordnung des National sozialistschen staates, no. 7b).

"ململانێی ڕێبەرو حیزبەکەی جۆرە هەڵبژاردنێك بو کە ئەو ساتەوەختە بەدینەهاتبو ڕێبەرو پاسەوانە دێرینەکانی دەیانزانی کە هەوڵو کۆششی واقعیانە تازە بەتازە دەستی پێکردوە، هەرچەندە ئەم هەڵبژاردنو ململانێیەش لە 30/ ك2/ 1933 بە ئاشکرا ئەنجام درابو"

Robert ley, Der weg Zur ordeusbrurg, o.D verlag der Deustscher (Arbeitsfront, "Escxemplaire non Commercial).

17ـ ئێف. بۆرکینۆ، زۆر بە دروستی حاڵەتەکە بەمشێوەیە وەسفدەکات: "هەر کاتێك کۆمۆنیستەکان هەوڵیان دابێت لە نێو جەماوەری کریکاراندا دەسەلات پەیدا بکەن، سەرکەوتنێکی ئەوتۆیان بە دەست نەهێناوە. ئنجا پاڵپشتی جەماوەرییان، ئەگەر پاڵپشتییەکی لەو جۆرەیان هەبوبێت، ئەوا زۆر لەوە دوورترە بدرێتە پاڵ چینی پرۆلیتار"

("Die nene komintern," dans Der Monat, Berlin, 1949, Heft 4).

18. ویلیام ئیبستاین، دەوڵەتی نازی، نیویۆرك، 1943، ل247.

19. بەپێی وتەکانی ماکسیم گۆرکی، بڕوانە سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل290.

20. گوتاری هێنریش هیملەر دەربارەی "ڕێکخستنو دەربەستی دەستەی پاراستنو پۆلیس" لە (National –Politisher Lehrgang der Wehrmacht von 15 – 23, janvier 1937) بڵاوبۆتەوەو لە "پیلانگێڕیو دوژمنایەتی نازی"دا هاتوە، واشتن، 1946 1v، ل616. نوسینگەی بەڕیوەبەری لیژنەی ولاتە یەکگرتوەکان لە پێناوی ڕاوەدونانی تاوانبارانی ولاتە سوێندخۆرەکان. حکومەتی ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

21ـ گۆستاف لۆبۆن، "سایکۆلۆجیای جەماوەر"، 1895، ئامارژە بە بێباکی جەماوەر دەکات، بڕوانە بەشی دوەم، ل80.

22. دامەزرێنەرانی حیزبی نازی تەنانەت لە پێشئەوەی هیتلەر وەك ڕێبەری "حیزبی چەپ" دەربکەوێت، جاروبار ئامارژەیان بەم خاڵە کردوە. هەروەها بڕوانە ئەو ڕودلوەی لە دوای هەڵبژاردنی پارلەمان لە ساڵی 1932 ڕویدا: "گریگۆر ئیستراسە بە پەژارەوە بە ڕێبەرەکەی دەڵێت، ناسیونال سوپالیست لە پێش هەڵبژاردن دەیتوانی لەگەڵ گرۆپی نێوەند، زۆرینەی ڕەها لە ئەنجومەن بەدەست بهێنێت، کەچی ئێستا ئەو توانایە لە دەست چوەو نوێنەرانی هەر دوو حیزبەکە لە نیوە کەمتر پێکدەهێنن ... بەلام هێشتا دەتوانن بە هاوپەیمانی لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا زۆرینە بەدەست بهێنن ... هیتلەریش وەلامیدەداتەوە کە هیچ کەسێك ناتوانێت حکومەت لە دژی ئێمە پێکبهێنێت" (هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل94و 495).

23ـ كارلتۆن ج. هـ. هاین، سەرچاوەی پێشو، هیچ ئاستێك لە نێوان هەرچیوپەرچی و جەماوەر ناهێڵێتەوە، پێیوایە دیکتاتۆرە توتالیتارەکان: "زیاتر لەنێو جەماوەرەوە پێدەگەن تا چینەکان"

24ـ شیتەڵکارییەکانی تیورە سەرەکییەکەی هایدن دەربارەی بزوتنەوەی نازی هێشتا لەچاو شیتەڵکارییەکانی دی بە پلەی یەکەم دەژمێردرێت. "لەنێو پاشماوەی چینە لە نێوچوەکاندا، چینێکی روناکبیری نوێ سەرهەڵدەدا کە بێبەزەییترینو بەتواناترین کەس پێشڕەوییان دەکات، ئەوانەی شتێکی ئەوتۆیان نیە لەدەستی بدەن، کەواتە بەهێزترین سوپای دەربەدەرەکان، مەیدانی جەنگ بەماڵوحاڵی خۆیان دەزانن و گۆرەپانی شەڕی ناوخۆش بەنیشتمان. (سەرچاوەی پێشو، ل100).

25ـ رێکەوتنی نهێنی نێوان جەنەراڵ شلایخەر Schleicher و رۆهم، فەرماندەی یەکەی هێرش، بریتی بو لەوەی کە گشت پێکهاتە نیمچە سەربازییەکان بخرێنە ژێر دەسەڵاتی هێزی سوپای رایخەوە، بەمجۆرەش بە ملیۆنان کەسیان دەخستە ریزەکانی سوپاوە. هەڵبەتە ئەم هەنگاوەش بە شێوەیەکی حەتمی دەبوە مایەی سەرهەڵدانی دیکتاتۆرییەتی سەربازی. هیتلەر لە حوزەیرانی ساڵی 1934دا رۆهمو شلایخەری پاکتاوکرد. گفتوگۆ سەرەکییەکانی نێوان نازییەکانو سوپا بە ئاگاداری تەواوی هیتلەر ئەنجامدەدرا. هیتلەر بە مەبەستی فریودانی نێوەندی سەربازی سەبارەت بەرازە راستەقینەکانی خۆی سودی لە رۆهمو سوپاش وەردەگرت. لە نیسانی ساڵی 1932دا رۆهم لە یەکێك لە دادگاییەکانی هیتلەردا شایەتی ئەوەی دابو کە پێگەی سەربازی یەکەکانی هێرش بەتەواوەتی لەلایەن سوپای رایخەوە ناسراوە (سەبارەت بە بەڵگەنامەکان دەربارەی پلانی رۆهم ـ شلایخەر، بڕوانە "پیلانگێڕی نازی" جلدی پێنجەم، ل456. هەروەها بڕوانە، هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل450). رۆهم بە شانازییەوە قسەی لەسەر گفتوگۆکانی لەگەڵ شلایخەر دەکردو بەپێی قسەکانی خۆی ئەو گفتوگۆیانە لە ساڵی 1931وە دەستی پێکردبو. لەو گفتوگۆیانەدا شلایخەر پەیمانی دابو کە لە حاڵەتی نائاساییدا یەکەکانی هێرش بخاتە ژێر فەرماندەیی سوپای ئەڵمانیاوە.

(Voir Die Memoiren des stabschefs Rohm. Sarrebruck, 1934, p.170)

بەهەر حاڵ خەسڵەتی سەربازی یەکەکانی هێرش کە بۆ رۆهم دەگەڕێتەوە، هەمیشە لەلایەن هیتلەرەوە دژایەتی دەکرا، تەنانەت لەدوای پاکتاوکردنی باڵی رۆهمیش، هەر وەکخۆی مایەوە. یەکەکانی هێرش، بە پێچەوانەی دەستەی پاراستنەوە، هەمیشە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە "نوێنەرایەتی ویستی سەربازی ئەڵمانیا دەکەن"، بۆیە پێیان وابو رایخی سێیەم کۆمەڵەیەکی سەربازییەو لەسەر دوو کۆڵەکە راوەستاوە ئەویش: حیزبو سوپای رایخ"

Vior Handbuch der s.A, Berlin. 1939, ct "Die Sturmabteilungen".par ) bictor Lutze, dans Grundlagen, Aufbau und Wirtschaftsordnung des .(National Sozialitischen staates, no. 7a

26ـ ژیاننامەی رۆهم، بەشێوەیەکی تایبەتی، سەرچاوەیەکی کلاسیکی ئەمجۆرە ئەدەبەیە.

27. هەروەکو دەزانرێ گروپە بچوکە نەیارەکانی رژێمی ستالین دەربارەی گۆڕانی سیاسەتی یەکێتی سۆڤێت، رەخنەکانیان لەسەر ئەم وتەزایەی مارکس بونیات دەناو هەرگیز دەستبەرداریشی نەبون. سەرباری پاکتاوکردنە لەسەریەکەکانی بیروکراسیەتی یەکێتی سۆڤێت کە هاوتای لەنێوبردنی بو وەك چینێك، کەچی هەرگیز ئەو رەخنەگرانەی والێنەکرد واز لە بیروباوەری خۆیان بهێنن و بیروکراسی سۆڤێتی وەك چینێکی سەردەستی کۆمەڵگەی سۆڤێت لەبەرچاو نەگرن. ئەم دەستەواژەیەی راکۆڤسکی کە سالی 1930 لە تاراوگە لە سیبیریا نوسراوە، لایەنگری لە هەمان دیدوبۆچون دەکات: "بە بەرچاومانەوە، چینێکی گەورە لە ئیدارییە پایە بڵندو بچوکەکان دروست دەبو، ئەو چینەی لەرێگەی هەڵبژاردنێکی حیساب بۆکراوو دامەزراندنی راستەوخۆ، ناراستەخۆوە، بەردەوام ژمارەیان زیادی دەکرد... بەلام ئەو توخمەی ئەم چینە تازەیە یەکدەخات، شێوەیەکی تازە بو لە موڵکایەتی تایبەت، واتە دەسەلاتی دەوڵەت". (لەهەمان کتێبی سۆڤارینەوە وەرگیراوە، ل564). لە راستیدا ئەم شیتەڵکارییە بە تەواوەتی بۆ سەردەمی پێش ستالینیش دەگونجێت. دەربارەی گەشەسەندنی پەیوەندی نێوان حیزب و سۆڤێتەکانیش کە گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی سەبارەت بە رەوتی شۆڕشی ئۆکتۆبەر هەیە، بڕوانە ئیسحاق دویچەر، پیامبەرێکی چەکدار، تروتسکی 1879. 1921، 1954

28ـ لە سالی 1927دا، لە 90٪ ئەندامانی ئەنجومەنی گوندەکان و لە 75٪ سەرۆکی ئەنجومەنەکانیش ئەندامی حیزب نەبون. لیژنەی جێبەجێکاری هەرێمەکان تەنها لە 50٪ یان ئەندامی حیزب بون و لە 50٪ شیان ناحیزبی بون، ئەمە لە کاتێکدا ئەندامانی لیژنەی نێوەندی لە 75٪ یان حیزبی بون. بڕوانە گوتاری "بۆلشەفیزم" لە نوسینی "مۆریس دۆب" لە ئینسکلۆپیدیای زانستی کۆمەلایەتی.

ا. رۆزنبۆرگ، لە کتێبی " مێژووی بۆلشەفیزم"، لەندەن، 1934، بەشی شەشەم، بەدوورودرێژی ئەوە روندەکاتەوە کە چۆن ئەندامانی حیزب، "بەپێی رێنمایی فەرمانبەرە هەمیشەییەکانی حیزب"، سیستمی سۆڤێتەکانیان لەناوەوە لە نێوبرد.

29. ئەم ژمارانە لە کتێبی ڤیکتۆر کراڤچینکۆ وەرگیراوە: "ئازادیم هەڵبژارد: ژیانی تایبەتی و سیاسی فەرمانبەرانی سۆڤێت"، نیویۆرك، 1946، ل278و303، ئەم کارەش پەیوەندی بە سەرچاوەیەکەوە هەیە کە زۆر گومان لە راستگۆیی دەکرێ. بەلام لە روسیادا، ئێمە ناچارین پەنا بۆ سەرچاوەی گومانلێکراویش بەرین، واتە پێویستە بە تەواوەتی پشت بە داستانی گەرماوگەرمی رۆژنامەو هەڵسەنگاندن یا راپۆرتی جۆراوجۆر ببەستین. لێرەدا تەنها کارێك کە دەتوانین ئەنجامی بدەین ئەوەیە زانیارییەك بەکاربهێنین رەنگە تارادەیەك ئەگەری راستگۆیی لەوانی دی زیاتر بێت. بەهەر حاڵ هێندێك مێژوونوس بە رووکەش پێیانوایە میتۆدی پێچەوانەی ئەم میتۆدە، واتە بەکارهێنانی ئەو بەڵگەنامانەی لە لایەن حکومەتەوە دەردەچێت،

زامترەو زیاتر قابیلی پشت پێبەستنە، بەڵام ئەم رەوشە دروست نیەو هیچ شتێکیش چارەسەر ناکات، چونکە ئەو بەڵگەنامە رەسمیانە جگە لە پروپاگەندەیەکی رووت شتێکی دی نیە.

30ـ ستالین لە شازدەهەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستدا، سەرزەنشتی ئەو لادانەی کردوەو بە "رەنگدانەوەی" بەرگری جوتیاران و وردە بۆرجوازی ناوەوەی حیزبی دەزانی (بڕوانە لینینیزم، 1933، جلدی 2، بەشی سێیەم). نەیارانی ستالین لە بەرامبەر ئەو هێرشەدا بە تەواوەتی بێتوانا و دەستەوەستان بون، چونکە ئەوانیش، وەك تروتسکی هەر سەرقاڵی ئەوەبون "ململانێی چینایەتی لەپشت ململانێی دەستەگەری حیزبیەوە ئاشکرا بکەن" (سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل440).

31. کراڤچینکۆ، سەرچاوەی پێشو، ل187.

32. سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل575.

33ـ دروشمی نهێنی دەستەی پاراستن کە هیملەر خۆی دایڕشتبو، بەم وشانە دەستی پێدەکرد: "هیچ ئەرکێك کە بەخاتری خودی ئەرکەکە بوونی نیە"، بڕوانە "گۆنتەر داڵکن" لە کتێبی (Schriften der Hochschule fur politik, 1939).

ئەو وتارە پڕ توانجانەی دەستەی پاراستنی ئەڵمانیا بۆ ناوخۆ بڵاویدەکردەوە، هەمیشە جەختیان دەکردەوە لەسەر "پێداویستی رەها بەمەبەستی پەیبردن لە پوچی هەر شتێك کە هەڵگری ئامانجێکی تایبەت بێت".

Voir Der Reichs fuhrer S.S und chef der Deutschen polizei, Reserve a (L'ausage Interne de la police).

34. دەربارەی ئەم کارەش بەڵگەنامەیەکی زۆر لەبەردەستەو کریڤیتسکی لە کتێبی "پۆلیسی نهێنی ستالین"، نیویۆرك، 1939، دەڵێت، ستالین بونیاتنەری راستەوخۆی ئەم کارە بوە.

35ـ هیتلەر لە کتێبی "نەبەردی من" (لەهەر دوو چاپە ئەڵمانییەکەی 1925، 1927) دەڵێت بوونی بەرنامەیەکی کۆن باشترە لەوەی گفتوگۆ دەربارەی چەندو چونی بەرنامەیەکی گونجاو بکرێت (کتێبی دوەم، بەشی پێنجەم). ئەو هەر زۆر زوو رایگەیاند: "هەر کاتێك دەسەڵات بگرینەدەست، بەرنامەش خۆیەخۆ ئامادە دەبێت ... دەبێ هەر لەسەرەتاوە، دەستبەر کردنی هەلمەتێکی پروپاگەندەی وێنانەکراو لەبەرچاوبگرین. ئەمەش کارێکی سیاسییەو لە ئێستادا هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ مەسەلەکانی دی نیە". (بڕوانە هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل203).

36. بەرەنی من سۆڤارین بەهەڵە وێنای ئەوەی کردوە کە لینین لە پێش ستالین دا رۆڵی بەرنامەی حیزبی نەهێشتوە: "شتێکی روون و ئاشکرایە کە بۆلشەفیزم، وەك بیروباوەر تەنها لەمێشکی لینیندا بوونی هەبوە، چونکە لەدوای مردنی لینین، هەر بۆلشەفیکێك وازی لێهێنرابێت، زۆر بەخێرایی لە خەتی باڵەکەی خۆی پەرت بوە... لەبەر ئەوەی ئەو خەڵکانە بە میزاجی خۆیان و بەهۆی لێهاتویی لینین خڕبوبونەوە، نەك لەبەر هەبونی فیکرێکی هاوبەش... " (سەرچاوەی پێشو، ل85).

37. بەرنامەی حیزبی نازی کە لەلایەن "گوتفرید فیدەر"ەوە لە (25) مادەدا ئامادەکرابو، زیاتر رۆڵی لە ئەدەبیاتی بزوتنەوە هەبو تا لەناو خودی بزوتنەوە.

38ـ هەڵسەنگاندنی دروشمەکەی هیملەر زۆر زەحمەتە. دارشتە ئەڵمانییەکەی Meine Ehre Heisst Treue دەلالەت لە شەیدایی و گوێڕایەڵییەکی کوێرانەی ئەوتۆ دەکات کە هەمو جۆرە دیسپلین و وەفادارییەکی رووت تێدەپەرێنێت. وەرگێڕانی بەڵگەنامە ئەڵمانیەکان لە کتێبی "پیلانگێڕی نازی" سەرچاوەیەکی گەلێك دەوڵەمەند پێکدەهێنێت، وەلێ ئەفسوس بە شێوەیەکی کارەساتبار نایەکسانە، تەنانەت دروشمی نهێنی تایبەت بە دەستەی پاراستنی ئەڵمانی بەمشێوەیە وەرگێڕدراوە: "شەرەفی من دەلالەت لە وەفاداریم دەکات" (جڵدی پێنجەم، ل346).

39ـ رەنگە مۆسۆلینی یەکەم کەس بێت وشیارانە بەرنامەی رەسمی رەتکردبێتەوەو پرەنسیپی رێبەری سروشبەخش و کاری لە جێگەی دانابێت. لە پشت ئەو کارەی مۆسۆلینیەوە ئەو بیروباوەرە خۆی متکردوە کە بەدیهاتنی خودی ساتەوەخت، رەگەزی سەرەکی سروش پێکدەهێنێت، ئەو سروشەی بەرنامەی حیزب سەرچاوەکەی وشك دەکات. بۆیە فەلسەفەی فاشیزمی ئیتاڵی زیاتر بە دیدوبۆچونی کردەگەرای actualism جەنتیلە Gentile گوزارشتی لێدەکرێ تا بە "ئەفسانەکانی" سۆرێل. بڕوانە گوتاری "فاشیزم" لە ئینسکلۆپیدیای زانستی کۆمەلایەتی. بەرنامەی 1921، لەدوای تێپەربونی دوو ساڵ بەسەر تەمەنی بزوتنەوە ئنجا ئامادەکرا، ئەم بەرنامەیە بەشێوەیەکی سەرەکی فەلسەفەی نەتەوایەتی لە خۆگرتوە.

40. ئێرنست بایەر، "دەربارەی یەکەی هێرش" بەرلین، 1938، کتێبی "پیلانگێڕی نازی"، جڵدی IV، ل784.

41ـ یەکەمین جار لە کتێبی سیاسەتی ئەفلاتون، ل305، کارکردن بەپێی prattein و aechein سیستمی دەست پێکردنی کارکردن و جێبەجێ کردنی . گوزارشتی لێکراوە.

42. Hitlers Tischesprache, p.182.

43. "نەبەردی من"، کتێبی یەکەم، بەشی 11 هەروەها بۆ نمونە بڕوانە
Dieter Schaurz. Angriffe auf die National sozialistische Weltauschaung. Aus den Schwarzen Korp. No. 2. 1936.
بەمشێوەیە وەلامی ئەو رەخنانە دەداتەوە کە گوایە "ناسیونال سوسیالیستەکان" لەدوای ئەوەی دەسەلاتیش دەگرنە دەست، دیسانەوە قسە لەسەر "ململانێ" دەکات: "حیزبی ناسیونال سۆسیالیست وەك خاوەن ئایدیۆلۆجیای Weltanschauung، دەستبەرداری ململانێ نابێت پێشئەوەی شێوەی ژیانی هەمو ئەڵمانییەك سیمای بەهای سەرەکی بزوتنەوە وەرنەگرێت ئەم کارەش دەبێ رۆژانە سەرلەنوێ بەدیبێت"

44. بڕوانە پەرچەکرداری هیتلەر لەسەر ئەو رۆژەی جەنگی جهانی یەکەمی تیا هەلایسا، ئەو پەرچەکردارەی لە کتێبی "نەبەردی من" دا وەسفکراوە، کتێبی یەکەم، بەشی پێنجەم.

45. بڕوانه کۆمەڵه بەڵگەنامەیەك لەسەر " ڕۆژمێری جەنگی جهانی یەکەم" له نوسینی هانا هاڤکاسبرینگ، ئەڵمانیای نادیار Unknown Germany نیوهاڤن، 1948، ل43، 45، 81. بەهای مەزنی ئەم کۆمەڵه بەڵگەنامەیه لەوەدایه کە بەشداری له ئاشکراکردنی "نهێنییەکانی" کەشوهەوای مێژووی ئەڵمانیا دەکات. نەبونی لێکۆڵینەوەی لەو جۆرەش دەربارەی فەرەنسا، بریتانیاو ئیتاڵیا، کارێکه جێگەی داخ و پەژارەیه.

46. سەرچاوەی پێشو، ل20 . 21

47. ئەم مەسەلەیه به هەستێکی پڕ له نامۆبون له ئاست ژیانی ئاسایی دەستی پێکرد. بۆ نمونه لەم ناوکۆیەدا کتێبی ڕۆدۆڵف بیندینگ بخوێنەرەوە: "پێویستە زیاتر له ڕیزی مردوو سەرلێشێواوەکان حیسابمان بۆ بکرێ تا وەك ئەو دوورخراوانەی کە ئەگەری گەڕانەوەیان هەیە، چونکە گەورەیی ڕوداوەکە له کۆمەڵگەمان جیادەکاتەوەو توشی گومڕاییمان دەکات..." (هەمان سەرچاوە، ل160). تا ئێستاش دەتوانرێ سەیرو سەمەرەترین بانگەشەی دەستەبژێری ئەوەی بەرە، لەم دەقەی هیملەردا بەدیبکرێ، کە تیایه ئەوە ڕاڤەدەکات کە چۆن سەرئەنجام توانیویێتی شیاوترین "شکڵی هەڵبژاردن" بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دەستەی پاراستن بدۆزێتەوە: " بەتەنها جەنگ کاریگەرترین شکڵی هەڵبژاردن بەرهەمدەهێنێت، لەبەرئەوەی ململانێیەکە له پێناوی ژیان و مردن. لەم شکڵەدا، بەهای خوێن لەرێگەی دەستکەوتەکانی جەنگ ڕوندەبێتەوە... لەگەڵ ئەوەشدا، جەنگ بارودۆخێکی ئاوارتەو نائاساییەو دەبێ پێوەری هەڵبژاردنی زەمەنی ئاشتی لەجەنگدا بەدی بکرێ" (هەمان سەرچاوە).

48. بۆ نمونه بڕوانه ئێرنست یۆنگەر، "شالاوی پۆڵا"، 1920، هێنری پلار وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسی، پاریس 1970

49. هاڤگاسبرینگ، سەرچاوەی پێشو، ل156، 157

50. هایدن له هەمان کتێبدا دەڵێت، هیتلەر له ڕۆژانی یەکەمی حوکمڕانیدا لایەنگیری له کارەسات دەکردو تا ڕادەیەکی زۆریش ترسی له ئەگەری ڕابونی ئەڵمانیا هەبو. ئەو شەش کەرەت (لەو دەمەی هاوپەیمانان ناوچەی ڕۆهەر . یان داگیرکردبو) به گوزارشتی جیاواز دەستەی هێرشی له کەوتنی ئەڵمانیا ئاگادار کردۆتەوە. "ئەرکی ئێمە زامنکردنی سەرکەوتنی بزوتنەوەکەمانه" . ئەم سەرکەوتنەشمان لەسەر شکستی شەڕی ڕۆهەر ڕاوەستاوە. ل167

51. هاڤکاسبرینك، سەرچاوەی پێشو، ل156 . 157

52. ئەم هەستە بەدرێژایی جەنگ، هەستێکی باو بو، هەر له هەمان کاتیشدا ڕۆدۆڵف بیندینگ دەنوسێت :"نابێت ئەم جەنگە بەشەڕی ڕوبەڕوبونەوەی سەربازی بەراورد بکرێ، چونکه له شەڕی ڕوبەڕوبونەوەدا فەرماندەیەك، فەرماندەیەکی دی دەخات، لەم حاڵەتەدا هەردوکیان دەکەون، تەنها جەنگ لەسەر قاچ ڕادەوەستێت" (هەمان سەرچاوە، ل67).

53. نامەیەکی باکۆنین لە 7/شوبات/ 1870، بڕوانە ماکس نۆماد، پەیامبەرانی شۆڕش، بۆستن، 1939، ل180

54. کتێبی "چارەسەرکردنی مەسەلەی شۆڕش" یا لە نوسینی خودی باکۆنین یا نکایف. ی شاگردی. سەبارەت بە ڕێبازی چارەسەرکردنی ئەم مەسەلانەو وەرگێڕانە کامڵەکەی بڕوانە نۆماد، سەرچاوەی پێشو، ل227. بە هەر حاڵ " نەزمی ڕق و کینەی تەواو سەبارەت بە هەمو پرەنسیپەکانی شەرەف لە ڕێبازی شۆڕشگێڕێك بەرامبەر بە مرۆڤەکانی دی... لەژێر ناونیشانی نیچیا ئیڤچینا (Nechayevshchina) چوە مێژووی شۆڕشی ڕوسیاوە" (هەمان سەرچاوە، ل224).

55. "ئێرنست سۆلێر" یەکێکە لە تیوریستە پلە یەکەکانی ئیمپریالیزم، پێیوایە سۆفیگەری و بالادەستی هەوڵێکە بۆ ڕەخنەکردنی ئیمپریالیزم، 1913. هەروەها بڕوانە "کارچێل سپریتسما" ئێمەش ئیمپریالیستین: تێبینی دەربارەی فەلسەفەی ئیمپریالیزم لە نوسینی ئێرنست سۆلێر، نیویۆرك، 1931، چ . مۆنۆد لە گۆڤاری مێژوویی، شوبات/ 1912، لویس ئیستیڤ، سایکۆلۆجیای نوێ دەربارەی ئیمپریالیزم، ئێرنست سولێر، 1913

56. مارکیز دوساد لە ساڵی 1930 بەدواوە، بوە یەکێك لە نوسەرە نێودارەکانی پێشەنگی ئەدەبی فرەنسا. تەنانەت "جان پۆلهان"، لەچاپی نوێی کتێبەکەی ساد "کارەساتی فەزیلەت"، پاریس، 1946، بەمجۆرە سەرنج و تێبینییەکانی یاداشتکردوە: "دەپرسم، کاتێك دەبینم زۆرێك لە نوسەرانی ئەم ڕۆژگارەی ئێمە، وشیارانە لە پێناوی ڕوداوێکی بانوەسفدا پێ لەسەر ڕەتکردنەوەی گزی و گەمەکردنی ئەدەبی دادەگرن... هەوڵدەدەن بالاکردن (السامی) لە گەندەڵی و مەزنی لە تێکدەر هەڵگۆزن... دەپرسم ئەدەبی هاوچەرخی ئێمە، ئەو بەشەی لەلای ئێمە پڕ ژیانە - هەڵبەتە زیاتر دوژمنکارانەیە . سەرلەبەری ڕووی ڕابردوی وەرنەگێڕاوە، بەشێوەیەکی زۆر دیاریکراویش بەلای ساد دا ...". هەروەها بڕوانە جۆرج باتای، "نهێنی ساد"، لە گۆڤاری ڕەخنە Critique، بەرگی III، ژمارە 15 17 . 1947

57. گۆبلز، سەرچاوەی پێشو، ل139

58- تیورە هونەرییەکانی بۆهاوس، دەلالەتێکی ڕوون و ئاشکرایان لەم بارەیەوە تیا بەدیدەکرێ. هەروەها بڕوانە تێبینییەکانی بەرتۆلد برێخت، دەربارەی شانۆ Gesammelte werke، لەندەن، 1938.

59- ئەم دەستەواژەیەی خوارەوەی ڕۆهم، نمونەی هەستێك دەخاتەڕوو کە نەك هەر خەسڵەتی دەستەبژێر، بەڵکو بە نزیکەیی خەسڵەتی سەرجەم نەوەی گەنجیش بو: "ڕوپامایی و پیرۆزکردنی وشك و بێناوەڕۆك ئاشکراترین خەسڵەتی کۆمەڵگەی ئەمرۆی ئێمە پێکدەهێنێت... هیچ شتێك لەوەی کە پێی دەوترێ ڕەوشتی کۆمەڵگە درۆزنانەتر نیە.." ئەو گەنجانەی ڕێگەی خۆیان لە جهانی سوك و ڕیسواو دووڕوویی بۆرجوازی نادۆزنەوە، نازانن بە چ جۆرێك جیاوازی

لە نێوان راستو هەڵەدا دەست نیشان بکەن" نێربازی ناو ئەو نێوەندانەش، بەلانی کەمەوە بەشێکی وەك نارەزایی لەدژی کۆمەڵگە گوزارشتی لێدەکرا.

(Die Gesschichte eines Hochuerraters, p.267 et 269)

60. رۆڵی "فیکرەکان لەسەر جهان . Weltanschauung . لە پێکهێنانی بزوتنەوەی نازیدا، چەندین کەرەت لەلایەن خودی هیتلەرەوە جەختی لەسەر کراوەتەوە. جێگەی خۆیەتی ئەوە وەبیربهێنینەوە کە هیتلەر لە کتێبی "نەبەردی من" بانگەشەی ئەوە دەکات لە زەرورەتی دامەزراندنی حیزب لەسەر بنەمای رۆڵی فیکرەکان لەسەر جهان، تێگەیشتوە، ئەوەش بۆ سەرکەوتویی حیزبە مارکسیستەکان دەگێڕێتەوە. کتێبی دوەم، بەشی یەکەم، Weltanschauung و حیزب.

61. نیکۆلا بردیاییف، سەرچاوەکانی کۆمۆنیستی روسیا، 1937، ل124. 125

62. بۆ نمونە ویلهێلم کوب، کۆمیسەری بالای نازی لە مینسكو ئەندامی دێرینی حیزبی نازی، سالی 1941، واتە لەسەرەتای کوشتاری بەکۆمەڵ بەمشێوەیە بۆ سەرۆکەکەی خۆی دەنوسێت: "بەدڵنیاییەوە من کەسێکی دەستوپێ سپی نیمو دەمەوێت بەشداری لە چارەسەرکردنی مەسەلەی یەهود بکەم، بەڵام ئەوانەی بە کولتوری ئێمە پەروەردە بونو نشونمایان کردوە، بەپلەی یەکەم، جیاوازییان لەگەڵ خێڵە دڕندە ناوخۆییەکاندا هەیە. ئایا دەتوانین ئەرکی کوشتنیان بە لیتوانیو لیتونیەکان بسپێرین، ئەوانەی لەلایەن خودی خەڵکی ناوچەکەوە بێزراون؟ ناتوانم چارەسەرێك بۆ ئەم کارە بدۆزمەوە. داواتان لێدەکەم بەخاتری شکۆمەندی رایخو حیزبەکەمان، رێنمایی وردم بۆ دەربکەن بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە بە شێوازێکی مرۆڤانەتر چارەسەر بکرێ"

ئەم نامەیە لە کتێبی "مامۆستایانی هیتلەر" لە نوسینی ماکس واینریچ، نیویۆرك، 1946، لە لاپەرەکانی 153و154دا بلاوبۆتەوە. کوب لەم میانەیەدا سەرکەوتو نەبو، لەگەڵ ئەوەشدا دەست پێشخەرییەکەی کۆمیسەری گشتی رایخ لە دانیماركو نازی ناودار "دەبلیو. بیست" بە مەبەستی رزگار کردنی گیانی یەهودییەکانی دانیمارك لە هەوڵو کۆششەکەی "کوب" سەرکەوتوتر بو. بڕوانە "پیلانگێڕی نازی"، بەرگی دوەم.

هەروەها ئەڵفێرد رۆزنبۆرگ کە زۆرجاران بانگەشەی نزمی گەلانی سلاڤی دەکرد، وێنای ئەوەی نەدەکرد رۆژگارێك بە مانای پاکتاوکردنی ئەو میللەتانە گوزارشتی لێدەکرێ. بۆیە هەر کە بوە بەرپرسی ئیدارەی ئۆکرانیا، داوای لە هیتلەر کرد راستەوخۆ خۆتێوەردان (تەدەخول) بکات، بەڵام دوای ئەوەی هیچ ئاکامێکی دەست نەکەوت، لە پایزی سالی 1942دا راپۆرتێکی توندی دەربارەی نالەباری باروبۆخی ئۆکرانیا نوسی. بڕوانە، پیلانگێڕی نازی، III، ل83، IV، ل62.

بێگومان ئەم ڕێسایەش هێندێك ئاوارتەیی هەیە. جەنەراڵ "ڤۆن چۆلتیتز"، ئەو پیاوە ئەڵمانییەی پاریسی لە وێرانەیی و کاولکاری ڕزگار کرد، هەر چەندە زۆرباش دەیزانی کە "چەندین ساڵە نازییەکان شەڕیان دۆڕاندوە"، کەچی هێشتا هەر دەترسا لەوەی بەبیانوی ئەوەی فەرمانی جێبەجێ نەکردوە، پلەی فەرماندەیی لەدەست بدات. ئایا ئازایەتی ئەوەی تیابو بەرامبەر ئەو فەرمانانەی داوای لێدەکرد "پاریس بکاتە وێرانە" خۆی ڕابگرێت، بەبێ ئەوەی لەلایەن نازی دێرینو باڵوێزی ئەڵمانیا لە فەرەنسا "ئۆتۆ ئەبیتز" پشتیوانی لێنەکرێ؟ ئەو کارەی بەپێی گەواهینامە تایبەتەکەی لە داداگاییکردنی ئاپتز لە پاریس، گومانی لێدەکرێ. بڕوانە نیویۆرك تایمز، 21/ تەموز/ 1949

63. ئینگلیزێك بە ناوی ستیڤن ئێج. ڕۆبێرتس، لە "ئەو ماڵەی هیتلەر دروستی کرد"، ساڵی 1939، هیملەر بە " پیاوێکی ڕەوشت بەرزو وەك کەسێك کە گرنگی بە ساکارترین شتی ژیان دەدا" وەسفدەکات کە پۆخڵەواتی هیچ کام لەو نازییانەی تیا نیە کە چەشنی نیمچە خوداوەند ڕەفتار دەکەن... ڕەفتاری ئەم دیکتاتۆرە پۆلیسەی ئەڵمانیا بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ ئەرکەکانی نایەتەوە، ئیدی گەیشتمە ئەو باوەڕەی کە لە ئەڵمانیا کەسێکی دی نیە، هێندەی ئەو ئاسایی بێت" (ل89 . 90). ئەم وتەیەش بە شێوەیەکی سەیر دیدوبۆچونی دایکی ستالینمان لەسەر کورەکەی وەبیردەهێنێتەوە کە بەپێی ڕاگەیاندنی بۆلشەفیك بەمجۆرە قسە لەسەر کورەکەی دەکات: "کوڕێکی نمونەییە، خۆزگە هەمو کەس لەو دەچو!" (سوڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل656).

64. تێبینییەکانی ڕۆبێرت لای. بڕوانە کۆهن . برامستید، سەرچاوەی پێشو، ل178.

65. لەم بارەیەوە سیاسەتی بۆلشەفیکی تا ئاستی سەرسوڕمان یەکانگیرەو هێندەش زانراوە کە چیدی پێویست بە لێکدانەوەی دی ناکات. پیکاسۆ نمونەیەکی زۆر بە ناوبانگی ئەم سیاسەتەیە، پیکاسۆ هەرچەندە ببو بە کۆمۆنیست، بەڵام لە یەکێتی سۆڤێتدا کەسێکی پەسەند نەبو. ڕەنگە وەرچەرخانی لەپڕی "ئەندریە جید"، لەدوای بینینی واقیعی یەکێتی سۆڤێت لەساڵی 1936 (لە کتێبی گەڕانەوە لە یەکێتی سۆڤێت)، بێسودیو بێکەڵکی هونەرمەندە داهێنەرەکانی، بەلایەنگرەکانیشەوە، بۆ ستالین سەلماند. بەڵام تەنها جیاوازی سیاسەتی نازی لەگەڵ هەنگاوەکانی بۆلشەفیکدا لەوەدابو کە نازییەکان نەگەیشتبونە ئەو ئاستەی بەهرە پلە یەکەکان بکوژن.

جێگەی خۆیەتی کارنامەی ئەو ڕوناکبیرە ئەڵمانیانەی کەمینەیەکی ناچیزیان پێکدەهێنا بەدوورودرێژی لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ، ئەوانەی زیاد لە هاوکاری ڕووتو بە خاتری بڕوابونیان بە نازیزم، خۆبەخشانە خزمەتگوزاری خۆیان پێشکەش بە بزوتنەوە دەکرد. (لێکۆڵینەوەی واینریچ، سەرچاوەی پێشو، تاکە لێکۆڵینەوەیە لەم بوارەدا مابێتەوە، بەڵام سەرچاوەیەکی گومڕاکارو تێکەڵو پێکەڵە، لەبەر ئەوەی جیاوازی ناکات لە نێوان ئەو

ئۆستازانەی بڕوایان بە نازییەت هەبو، لەگەڵ ئەو کەسانەی هەمو کارنامەکانیان تەنها بەخودی ڕژێمەوە تایبەت بو. هەروەها چاوپۆشی لە پێشینەی ئەو لێکۆڵەرانەش دەکات، کە مایەی پرسیار بو، بەمشێوەیە بەهرەمەندە مەزنەکان لە جێگەی توێژە کاڵفامە نازییەکان دادەنێت). لەم بارەیەوە حاڵەتی کارل شمیت carl Schmitt . ی یاسازان پڕ بایەخترین نمونەیە کە تیورە بە تواناکەی دەربارەی کۆتایی دیموکراسیو حکومەتی یاسا تا ئەمڕۆش لەبەر پڕ سودی بەوردی دەخوێنرێتەوە. لە نیوەی دەیەی 1930ەوە کارکەنار کراو لە جێگەیدا تیوریستە یاسایی‌و سیاسییە نازییە رەگەزپەرستەکان دانران، وەك هانس فرانك، حاکمی پۆلۆنیا، رینهارد هۆهن‌و گوتفرید نیسە، بەلأم دواهەمین کەسی بێچانس، والتر فرانك . ی مێژوونوس‌و ئەندامی دێرینی حیزبی نازی بو کە قەناعەتێکی تەواوی بەدژە سامییەت هەبو، لە سالی 1933 بوە بەڕیوەبەری " پەیمانگەی رایخ بۆ لێکۆڵینەوەی ئەلمانیا Reichsinstitut fur Geschichte des Neuen Deutschlands و بە "لێکۆڵینەوە دەربارەی وردەکارییەکانی مەسەلەی یەهود forschungsabteilunz Judenfrage ناوبانگی دەرکردبو، نۆ بەرگی دەربارەی مەسەلەی یەهود دەرکردوە (1937 . 1944). سالی 1940 فرانك مەیدان‌و کاریگەری بۆ ئەلفرێد رۆزنبۆرگ چۆڵ کرد کە خاوەنی ئەفسانەی سەدەی بیستەمە Der Mytgos des 20 yahrhunerts کە هیچ نیشانەیەکی لێکۆڵینەوەی تیا نیە. لە راستیدا نازییەکان لە فرانك دەترسان تەنها لەبەرئەوەی کەسێکی فێڵباز نەبو.

ئەوەی دەستەبژێرو هەرچیو پەرچی لێی تێنەدەگەیشتن، ئەوەیە کە" ئەستەم بو بەشێوەیەکی راگوزەری باوەش بەم ڕژێمەدا بکرێ.. لەسەروی هەر جۆرە ئارەزوویەك بە خزمەتکردن، زەرورەتێکی بێبەزەیی هەڵبژاردن هەیە کە هەلومەرجی ئاسایی‌و نەرم‌و نیانی ناناسێت"

(Der weg dea SS, issued by the ss Hauptampt- schulungsant, n,d,p.4)

بە وتەیەکی دی، نازییەکان لە پێناوی ئەوەی پاڵیوراوەکانیان هەڵبژێرن، تەنها پشتیان بە بڕیارەکانی خۆیان دەبەست‌و "نارەزایی" بیروباوەری ئەوانی دییان لەبەرچاونەدەگرت. هەمان شتیش لەسەر شێوازی هەڵبژاردنی پۆلیسی نهێنی بۆلشەفیك راستە. ف. بیك‌و دەبلیو. گۆدین، لە کتێبی "پاکتاوکردنی روسیو قسەلێدەرهێنان"، 1951، ل160، پێیان وایە ئەندامانی پۆلیسی نهێنی لە ریزەکانی حیزبەوە هەڵدەبژێردران، بێئەوەی هیچ دەرفەتێك لەبەردەم ئەو کەسانەدا هەبێت تا بەخوایشتی خۆیان ئەو پیشەیە قبوڵ بکەن.

## 1. پروپاگەندەی تۆتالیتاریزم

تــەنها هەرچی‌وپەرچــی‌و دەســتەبژێر بــەهێزی بزوێنــەری momentum تۆتالیتاریزم کێشدەکرێن، بەڵام دەبێ جەماوەر لەرێگەی پروپاگەنــدەوە بــەرەو بزوتنــەوە کێــشبکرێت. ئــەو کاتــەی بزوتنــەوە تۆتالیتارەکــان لــە ســایەی سیــستمێکی دەســتوریدا کــە ئــازادی رەئــی دەســتەبەردەکرد هەوڵیانــدەدا دەســەڵات بگرنەدەســت، نەیانــدەتوانی لــە ســنورێکی تارادەیــەك بەرتەســکدا نــەبێت، تــیرۆر پیادەبکــەن. بۆیــە لــەو دەمــەی هێــشتا رای گــشتی بەتــەواوەتی لەهــەمو سەرچــاوەکانی راگەیانــدن دانــەبڕابو، ئــەو بزوتنەوانــەش وەك تێکــرای حیزبــەکانی دی بەشــدارییان لــە راکێــشانی لایــەنگر دەکــردو بەدیمــەنێکی راستگۆیانە خۆیان نمایش دەکرد.

هەر زوو تێگەیشتین‌و زۆرجاریش ئەوەمان پشتراستکردۆتەوە کە لە وڵاتە تۆتالیتارەکاندا، تیرۆرو هەڵمەتی پروپاگەندە، وەك دوو رووی دراوێك، پێکەوە پەیوەستن[1]. ئەم دیدەش تەنها بەشێك راستی تیایە. هەر کاتێك تۆتالیتاریزم دەســەڵاتی رەهــا پەیــدا بکــات، پروپاگەنــدە بــە تــەڵقینی بــیروڕا دەگۆڕێتــەوە، توندوتیژیش زیاتر بۆ بەدیهێنانی بیروباوەڕە ئایدیۆلۆجی‌و سەلماندنی درۆ کردەییەکانی بەکاردەهێنێ، تا ترساندنی خەڵکی (لەسەرەتای دەسەڵات گرتنە دەســت نــەبێت، بەدەگمــەن توندوتیــژی پیــادە دەکــات، ئــەویش کاتێــك کــە ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی لەئارادا بێت). تۆتالیتاریزم تەنها بەوەندەوە ناوەستێت بە بێکاری بڵێت بوونی نیە کە قەناعەتی حەتمی بە بوونی هەیە، بەڵکو لە هەڵمــەتی پروپاگەنــدەی خۆیــدا مــافی بێکــاری بــەزیادە دەزانێــت‌و حــوکمی هەڵوەشــانەوەی بەســەرا دەدا[2] کاتێــك تۆتالیتــاریزم بێکــاری رەتدەکاتــەوە پێیوایــە، ئــازادە لــەوەی ئایــدیۆلۆجیا کۆنەکــەی سۆســیالیزم، ئەگەرچــی

بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراویش بێت، بەدیبهێنێت: ئەو کەسەی کار نەکات، نانی پێنادرێت. ئەگەر نمونەیەکی دی بهێنینەوە: کاتێك ستالین بریاریدا مێژووی شۆڕشی روسیا بنوسرێتەوە، پروپاگەندەی پشتگیریکردن لە داڕشتنەوەی مێژووی نویێ وایدەخواست، نەك هەر کتێبو دیکۆمێنتە کۆنەکان لەنێوبەرێت، بەڵکو دەخوازرا لەیەك کاتدا نوسەرو خوێنەرانیشی لەنێوببرێن. بۆیە بڵاوبونەوەی مێژووی رەسمی نوێی حیزبی کۆمۆنیست لەساڵی 1938دا، نیشانەی کۆتایی پاکتاوکردنێکی بەرفراوان بو کە بەدروێنەکردنی نەوەیەك لە روناکبیرانی سۆڤێتی دوایی هات. بەهەمان شێوەش ئەڵمانیا، لە وڵاتە داگیراوەکانی رۆژهەڵاتدا، لەپێناوی ئەوەی چاودێرییەکی توندوتۆڵی میللەت بکەن، دەستیان کرد بە هەڵمەتێکی بەرفراوان کە زیاتر سیمای دژایەتی کردنی سامییەتی لەخۆی گرتبو. ئەڵمانەکان نە پێویستیان بەتیرۆر هەبو، نە پەناشیان بۆ برد بۆ ئەوەی پشتگیری لە هەڵمەتەکەیان بکەن. بۆیە کاتێك زۆرینەی روناکبیرانی پۆڵۆنیان لەنێوبرد بەخاتری بەئۆپۆزیسیۆن بونی ئەو روناکبیرانە نەبو، بەڵکو لەوباوەڕەدا بون پۆڵۆنییەکان خەڵکانی بێعەقلن، هەروەها بەمەبەستی ترساندنی دانیشتوانی پۆڵۆنیا نەکەوتنە رفاندنی مناڵانی چاوشینو قژزەرد، هێندەی مەبەستیان بو پارێزگاری لە "خوێنی ئەڵمانی"[3] بکەن.

ئەو بزوتنەوە تۆتالیتارانەی لەدونیای ناتۆتالیتاردا بونیان هەیە، بەناچاری پەنا بۆ شتێك دەبەن کە ئێمە بە هەڵمەتی پروپاگەندەی ناوزەد دەکەین. بەڵام ئەمجۆرە پروپاگەندانە هەمیشە ئاراستەی دونیای دەرەوەی تۆتالیتار دەکرێتەوە، ئیدی ئەوانەی گوتارەکانیان ئاراستە دەکرێت، چ توێژە ناتۆتالیتارەکانی ناوەوەی وڵات بن، یا وڵاتە ناتۆتالیتارەکانی دەرەوە. ئەو بوارە دەرەکییەی هەڵمەتی پروپاگەندە دەیانگرێتەوە، فرە چەشنە، تەنانەت بزوتنەوەی تۆتالیتار لەدوای ئەوەی دەسەڵاتیش دەگرێتە دەست، بەشێك لە نەتەوە، ئەوانەی بەگۆڕانکاری سیاسییەوە پەیوەندیدارنو وەك پێویست تەڵقینی ئایدیۆلۆجی نەدراون، دەکات بەئامانجی خۆی. لەم بارەیەشەوە،

گوتارەکەی هیتلەر بۆ فەرماندەکانی سوپاکەی لەسەردەمی جەنگدا، باشترین نمونەیە لەسەر ئەمجۆرە پروپاگەندەیە، کە بەدرۆی شاخدار دەناسرێتەوە بۆ ئەوەی پێشەوا سەرنج و پاڵپشتی میوانەکانی بەلای خۆیدا رابکێشێت[4] هەروەها دەشێت بواری دەرەکی تیمێك لەو لایەنگرانەش بگرێتەوە کە هێشتا دوودڵن لەوەی ئامانجە راستەقینەکانی بزوتنەوە هەرس بکەن، لە کۆتاییدا هێندێك جار روودەدا کە خەڵکانی دەوروبەری هیتلەرو ئەندامانی رێکخستنەکانی دەستەبژێری حیزبیش بچنە ریزی بواری دەرەکییەوە: لەم حاڵەتەدا، ئەو کەسانەش پێویستیان بەوجۆرە پروپاگەندەیە هەیە، چونکە بەئەندازەی پێویست نەکەوتونەتە ژێر رکێفی دەسەلاتی گشتگیرەوە. لە ترسی ئەوەی هەڵمەتی پروپاگەندە درۆگەلێك گەورە نەکاتەوە، پێویستە زۆرێك لەو نمونانە بهێنینەوە کە خودی هیتلەر تا ئاستی رووشکاندن لەدیاریکردنی ئامانجە راستەقینەکانی بزوتنەوەدا راستگۆ بوە. بەلام جەماوەر بەم حاڵەتانە ئاشنا نابێت، ئەگەر هەر لەسەرەتاوە بۆ ئەمجۆرە یەکگرتنە ئامادەباش نەبێت[5]. بالادەستیی تۆتالیتار هەوڵدەدا بەشێوەیەکی سەرەکی میتۆدی هەڵمەتی پروپاگەندەکانی تەنها بەسیاسەتی دەرەوە سنوردار بکات، یا لقەکانی بزوتنەوە لە دەرەوەی وڵات بەمادەی سیاسی گونجاو سازو ئامادەکات، بۆ ئەوەی سودیان لێوەربگرێت. هەر کاتێك تەڵقینی تۆتالیتار لە ناوەوەی وڵات لەگەڵ شێوەکانی پروپاگەندەی تایبەت بەدەرەوەی وڵات بکەوێتە کێشمەکێش و ناکۆکییەوە، ئیدی پروپاگەندەی دەرەوەش، لەناوەوەی وڵات وەك "مانۆرێکی تاکتیکی کاتی"[6] ئاراستە دەکرێ (ئەم مەسەلەیە لە کاتی جەنگی جهانی دوەم لە روسیا رویدا، هەڵبەتە لە کاتی هاوپەیمانێتی نێوان ستالین و هیتلەر روینەدا، بەڵکو کاتێك رویدا کە جەنگ لەگەڵ هیتلەردا، ستالینی بەرەو بلۆکی وڵاتە دیموکراسییەکان پەلکێش کرد). بەهەر حاڵ جیاوازی نێوان سانایی بڕوای ئایدیۆلۆجی بۆ خەڵکانی بەئاگاو نێوان هەڵمەتی پروپاگەندە بۆ دونیای دەرەوە، تەنانەت پێشنەوەی بزوتنەوەش

دەسەلات بگرێتە دەست لە ئارادا بوە. پەیوەندی نێوان هەڵمەتی پروپاگەندەو تەڵقین، بەقەوارەی بزوتنەوەو فشاری دەرەکییەوە بەستراوەتەوە. تا بزوتنەوە بچوك بێت، چالاکانەتر هەڵمەتی پروپاگەندە دەکات، بەلام ناتوانین پیادەکردنی فشاری دونیای دەرەوەش بە تەواوەتی پشتگوێ بخەین، تەنانەت ئەگەر دەوڵەتی پەیوەندیدار لەپشتی پەردەی ئاسنینەوە خۆی مەلاس دابێت، دیسانەوە هەر ناتوانێت ئەو فشارە بەهەند وەرنەگرێت، بۆیە تا ئەو فشارە بەهێزتر بێت، فەرمانڕەوا دیکتاتۆرە تۆتالیتارەکانیش هەڵمەتی پروپاگەندەی کارا، مەزنتر دەکەن. خاڵی گەوهەری لەم هەمو شتانەدا لەوێدایە کە پێداویستی هەڵمەتی پروپاگەندە هەمیشە دونیای دەرەوە دەیسەپێنێت، چونکە خودی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پەنا بۆ تەڵقین دەبەن. لە بەرامبەر ئەوەشدا، هەڵمەتی تەڵقین کە زۆرجار هاوڕێی تیرۆرە، لەگەڵ توانای بزوتنەوە تۆتالیتارەکان یا گۆشەگیرکردنی رژێمە تۆتالیتارەکان، کە لە کاریگەری دونیای دەرەوە دوریان دەخاتەوە، زیاد دەکات.

ئەگەر هەڵمەتی پروپاگەندە بەشێکی دانەبڕاوی "شەڕێکی دەرونی" بێت، ئەوا تیرۆر شتێکی دییە. رژێمە تۆتالیتارەکان لەدوای ئەوەی بە ئامانجە دەرونییەکانیشیان دەگەن، تیرۆر هەر پیادە دەکەن: ترسی راستەقینەی تیرۆر ئەوەیە کە بەتەواوەتی بەسەر هاولاتیانی ملکەچدا حوکمفەرما دەبێت. لە هەر شوێنێکدا دەسەلاتی تیرۆر بگاتە ئاستێکی نمونەیی، هەروەکو ئۆردوگاکانی دەست بەسەراگرتن، هەڵمەتی پروپاگەندەش بەتەواوەتی نامێنێت، تەنانەت لەئەڵمانیای نازیدا بەئاشکرا قەدەغەکرا[7]. بەگوزارشتێکی دی، هەڵمەتی پروپاگەندە گرنگترین ئامراز نیە کە تۆتالیتاریزم لەدژی دونیای نا تۆتالیتار بەکاریدەهێنێت. بەپێچەوانەوە، تیرۆر بەگەوهەری راستەقینەی ئەوجۆرە حکومەتانە دەژمێردرێت. هەروەکو بوونی قانون لەسیستەمی دەستوریدا بە ژمارەی ئەو کەسانەوە پەیوەست نیە کە قانون پێشێلدەکەن، بوونی رژێمی تۆتالیتاریش پەیوەستی بەهۆکارە خودی، دەرونی یا هۆکارەکانی دییەوە نیە[6]

تیرۆر ـ terror ـ وەك تەواوكاری هەڵمەتی پروپاگەندە، لەنازیزمدا رۆڵی گرنگتری وازیدەكرد تا كۆمۆنیزم. نازییەكان پەلاماری كەسایەتییە سیاسییەكانی ئەڵمانیایان نەدا، هەروەكو لە سەرەتادا شەپۆڵی كوشتنی خەڵكە سیاسییەكانی لەبابەت رانتینۆ Ratheneu و ئیرزبرگەر Erzberger ی گرتەوە، بەڵكو لەجیاتی ئەوە، كەوتنە كوشتنی فەرمانبەرە سۆسیالیستە بچوكەكان یا كوشتنی هێندێك ئەندامی كاریگەر لە حیزبە نەیارەكان، بۆ ئەوەی بەهاولاتیانی نیشان بدەن كە شۆرشگێرێتی چ مەترسییەكی هەیە. ئەمجۆرە تیرۆرە بەكۆمەڵە كە تا رادەیەك لە سنورێكی تەسكدا ئەنجام دەدرا، بەشێوەیەكی سیستماتیكیانە گەورە دەبو، چونكە پۆلیس و دادگاكان بەجیدی شوێنی تاوانە سیاسییەكان نەدەكەوتن كە لەلایەن باڵی راستەوە ئەنجام دەدرا. ئەمجۆرە كردەوانە هەروەكو كادرێكی راگەیاندنی نازی دەڵێت، تیرۆر وەك " هەڵمەتی پروپاگەندەی هێز" كارێكی پر بەها بو: ئەوجۆرە كوشتنە سیاسییە ئەوەی بۆ خەڵكی ئاشكرا كرد، نازییەكان لەدەسەلات بەتواناترن و مرۆڤ ئەندامی رێكخستنێكی نیمچە سەربازی نازی بێت زیاتر هەست بەئەمان دەكات تا سەر بەكۆمارییەكان بێت. سەرنجێكی لەوجۆرە زیاتر پایەدارتر دەكرا، لەبەر ئەوەی نازییەكان سودێكی زۆریان لەو تاوانە سیاسیيانە وەردەگرت كە خوویان پێوەگرتبو. نازییەكان بەئاشكرا دانیان بەتاوانەكانی خۆیاندا دەناو هەرگیز "لەسەر زیادەرەوییەكانی خەڵكانی خوارەوەی حیزب" عوزرخواهیان نەدەهێنایەوە. تەنها لایەنگرانی نازی عوزرخواهیان دەهێنایەوە . بۆیە واخۆیان نیشان دەدا كە جیاوازییەكی زۆریان لەگەڵ "چەنەبازانی" حیزبەكانی دی هەیە، بەمشێوەیەش كاریان لەخەڵكی دەكرد.

لێكچونی نێوان ئەمجۆرە تیرۆرو چەتەگەرایە (گانگستریزم ـ Gangster) هێندە روون و ئاشكرایە، پێویستی بەرونكردنەوە نیە. ئەمەش مانای وانیە وەك هێندێك جار پێمانخۆشە ئەو ئەنجامگیرییە بكەین كە نازیزم هەمان چەتەگەرایە، بەڵكو بەو مانایەی نازیزم بەبێ ئەوەی رێكخستنەكانی چەتە

ئەمریکاییەکانی پێقبول بێت، زۆر شتی لێوەفێربون، هەروەها بەهەمان ئەندازەش وانەی زۆر بەنرخ لە پروپاگەندەو ئامرازی راگەیاندنی بازرگانی ئەمریکا، فێربون.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەهەڵمەتی پروپاگەندەی توتالیتاریزمدا ئەوەی لەهەڕەشەو تاوانی راستەوخۆ لەدژی تاکەکەس گرنگترە: سەرەتا بەکارهێنانی ئاماژەی ناراستەخۆو بەتوێکڵو هەڕەشەئامێز لەدژی ئەو کەسانەی گوێ بەرێنماییەکانی تۆتالیتار نادەن، ئنجا کوشتنی بەکۆمەڵی "بێتاوان"و "تاوانبار"، بەبێ ئەوەی جیاوازی لەنێوانیاندا بکرێت. لەکاتێکدا پروپاگەندەی کۆمۆنیزم بەدواکەوتن لە شەمەندەفەری مێژوو، لەسەردەمو بێهودەیی ژیان بەسەربردن هەڕەشەی لەخەڵکی دەکرد، نازییەکانیش هەڕەشەی تێکچونی هاوسەنگی ژیانو یاساکانی سروشتو ژیانی هەتاهەتاییان لەخەڵکی دەکرد، بۆ ئەوەی بەشێوازێکی نهێنی ئامێزو حەتمی خوێنیان بەهەدەر بدەن.

پێشتر پروپاگەندەی تۆتالیتاریزم لەدەرخستنی سروشتی سەلماندی"زانستی" لەگەڵ هێندێك هونەری پروپاگەندەی بازرگانی کە ئاراستەی جەماوەر دەکرا، بەراورد کرا ئەگەر راست بێت ئاگادارییەکانی لاپەرەی یەکەمی هەر رۆژنامەیەك نمونەی ئەم "زانستگەرا" یە دەربخات، کە بوار بە هەر بەرهەمهێنێك دەدرێ، لەرێگەی فاکتو ژمارەو "دەستەی لێکۆڵەران"وە، بیسەلمێنێت سابونەکەی " باشترین سابونی دونیایە"[9]، ئەوەش راستە کە رەگەزی توندوتیژی لەزەینی پروپاگەندەچییەکانیشدا هەیە، چونکە لەپشت ئەم دیدەوە جۆرە پشتڕاستکردنەوەیەك هەیە، هەر کچێك ئەم چەشنە سابونە تایبەتە بەکارنەهێنێت، بەدرێژایی تەمەنی پەڵەوزیپکەی پێوەدەبێتو بەکچێتیش دەمێنێتەوە. خەونی شێتانەی مۆنۆپۆڵکردنو خەونی بەرهەمی ئاماژە بۆکراو "تاکە سابونە زیپکە ناهێڵێت"، دەسەڵاتی ئەوەی دەبێت رێگەی شوکردن لەو کچانە بگرێت کە ئەوسابونە بەکارناهێنن. زانست لە هەر دوو حاڵەتی پروپاگەندەی بازرگانیو تۆتالیتاریدا تەنها جێگۆڕکییەکی

ئاشـكراى هێزوتواناىـه. بـەڵام كاتێـك بزوتنــەوه تۆتاليتارەكـان دەســەڵات دەگرنەدەست، ئيدى بير لەبەڵگەى زانستى ناكەنەوە. بۆيه نازييـەكان دەست بەردارى ئەو زانايانه بون كه ئامادەبون دەستياريیان بكەن، ئەمه لەكاتێكدا بۆلـشەفيكەكان بەمەبەسـتى كـارى نازانـستى سـوديان لـەناوبانگى زاناكـان وەردەگرت، تەنانەت زاناكانيان ناچارەكرد رۆڵى فاڵچى وازيبكەن.

سـەبارەت بەلێكـچونى ريكلامـى بازرگـانىو پروپاگەنـدەى تۆتاليتـار كـه ئاراستەى جەماوەر دەكرێن، نابێت هـەنگاوى لەمه زياتر بنێين. بازرگانـەكان بەگـشتى مەسـەلەكان لەگـەڵ پەيامبەرانـدا ئـاڵوگۆڕ ناكـەنو هـەوڵيش نـادەن راسـتىو دروسـتى پێـشبينيەكانيان بـسەلمێنن. ديـاردەى زانـسگەراى پروپاگەنـدەى تۆتاليتـاريزم بەشـێوەيەكى تايبـەتى پـێ لەسـەر پەيامبـەرێتى دادەگرێت، ئەوەش جياوازى لەگەڵ پەيامبـەرێتى نەريتى كۆندا هەيە. بە هـەر حـاڵ سەرچاوەى ئايـديۆلۆجياى سۆسياليزم چەشنى رەگەزپەرستى، كاتێـك هەڵدەقوڵێت كه قسەكەرەكانى دوپاتيدەكەنـەوە ئـەو هێزه ناديارەيـان ئاشـكرا كردوە كـه مـرۆڤ لـەزنجيرەى چارەنوسساز كامـەران دەكـات. چـونكه جـەماوەر ئارەزوييــەكى زۆرى بـۆ ئـەو "رژێمــه رەهاگەرانـه هەيـه كـه هــەمو رووداوێكــى مێـژوويى وابەسـته بـەو مەسـەله گـەورە سـەرەتاييانەى پەيوەنـدى بـەزنجيرەى چارەنوسـسازەوە هەيـه، وابەرجەسـته دەكـات وەكئـەوەى مـرۆڤ لەسـەر شـانۆى مێژووى رەگـەزى مرۆڤايەتى دەربكـات" (بـەپێى وتـەكانى تـۆكڤێڵ). بێگومـان سـەركردە نازييـەكان بڕوايـان بـه حەقيقـەتى ئـەو بيروبـاوەرە هـەبو كه پێڕەوى لێدەكرا، بۆيه تەنها لەپێناوى پروپاگەندە سوديان لێوەرنەدەگرت، بەڵكو پێيان وابو: "تا زانياريمـان لەسـەر ياساكانى سروشتو ژيـان زيـاتر بێتو پێڕەوى لێبكەين، زياتر گوێڕاڵى ويسته بەتوانا باڵاكان دەبين، تا زانيـارى زيـاتر لەسـەر ويسته بەتوانا باڵاكـانيش پەيدا بكـەين، سـەركەوتنەكانمان مەزنتر دەبن"(10)

شـتێكى روونو ئاشـكرايه ئــەم دوو رسـتەيەى سـەرەوە، بەدەسـتكارييەكى كەمەوە گوزارشت لـەئيمانى ستالينيش دەكات كه دەڵێت: "تا تێگەيشتنمان

لەسەر یاساکانی مێژوو، ململانێی چینایەتی و پشکنیان زیاتر بێت، زیاتر دەتوانین خۆمان لەگەڵ مادییەتی دیالیکتیکدا بگونجێنین، تا زانیاریشمان لەسەر مادەی دیالیکتیك زیاتر بێت، سەرکەوتنەکانمان مەزنتر دەبێت" بە هەر حاڵ ئەمە باشترین نمونەی چەمکی ستالینە لەسەر "رێبەری دروست"[11]

پروپاگەندەی تۆتالیتاریزم، عەلمانیەتی ئایدیۆلۆجی و هونەری پیامبەری بۆ ئاستێك لەچالاکی میتۆدی بێناوەرۆك بەرزکردەوە کە پێشتر نەزانرابو. چونکە لە نەریتی دیماگۆگییەتدا، باشترین شێواز بۆ دورکەوتنەوە لە گفتوگۆ ئەوەیە کە بوترێ تەنها داهاتو راستی ئەو وتانە دەسەلمێنێت، بەمشێوەیەش کارێك دەکات بۆ ئەوەی لە بەڵگەهێنانەوەی کۆتی هەر جۆرە چاودێریکردنێکی حاڵی حازر قورتاری بێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاریزم ئەم رێبازەی دانەهێناوە، هەر ئەوانیش بەکاریان نەهێناوە. لەراستیدا عەلمانیەتی پروپاگەندەی جەماوەری لەسیاسەتی هاوچەرخدا بوە بە چەمکێکی جهانی: وەك نیشانەیەکی گشتیتر لەسەر رامکردنی زەین لەرێگەی زانستەوە راڤە دەکرا، واتە هەمان ئەو بارودۆخەی کە جهانی رۆژئاوای دیاریدەکرد، هەر لەدەسپێکی بیرکارییەوە تا زانستی فیزیك لەسەدەی شازدەهەمدا. بەمشێوەیە، وادەردەکەوێت تۆتالیتاریزم دوا قۆناغی پرۆسەیەك بێت کە تیایە "زانست بتێکە توانایی چارەسەرکردنێکی ئەفسوناوی هەمو ئێشوئازارەکانی هەیەو سروشتی مرۆڤیش دەگۆرێت"[12] لەراستیدا، هەر لەسەرەتاوە پەیوەندی لەنێوان زانستخوازیو دەرکەوتنی جەماوەر هەیە. بەهەر حاڵ "کۆمەڵگەرا Collectivism"ی جەماوەر هەر زوو لەلایەن ئەو کەسانەوە موبارەك بایی لێکرا کە ئاواتەخوازبون دەرکەوتنی " یاسای سروشتی پەرەسەندنی مێژوو" سیمای کردەوە پێشبینینەکراوو نامۆکانی رەفتاری تاکەکەس لەنێوبەرێت"[13] نمونەی ئەو کەسانەش "ئەنفانتین . Enfantin"ە کە پێی وابو "سەردەمێك دێت "هونەری وروژاندنی جەماوەر" دەگاتە ئاستی کامڵ بون، بەجۆرێك هونەرمەند، شاعیرو مۆسیقاژەن، دەتوانن بەهەمان ئەندازەی

بڕوا بەخۆبوونی هەوڵی بیرکارێك لەشیکردنەوەی مەسەلەیەکی ئەندازەیی یا کیمیاکارێك لەشیتەڵکاری مادەیەکدا، کاریگەرییان هەبێت و لە ئاکامەکەیشی بەهرەمەندبن" بۆیە ئەو کەسانە گەیشتنە ئەو دەرئەنجامە کە پروپاگەندەی هاوچەرخ لەم ساتەوەختەدا لە دایك دەبێت(14)

بەڵام کەموکورتییەکانی پۆزەتیڤیزم . Positvism، پراگماتیزم Pragmatismو رەفتارگەری هەر چەندێك بێت، کاریگەری لەسەر دروستکردنی "مانای گشتی" لەسەدەی نۆزدەهەمدا چەند بوبێت، دیسانەوە بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ بوترێت کە "گەشەکردنی شێرپەنجەی کەرتی سودگەرای . Utilitarianism بوونی مرۆڤ"(15) ، ئامارەیە بە جەماوەرێك کە بوە بە ئامانجی هەڵمەتی پروپاگەندەی تۆتالیتاریزمو زانستخوازی. قەناعەتی پۆزەتیڤیزم تا ئەو جێگەیەی لەلای "ئۆگۆست کۆنت" پەی پێدەبەین، دەکرێ داهاتو بەرێگەی زانستی پێشبینی روودانی بکرێت، ئەم قەناعەتەیشی لەسەر پایەی بەرژەوەندی interest وەك هێزێکی هەمیشە ئامادە لەمێژوودا خۆی راگرتوە، هەروەها لەسەر ئەو بەڵگەنەویستەش کە دەتوانرێ یاسای بابەتی هێز ئاشکرا بکرێت. کەواتە تیورەی سیاسی روهان . Rohan کە کرۆکی سودگەرای هاوچەرخە، ئیدی چ پۆزەتیڤیزم بێت یا سۆسیالیزم، بەپێی ئەو تیورەیە، "میرەکان فەرمانڕەوایی رەعیەت دەکەنو بەرژەوەندیش حوکمی میر دەکات"، تەنها بەرژەوەندی بابەتی رێسایەکی "بێهەڵەیە" و "بەردەوامی و داروخانی حکومەتەکانیش پەیوەندی بەدەست نیشانکردنی چەوتی یا دروستی بەرژەوەندییەوە هەیە" بەڵام ئەو تیورانە هەر چییەك بێت بە مەبەستی گۆڕینی سروشتی خودی مرۆڤ" گەلاڵە ناکرێت، هەروەکو تۆتالیتاریزم لەدیدو ئامانجەکانیدا بۆی دەچێت. بەڵکو بەپێچەوانەوە، گشت ئەو تیورانە بەشێوەیەکی ئاشکرا یا بە ئامارە، پێیان وایە هەمیشە سروشتی مرۆڤایەتی وەك خۆی دەمێنێتەوە، مێژووش جگە لە گێرانەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر هەلومەرجی بابەتیدا دێت و پەرچەکرداری مرۆڤ بەرامبەر بەو

گۆڕانکارییانە شتێکی دی نیە، بۆیە ئەگەر بە باشی پەی بەو بەرژەوەندییە ببرێت، دەتوانێت ئەو هەلومەرجە بگۆڕێت، نەك پەرچەکرداری مرۆڤایەتی بەمانا رەهاکەی. بەڵام زانستخوازی لەبواری سیاسەتدا، خۆشگوزەرانی مرۆڤ دەکاتە ئامانجی خۆی، ئەمە لەکاتێکدا ئەم چەمکە بەتەواوەتی نامۆیە بە تۆتالیتاریزم[16].

لەبەر ئەوەی " ناوکی سودگەرا" بەئایدیۆلۆجیا وەسفکراوەکانەوە پەیوەست بو، رێبازی دژ بەسودگەراش کە رژێمی تۆتالیتاریزم پێڕەوی لێدەکرد و بەتەواوەتی بەرامبەر بە بەرژەوەندی جەماوەر کەمتەرخەم بو، مایەی سەرسوڕمان بو. ئەم مەسەلەیە هۆکارێکی "نادیاری" دەهێنایە ناو سیاسەتی هاوچەرخەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، پروپاگەندەی تۆتالیتاریزم هەر زوو پێشئەوەی تۆتالیتاریزم دەسەڵات بگرێتەدەست، بەشێوەیەکی تەومژاوی ئاماژەی دەکرد بەوەی جەماوەر تا چەند دەستی لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەڵگرتوە. بەمشێوەیە هاوپەیمانەکان پێیان وابو کوشتنی شێتەکان لەسەرەتای جەنگدا لەلایەن هیتلەرەوە، دەگەڕایەوە بۆ رزگار بوون لەزارە بێسودەکان، لەوەشدا بەتەواوەتی بەهەڵەدا چوبون[17]. جەنگ هیتلەری والێنەکرد هەمو بەها رەوشتییەکان پێشێل بکات، بەڵکو هیتلەر پێیوابو جەنگ دەرفەتێکی زێڕین بۆ کوشتنی بەکۆمەڵ دەرەخسێنێت، بۆ ئەوەی دەست بە بەرنامەی کوشتن بکات، کە وەك خاڵەکانی دی بەرنامەکەی حیسابی هەزاران ساڵی ئاینەدەی بۆ کرابو[18]. مێژووی سەرتاسەری ئەوروپا بەدرێژایی چەندین سەدە خەڵکی وافێرکردبو، لە رێگەی بەدەستهێنانی دەسکەوتەوە دادوەریی لەسەر هەمو کارێکی سیاسی بکات، هەروەها لەرێگەی بەرژەوەندییەوە حوکم بەسەر گشت روداوە سیاسییەکانیشدا بدات: لەناکاو ئەو خەڵکانە خۆیان لەبەردەم دیاردەیەکی نادیارو پێشبینینەکراو بینییەوە. زۆرجار، پروپاگەندەی تۆتالیتاریزم بەهۆی سیمای دیماگۆگییەوە، پێشئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست، بەماوەیەکی زۆر، بڵاویدەکردەوە کە جەماوەر بەدەگمەن لە ژێر کاریگەری غەریزەی مانەوە رەفتاری کردوە، بەڵام وتەکانیان بەهەند وەرنەدەگیرا. بەهەر حاڵ، پروپاگەندەی تۆتالیتاری

زۆر لەسەر پایەی فریودانی خەڵکی پایەدار نیە، بەڵکو سەرکەوتنی زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وشیارییەی کە بەرژەوەندی وەك هێزێکی هەمەلایەنە تەنها کاتێك هەستی پێدەکرێت کە ئۆرگانی سیاسی سەقامگیر، هێڵی پەیوەندی پێویست لە نێوان تاكو کۆمەڵ دەستەبەر بکات. ئەو پروپاگەندەیەی لەسەر بەرژەوەندی پەتی خۆی راگرتوە لە لای جەماوەرێك کارا نیە کە ئینتمای بۆ هیچ ئۆرگانێکی کۆمەڵایەتی یا سیاسی نیە، بۆیە تەنها گوزارشت لە ئاژاوەوپشێویەکی تەواوی بەرژەوەندی شەخسی دەکات. توندرەوی ئەندامانی بزوتنەوەی تۆتالیتاری کە لە رووی توندرەوییەوە لەگەڵ بە ئەمەکترین ئەندامی حیزبی ئاسایی شایستەی بەراورد نیە، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی بەرژەوەندی تاکەکەس لەکن ئەو جەماوەرەی ئامادەیە قوربانی بەگیانی خۆی بدات. نازییەکان سەلماندیان تەنها بەدروشمێکی وەك "وەڵێ، کارەساتێك دەقەومێت" دەتوانرێ سەرلەبەری میللەتێك رەوانەی جەنگ بکرێت، (ئەو دروشمەی پروپاگەندەی جەنگی 1914 زۆر وریانە هەوڵیدەدا خۆی لێبدزێتەوە)، ئەمەش لە سەردەمێکدا دەبێت کە کوێرەوەری، بێکاری‌و بەرخوازی نەتەوەیی سەرکوتکراوی تیا نەبێت. هەمان رۆح لە دوا مانگەکانی جەنگدا بەدیارکەوت، کاتێك سەرەتاکانی دۆڕاندنی جەنگ ئاشکرا بو، راگەیاندنی نازی خەڵکە هەراسانەکەی بەمشێوەیە دڵنەوایی دەکرد، پێشەوا: "بەهۆشمەندی خۆی پەیمانی داوە، لەکاتی شکست هێناندا مردنێکی ساناى بەگاز بۆ خەڵکی ئەڵمانیا فەراهەم بکات"[19]

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، سۆسیالیزم‌و راسیزم لەناوەرۆکی سودگەراییان دادەماڵێت، کە هەمان بەرژەوەندی چینێکی دیاریکراو یا نەتەوەیەك پێکدەهێنێت. شکڵی پێشبینییە پاکەکانی ئەم چەمکانە زۆر لەناوەڕۆکەکەیان گرنگتر بو[20] یەکەم سیفەتی سەرکردەی جەماوەری، هەمیشە بێهەڵەیە، بەردەوامیش هەڵە قبوڵ ناکات[21] بۆیە پابەندبونی سەرکردەی تۆتالیتاری بێهەڵە ئەوەندەی لەسەر راڤەکردنی دروستی هێزە باوەڕپێکراوەکانی مێژوو یا سروشت بونیات نراوە، ئەوەندە لەسەر وشیارییەکی نائاسایی بونیات

نەنراوە، ئەو هێزەی ئەستەمە شکستو وێرانکردن بتوانێت نادروستی بسەلمێنێت، چونکە ئەو هێزە لەمەودایەکی دوردا پشتراستدەکرێتەوە[22]

کاتێك سەرکردەی جەماوەری دەسەلات دەگرێتەدەست جگە لە غەمی هێنانەدی پێشبینیەکانی کەهەمو بەها سودگەراکانی دی لەخۆیدەگرێت، غەمێکی دی نیە. نازییەکان لەکۆتایی جەنگدا هەمو توانای رێکخستنەکانیان، ئەوانەی هێشتا توانایی کارکردنیان مابو لە پێناو وێرانکردنی ئەڵمانیا خستەگەڕ، بۆ ئەوەی پێشبینییەکەیان بێتەدی کە دەڵێت ئەڵمانیا لەکاتی شکستهێناندا وێراندەبێت.

کاریگەریو سەرکەوتنی راگەیاندنی بێهەڵەیی دیکتاتۆرە تۆتالیتارەکان، مەبەستم ئەو هەڵوێستەیە کە دەدرێتە پاڵیان وەك راڤەکارێکی هێزە پێشبینیکراوەکان، هانیدان نیازە سیاسییەکانیان لە قالبی پەیامبەریدا رابگەیەنن. لێدوانەکەی هیتلەر لە ئەنجومەنی نوێنەران (Reichstag)، لە شوباتی سالی 1939دا، ناودارترین نمونەیە: "ئەمرۆ، دیسانەوە دەمەوێت دەستپێشخەری پێشبینییەك بکەم، ئەگەر سەرمایەدارانی یەهود بتوانن جارێکی دی میللەتان بەرەو جەنگێکی جهانی پەلکێش بکەن، ئەمجارەیان رەگەزی یەهودی لە ئەوروپا لەنێودەچێت"[23] ئەگەر ئەم وتەیە بۆ دەستەواژەیەکی ناتۆتالیتاری وەربگێڕین، بەم مانایەدێت: دەمەوێت جەنگێك هەلایسێنمو هەمو یەهودییەکانی ئەوروپاش بکوژم. بەهەمان شێوەش سالی 1930 ستالین گوتارێکی لەبەردەم کۆمیتەی نێوەندی حیزبی کۆمۆنیستدا خوێندەوە، ناوەرۆکی گوتارەکەی بۆنی ئەوەی لێدەهات رێگەی بۆ کوشتنی خەڵکانی چەپو راستی حیزب خۆشبکاتو بەخەڵکانێکی وەسفدەکردن کە نوێنەرایەتی "چینی روولەمەرگ"[24] دەکەن لە کۆمەڵگەدا. ئەم پێناسەیە تەنها گوڕوتینێکی تایبەتی بەپاساوە ناوبراوەکەی ستالین نەبەخشی، بەڵکو بەشێوازێکی تۆتالیتاریانەی ئاشکرا پێشبینی لە ناوبردنی ئەو کەسانەی روو لەمەرگن راگەیاند. لەهەر دوو حالەتەکەشدا یەك ئامانج دێتەدی: لەنێوبردنی

مرۆڤـەكان بـەپێی پرۆسـەیەكی مێـژوویی ئەنجامـدەدرێ كـە لـەو پرۆسـەیەدا، ئەوەی بەسەر مرۆڤدا دێت، بمانـەوێت و نەمانـەوێت، بـەپێی یاسایەكی نـەگۆڕ، هەر دەبێ روودبدات. كوشـتنی قوربانیـەكان بـەدیهاتنی پێشبینیەكانی دونیـای غەیبانیەتـە: جگـە لـەو روداوانـەی پێـشبینكراوە، هـیچ روداوێكـی دی رونادات[25] چ جیاوازییەك هەیە كە "یاساكانی مێژوو" زەنگی نەمان بۆ چینە حوكمـدراوەكان و نوێنـەرەكانیان لێبـدات، یـا "یاسـاكانی سروشـت" ئـەو رەگەزانەی لە هەمو روویەكەوە شایستەی ژیان نین، لەنێوبەرێت . دیموكراسی، یـەهودی، مرۆڤـە نەوییـەكانی ئـەوروپای رۆژهـەلات یـا ئـەو نەخۆشـانەی چارەسـەریان نیـە . هیتلـەریش بەرێكـەوتێكی سـەیر لەسـەر "چینی روو لـە مەرگ"، ئەوانەی دەبێ " بەبێدەنگی لەناوببرێن" قسەی كردبو[26]

میتـۆدی پروپاگەنـدەی تۆتالیتـاری كـە بـەپێی پێشبینیەكان چارەنوسـی دوژمنـان و لـەنێوبردنیان دیاریـدەكات، وەك هـەمو میتۆدەكـانی پروپاگەنـدەی تۆتالیتاری لەدوای دەسەلات گرتنەدەست بەتـەواوەتی كارپێـدەكرێ. گفتوگۆ كـردن دەربـارەی پێـشبینیەكانی دیكتـاتۆر بـە ئەندازەیـەك ناسروشـتییە وەكئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ پیاوكوژێك بكـەیت لەسـەر ئەوەی قوربانیە تازەكـەی زیندوە یا مردوە، چونكە پیاوكوژەكە هـەر بەكوشتنی قوربانیەكـەی دەتوانێت بەزوویی راستی وتەكانی بسەلمێنێت. بەلام تاكە بەلگەیەك لـەو هەلومەرجـەدا پشتی پێببەسترێت، خێرا فریاكـەوتنی ئـەو كەسـەیە كـە پێشبینی كوشتنی لێدەكرێ. سـەركردە جەماوەرییـەكان لـە پێشئەوەی دەسـەلات بگرنەدەست و بتـوانن ملـی راسـتی لـەپێناوی بەرژەوەنـدی درۆ هەڵبەسـتراوەكانی خۆیانـدا بـشكێنن، بێـزاری و رقلێبونەوەیـەكی تـەواو بەرامبـەر بـەخودی واقیـع لەپروپاگەنـدەكانیان بەدیاردەكـەوت[27] چـونكە بـەپێی دیدوبۆچـونیان واقیـع بەتەواوەتی پەیوەستە بەدەسەلاتی ئەو كەسەی دەتوانێت دروستی بكـات. ئـەو وتەیـەی دەڵێـت میترۆكـەی مۆسـكۆ تاكـە مـیترۆی جهانـە، تـەنها كاتێـك بـەدرۆ دەكەوێتەوە كە بۆلشەفیكەكان نـەتوانن هـەمو میترۆكـانی دی جهان لەناوبـەرن.

بەگوزارشتێکی دی، ڕەوشی پێشبینییە بێهەڵەکان لە هەمو پروپاگەندە تۆتالیتارەکانی دی کاراتر دوا ئامانجی لە داگیرکردنی جهاندا ئاشکرا دەکات، چونکە سەرکردەی تۆتالیتار تەنها کاتێك دەتوانێت گشت پێشبینیە درۆزنەکانی بهێنێتەدی کە جهان بەتەواوەتی بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

زمانی زانستگەری پەیامبەرانە بە ڕاستی وەڵامی پێداویستیەکانی ئەو جەماوەرە دەداتەوە کە خاڵی پەیوەندییان بەم دونیایەوە گومکردوە، ئێستاش ئامادەیە بچێتە ڕیزی ئەو هێزە جاویدانو بەتوانایەوە کە تەنها لەرێگەی ئەوەوە مرۆڤی مەلەوانکار لەنێو دوژمنو شەپۆلەکاندا بە کەناری دڵنیایی دەگەیەنێت. نازییەکان دەیانوت: "ئێمە ژیانی میللەتو ئیدارەکەمان بە باشترین شێواز لەگەڵ یاساکانی جینناسیدا دەگونجێنین"[28]، هەروەکو چۆن بۆلشەفیەکانیش دۆستو لایەنگرەکانی خۆیان دڵنیادەکردەوە کە هێزی ئابوری، بەهای بریارێکە لە بریارەکانی مێژوو. بۆیە بەڵێنی سەرکەوتنیان بە خەڵکی دەدا، سەرکەوتنێك کە سەربەخۆیە لەشکستو نسکۆیی "کاتی"ی جێبەجێ کردنی هێندێك پرۆژەی تایبەتی. لە ڕاستیدا جەماوەر بەپێچەوانەی چینەکانەوە سەرکەوتنو پێشکەوتنی ڕەهایان بە سادەترین شێوە دەخواست، چونکە ئەو جەماوەرە بەخاتری بەرژەوەندی تایبەتیو کۆمەڵ پێکەوە نەبەسترابونەوە کە بۆ مانەوەوەو بەردەوامی خۆیان وەك تیمێك هەست بەزەرورەتی دەکەنو جەختی لەسەر دەکەنەوە، تەنانەت ئەگەر هەمو بارودۆخەکان لەدژی بوەستێتەوەو بەهیچ جۆرێکیش بەخت یاوەری نەبێت. جەماوەر ئەو مەسەلەیەی بۆ گرنگ نەبو کە سەرکەوتنی تیا بەدەستدەهێنێت یا ئەو پرۆژە تایبەتەی دەشێت سەرکەوتنی تەواوی تیا بەدەست بهێنێت، بەڵکو سەرکەوتن لە هەمو مەسەلەیەكو پێشکەوتن یا دەستپێشخەری لە هەر پرۆژەیەکدا لەلای گرنگ بو.

پروپاگەندەی تۆتالیتاری، لەتەکنیکی پروپاگەندەی تایبەت بە جەماوەر بەدیاردەکەوێت، بەڵام نە داهێنانی تیا دەکاتو نە ناوەرۆکی بۆ دەخوڵقێنێت.

دەسـپێکی ئیمپریـالیزمو داڕوخـانی دەوڵـەتی نەتـەوەیی و دەرکـەوتنی هەرچیوپەرچی لەسەر شانۆی سیاسەتی ئەوروپا لە پەنجا ساڵی رابردودا ئەو هونـەرو بابەتـە ناوبراوانـەی بـۆ پروپاگەنـدەی تۆتالیتـاری فەراهـەمکرد. وتەبێژانی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، چەشنی رێبەرە جەماوەرییەکانی پێشو، بەرامبەر ئەو بابەتانەی پروپاگەندە باوە حیزبییەکان یا رای گشتی فەرامۆشیان دەکرد یا نەیاندەوێرا خۆیان لەقەرەی بدەن، هەستێکی راستو دروستیان هـەبو. هـەمو شـتە شـاراوەکان بـەبێ ئـەوەی نـاوەرۆکێکی گرنگیـان هـەبێت، مانایەکی زۆریان پەیداکرد. هەرچیوپەرچی لەو باوەڕەدابو راستی هەمان ئەو شتەیە کە کۆمەڵگەی پێشکەوتو پەردەی بێدەنگی بەسەرا داداوەتەوە یا بە گەندەڵییەکانی پەردەپۆشی کردوە.

ئەگەر ئـەو کەسـانە بـۆ هەڵبـژاردنی بابـەتێکی پروپاگەنـدەیی بانگهێشت بکـرێن، نـەك هـەر ئاسـتی نهـێنی، بـەڵکو خـودی نهـێنی پێـوەری یەکـەمی هەڵبـژاردنی بابەتەکەیان دەبێت. سەرچاوەی نهێنیەکان گرنگییەکی ئەوتۆی نیـە: رەنگـە ئارەزویـەکی ئاراسـتەکراو ئـەو نهێنییـە بپارێزێـت کـە لـەرووی سیاسییەوە قابیلی پـەیبردن بێت، هەروەکو لەحاڵـەتی هـەواڵگری بریتانیا یا نوسـینگەی دوەمـی فرەنـسا، یـا پێدوایـستیەکانی پیلانگێـڕی تیمـە شۆڕشـگێڕەکانی لـە بابـەت گروپـە تیرۆیـستو ئانارچیـستو ئـەوانی دی دەبینرێ، یا بونیاتی ئەو کۆمەڵانەی کە هـەر لە بناغەوە نـاوەرۆکێکی نهێنیـان هـەبوەو دەمێکـە کـاری ئاشـکرا دەکـەنو تـا ئێـستاش سـروتەکانیان بڕێـك لـە نهێنی تیایە (وەك تیمەکانی ماسۆنیزم)، یا ئەو خورافاتە دێرینانەی ئەفسانەی هێندێك گروپی هۆنیوەتەوە (مەسیحیو یەهودییەکان). بێگومان نازیـەکان لـە هەڵبـژاردنی ئـەو جـۆرە بابەتانـەدا لـە بۆلـشەفیکەکان لێهـاتوتر بـون، بـەڵام بۆلشەفیکەکانیش هێدی هێدی ئـەم هونـەرە فێربـون . ئەگـەر چـی بەدەگمـەن پشتیان بە نهێنی نەریتە پەسەندکراوەکان دەبەست، بەڵکو نهێنی داهێنەرانەی تایبـەت بـە خۆیـان هـەبو ـ لـە سـاڵی 1930 بـەدواوە، پیلانگێـڕی جهـانی

تەمومـژاوی و نهێنیئـامێز یـەك لـەدوای یـەك لەپروپاگەنـدەی بۆلـشەفیکەکان پەیدابون: سەرەتا پیلانی تروتسکییەکان، ئنجا پیلانی دوو سەد خێزانی و لە کۆتایشدا دەسیسە دزێوەکانی ئیمپریالیزم (واتە جهانی) کە هەواڵگری نهێنی بریتانیا یا ئەمریکا ئەنجامیدەدا(29)

کـارایی ئـەمجۆرە پروپاگەندەیـە یـەکێك لـە خەسـڵەتە سـەرەکییەکانی جەماوەری هاوچەرخ ئاشکرا دەکات. جەماوەر بڕوای بە شتی بینراو و واقیعی ئەزمونی کەسی و بڕوای بەگوێ و چاوەکانی نیە، بەڵکو تەنها بڕوای بە زەین هەیە، زەینێك کە هەمو شتێکی گشتگیرو یەکانگیر کاریگەری لەسەر دەبێ. لە راسـتیدا فاکتـەکان قەناعـەت بەجـەماوەر ناکـەن، تەنانـەت ئەگـەر فـاکتێکی داهێنەرانـەش بێـت، بـەڵکو یـەکانگیری ئـەو سیـستەمەی بەرووکـەش بەشێکی دانـەبڕاوی پێکـدەهێنێ، قەناعـەتی پێـدەهێنێت. بۆیـە ئـەوەی رەخنـەگران و خـەڵکی لەسـەر گرنگـی دوبارەکردنـەوە لـە پروپاگەنـدەی ئاراسـتەکراودا کۆدەکاتـەوە، ئەوەیـە کـە پێیـان وایـە جـەماوەر توانـای تێگەیـشتن و وەبیرهێنانەوەی نیە، لەراستیدا دووبارە کردنەوە تەنها لەو رووەوە گرنگە لە زەمەنێکدا بەیەکانگیری دیاردەیەك قەناعەت بەجەماوەر بهێنێت.

جەماوەر بۆ کاراکتەرە کتوپڕو رێکەوتەکانی واقیع ملنادات. ئەگەر مرۆڤ پێی وابێت جـەماوەر پێشوەخت بـۆ قبـولکردنی هـەمو ئایـدیۆلۆجیاکان ئامادەکراوە، لەبەر ئـەوەی جـەماوەر واقیـع وەك نمونەیـەکی بێگـەردی یاسا لێکدەداتـەوە و ئـەو رێکەوتانەش بەلاوەدەنێت کە داهێنـەری دەسەلاتێکی بالا و گەردونی ئەوتۆ بێت هەمو روداوەکانی لێبکەوێتەوە. بۆیە پروپاگەندەی تۆتالیتاری بە خۆدزینەوە لە واقیعەوە بۆ ئەفسانە، لەرێکەوتەوە بەرەو یەکانگیری گەشەدەکات.

بێتوانـایی سـەرەکی پروپاگەنـدەی تۆتالیتـاریزم لەوەدایـە کـە ناتوانێـت حـەزەکانی جـەماوەر لـە بینـینی دونیایـەکی بـە تـەواوەتی یـەکانگیر تێـر بکـات، دونیایـەك قـابیلی تێگەیـشتن و پێـشبینیکردن بێـت، بـەبێ ئـەوەی ململانێیـەکی ترسناك لەگەڵ هەستێکی هاوبەشدا نەکات. بۆ نمونە ئەگەر لە یەکێتی سۆڤیەتدا

هەمو " دانپیانانەکانی" ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی یەك گوزارەیان هەبێت و دان بە یەك پاڵنەردا بنێن، جەماوەری تینوی یەکانگیر ئەو وەهمە وەك سەلماندنێکی مەزن وەردەگرێت کە گوزارشت لە راستگۆیی دانپیانانەکان دەکات، ئەمە لە کاتێکدا هێزی تەندروست ئاگادارمان دەکاتەوە ئەو یەکانگیرییە هیچ پەیوەندیەکی بە زانستەوە نیەو هەڵبەستراوی دانپیانانەکان دەسەلمێنێ. بە وشەیەکی خواستراو، وەکئەوەی پروپاگەندەی تۆتالیتاری بیەوێت ئەو وێنەیە دەربخات کە جەماوەر خوازیارە روداوی پەرجوئامێزی سپتواجنت Septuagint . بەردەوام وەك خۆی دوبارە بکاتەوە، کاتێك حەفتا وەرگێڕی جودا لەیەك، کتێبی پیرۆزی سەردەمی کۆنیان وەکیەك وەرگێراوەتە سەر زمانی یۆنانی. هەر چەندە عەقلی تەندروست ئەم وەرگێڕانە تەنها وەك ئەفسانە یا پەرجو قبوڵدەکات، بەڵام سەرباری ئەوەش دەتوانرێ ئەم ئەفسانەیە وەك گەواهییەك لەسەر بەڵگەی ئەمانەتی وشە بە وشەی وەرگێرانەکە لەبەرچاو بگیرێت.

بە گوزارشتێکی دی، ئەگەر راست بێت جەماوەر بەهۆی دەربەدەری و پربوونی بادەی سەبری لەبەرامبەر دیاردەی رێکەوت و دەرەتێگەیشتن ژیان هەمیشە ئارەزوی راکردن لە واقیع دەکات، ئەوا دیسانەوە ئەوەش راستە تینوێتی جەماوەر بۆ ئەفسانە پەیوەندییەکی دیاریکراوی لەگەڵ زەینی مرۆڤایەتیدا هەیە کە بونیادە یەکانگیرییەکەی پەلە لە داڕوخانی هەمو رێکەوتێکی بێخەوش و بێگەرد دەکات. راکردنی جەماوەر لە واقیع شەرمەزارکردنی دونیایەکە کە لەلایەکەوە ناچارە ژیانی تیا بەسەر بەرێت، لەلایەکی دی بوونی لەو دونیایەدا نیە، چونکە رێکەوت تیایە بوە بە یاسایەکی نمونەیی و زۆرجار مرۆڤ پێویستی هەیە بەوەی هەلومەرجی بێسەروبەرەیی و راگوزەری بەشێوەیەکی نەگۆڕ بۆ یەکانگیرییەکی رێژەیی بگۆڕێت. راپەڕینی جەماوەر لە دژی "واقیعبینی" هەستی هاوبەش و هەمو "ماقوولییەکی جهانی . ئەگزیستانسیالیستی . (بەگوزارەی بۆرك) دەرئەنجامی بە ئەتۆمیبون و لەدەستدانی پێگەی کۆمەڵایەتی بو. هەروەها لە هەمان کاتیشدا جەماوەر هەمو

بوارەکانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە دەستدەدا کە مانایەك بە هەستی هاوبەش دەبەخشێت. سەرەئەنجام لە سایەی ئەم داماڵینیە رۆحی و کۆمەڵایەتیەدا جێگەیەك بۆ دیدێکی هەڵسەنگاندن لەسەر پەیوەندی نێوان هەرەمەکی و پێشبینکراو و لە نێوان راگوزەری و زەرورەت نامێنێتەوە. بۆیە پروپاگەندەی تۆتالیتاری تەنها کاتێك دەتوانێت سوکایەتی بە هزری تەندروست بکات کە ئەو هزرە بەهاو گرنگی خۆی لەدەست بدات. جەماوەر لە دوڕیانی روبەروبونەوەی گەشەسەندنی ئاژاوەو بەرهەڵستی هەرەمەکی داروخانی تەواودا، یا ملکەچکردن بۆ ئایدیۆلۆجیایەکی یەکانگیری زۆر دڵڕەقانەو بارگاوی بە وەهمێکی سەیروسەمەرە، هەمیشە ئاراستەی دوەم هەڵدەبژێرێت، ئەویش نەك لەبەر ئەوەی جەماوەر کاڵفامە یا لادەرە، بەڵکو راکردنی لە واقیع، لە نێو کارەساتێکی سەرتاپاگیردا، لانی کەمی رێز لە خۆگرتنی بۆ دەستەبەر دەکات.

ئەگەر پروپاگەندەی نازیزم تاسەی جەماوەری بۆ یەکانگیری دەقۆزستەوە، ئەوا میتۆدەکانی بۆلشەفیزمیش هەوڵیان دەدا، کاریگەری هێزی یەکانگیری لەسەر ئەو مرۆڤەی ئینتمای بۆ جەماوەری گۆشەگیر هەیە، روونکردنەوەیەکی تاقیگەیی بکەن. کاتێك سیاسەتی پۆلیسی نهێنی سەرسام بو لەوەی قوربانییەکانی بە تاوانێك قاییل بکات کە نەیانکردبو، زۆرجاریش لە پێگەیەکدا نەبون ئەو تاوانانە ئەنجامبدەن، بۆیە قوربانییەکانیان لە یەکتری جیادەکردەوەو بە جۆرێك لە هەمو فاکتە واقعیەکانیان دادەبڕین کە تەنها لۆجیك و تەبایی ئەو حیکایەتە جیاوازانەی لە دانپیانانەکانیاندا هاتوە، بەسەر مێشکیاندا زاڵبێت. ئەو دەمەی هێڵی یەکلاکەرەوەی نێوان ئەفسانەو واقیع لەگەڵ دزێویی تاوانبارکردن و یەکانگیری دەرونی تێکەڵ بەیەکدەبێت، نەك تەنها پێویستی بە توانای بەرگری کەسایەتی مرۆڤەوە هەیە بەرامبەر بەهەڕەشە بەردەوامەکان، بەڵکو ئەو متمانە بەرزەش بە بوونی هاوشێوەکان (کەسوکار یا هاوڕێ و دراوسێ) پێویستە، ئەوانەی هەرگیز باوەڕیان بەو

حیکایەتی تاوانبارکردنە نەبو، بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەرامبەر ئەزمونی تەسلیمبون بە توانای تاوانێکی ئەبستراکت بەرگری بکات.

بێگومان ئەم نیشانەی شێتیە تەنها لە جهانێکی تۆتالیتاریدا بەشێوەیەکی ساختەیی دەخولقێنرێت. بە هەر حاڵ ئەم کارە بەشێکی دانەبڕاوی دەزگای پروپاگەندەی رژێمە تۆتالیتارەکانەو تا رادەیەکیش لایەنی یاسایی لە دەستدەدا، چونکە ئەم رژێمانە داننان بە گوناه بە مەبەستی سزادان بە پێویست نازانن. لە کاتێکدا "دانپیانان" لە تایبەتمەندییەکانی پروپاگەندەی بۆلشەفیزم بو، لە پروپاگەندەی نازیزمدا وەك خۆهەڵکێشانێکی ورووژێنەری سەیر بەدیاردەکەوت کە لە رێگەی ئیدارەیەکی رابردوییو ئیرتجاعیەوە یاسای تاوانەکانی دادەڕشت. بەڵام یەك ئامانج لە هەر دوو حاڵەتەکەدا هەیە، ئەویش کۆمەڵگە یەکانگیر بێت.

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پێشئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست سروش بۆ دامەزراندنی جهانێك دەکەن لەگەڵ بیروباوەریاندا یەکانگیر بێت، دونیایەکی خەیاڵیو رەگەز هارمۆنی کە پێداویستیە دەرونیەکانی مرۆڤ لە خودی واقیع باشتر دەستەبەر بکات، چونکە جەماوەری بێڕەگوریشە تەنها لەرێگەی خەیاڵێکی پەتیەوە هەست بە ئۆقرەیی دەکاتو لە لێدانە بێکۆتاییەکانی دەپارێزێت کە ژیانی واقیعیو ئەزمونەکانی روبەروی مرۆڤ و ئارەزوەکانی دەکاتەوە. بۆیە هێزی پروپاگەندەی تۆتالیتاری لەو توانا مەزنەیەتی کە پەیوەندی نێوان جەماوەرو جهانی واقیعی لێکدادەبڕێت . ئەوەش پێشئەوەی بزوتنەوە دەسەڵاتی ئەوە پەیدا بکات بەرامبەر بە هەر کەسێك کە بخوازێت بە پنتێك لە واقیعیەت، ئارامی ئەوجهانە ترسناکە وێناکراوە بشێوێنێت، پەردەی ئاسنین داداتەوە. بەڵام تاکە نیشانەیەك کە جهانی واقیعی بە گوێی جەماوەری لێکترازاویدا بدات . جەماوەر لەگەڵ هەر لێدانێکی تازەی بەدبەختی زیاتر فریو دەدرێت . خاڵە لاوازەکانی ئەو جهانەیە. لە رووی لاوازییەوە جهانی واقیعی لێکۆڵینەوەی ئاشکرا دەربارەی مەسەلەکانی ناکاتو ئازایەتی ئەوەی تیانیە

بەرپەرچی واتەواتەکان بداتەوە، ئەگەرچی ئەو واتەواتانە بەشێوازێکی زێدەڕۆیانەو شێواوانە بەر خاڵە لاوازەکانی دەکەوێت. کەواتە، ئەم خاڵە هەستیارانە دەرفەتی توخمی راستگۆیی و ئەزمونی واقیعی بە پروپاگەندەی تۆتالیتاری دەبەخشێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی واقیع و وەهم لە یەکتری جیادەکەنەوە.

تەنها تیرۆر پشت بە ئەفسانەیەکی پوخت دەبەستێت، بەلام تەنانەت ئەفسانە ساختەکانی رژێمە تۆتالیتارەکانیش کە بە تیرۆر پشتگیریان لێدەکرێت، هێشتا هەر بەتەواوەتی هەرەمەکی نیە، ئەگەر چی ئەو ئەفسانانە بەگشتی لە ئەفسانەکانی بزوتنەوە درێوترو بێئابڕوترە. (مرۆڤ پێویستی بە لێهاتویی نیە، بەڵکو پێویستی بە توانا هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت فۆرمی نوێی شۆڕشی روسیا بلاوبکاتەوە، ئەو شۆڕشەی کەسێکی بە ناوی تروتسکییەوە تیا نیە کە فەرماندەی لەشکری سور بوبێت). لەلایەکی دی، بانگهێشتی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان زۆر وردترو بەسەلیقەترە، چونکە بەهەمو دیاردەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسییەوە پابەند دەبێت کە بۆ خەڵکی عەوام نادیارن. لەوەشدا بە باشترین شێوە سەرکەوتو دەبێت، کاتێک دەسەلاتەکان بە کەشوهەوایەکی نهێنی دەورە دەدرێن. ئەو درۆیانە لە پێش چاوی خەڵکی بەرزترین پلەی "واقعبینی" پەیدا دەکات، چونکە کاروبارێکی راستەقینەی ئەوتۆ چارەسەر دەکات کە لە چاوی خەڵکی شاردراوەتەوە. بەهەر حاڵ، هەواڵی ئاشکرابونی ریسواییەکانی ژیانی کۆمەڵگەی سەرمایەداری و گەندەڵی سیاسەتمەداران و ئەو شتانەی پەیوەندی بە رۆژنامەی وروژێنەرئامێزەوە هەبێت، پروپاگەندەکارانی بزوتنەوە دەیکەن بە چەکێك کە لە چەکی ئاسایی گرنگتر بێت.

کاراترین ئەفسانەی پروپاگەندەی نازییەکان داهێنانی پیلانی جهانی یەهودییەکان بو. لە راستیدا سوربون لەسەر پروپاگەندەی دژ بە سامییەت لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە رێبازێکی باوی دیماگۆکیەکان بو، لە بیستەکانی

سـەدەی بیستیـشەوە لـە ئـەڵمانیاو نەمـسا بـرەوی پەیـداکرد. تـا حیـزبو دەزگاکـانی رای گـشتی لـە گفتوگـۆکردن دەربـارەی مەسـەلەی یەهودییـەکان دوورەپـەرێز بوایـە، هەرچیوپەرچـی زیـاتر قەناعـەتیان بـەوە دەهێنـا کـە یەهودییـەکان نوێنەرایـەتی راسـتەقینەی هێـزە باوەکـان دەکـەنو مەسـەلەی یەهودیش هێمای پۆخڵیو بێئابڕوویی سەرلەبەری رژێم بو.

نـاوەرۆکی پروپاگەنـدەی دژە سـامییەت، نـە بەتـەنها مۆنۆپـۆڵی نـازیو نـە شتێکی نوێو رەسەنیش بو. بانگەشەکانی هەبونی پیلانێکی جهانی یەهود لە مەسـەلەی درایفۆسـەوە بـرەوی پەیـداکردوەو پـشت بـە پەیوەنـدی هاوبەشـی نێودەوڵەتی گەلی یەهود دەبەستێت کە لە سەرتاسەری جهاندا بڵاوبوبونەوە. گومـانو وێنـاکردنی لـە رادەبـەدەر دەربـارەی دەسـەڵاتی جهـانی یـەهود لـەو درۆیانەی سەرەوە دێرنترە، تەنانەت دەکرێ بۆ کۆتـایی سـەدەی هەژدەهـەمیش بگێڕدرێتەوە، کاتێك پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان بازرگانانی یـەهودو دەوڵـەتی نەتەوەیی شێوەیەکی ئاشکرای هـەبو. بـەڵام ئـەوەی یـەهود نوێنەرایـەتی هێـزی شەڕەنگیزی بەرجەستە دەکات، بەشێوەیەکی گشتی بۆ پاشماوەی کردەوەی دوژمنکارانـەو یـادەوەری خورافیانـەی سـەدەی ناوەراسـت دەگەڕێتـەوە، لـە راستیدا ئـەو نوێنەرایـەتی کردنـە پەیوەندییـەکی تونـدو تـۆڵی بـە رۆڵـی تـازەو تەمومژاوی یەهودەوە هەیە کە لـە کۆمەڵگـەی ئـەورووپی وازیـدەکرد، ئـەو رۆڵـەی لەساتەوەختی رزگاربونیانەوە لە دیلێتی بابل وێنەی نەبوە. بێگومان یەهود لـە قۆناغی دوای جـەنگی جهـانی یەکەمـەوە لـە هـەمو کـاتێکی دی زیاتر هـەنگاوی مەزن دەنێن.

لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا، یـەهود پێیوابـو خـاڵی هـەرە گـرنگ لـەو ژاوە ژاوەی دەوروبەریان بریتیە لەوەی رێك لەدیدێکی پێچەوانەوە تەماشای پێگەی راستەقینەو پلەی توانایان دەکرێ، بۆیە هەر کەمکردنەوەیەك لە سەقامگیریو هێزی دەوڵـەتی نەتەوەیی، پێگەی کۆمەڵایەتی یەهودیش لێدانێکی راستەوخۆی بەردەکەوێت. لەبەر ئـەوەی بردنـەوەی نەتـەوە لـە حکومـەت بردنەوەیـەکی سـەرکەوتو نـامێز بـو، بۆیـە

نەیدەهێشت ئامرازی حکومەت لەسەروی چین و حیزبەکانی کۆمەڵگەدا، پاریزگاری لەپێگەی خۆی بکات، بەمشێوەیە هاوپەیمانێتی لەگەڵ توێژێکی دانیشتوانی یەهود کە خۆی لە دەرەوەی ریزەکانی کۆمەڵگەدا دەبینییەوەو لەئاست سیاسەتی حیزبەکانیشدا کەمتەرخەم بو، هیچ سودێکی نەبو. بەلام زیادبوونی گرنگی بۆرجوازی ئیمپریالیزم بە سیاسەتی دەرەوەو کاریگەری راستەوانەی بەسەر میکانیزمی دەوڵەتدا، روبەروی رەتکردنەوەیەکی سەرکێشانەی زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەمەندەکانی یەهود بووە، کە لە پێناوی بەرژەوەندی پرۆژە ئەندازەییەکان، دەست لە نەریتی کۆنی بازرگانی بانکی هەڵگرن. هەمو ئەو فاکتەرانە پێکەوە جۆرە سنورێکی بۆ بەرژەوەندی یەهود دانا بەرامبەر بە دەوڵەت، هەروەها کۆتایی بەو دەستکەوتانەش هێنا کە لە جیاوازییە کۆمەلایەتییەکانەوە بەدەستیان دەهێنا، هەروەکو پێشتر باو بو. لە راستیدا یەهودییەکانی ئەوروپا لە دوای جەنگی جهانی یەکەمەوە تێکەڵ بە میللەتانی ئەوروپا بون، هەروەکو چۆن یەهودییەکانی فەرەنسا لە سەرەتای کۆماری سێیەمی فەرەنسادا ئەو کارەیان کرد.

بێگومان وڵاتە پەیوەندیدارەکان ئاگایان لە گۆڕانکاری هەڵویستی یەهود هەبو، بۆیە ساڵی 1917، حکومەتی ئەڵمانیا بەپێی نەریتێکی زۆر کۆن، یەهودییەکانی ئەڵمانیای بەکارهێنا بۆ ئەوەی رێگە لەبەردەم گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵ هاوپەیماناندا خۆشبکات. بەلام حکومەتی ئەڵمانیا لە جیاتی ئەوەی رووبکاتە نوێنەرە راستەقینەکانی یەهود، روویکردە کەمایەتییەکی بچوکی زایۆنیزم کە کاریگەرییەکی ناچیزیان لەسەر یەهود هەبو. فەرمانرەوایانی ئەڵمانیا هێشتا بروایان بەم کەمایەتییە مابو، لەبەر ئەوەی جەختیان لەسەر بونی گەلی یەهود وەك نەتەوەیەکی سەربەخۆو جیاواز لە نەتەوەکانی دی ئەوروپا دەکردەوە، لەمرووەوە دەکرا لەسەر هەمان شێوازە کۆنەکەی جاران، بە مەبەستی خزمەتکردن لەبواری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکاندا سودیان لێوەربگیرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو دەستپێشخەرییە بەرامبەر بەیەهود، هەڵەیەکی فەرمانرەوایانی ئەڵمانیا بو: زایۆنیزمەکان کارێکیان

دەکرد کە پێشتر هیچ بانکدارێکی (مصرفی) یەهودی هەرگیز پێی هەڵنەسابو، بەوەی مەرجی تایبەتیان دادەناو دەیانوت تەنها دەربارەی ئاشتی گفتوگۆ دەکەن، بێئەوەی قسە لەسەر قەرەبو کردنەوە یا لکاندنی خاك بکەن[30]. بەمشێوەیە قۆناغی کەمتەرخەمی یەهود لەسەر مەسەلە سیاسییەکان بەسەرچو، بۆیە ئیدی ئەستەم بو زۆرینەی یەهود بەکاربهێنرێت، لەبەر ئەوەی بەشێك بون لە میللەت، ئەمە لەکاتێکدا کارکردن لەگەڵ کەمایەتی زایۆنیزمدا بێبەر بو، چونکە بیروباوەری سیاسی تایبەت بە خۆیان هەبو.

دامەزراندنی سیستمی کۆماری لە جێی سیستمی پاشایەتی لە ئەوروپای نێوەندا، لێکترازاندنی یەهودییەکانی کامڵتر کرد، هەروەکو چۆن دامەزراندنی کۆماری سێیەم لە فرەنسا لە پەنجا ساڵی رابردودا هەمان کاری ئەنجامدابو. لە راستیدا یەهودییەکان زۆرێك لە کاریگەری خۆیان لەدەستدابو، چونکە سیستمە نوێیەکان لەهەلومەرجێکدا دامەزرابون کە هیچ توانایەك یا بەرژەوەندیەکیان لە پاراستنی یەهودا نەبو. لە کاتی گفتوگۆی ئاشتی ڤرسای، یەهود زیاتر وەك پسپۆر سودیان لێوەرگیرا، تەنانەت خودی دژە سامییەکانیش دواجار ملیاندا کە زۆرینەی جەمبازە بچوکەکانی یەهود، ئەوانەی لە دوای جەنگ هاتبونە ئەوروپا، هیچ پەیوەندییەکیان لەگەڵ بەناو نوێنەرانی نیونەتەوەیی یەهودەوە نەبو[31] ( تازە هاتوەکان لە پشت ئەو چالاکیە گزیکارانەی بە روونی لە هاودینەکانی خۆیانی جیادەکردنەوە، بەرامبەر بەو رێسایانەی لە چواردەوریاندا کارپێدەکرا، رێچکەیەکیان گرتەبەر تا رادەیەکی زۆر لە کەمتەرخەمی یەهودییە کۆنەکان دەچو).

لەنێو دەستە جۆراوجۆرەکانی گروپە دژە سامییەکان و لە کەشوهەوایەکی بارگاوی بە دژایەتیکردنی سامییەت، پروپاگەندەی نازییەت رێبازێکی گرتەبەر، بە تەواوەتی لە هەمو گروپە دژ بە سامییەکانی دی جیاوازترو بالاتر بو. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ دروشمێکی نازی نوێ یا داهێنەرانە نەبو . تەنانەت

ئەو وێنە ژیرانەیەی هیتلەرییەکانیش لەسەر ململانێی چینایەتی شتێکی تازە نەبو کە بازرگانە چاوچنۆکە یەهودییەکان لەیەک کاتدا هەم کرێکاران دەچەوسێننەوەو هەم هانیان دەدەن دەست بە راپەرین بکەن[32] بەڵام تاکە رەگەزی نوێ لە بانگەوازی حیزبی نازیدا بریتی بو لەوەی داوایان لە ئەندامانی خۆیان دەکرد رەچەڵەکی نا یەهودی بوونیان بسەلمێنن، ئەمە سەرباری بەرنامەی فیدەر[33] Feder کەچی لە دوای ئەوەی دەسەڵاتیان دەگرتەدەست ئەو رێوشوێنانە هەر بە ئاڵۆزیو تەمومژاوی مانەوەو تا کاتی جێبەجێ کردنیان هەرگیز ئاشکرا نەکران. بەهەر حاڵ مەسەلەی یەهودییەکان بەجۆرێك ببو بە کوانوی هەڵمەتی پروپاگەندەی نازییەکان کە چیدی دژایەتیکردنی سامییەت تەنها مەسەلەیەکی پەیوەست بە بیرورای کەمینەیەکی جیاکار لە زۆرینە نەبو، یا خەمێك بێت لە خەمەکانی سیاسەتی نەتەوەیی[34]، بەڵکو مەسەلەیەکی دەستەویەخەی ژیانی کەسێتی هەر تاکێك بو. ئەگەر کەسێك "رەچەڵەکنامەی" پاكو رێکوپێك نەبوایە، نەیدەتوانی ببێت بە ئەندامی حیزبی نازی، بۆیە تا رەچەڵەکی هەر ئەندامێك لە یەهودبوونەوە دوورتر بوایە لە ریزەکانی نازییەتدا پلەوپایەی بەرزتر دەبووە. بەهەمان شێوەش، بەڵام بە جۆرێکی نەرمتر، بۆلشەفیکەکان سەرکەوتنی حەتمی پرۆلیتارییان بە جۆرێك گۆڕی کە ئەندامەکانیان لە نێو پرۆلیتار زادەکانەوە هەڵدەبژاردو لە بەرامبەر ئەوەشدا پێگەی چینەکانی دییان بە سوكو ریسوا دەزانی[36].

پروپاگەندەی نازی ئەوەندە وشیار بو کە دەیتوانی دژایەتیکردنی سامییەت بە پرەنسیپێکی خۆرسك بگۆڕێتو لە هەمو هەڵبەزودابەزی بیروباوەرێکی رووت رزگاری بکات. لەمجۆرە پروپاگەندەیەدا تەنها وەك قۆناغێکی سەرەتایی و رێگەخۆشکەر پەنا بۆ قاییلکردنی دیماگۆگیەتی جەماوەر دەبرێو هەرگیز لە گوتارو بڵاوکراوەکانیاندا دەربارەی کاریگەری هەمیشەیی زیادەڕەوی نەدەکرا[37] دژە سامییەت بە جەماوەری پەرشوبڵاو و بێپێناسەو ناجیگیرو هیچ‌وپوچ، ئامرازی خۆناسینو ئاوێتەبونی دەستەبەر

کرد، نەك تەنها بەشێك لەو ڕێژەیان بۆ نۆژەنبکاتەوە کە پێشتر لە ڕێگەی کارکردنیانەوە لە کۆمەڵگە بەدەستیان هێنابو، بەڵکو سەقامگیرییەکی دروزنانەی ئەوتۆش لەلاناخیان بخوڵقێنێت کە شیاوترین کەسیان بۆ ڕێکخستن لێدروستبکات. بزوتنەوەی نازیزم بە هۆی ئەمجۆرە ڕاگەیاندنەوە توانی خۆی وەك درێژکراوەیەکی دەستکردی کۆڕی جەماوەری پێشانبداتو هەستە پوچو بێبەهاکان بە عەقلانییەت بکات، گرنگیو ئەمانەتێکی هیستیریاییش[38] بە تاکە گۆشەگیرەکانی کۆمەڵگەیەکی ئەتۆمی ببەخشێت.

بەهەر حاڵ هەمان پیادەکردنی هۆشمەندانەی ئەو دروشمانەی خەڵکانی دی لەپێش نازیەکان لەدوای ئەزمونکردنی دایانڕشتبو، نازییەکان مەسەلەی دییان پێچارەسەر دەکرد. لەکاتێکدا سەرنجی جەماوەر لەنێوان ناسیونالیزیمو سۆسیالیزم دابەش ببو، ئەو گومانەش باڵادەست بو کە ئەو دوو بیروباوەڕە ناکۆکە پنتی بە یەکگەیشتنی نێوان چەپو ڕاست پێکدەهێنن، دروست لەو کاتەشدا حیزبی سۆسیال ناسیونالی کرێکارانی ئەڵمانیا (واتە حیزبی نازی) پێکهاتەی یەکێتی نیشتمانی پێشنیاز دەکرد، ئەمەش ئیدیۆمێکە لەسەر چارەسەری ماناگەری Semantic بۆ خەسڵەتی دوانەیی "ئەڵمانی" و کرێکاری" کە ناسیونالیستی ڕاستڕەوو نێونەتەوەیی چەپڕەوی لەژێر یەك ئاڵادا یەکدەخست. خودی ناوی نازی کە بۆ بزوتنەوە هەڵبژێدرا ناوەرۆکی هەمو حیزبە سیاسیەکانی دی بۆ خۆی بردبو، بەشێوەیەکی ئاماژەیی هەمو حیزبەکانی لە خۆیدا بەرجەستە دەکرد. پێشتر هێندێك حیزب هەوڵیاندا ئەو بیروباوەرە سیاسیانە لەیەکبدەن (دمج) کە بانگەشەی جیاوازیبوونیان دەکرد(سۆسیال ناسیونال . سۆسیالیزمی مەسیحی)، لە هەوڵەکانیشیاندا سەرکەوتوبون، بەڵام نازییەکان ئەو لەیەکدانەیان بەجۆرێك ئەنجامدا وەکئەوەی هەمو ململانێ پارلەمانیەکانی نێوان سۆسیالیستو نەتەوەپەرستەکان، واتە لە نێوان ئەوانەی پێش هەمو شتێك خۆیان بە کارگەر ناوزەدە دەکردو ئەوانەی یەکەمجار خۆیان بە ئەڵمانی دەزانی، پەردەیەك بێت هەمو پاشینە ترسناکەکان

له پشتەوەی بشارێتەوە . ئایا ئەندامێکی حیزبی نازی هەمو ئەو شتانەی تیا بەدیناکرێت؟.

ئـەوەی شـایانی ئامـاژە کردنـە، نازییـەکان تەنانـەت لـە سـەرەتای دەسەلاتیشیاندا بێپەروا لە بەکارهێنانی دروشمی وەك دیموکراسی، کۆماریو دیکتاتۆریـەت یـا پاشایەتی دەسڵەمینەوە، چونکە هـەر یـەکێکیان دەلالـەتی لـەجۆرە سیـستمێکی تایبـەتی دەکـرد[39] وەکئـەوەی تـەنها لـەم مەسـەلەیدا بەتـەواوەتی درکیـان بەداهێنـەریی خۆیـان کردبێـت. بۆیـە دەربـارەی فـۆرمی داهـاتویی رژێمـی نـازی هـەمو گفتوگۆیـەك وەلاوەنـرا، وەکئـەوەی چەنەبازییەك بێـت لەسـەر دیاردەیـەکی رووت. دەوڵـەت لـە روانگـەی هیتلـەرەوە جگـە لـە ئامرازێـك بـۆ رزگـارکردنی رەگـەز هیـچی دی نـەبو، ئەمـە لـە کاتێکـدا دەوڵـەت بەپێی پروپاگەندەی بۆلشەفیزم ئامرازێکی ململانێی چینایەتی بو[40]

لەگەڵ ئەوەشـدا، پروپاگەنـدەی نـازی بەشـێوەیەکی چەواشـەکارانەو سـەیر وەلامـی چـییەتی (ماهیـەت) رۆڵـی داهـاتویی نـازیزمی دەدایـەوە: دەبوایـە "پرۆتۆکۆڵـەکانی پیرانـی زایـۆنیزم" وەك نمونەیـەك لـە پێنـاو رێکخـستنی داهـاتوی جـەماوەری ئـەڵمانیا بـەکاربهێنێت بـۆ ئـەوەی بـە "ئیمپراتۆرییـەتی جهـانی" چاوەروانکراو، بگـات. تـەنها نازییـەکان سـوودیان لـە پرۆتۆکۆڵـەکانی زایۆن وەرنەگرتبو، لەبەر ئەوەی لەپێش جەنگی جهـانی یەکەمدا سەدان هـەزار وێنەی ئەو پرۆتۆکۆلانە لە ئەڵمانیا فرۆشرا بو، هـەروەها بەکارهێنانیشی وەك رێنوێنیکـارێکی سیاسـی (دلیـل سیاسـی) شـتێکی تـازەش نـەبو[41]. بـەلام ئـەو رێنوێنکارە ساختەیە بە شێوەیەکی تایبـەتی بە مەبەستی لێخوێنـدنی یـەهود بـەکاردەهێنرا هەرچیوپەرچـیش لـە مەترسـی دەسـەلاتی یـەهود وشـیار بکرێتـەوە[42]. لـە راسـتیدا نازییـەکان بـە دیـدێکی پروپاگەنـدەیی رووت ئاشکرایان کرد، جەماوەر ترسێکی ناچیزی لە بالادەستی جهانی یەهود هەیەو گرنگییـەکی کـەمیش بەشـێوازی بـەدیهێنانی دەدات، بـەڵکو دەنـگو ناوبـانگی پرۆتۆکۆڵەکان لەسەر پایەی شەیدایيو ستایشکردنو تینوێتی لێوە فێربونیان

خۆی راگرتبو تا لەسەر بێزاریو رقلێبونەوەیان. بۆیە باشتروایە خەڵکی تا ئەو جێگەیەی لە توانایەتی خۆی لەگەڵ بەرجەستەترین فۆرمۆلەیدا بگونجێنێت. نمونەشمان لەسەر ئەو حاڵەتە دروشمێکی ناوداره: "هەق هەمان ئەو شتەیە کە بۆ میللەتی ئەڵمانیا باش بێت"، کە وێنەیەکی کتومتی دروشمی پرۆتۆکۆڵەکانە: "هەر شتێك لە بەرژەوەندی میللەتی یەهود بێت، بەپێی ئەخلاق راستو پیرۆزە"[43]

ئەو پرۆتۆکۆڵانە لە زۆر رووەوە بەڵگەنامەی سەیرو پڕ بایەخن. بەدەر لە میکاڤیلییە رووکەشەکەی، گرنگترینو جەوهەریترین خاسییەتی ئەوەیە، هەمو مەسەلە سیاسییە گرنگەکانی سەردەمەکەی بەشێوازێکی وڕێنەکارانەو ناعاقڵانە لەیەکتری نزیکدەکاتەوە. بەمجۆرە پرۆتۆکۆڵەکان وەك پرەنسیپ دژایەتی نەتەوەپەرستی دەکاتو دەوڵەتی نەتەوەیی وەك پەیکەرێکی زۆر زەبەلاح وەسفدەکات، بەڵام دوو پێی سیرامیك (فخار)ی هەبێت. بۆیە ئەو پرۆتۆکۆڵانە تێزی سەروەریی نەتەوەیی رەتدەکەنەوە، هەروەك هیتلەر دەڵێت، بڕوایان بە دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی جهانی هەیە، بەڵام لەسەر بنەمای نەتەوەیی[44] پرۆتۆکۆڵەکان بە هەڵایسانی شۆڕش لە وڵاتێکدا قاییل نابن، بەڵکو ئامانجیان داگیرکردنو کۆنترۆڵکردنی هەمو جهانە. ئەوانە پەیمان بە میللەتی یەهود دەدەن کە تەنها لە رێگەی رێکخستنەوە دەتوانرێ جهان کۆنترۆڵ بکرێ، بەبێ ئەوەی زۆریی ژمارەی دانیشتوان، بەرفراوانی خاكو توانای دەوڵەت لەبەرچاو بگیرێ. بێگومان بەشێك لە توانای قەناعەتپێکردنی ئەو پرۆتۆکۆڵانە لە رەگەزە خورافییە کۆنەکانەوە سەرچاوەی گرتبو. ئەو بیروباوەڕە نەگۆڕەی پێیوایە تیمی نێونەتەوەیی لە دێر زەمانەوە تاکو هەنوکە شوێن پێی هەمان ئامانجی شۆڕشگێڕانەی هەڵگرتوە، بیروباوەڕێکی زۆر کۆنە[45]، لە شۆڕشی فرەنساوە تاکو ئێستا لە ئەدەبیاتی سیاسی نهێنیدا رۆڵی هەیە، بەڵام تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەخەیاڵی هیچ کەسێکدا

نەهاتوە بنوسێت، ئەم "تیمە شۆڕشگێڕە"و "ئەم میللەتە تایبەتە، لەنێو هەمو میللەتانی شارستانیدا" میللەتی یەهودە[46]

لە نێو پرۆتۆکۆڵەکانی زایۆنیزمدا بابەتی پیلانی جهانی لە هەمو شتێکی دی زیاتر جەماوەری بەلای خۆیدا رادەکێشا، چونکە بەتەواوەتی لەگەڵ بارودۆخی دەسەڵاتی نوێدا دەگونجا. (کاتێك هیتلەر دەسەڵاتی گرتەدەست هەر بەزوویی بەڵێنی بەلایەنگرانی خۆیدا کە بزوتنەوەی نازیزم لە "سنوری تەسکی نەتەوەگەرای هاوچەرخ هەنگاوی زیاتر بنێت"[47]، لەراستیدا لەکاتی جەنگدا لە نێو دەزگای هەواڵگری ئەڵمانیا هەوڵدەدرا وشەی "نەتەوە" لە فەرهەنگی ناسیونال سۆسیالیست لاببرێت). لەدوایشدا وێنای ئەوەدەکرا تەنها هێزی جهانی بەختی مانەوەی سەربەخۆی هەیەو بە تەنها سیاسەتی جهانی دەتوانێت پەیامی مانەوەی هەبێت. ئایا لە سایەی هەلومەرجێکی لەوجۆرەدا ئەو هۆیەی میللەتە بچوکەکان والێدەکات لە خۆیان بترسن، روونەبۆتەوە؟ لەبەرامبەر ئەوەشدا، پرۆتۆکۆڵەکان دەروازەیەك دەکاتەوە کە هەرگیز پەیوەندی بەهەلومەرجی نەگۆڕی بابەتییەوە نیە، بەڵکو بەتەنها پشت بە دەسەڵاتی رێکخستن دەبەستێت.

بەدەستەواژەیەکی دی، پروپاگەندەی نازی توانی لە "بانەتەوایەتی میللەتی یەهود"[48]ەوە رووی سەروەری جهانی نەتەوەی جێرمەنی ئاشکرا بکات، جەماوەریشی لەوە دڵنیادەکردەوە ئەو "میللەتەی لەپێش میللەتانی دی بە گەمەی یەهود بزانێت و شەڕی بکات، دەتوانێت لەحوکمکردنی جهاندا جێگەی بگرێتەوە"[49] وەهمی پیلانی جهانی یەهود بوە بنەمای ئارەزوی ئەڵمانیا بۆ کۆنترۆڵکردنی جهان، ئەو کۆنترۆڵکردنەی هەر دەبێ بێتەدی. هیملەر ئاماژەی بەهەمان شت دەدا کاتێك دەیوەت "ئێمە لە هونەری حوکمکردندا قەرزارباری یەهودین"، واتە پرۆتۆکۆڵەکانی زایۆنیزم کە پێشەوا سەرلەبەری ئەزبەر کردوە"[50] بەمشێوەیە پرۆتۆکۆڵەکان بە کردەوە داگیرکردنی جهانی بەرجەستەدەکرد، واتە هەمو مەسەلەکە پەیوەندی بە

سروش یا فروفێڵەوە هەیە، بۆیە کەس ناتوانێت ڕێگە لە سەرکەوتنی ئەڵمانیا بگرێت بەسەر جهاندا، کاتێك میللەتێکی بچوکی وەك یەهود بەبێ ئەوەی هیچ ئامرازێکی توندوتیژی لەبەردەستدا بێت، بتوانێت فەرمانڕەوایی جهان بکات، یەهود دەبێتە پارویەکی چەور کاتێك رازەکەیان ئاشکرا دەبێت و لەسەر فراوانترین ئاست ڕێبازەکەیان بەکاردەهێنرێت.

پروپاگەندەی نازیزم هەمو ئەم دیدو بەڵێنانەی لە چەمکێکدا بەناوی Volksgemeinschaft، واتە "خاوەندارێتی ـ میللەت و کۆمەڵ" کۆکردەوە. ئەم کۆمەڵە تازەیەی لە کەشوهەوای پێش تۆتالیتاریەتی بزوتنەوەی نازی بەشێوەیەکی ئازمایشی بەدیهاتبو، لەسەر بنەمای یەکسانی رەهای نێوان گشت ئەڵمانەکان. هەڵبەتە یەکسانی لە سروشتدا نەك یەکسانی لە مافەکانداو جیاوازی رەهایان لەگەڵ میللەتانی دی خۆی راگرتبو[51] ئەم چەمکە لەدوای ئەوەی نازییەکان دەسەڵاتیان گرتەدەست بەتەواوەتی گرنگی لەدەستداو لەجیاتی ئەوەش لەلایەکەوە، رقێکی گشتی بەرامبەر بەخودی میللەتی ئەڵمان جێگەی گرتەوە (نازییەکان هەمیشە ئەم رقەیان لە زەیندا هەبو، بەڵام پێشئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست نەیاندەتوانی بەراشکاوی دەریببڕن)[52]، لەلایەکی دی، ئارەزویەکی زۆری رژێمی نازی بە ئاواڵەکردنی ریزەکانی بۆ (ئاری نەژاد)ی میللەتانی دی، ئەوەش ئایدیایەك بو لەپێشئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست رۆڵێکی ناچیزی لە پروپاگەندەی نازیدا هەبو[53] بەهەرحاڵ چەمکی "خاوەندارێتی ـ میللەت ـ کۆمەڵ"، واتە Volksgemeinschaft، تەنها بوارێك بو تا لە رێگەی پروپاگەندەوە بگەن بە کۆمەڵگەیەکی ئاری نەژاد کە سەرئەنجام هۆیەك بو بۆ لەدەستدانی هەمو میللەتانی دونیا بە میللەتی ئەڵمانیشەوە.

چەمکی "خاوەندارێتی ـ میللەت ـ کۆمەڵ" هەوڵێکی نازییەکان بو بەرامبەر بە بەڵێنی کۆمەڵگەی بێچینی کۆمۆنیستەکان. لەم بوارەدا ئەگەر دەلالەت و گرەنتی ئایدیۆلۆجیا لەبەرچاو نەگرین، بالادەستی پروپاگەندەی نازیزم بەسەر

پروپاگەندەی کۆمۆنیزمدا شتێکی ئاشکراو حەتمی بو. ئەگەرچی هەر یەك لەو دوو ئایدیۆلۆجیایە (نازیزم . کۆمۆنیزم) هەولّیدەدا هەمو جیاوازییەکی کۆمەلاّیەتیو ئابوری نەهێڵێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە کۆمەڵگەی بێچین خەڵك بۆ ئاستی کارگەری کارخانەکان دادەبەزێنێت، ئەمە لەکاتێکدا چەمکی (خاوەنداریێتی . میللەت . کۆمەڵ) بەمەبەستی کۆنترۆڵکردنی جهان پێشنیازی نەخشەیەك دەکات بۆ ئەوەی دەرفەت بڕەخسێت بۆ هەر ئەڵمانییەك ببێت بە بەڕێوەبەری کارخانە. لەگەڵ ئەوەشدا چەمکی "خاوەنداریێتی . میللەت کۆمەڵ" خەسڵەتێکی باشتری هەبو بەوەی جێبەجێکردنی ئەم چەمکە بەداهاتویەکی دوورو هەلومەرجێکی بابەتییەوە پەیوەست نەبو، بەڵکو دەکرا یەکسەر لە دونیای ساختەی بزوتنەوەدا پیادەبکرێ.

ڕێکخستن، نەك قاییلکردنی جەماوەر ئامانجی راستەقینەی پروپاگەندەی تۆتالیتار بو "کەڵەکەبونی دەسەلاّت بەبێ خاوەنداریێتی ئامرازی توندوتیژی"[54] لەم روانگەیەوە بیۆێنەیی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆجیا بە بەربەستێکی بێسود دەژمێردرێت. شتێکی ڕێکەوت نیە کە ئەم دوو بزوتنەوە تۆتالیتارییەی سەردەمی ئێمە، لە ئامرازی فەرمانڕەوایی نوێدا زۆر ترسناكو لەشێوەی ڕێکخستنیشدا زۆر لێهاتو بن، بەلاّم مژدەبەخشیی بیروباوەڕێکی نوێ نەبنو ئایدیۆلۆجیایەکیش دانەهێنن لە ئاستی جەماوەری سەردەمەکەیان بەرزتر بێت[55] بەهەر حاڵ، جەماوەر شوێن سەرکەوتنە دیماگۆگییەکان ناکەوێت، بەڵکو واقیعی "ڕێکخستنێکی زیندو"[56] و توانا بینراوەکانی شەیدای دەکات. بێگومان لێهاتویی هیتلەر وەك گوتاربێژێکی جەماوەریی پێگەی لەناو بزوتنەوەی نازیزمدا رانەگرتبو، بەڵکو بە پێچەوانەوە، نەیارەکانی هاندەدا وەك دیماگۆگییەکی سادە لە پلەوپایەی کەمبکەنەوە، هەروەها ستالینیش تێگەیشت چۆن شکست بە باشترین گوتاربێژی شۆڕشی روسیادا بهێنێت[57] ئەوەی بە پلەی یەکەم تۆتالیتارەکان لە دیکتاتۆرەکان جیادەکاتەوە ورەی بەرزو سادەیی فیکریانە لە هەڵبژاردنی شیاوترین

ڕەگەزەی ئایدیۆلۆجیا باوەکاندا کە شایانی ئەوە بێت ببێتە بنەمای جهانێکی دی سەرتاپا ساختەو وێناکراو.

ئەفسانەی پرۆتۆکۆلۆکانو بیرۆکەی پیلانی تروتسکی وەکیەك شیاوبون: هەر دووکیان ڕەگەزی بەجێیان تیابو کە دونیای ساختەی تۆتالیتاریزم ناهێڵێت بەبێ سزا تێپەڕن. کاریگەری ئاشکرای یەهودییەکان لەرابردوداو ململانێی دەسەڵات لەنێوان تروتسکیو ستالیندا. هونەری ئەم ئەفسانەیە بە مەبەستی بونیاتنانی جهانێکی ساختە، لەلایەکەوە سودیان لە توخمەکانی واقیعو ئەزمونە باوەڕپێکراوەکان وەردەگرت، لەلایەکی دی، لەوەش زیاتر دەڕۆیشتنو لەپێگەی ئەو واقیعو ئەزمونانەیان بەرزەکردەوەو بەجۆرێك دەیانگشتاند (تعمیم) کە بەتەواوەتی لەچاودێریکردنی هەر تاکێك بە دووربێت. پروپاگەندەی توتالیتاریزم بەهۆی ئەم گشتاندنەوە هەوڵیدەدا جهانێك دامەزرێنێت پێشبڕکێی جهانی ڕاستەقینە بکات کە نالۆجیکیو نایەکانگیریو نارێکی یەکێکە لە گەورەترین کەموکورتییەکانی. لەبەرامبەر ئەوەشدا، یەکانگیریی ئەم جهانە ساختەیەو سەرسەختی ڕێکخستنەکانی پێویستی دەکرد گشتاندنە ناوبراوەکان، تەنانەت لەدوای ئاشکرابونی درۆ شاخدارەکانیشی هەستی مانەوە دەستەبەر بکات. بۆ نمونە درۆگەلێکی وەك دەسەڵاتی یەهود، تەنانەت لەدوای قەتلوعامکردنیشیان بواریان پێنەدرا بەرگری لە خۆیان بکەنو پیلانی جهانی نەگریسانەی تروتسکیەکان لەدوای پاکتاوکردنیان لە ڕوسیای سۆڤێتیو کوشتنی خودی تروتسکی.

پابەندبونی سەرسەختانەی دیکتاتۆرەکان بە درۆ پروپوچە بەراییەکانیانەوە تەنها بۆ ڕێزی بێپایانو ئەفسانەئامێزی کارە بێبەهاکانیان ناگەڕێتەوە، بەلانی کەمەوە لە حاڵەتی ستالیندا ناتوانرێت ئەم سەرسەختیە لەرێگەی دەرونناسی درۆزنانەوە ڕاڤەبکرێت کە هەر درۆیەکی سەرکەوتوانەیان درۆیەکی دی کێشدەکات تا سەرئەنجام خۆیان دەبن بە قوربانی دوا درۆیان. هەر کاتێك ئەم دروشمە درۆزنەی پروپاگەندە تێکەڵ بە "ڕێکخستنێکی زیندو"

دەبێت، ئیدی ناتوانرێت خەمساردانە بەبێ روخاندنی سەرلەبەری بونیاد، بەلاوەبنرێت. لە راستیدا پروپاگەندەی تۆتالیتاری گومانی بوونی پیلانێکی جهانی یەهود لە مەسەلەیەکی بابەتیو قابیلی ئەوەبێت گفتوگۆی لەسەر بکرێت، بۆ رەگەزێکی سەرەکی واقیعی نازی گۆڕی. لەوەش گرنگتر نازییەکان بەجۆرێك كاریاندەکرد وەکئەوەی جهان لەژێر دەسەلاتی یەهود بێتو ئێستاش بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆی بکات، پێویستی بە دژە پیلانێك هەیە. رەگەزپەرستی لەلای ئەوان بە تەنها تیورەیەك نەبو جێگەی مشتومڕ بێتو بەهایەکی زانستی گومانلێکراوی هەبێت، بەڵکو رۆژانە لە هەرەمییەتی رێکخستنی سیاسیدا دەهاتەدی، تا لەو چوارچێوەیەدا قابیلی چاوپێخشاندنەوەو گفتوگۆکردن نیە، وەك "جیاوازییەکی واقیعی" دەرکەوێت. بەمشێوەیە بۆلشەفیزم دەربارەی ململانێی چینایەتی، نێونەتەوەییو بەستنەوەی بەرژەوەندی بێقەیدومەرجی کارگەران بە بەرژەوەندی یەکێتی سۆڤێتەوە پێویستی بە بەڵگەهێنانەوە نەبو، چونکە کارکردنی رێکخستنی کۆمێنترن لە هەر بەڵگەهێنانەوە یا ئایدیۆلۆجیایەك بەوەلامتر بو.

ئەو هۆیە سەرەکییەی کە پروپاگەندەی تۆتالیتاری والێدەکات بەسەر پروپاگەندەی حیزبەکانی دی بالادەستتر بێت، ئەوەیە، ناوەرۆکەکەی بەلانی کەمەوە سەبارەت بە ئەندامانی بزوتنەوە مەسەلەیەکی بابەتی ئەوتۆ نییە بیروڕایەکی لەسەر هەبێت، بەڵکو ئەم ناوەرۆکە لە ژیانیاندا چەشنی رێسای بیرکاری هەم واقعییەو هەم هەستپێکراویش نیە. بۆیە تەنها لەسایەی رژێمێکی تۆتالیتاریدا دەتوانرێ سەرلەبەری پێکهاتەی ژیان بەپێی تاکە ئایدیۆلۆجیایەك رێکبخرێت. لە ئەڵمانیای نازیدا جگە لە پێگەی نەژادی شتێکی دی لەئارادا نەبو، هەروەها کارنامەی هەر کەسێك پەیوەندی بە بیچمناسی ـ Physiognomy"ئاری" بونیەوە هەبو (هیملەر لەسەر وێنەی فۆتۆگرافی تاکەکانی هەوالگری هەڵدەبژارد)، ئەمە لەکاتێکدا بە پێی دوورونزیکی

رەچەڵەكی مـرۆڤ لەیـەهودی بونیـەوە ژەمـەخۆراكی كـەمو زیادیـدەكرد، كەواتـە نیشاندانی رەگەزی مرۆڤ وەك چاوخشاندنەوەیەك بو بە بوونی هەمو جهاندا.

خەسـڵەتی ئـەو پروپاگەندەیـەی هەمیـشە "توانـای رێكخستن زیاددەكات"[58] و یەكـسەر وتـەكانی دەكـات بـەكردەوە، سـەبارەت بـەدەنگی نـەرمو بێبەڵگـە، ئەوەنـدە روونو ئاشكرایە پێویست بە سەلماندن ناكات. ئەمجۆرە بەڵگانـە تـەنها لەبـەر ئـەوەی لەسەر واقعێك پایەدار بو كە بزوتنەوەی تۆتالیتاری پەیمانی گۆڕینی دابو، بەسە بۆ ئەوەی رەتبكرێتـەوە. پروپاگەنـدەی تۆتالیتـاری ئـەو بەڵگانـەی بە دژی خۆیـدەزانیو لەبـەر هـەمان واقیعـیش رەتیدەكردنـەوە، چـونكە بـەرگری لـەجهانێك دەكـرد كـە جەماوەری بێچارە نەیدەتوانیو نەیدەیشیویست قبوڵیبكات، جهانێك تـەنها واقعێكـی باشترو بەتواناتر دەیتوانی بێبەهای بكات.

تەنها لە كـاتی شكستدا پروپاگەنـدەی تۆتالیتـاری ئاشـكرا دەبێـت. چـونكە كاتێك بزوتنـەوە هێـزو توانـای لەدەسـتدەدا ئیـدی ئەندامـەكانی دەمودەسـت پشتدەكەنە ئەو بیروباوەرەی كە تادیرۆكی ئامادەبون گیانی خۆیانی لـەپێناودا بەختبكەن. لەو ساتەوەختەی بزوتنەوە لەبەریەكهەڵدەوەشێتەوەو دادەروخێت، واتــە ئــەو جهانــە ســاختەیەی پــشتوپەنایان بــو، جــەماوەریش بــۆ پێگــە سەرەتایەكەی جارانی دەگەڕێتەوە كە پێگەی خـەڵكانی گۆشەگیربو، یـا دوبـارە روودەكەنـە دونیـا نائومێـدە كۆنەكـەیان كـە دونیـای خـەڵكانێكی بێفـەڕبو. ئەندامانی بزوتنەوەی تۆتالیتار تا ئەو كاتەی بزوتنەوە مابێـت زۆر دەمـارگیرن، بەڵام ئامادەنین چەشنی ئیمانداره توندڕەوەكان بەشـەهیدی بمـرن (هـەر چەنـدە لــە كــاتی حــوكمڕانی بزوتنــەوەدا ئامــادەبون بوكەڵەئاســا گیــانی خۆیــان لــە دەستبدەن)[59] بـەڵكو بە پێچەوانەوە لـەدوای شكستی بزوتنـەوە وەكئـەوەی گرەوێكـی دۆڕاویـان كردبێـت زۆر بـەهێمنی ریزەكـانی بزوتنـەوە بەجێـدەهێڵنو بەدوای وەهمێكی چاوەڕوانكراوی هیوابەخشدا دەگەڕێن یا چاوەڕوان دەكـەن تــا ئەفــسانە كۆنەكــەیان هێــزو توانــای بزوتنەوەیــەكی جــەماوەری دی پەیدابكاتەوە.

هاوپەیمانەکان بێهودە هەوڵیاندەدا لەنێو میللەتی ئەڵمانیادا تەنها نازییەك بدۆزنەوە شەیدای نازییەت بێت و بڕوای پێی هەبێت، ئەمە لە حاڵەتێکدا لەسەدا نەوەدی ئەڵمانیەکان سەردەمانێك لایەنگری راستگۆیی نازی بون، بەڵام نابێت ئەم ئەزمونە بە نیشانەی لاوازی مرۆڤ راڤەبکرێت یا ئامارەی هەڵپەرستی (انتهازی) رووت بێت. بە هەر حاڵ نازیزم وەك ئایدیۆلۆجیا بەجۆرێك گەیشتبوە رادەی کامڵبونی ئیدی ناوەرۆکی وەك زنجیرە بیروباوەرێکی سەربەخۆ توانای بەردەوامی ژیانی نەمابو، ئەگەر گوزارشتێکی راست بێت، بوونی فیکری لە دەستدابو. کەواتە لەنێوچونی واقیعی نازیزم بەنزیکەیی هیچ شتێکی لەدوای خۆی بەجێنەهێشت، هەروەکو چۆن ئیماندارو دەمارگیریشی لەدوای خۆی بەجێنەهێشت.

## 2. ڕێکخستنی تۆتالیتاری

شێوەی ڕێکخستنی تۆتالیتاری بەپێچەوانەی ناوەڕۆکی ئایدیۆلۆجیاو دروشمی پروپاگەندەکانیەوە بەتەواوەتی بێوێنەو تازە بو[60] ئەو ڕێکخستنە بۆ ئەوە بەرنامەرێژیکراوە تا ئەفسانەکانی پروپاگەندەی بزوتنەوە کە لەسەر ئەفسانەیەکی نێوەندی تەوەرە دەبەستێت . پیلانگێری یەهود، پیلانی تروتسکییەکان، پیلانی دووسەد خێزانی . بۆ واقعێك بگۆڕێت، هەروەها تەنانەت لە سایەی هەلومەرجێکی ناتۆتالیتاریشدا کۆمەڵگەیەك بینابکات کە ئەندامەکانی بەپێی ڕێسای جهانێکی ساختە مامەڵەی لەتەکدا بکەن‌و پەرچەکرداریان هەبێت. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بەپێچەوانەی ئەو حیزب‌و بزوتنەوانەی بەرووکەش لە فاشیزم یا سۆسیالیست، نەتەوەپەرست یا کۆمۆنیست دەچن، ئەوانەی لە ڕادیکالییەتدا دەگەنە ئاستێك بەتیرۆر پشتیوانی لە پروپاگەندەکانیان دەکەن، پروپاگەندەکانی بەجیدی وەردەگرێت، ئەو جیدییەتەی لەرێگەی ڕێکخستنی موریدەکانیەوە گوزارشتی لێدەکات زۆر لە پاکتاوکردنی جەستەیی نەیارەکانی ترسناکترە. ڕێکخستن‌و پروپاگەندە (زیاتر لە تیرۆرو پروپاگەندە) لە دوو دیوی عانەیەك دەچن[61]

تەکنیکی بێوێنەی ڕێکخراوی نوێی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بەرلەوەی دەسەڵات بگرنەدەست، ئەفراندنی ڕێکخستنی رووکار Front Organization و جیاکاری نێوان ئەندامانی حیزب‌و لایەنگرەکانی بو. ئەم ئەفراندن‌و داهێنانە بایەخی پلە دوویان هەیە، ئەگەر لەگەڵ هێندێك سیفاتی دی تۆتالیتاریزمدا بەراورد بکرێن، بۆ نمونە دامەزراندنی فەرمانبەران لەسەرەوەو قۆرغکردنی تەواوی دامەزراندنەکان لەلایەن تاکەکەسێکەوە. وتەزای "پرەنسیپی سەرکردە" وتەزایەکی ناتۆتالیتاریە، بەڵکو هێندێك سیمای لە دیسپۆتیزم‌و دیکتاتۆریەتی سەربازییەوە خوازراوە کە تا رادەیەکی زۆر بەشداری لە

بەدحاڵی بونی دیاردەی سەرەکی تۆتالیتاریزمو کەمکردنەوەی پلەو پایەی کردوە. ئەگەر ئەو فەرمانبەرانەی لەسەرەوە دادەمەزرێن دەسەڵاتو بەرپرسیارێتی راستەقینەیان هەبێت، لەو حاڵەتەدا لەبەرامبەر بونیادێکی هەرەمی ئەوتۆدا دەبین کە لە رێگەی یاساوە دەسەڵاتو توانایان پێدەدرێت. بەگشتی هەمان شت لەسەر رێکخستنی سوپا و دیکتاتۆریەتی سەربازیش جێبەجێ دەبێت. ئیدی لێرەوە دەسەڵاتی رەها لەسەرەوە بۆ خوارەوەو ملکەچیو گوێڕایەڵی رەهاش لە خوارەوە بۆ سەرەوە بە ئاستی مەترسی ئەو وڵاتەوە پەیوەستە کە لە حاڵەتی جەنگدا دەبێت. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە دیکتاتۆرییەتی سەربازیو رژێمی دیسپۆتیزم، تۆتالیتاری نین. زنجیرەی ریکخراوەیی لە سەرکردایەتی هەرەمیدا بەمانای دەسەڵاتی سەرکردە بە کۆی ئەو سیستەمەوە پەیوەستە کە خودی خۆی کاری تیا دەکات. بۆیە هەمو هەرەمییەك، هەر جۆرە ئیدارەیەکی ئیستبدادی هەبێتو هەمو زنجیرەیەك لە سەرکردایەتی، ناوەرۆکی بریارەکانی چەند هەرەمەکی یا دیکتاتۆری بێت، کار بۆ سەقامگیریو هاوسەنگی دەکاتو دەتوانێت دەسەڵاتی گشتگیری سەرکردەی بزوتنەوەی تۆتالیتاری سنوردار بکات(62) لە زمانی نازیدا ئیرادەی نائارامو هەمیشە چالاکی پێشەوا نەك فرمانەکانی دەبێتە "یاسای باڵای" دەوڵەتی تۆتالیتاری، رەنگە ئەو دەستەواژانە دەسەڵاتێکی جێگیرو سنورداریش دەستنیشان بکات(63) تەنها لەرێی ئەو پێگەیەی بزوتنەوەی تۆتالیتاری بەهۆی رێکخستنە بێوێنەکەیەوە بەرێبەری دەبەخشێت، پرەنسیپی رێبەر دەتوانێت سیمای تۆتالیتاری وەربگرێت، ئەوەش پشت بەو بایەخە وەزیفییەی دەبەستێت کە دەدرێت بە سەرکردە بەرامبەر بە بزوتنەوەکەی. لەلایەکی دی، پرەنسیپی رێبەر لە حاڵەتی هیتلەرو ستالینیشدا بە هێواشیو هاورێك لەگەڵ بە تۆتالیتاریکردنی پلە بە پلەی بزوتنەوە بەرجەستە دەبو(64).

جۆرێك لەو گومناوییەی لە نامۆیی گشت دیاردەکانی تۆتالیتاریزمەوە سەرچاوە دەگرێت، سەرەتاکانی بونیادی ئەم رێکخستنە نوێیە دادەپۆشێت. ئێمە بە تەواوەتی

نازانین یەکەمجار چ کەسێك بڕیاریدا هاوڕێیانی ڕێباز تێکەڵ بەڕێکخستنەکانی رووکار بکات، هەروەها ئەوەش نازانین یەکەمجار چ کەسێك لە نێو جەماوەری پڕ لەسۆزی ئاڵۆزو تێکەڵو پێکەڵدا ژیاوە . هەمو حیزبەکان لەرۆژی هەڵبژاردندا پشتیان پێدەبەستن، بەڵام دڕدونگیو دودڵیان لەمپەرێکە بۆ ئەوەی بهێنرێنە نێو حیزبەوە . ئەو جەماوەرە بە تەنها هەمبارێکی مرۆیی نەبو تا حیزبەکان دۆستو لایەنگر لە نێوانیاندا پەیدابکەن، بەڵکو هێزێکی سیاسی یەکلاکەرەوەش بو. ڕێکخستنە سەرەتاییەکانی لایەنگری کۆمۆنیست، لەبابەت دۆستانی یەکێتی سۆڤێت یا کۆمەڵەی فریاکەوتنی سوور، هەر بەزوویی بوون بەڕێکخستنی رووکار، بەڵام چالاکی ئەو ڕێکخستنانە جگە لەناوێك هیچی دی نەبو: کۆمەڵەی لایەنگران بۆ کۆکردنەوەی یارمەتی دارایی یا شتی دی، بۆ نمونە یارمەتی داوەری (قضائي). لەم پێناوەشدا هیتلەر یەکەمین کەس بو رایگەیاند: هەر بزوتنەوەیەك ئەو جەماوەرەی لەرێگەی راگەیاندنەوە بەلای خۆیدا رایدەکێشێت، پێویستە لەسەری بیکات بە دوو بەشەوە، لایەنگرانو ئەندامان. ئەم بۆچونە گرنگیو مانای تایبەتی خۆی هەیە، چونکە هیتلەر ئەم دابەشکردنەی کردە بنەمای فەلسەفەیەکی گشتیتر کە بەپێی ئەم دابەشبەندییە زۆرینەی خەڵکی تەمەڵو ترسنۆکەو تەنها دیدێکی تیوریان هەیە، تەنها کەمینەیەك لە پێناوی بیروباوەڕەکانیدا ئامادەگی گیانی تێکۆشانی تیایە[65] دەرئەنجام هیتلەر یەکەم کەس بو سیاسەتێکی هوشیارانەی داهێنا بۆ ئەوەی بەردەوام ریزی لایەنگران فراوان بکرێ لەگەڵ پەرۆشییەکی زۆر بۆ نەبەزاندنی سنوری توندوتۆڵی ژمارەی ئەندامانی حیزب[66] بەهەر حاڵ بیرۆکەی کەمینەی ئەندامان کە بە زۆرینەی لایەنگران دەورەدرابێت لە واقیعی ریکخستنەکانی رووکارەوە نزیکترە . ئەمەش دەستەواژەیەکە بەشێوەیەکی گونجاو گوزارشت لە دوا ئەرکیان دەکات، هەروەها پەیوەندی نێوان لایەنگرانو ئەندامانی خودی بزوتنەوەش دیاریدەکات. ڕێکخستنەکانی رووکار کە لایەنگران لە خۆی کۆدەکاتەوە بەرامبەر بە بزوتنەوە گرنگیو بایەخی لەئەندامەکانی کەمتر نیە.

ڕێکخستنەکانی ڕووکار چواردەوری ئەندامەکانی بزوتنەوە بەدیوارێك هەڵدەچنن کە لە دونیای ئاسایی‌و دەرەوە جیاندەکاتەوە، هەر لە چوارچێوەی ئەو ڕێکخستنانەشەوە پردی پەیوەندی لەگەڵ دونیای دەرەوە دروستدەکەن، چونکە بەبێ ئەو پردە ئەندامانی بزوتنەوە پێشئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست، هەست بە جیاوازییەکی گەورە دەکەن لە نێوان بیروڕای خۆیان‌و خەڵکی ئاساییدا، هەروەها هەست بەجیاوازی نێوان ساختەیی جهانی بزوتنەوەو واقعییەتی جهانی ئاسایی دەکەن. لێهاتویی ئەم هونەرە لەکاتی کێشمەکێشی بزوتنەوە بۆ دەسەڵات گرتنەدەست لەوەدایە ڕێکخستنەکانی ڕووکار تەنها ئەندامەکانی بزوتنەوە گۆشەگیر ناکات، بەڵکو جۆرێك لە ئاسایی بونی ڕووکەشیان پێدەبەخشێت کە لە تەڵقینی ئایدیۆلۆجیا کاراتر شۆکی واقعی راستەقینەیان لەسەر کەمدەکاتەوە. هەمان جیاوازی لە نێوان تێڕوانینی ئەندامێك‌و لایەنگرێك، وا لە نازی یا بۆلشەفیك دەکات، دەربارەی ڕاڤەکردنێکی ساختە بۆ دونیای ڕاستەقینە پێ لەسەر بیروباوەری خۆی دابگرێت، چونکە لایەنگریش هەمان بیروباوەری ئەندامێکی هەیە، هەڵبەتە بەشێوەیەکی ئاساییتر، واتە کەم دەمارگیرترو نەرمتر. تا ئەو جێگەیەی ئەندامێکی حیزب پێیوابێت هەر کەسێك بزوتنەوە بە دوژمن پێناسەی نەکردبێت (یەهود، سەرمایەدار، هتد)، لە بەرەی ئەودایەو جهانیش جمەی دێت لە هاوپەیمانی نهێنی کە تەنها جیاوازییان لەگەڵ خۆیدا ئەوەیە، هێشتا بە گوێرەی پێویست توانای ڕۆح‌و کەسایەتیان نیە دەرئەنجامی لۆجیکی لە بیروباوەریان هەڵگۆزن[67]

لەلایەکی دی، بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی سەرەتا بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لەرێگەی ڕێکخستنە ڕووکارەکانەوە دەناسن. بەپێی هەمو دیدێك لایەنگرانی بزوتنەوە لە کۆمەڵگای ناتۆتالیتاریدا خەڵکانێکی بێوەین‌و ئەستەمە بە خەڵکانی توندڕەو وەسف بکرێن، هەر لەرێگەی ئەوانیشەوە درۆ سەیروسەمەرەکانی بزوتنەوە قبوڵ دەکرێ. هەروەها ئەو خەڵکانە دەتوانن

نـاوەرۆكی پرۆپاگەنـدەكانیان لـە فـۆڕمی شـیاوترو بـەجێتر بڵاوبكەنـەوە، تـا كەشـوهەوای سـەرتاپای وڵات بەرەگـەزی تۆتالیتـاری ژەهـراوی دەبێـت . تـا بزوتنەوە دەسەڵات پەیدا نەكات، رەگەزە تۆتالیتارەكـانیش، زۆر ناسراو نین و زیـاتر بەشێوەی پەرچەكرداری سیاسـی یـا بیروبـاوەری ئاسـایی دەردەكەون. بۆیـە رێكخراوەكـانی رووكـار چواردەوری بزوتنـەوە تۆتالیتارەكـان بـە تـەمێكی ئاسـایی و ئابرومەندانـە دەگـرن، بـەجۆرێك كـە خەسـڵەتی راسـتەقینەی جهـانی دەرەوەی بزوتنـەوە لـە ئەندامـەكانی بزوتنـەوە دەشـارنەوە، هـەروەها جهـانی دەرەوەش لەسـەر خەسـڵەتی راسـتەقینەی بزوتنـەوە گـومڕا دەكـەن. كەواتـە رێكخستنەكانی رووكـار دوو جـۆر ئـەركیان هەیـە: یەكـەمیان وەك رووكـارێكی بزوتنەوەی تۆتالیتاری بەرامبەر بە جهانی ناتۆتالیتاری كاردەكەن، دوەم وەك رووكـارێكی جهـانی ناتۆتالیتـاری بەرامبـەر بـە هەرەمییەتی نـاوخۆی بزوتنـەوە خۆیان دەبیننەوە.

ئـەو پەیوەندییـەی لـە نـاوخۆی بزوتنـەوە لەسـەر ئاسـتی جۆراجـۆر دوبارەدەبێتـەوە، لـە پەیوەنـدیی نێـوان ئەنـدامان و لایـەنگرانی بزوتنـەوە سەیرترە. هەروەكو چۆن ئەندامان لەگەڵ لایەنگراندا پەیوەندییـەكی جودایـان هەیە، بەهەمان شێوە رێكخستنەكانی دەستەبژێر لەگەڵ ئەندامە ئاساییەكاندا پەیوەندییەكی جیاوازیان هەیە. لایـەنگر وەك كەسێكی ئاسـایی ئەم جهانـە كـە بیروبـاوەڕی هـەر حیزبێكـی دی هەڵـدەگرێت، بیروڕای تۆتالیتـاری هەڵـدەگرێ، بەڵام ئەندامێكی ئاسایی حیزبی نازی یا بۆلشەفیكی لە زۆر رووەوە بـە جهـانی دەوروبەرەكەیەوە پەیوەستە: چونكە هێشتا پەیوەنـدی پیشەیی و كۆمەڵایـەتی بەتـەواوەتی ملكەچـی حیزبایـەتی نیـە، ئەگـەر چـی دەشـزانێ . بەپێـچەوانەی لایەنگرێكی ئاساییەوە . كاتێك جۆرە ململانێیەك لە نێوان وەفاداری بۆ حیزب و ژیانی تایبەتی روبدات، ئەوا تای ترازوی یەكەم بەسەر دوەمدا لاسەنگ دەكات. لەلایەكی دی، ئەندامی تیمی تێكوشەران بەشێوەیەكی رەها ئاوێتەی بزوتنـەوە دەبێت، چونكە ئەو ئەندامە پیشەو ژیانێكی تایبەت بەخۆی نیە كە لە بزوتنەوە

جیاوازو سەربەخۆ بێت. هەروەکو چۆن لایەنگران دیواری ئاسودەیی لە چواردەوری ئەندامان پێکدەهێنن و بۆیان دەبن دونیای دەرەوە، هەر بەوجۆرەش ئەندامانی ئاسایی چواردەوری تیمە تێکۆشەرەکان دەگرن و نوێنەرایەتی جهانی ئاسایی دەرەکیان بۆ دەکەن. لە راستیدا ئەم بونیادە خەسڵەتێکی باش بۆ ئەندامی ئاسایی دەستەبەر دەکات بەوەی شۆکی یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی بیروباوەری تۆتالیتاری لەسەر سوکدەکات . بەپێی ئەو بنەمایە جهان بە دوو ئۆردوگای زەبەلاح دابەشدەبێت کە بزوتنەوە یەکێکیانە، بزوتنەوەش هەوڵدەداو پێویستە شەڕی هەمو جهان بکات . ئەم داوایەش جڵەو بۆ دوژمنایەتی کوێرانەی رژێمە تۆتالیتارەکان شلدەکات. بەهۆی ئەو هەرەمی تێکۆشانەوە کە زۆر بەوردی بۆ تێکۆشەرانی بزوتنەوە پلەبەندی کراوەو هەر پلەیەك سەبارەت بە پلەکەی سەرووی خۆی وێنەیەکی روونتر لەسەر جهانی دەرەوە بەرجەستەدەکات، لەبەر ئەوەی لە پلەکەی سەرووتری تێکۆشەرتر نیە، پەیوەندی رێکخستنیشی لاوازترە، بۆیە شۆکی دوو پارچەیی . dichotomy . تۆتالیتاریزم زۆر ترسناكو لادەرانەو نابابەتیانە دەردەکەوێت. ئەمجۆرە رێکخستنانە رێگەنادەن ئەندامەکانی راستەوخۆ روبەروی جهانی دەرەکی ببنەوە، بۆیە کارێك دەکەن کە دوژمنایەتی جهانی دەرەوەو ئەندامەکانی بزوتنەوە وەك گریمانەیەکی ئایدیۆلۆجیای پەتی بمێنێتەوە. بەهەر حاڵ خۆشاردنەوەی ئەو ئەندامانە لە جهانی ناتۆتالیتاری دەگاتە ئاستێك کە بەردەوام مەترسییە گەورەکانی سیاسەتی تۆتالیتاری بەهەند وەرنەگرن.

بێگومان بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، بەشێوەیەکی ریشەیی لە هەمو حیزبە شۆڕشگێڕەکانی پێش خۆیان، روبەڕوی هەلومەرجی باو دەبنەوە. ناتەباییەکی ئاشکرای رادیکالیزم لەگەڵ رێکخراوە جەماوەرییەکان، وایانلێدەکات بتوانن لەگەڵ ئەوجۆرە رادیکالیزمەدا کار بکەن، چونکە رێکخراوەکانیان دەبنە ئەڵتەرناتیڤێکی کاتی ژیانی ئاسایی و ناسیاسی، واتە هەمان ئەو ژیانەی کە تۆتالیتاریزم بەجدی تێدەکۆشێت نابودیان بکات. سەرتاپای دونیای

پەیوەندی کۆمەڵایەتی ناتۆتالیتاری کە "شۆڕشگێڕی پیشەکار . حرفی" یا دەبێت پەیوەندی لەگەڵدا بپچڕێت یا وەك خۆی قبوڵی بکات، لە ناو بزوتنەوەدا بوونیان لەشێوەی تیمی ناشۆڕشگێڕتر دەردەکەوێت. شۆڕشگێڕەکانی بزوتنەوە، ئەوانەی لە پێناوی داگیرکردنی جهانو شۆڕشی نێونەتەوەییدا دەجەنگن، هەرگیز توشی ئەو شۆکە نابنەوە کە لە ناکۆکی نێوان بیروباوەری "شۆڕشگێڕانە"و جهانی "ئاسایی" دێتەئاراوە. لە راستیدا ئەوەی توانای بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پێشئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست، واتە لە قۆناغی شۆڕشگێڕیدا راڤەدەکات، بەوەی دەتوانن زۆرێك لە خەڵکی ئاسایی بەلای خۆیاندا رابکێشن، بریتیە لەوەی کە ئەندامەکانیان لە بەهەشتێکی درۆزنانە ژیانێکی شایستەو دروست بەسەردەبەن، ئەندامەکانی حیزب بە جهانی لایەنگران دەورەدراون و پێکهاتەی دەستەبژێریش بە جهانی ئەندامە ئاساییەکان دەورەدراون.

خەسڵەتێکی دی نمونەی تۆتالیتاری ئەوەیە کە دەتوانێت بەردەوام خۆی دوبارەبکاتەوەو رێکخستنیش لە حاڵەتێکی نەرم بهێڵێتەوە، ئەو حاڵەتەی رێگەی پێبدات هەمیشە توێژی نوێ بهێنێتە ریزەکانییەوەو پلەی نوێ لە خەباتو تێکۆشانیش دیاریبکات. بۆیە دەکرێ هەمو مێژووی حیزبی نازی بە مێژووی پێکهاتەی نوێی ناو حیزبی نازی کورتبکرێتەوە. یەکەی هێرش (S.A)، ساڵی 1922 دامەزرا، یەکەم پێکهاتەی نازییە کە پێویستە بو لە خودی حیزب شۆڕشگێڕتر بێت(68) لە ساڵی 1926دا، دەستەی "پاراستن . S.S" دامەزرا، وەك پێکهاتەیەك کە دەستەبژێری یەکەی هێرشی پێشوی لەخۆدەگرت، لەدوای سێ ساڵ دەستەی ئێس ئێس لە یەکەی ئێس ئەی جیابووەو خرایە ژێر فەرماندەیی هیملەرەوە. لەدوای چەند ساڵێك هیملەریش هەمان گەمەی لە ناو تیمەکانی دەزگای هەواڵگریدا دوبارە کردەوە. لە هەمان چوارچێوەشدا رێکخستن لە دوای رێکخستن دروست دەبو کە هەر یەکەیان لەوەی پێشوتری شۆڕشگێڕتر بو: یەکەمجار تیمی شۆك . Shocktroops

ئنجا یەکەی پێشڕەوی مەرگ (یەکەی پاسەوانی ئۆردوگا زۆرەملێکان)، دواتر تێکەڵ کراو دەستەی پاراستنی چەکداری لێدروستکرا، سەرئەنجامیش دەزگای ئاسایش "دەزگای هەواڵگری ئایدیۆلۆجیای حیزبی نازی"و باسکی مەدەنی "دەزگای هەواڵگری لە پێناوی سیاسەتی نێگەتیڤی دانیشتوان"و نوسینگەی تایبەت بە مەسەلەی رەگەزو ئاوەدانکردنەوە کە ئەرکەکانی خسڵەتێکی پۆزەتیڤی هەبو. هەمو ئەو پێکهاتانەی لە دەستەی پاراستنەوە S.S . دروست بون، ئەندامەکانیان جگە لە رێکخستنەکانی پێشەوا، پێگەی مەدەنیان لەدەست نەدابو. ئەندامانی ئێس ئێس هەمان پەیوەندی تایبەتیان لەگەڵ ئەو پێکهاتە تازانە هەبو کە S.A لەگەڵ S.S، ئەندامانی حیزبی نازی لەگەڵ S.A یا ئەندامانی رێکخستنی رووکار لەگەڵ حیزبی نازیدا هەیبو[70] لە راستیدا دەستەی S.S بە تەنها ئەرکی " پاراستنی هەمو جەستەی ئایدیای ناسیونال سۆسیالیستی" لە ئەستۆ نەگرتبو، بەڵکو "پاراستنی ئەندامانی هەمو کادرە تایبەکانی هەواڵگری نهێنیشی پێسپێردرابو، نەبادا لە خودی بزوتنەوە دابڕێن"[71]

ئەم زنجیرە هەرەمییە ناجیگیرەی بەردەوام توێژی نوێ دەچێتە ناوکۆیی رێکخستنەکانییەوەو نێوەندی دەسەڵاتی هەمیشە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی دەگوێزرێتەوە، لەرێگەی رێکخستنە چاودێرە نهێنییەکانی لە بابەت پۆلیسی نهێنی یا دەزگای سیخوری بەجوانی ئەوەیان تیا بەدیدەکرێ کە بە مەبەستی چاودێری کردنی چاودێرەکان، هەمیشە پێویستی بە چاودێری تازە دەبێت. بزوتنەوە پێشئەوەی دەسەلات بگرێتەدەست، لە توانایدا نیە سیخوری تەواو بەسەر هەموانەوە بکات، واتە لەو ساتەوەختەی بزوتنەوە دەسەڵاتی فیعلی نیە، زنجیرەی هەرەمی ناجێگیری لەبابەت پۆلیسی نهێنی، سستی یا نیشانەی نا رادیکاڵییەتی لە هەر پلەوپایەیەك یا گروپێك بەدیبکات، بۆ پێگەیەکی خوارتر دایدەگرێت و توێژێکی رادیکاڵتری نوێ لە جێگەی دادەنێت، ئیدی بەمشێوەیە گروپە کۆنەکە خۆبەخۆ دەچێتەریزی رێکخستنی

رووکارەوەو لە نێوەندی بزوتنەوە دوور دەخرێتەوە. بەمجۆرە پێکهاتەکانی دەستەبژێری نازی لە پێش هەمو شتێکدا رێکخستنی ناوخۆی حیزبە: کاتێك حیزب رادیکالییەتی خۆی لە دەستدا، یەکەی هێرش گەیشتە پلەی بانحیزب، ئەو رێکخراوەش لەلای خۆیەوەو لەبەر هەمان هۆ پێگە باڵاکەی بۆ دەستەی پاراستن بەجێهێشت.

زۆرجار لێکۆڵەران لە بەهای سەربازی پێکهاتەکانی دەستەبژێر، بە تایبەتی یەکەی هێرش‌و دەستەی پاراستن زیادەڕەوی دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا گرنگی حیزبایەتیان پشتگوێ دەخەن[72]. بەهەر حاڵ هیچ کام لەو رێکخراوە فاشیستیانە (کراس رەشەکان، هتد..) بە مەبەستی بەرگرییەکی پەتی یا دوژمنایەتیەکی تایبەت دانەمەزرابون[73]، ئەگەرچی ئەو رێکخراوانە بەبیانوی پاسەوانیکردن لە رێبەرانی حیزب یا ئەندامە ئاساییەکان دامەزرا بون. تیمە نیمچە سەربازییەکانی دەستبژێری فاشیستی‌و نازییەکان، وەك " ئامرازی ململانێی ئایدیۆلۆجیای بزوتنەوە"[74] دامەزرابون، بە مەبەستی دژایەتیکردنی ئەو رەوتە ئاشتیخوازانەیەی لەدوای جەنگی جهانی یەکەم لە ئەورووپا تەشەنەیان سەندبو. تۆتالیتارەکان لە جیاتی ئەوەی لەشکرێکی مەشقدیدەی باشیان هەبێت، پێیان باش بو سوپایەکی ساختە بۆ "گوزارشتکردن لە هەڵوێستێکی شەڕەنگیزی"[75] دامەزرێنن کە تا رادەیەکی زۆر لە سوپای لەشکری رەش بچێت، ئەو لەشکرەی ئاشتیخوازەکان بانگەشەی دامەزراندیان دەکرد (ئاشتیخوازەکان، درکیان بەپێگەی دامەزراوەی سوپا نەدەکرد لە ناو قەوارەیەکی سیاسیدا، بەڵکو هەر پێکهاتەیەکی سەربازییان وەك چەتە پیاوکوژەکان، شەرمەزار دەکرد). هەر چەندە تیمەکانی هێرش‌و دەستەی پاراستن رێکخراوی نمونەیی بون لە پیادەکردنی توندوتیژی‌و کوشتنی هەڕەمەکیدا، بەڵام بەئەندازەی سوپای رایخی رەشBlack Reichswehr مەشقیان نەکردبو، هەروەها بە هیچ جۆرێك ئامادەیی روبەروبونەوەی هێزی سەربازییان تیانەبو. لە ئەڵمانیا، لە دوای جەنگی جهانی یەکەم، پروپاگەندەی

سەربازیگەرا لە پەروەردەو پێگەیاندنی سەربازیدا جەماوەرێکی زیاتری هەبو، بەجۆرێك ئەو جلوبەرگە سەربازییەی پێکهاتەی دەستەبژێر دەیپۆشی، ئاماژەیەك نەبو بۆ بەها سەربازییەکەی، هەر چەندە ئەو جلوبەرگانە ئەو سودەیشی هەبو کە مانایەکی رۆشنی لەسەر مایە پوچکردنی رەوشتو پێوەرە مەدەنیەکان هەبو، ویژدانی تاوانبارانی ئاسودەتر دەکرد، هەروەها زیاتر ملکەچی کوێرانەی دەسەڵاتی رەهای دەکردن. سەرباری ئەو کێشە سەربازییەش، گروپێکی حیزبی نازی وەك یەکەی هێرش کە سەرەتا ناسیونالو سەربازیگەرا بو، پێیوانەبو تیمە نیمچە سەربازییەکان پێکهاتەی حیزبی پەتی بێت، بەڵکو بەدرێژکراوەیەکی ناشەرعی گاردی ئیمپراتۆری (Reichwehr) دەزانی، کەچی یەکەم تیم بو بەتەواوەتی پاکتاوکرا. لە راستیدا، رۆهم، فەرماندەی یەکەکانی S.A حەزیدەکرد لە دوای ئەوەی نازییەکان دەسەڵات دەگرنەدەست، یەکەی هێرش تێکەڵ بە سوپای ئەڵمانیا بکرێتو لەو بارەیەشەوە گفتوگۆی لەگەڵ هێندێك لە فەرماندە سەربازییەکان کردبو. بەڵام بەدەستی هیتلەر کوژرا، چونکە هەوڵیدەدا رژێمی نوێ بە دیکتاتۆرییەتی سەربازی بگۆڕێت(76). هیتلەر چەندینساڵ پێشئەوەش بە راشکاوی رایگەیاندبو، بزوتنەوەی نازیزم هەرگیز گۆڕانکاری لەو چەشنە ناکات، بۆیە رۆهمی لە فەرماندەی یەکەکانی هێرش لابردو . بەراستی سەرباز بو، کەسێك بو لە ئامادەکردنی بەرنامەی جیدی سەربازیدا پشتگوێ نەدەخرا، چونکە شارەزاییەکی باشی لە ناو حیزبو لە رێکخستنی رایخی رەشدا هەبو. هیملەری لە شوێنی دانا بۆ ئەوەی دەزگای پاراستن رێکبخاتەوە کە هیچ شارەزاییەکی لە بواری سەربازیدا نەبو.

بەدەر لە گرنگی پێکهاتەی دەستەبژێر سەبارەت بە رێکخستنی بزوتنەوە کە ناوکی ئارەزویەکی سەربازی ناجیگیری پێکدەهێنێت، ئەوا خەسڵەتی نیمچە سەربازی ئەو پێکهاتانە پەیوەندی لەگەڵ رێکخستنە پیشەییەکانی حیزب شیدەکاتەوە، وەك رێکخراوی مامۆستایان، پارێزەران، پزیشکان، خویندکاران،

مامۆستایانی زانکۆ، تەکنیکاران و کرێکاران. بەهەر حاڵ ئەو ڕێکخستنانە لە پێش هەمو شتێکدا کۆپییەکی ئەو کۆمەڵە پێشەییە ناتۆتالیتارانە بون کە لەو سەردەمەدا هەبون، لە راستیدا ئەو کۆمەڵانە نیمچە پیشەیی بون، هەروەکو چۆن یەکەکانی هێرش نیمچە سەربازی بون. بەشێوەیەکی زۆر سەرنجراکیش، تا حیزبە کۆمۆنیستە ئەوروپاییەکان دەبون بە بەشێك لە بزوتنەوەی بۆلشەفیکی کە مۆسکۆ رێبەرایەتی دەکرد، نازییەکان بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی دەزگا پیشەییەکان، رێکخستنە رووکارەکانی خۆیان بەشێوەیەکی کاراتر بە کاردەهێنا. لەم بارەیەوە، تاکە جیاوازی نێوان نازیو بۆلشەفیکەکان بریتی بو لەوەی، نازییەکان پێیان وابو پێکهاتەی نیمچە پیشەییەکان بەشێکە لە دەستەبژێری حیزب، کەچی کۆمۆنیستەکان ئەو کەسانەیان دەهێنایە ریزی حیزبەوە کە لە رێکخستنەکانی رووکاردا کاراو چالاك بون. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، تەنانەت پێشئەوەی دەسەڵاتیش بگرنەدەست، خۆیان واپیشان بدەن کە هەمو تاکەکانی کۆمەڵگە لە ریزی رێکخستنەکانی بزوتنەوە کاردەکەن (رێکخستنی هەمو میللەتی ئەڵمانیا لە چوارچێوەی لایەنگرانی بزوتنەوەدا دوا ئامانجی پروپاگەندەی نازیزم بو)[77] نازییەکان لەم گەمە بچوکەدا زۆر شوڵیان لێهەڵکێشاو زنجیرەیەك وەزارەتی ساختەیان لەشێوەی ئیدارەی دەوڵەتێکی سیستماتیك دروستکرد، بەجۆرێك بزوتنەوەی نازی کۆمەڵێك وەزارەتی وەك وەزارەتی کاروباری دەرەوە، وەزارەتی پەروەردە، رۆشنبیری، وەرزش و هی دی هەبو. هیچ یەکێك لەو دەزگایانە بەهای پیشەیی لە بەهای یەکەکانی هێرش زیاتر نەبو کە لاسایی سوپای دەکردەوە، بەڵام هەمو ئەوانە پێکەوە، جهانێکی سەرلەبەری رووکەشیان دروستکردبو کە واقعی جهانی ناتۆتالیتاری تیایە بەشێوەیەکی فریودەرانەو تەقلیدی بونیات نرابۆوە.

ئەگەر ئەم هونەری پاساوهێنانەوەیە بەرامبەر بە سەرنگونکردنی راستەوخۆی رژێم ناکاراو بێسود بێت، ئەوا سەبارەت بە مینرێزکردنی چالاکی دەزگا باوەکان و

"لێکهەوڵوەشاندنەوەی بارودۆخی هەنوکەیی"[78] زۆر بە بەرو پڕ بەرهەم بو کە بزوتنەوە تۆتالیتارەکان هەمیشە لە نمایشکردنی ئاشکرای هێز پەسەندیان دەکرد. ئەگەر ئەرکی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان چەشنی گیانەوەری پولیپ (مدیخ . Polyp گیانەوەرێکی دەریایی بۆشە لە رووەك دەچێت مادەیەکی کلسی دەردەدات لەسەری و لە ناویدا دەژی، کەمالنامە. کەمال جەلال غەریب، ل1317) گشت پێگەکانی دەسەڵات بنکۆڵ بکات، پێویستە ئامادەگی تیابێت هەر پێگەیەکی کۆمەڵایەتی یا سیاسی بگرێتەدەست. لەبەر ئەوەی بزوتنەوەی تۆتالیتاری و بانگەشەکانی سەبارەت بەبالادەستی گشتگیر بەسەر کۆمەڵگەدا، تەبا و یەکانگیرە، بۆیە هەر تیمێکی رێکخراوی کۆمەڵگەی ناتۆتالیتاری بە بەرهەڵستکارێکی چارەنوسسازی خۆی دەزانێت و دەبێت لەناوی بەرێت، کەواتە هەمو بزوتنەوە پێویستی بە ئامرازێکی لەناوبردنی ئەوتۆ هەیە لەگەڵ کارەکەیدا بگونجێت. نازییەکان لە دوای ئەوەی دەسەڵاتیان گرتەدەست خاتریان بۆ ئەو رێکخراوە ساختانە گێڕایەوە و یەکسەر ئامادەگی خۆیشیان نیشاندا رێکخراوی مامۆستایانی ئەو دەمە لە رێگەی رێکخراوی دی مامۆستایانەوە لەناوبەرن، بەهەمان شێوەش نێوەندی پارێزەرانیان لە رێگەی نێوەندی دییەوە لەناوبرد کە نازییەکان سەرپەرشتیان دەکرد، هتد. نازییەکان نەك هەر توانیان ژیانی سیاسی بگۆڕن، بەڵکو لە شەوو رۆژێکدا هەمو بونیادی کۆمەڵگەی ئەڵمانییان گۆڕی، لەبەر ئەوەی پێشتر ئەڵتەرناتیڤی وردی ئەو بونیادەیان لەناو بزوتنەوە ئامادە کردبو. کاتێك لە دوا قۆناغی جەنگی جهانی دووەمدا هەمو پلەبەندییەکی سەربازییان خستە ژێر دەستی جەنەراڵەکانی دەستەی پاراستنەوە، ئیدی دەستیان لە پێکهاتەی تیمە نیمچە سەربازییەکانیش هەڵگرت. بە هەر حاڵ هونەری ئەم یەکشێوازییە بە جۆرێك وریانە و لە دەرەوەی بەرگری بو کە زۆر بەخێرایی و بەشێوەیەکی ریشەیی بوە مایەی داڕوخانی ئاستی پیشەیی، ئەگەرچی ئاکامی ئەم داڕوخانەش یەکسەر لە بواری تەکنەلۆجیای بالا و تایبەت بەجەنگ لە هەمو بوارەکانی دی زیاتر هەستی پێدەکرا.

هەروەکو چۆن بایەخی پێکهاتەی نیمچە سەربازی بزوتنەوەی تۆتالیتاری لە بەها سەربازییە گومانلێکراوەکەیدا نییە، بەهەمان شێوە نابێت لاساییکردنەوەی رووکەشی سەربازییانەی ئەم پێکهاتەیە فریومان بدات. ئەم پێکهاتانەی دەستەبژێر پێویستە لە هەمو گروپەکانی دی لە جهانی دەرەوە دابڕێن. نازییەکان هەر بەزوویی درکیان کرد بەوەی کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ هەیە لە نێوان رۆحیەتی سەربازگەراو دابڕانێکی تەواو لەگەڵ سەرجەم خەڵکیدا، بۆیە هەرگیز یەکەی هێرش ئەرکیان لە شوێنی لە دایکبونیان پێنەدەدرا، ئەندامانی گروپی هێرش پێشئەوەی بزوتنەوە دەسەلات بگرێتەدەستو دەستەی پاراستنیش لەسەردەمی نازیدا زۆر چالاکو پڕجوڵە بونو بەردەوام جێگۆڕکیان پێدەکرا بەجۆرێك کە ئەستەم خوو بە بەشێکی ئەم دونیایەوە بگرنو تیایە سەقامگیربن[80] ئەم گروپانە بەوێنەی چەتەو رێگر رێکخرابونو بۆ تیرۆرکردنی سیستماتێکانە سودیان لێوەردەگیرا[81]. ئەوانە بەئاشکرا قسەیان لەسەر تاوانێك دەکرد کە بەدەستی خۆیان ئەنجامیان دابو، گەورەترین دەسەلاتیش بەرەسمی دانیپیادەنا، بۆ ئەوەی دەست تێکەڵکردنی ئاشکرایان لەگەڵ نازییەکاندا رێگە نەدا، تەنانەت لە سایەی رژێمێکی ناتۆتالیتاریدا و ئەگەر لەلایەن هاورێ کۆنەکانیشیانەوە هەڕەشەی کوشتنیان لێنەکرێ، هەروەکو بەراستی ئەو حاڵەتی هەڕەشەکردنە لە ئارادابو، ئەندامانی بزوتنەوە ریزی چەتەکان بەجێبهێڵن. لەم ناوکۆیەشدا، ئەرکی پێکهاتەی دەستەبژێر بە تەواوەتی لەگەڵ ئەرکی رێکخستنەکانی رووکار جیاواز بو: لەکاتێکدا رێکخستنەکانی رووکار کەشوهەوایەکی ئابرومەندانەو پڕمتمانەی بە بزوتنەوە دەبەخشی، ئەو پێکهاتە تاوانبارە بە هاودەستی بەرفراوانی لە تاوانی نازییەکاندا، ئەندامەکانی رێنمایی دەکرد جهانی ئاسایی کە تاوان بە لادان لە یاسا دادەنێت، بۆ هەتا هەتایە بەجێبهێڵن، ئەو جهانەی بەرپرسیارە لەو تاوانانەی کە دەستەبژێر ئەنجامیدەدا[82] ئەم بارودۆخە، تەنانەت پێشئەوەی نازیزم دەسەلات بگرێتەدەست، بەکردەوە بەدیهاتبو، واتە کاتێك سەرکردەکان بەرپرسیارێتی هەمو

تاوانەکانیان لە ئەستۆدەگرت و بەراشکاوی جەختیان لەسەر تاوانێك دەکرد کە لە پێناوی بەرژەوەندی باڵای بزوتنەوە ئەنجامدرابون.

ئەفراندنی هەلومەرجی شەڕی ناوخۆ لە ئەڵمانیا ڕێگەی بۆ نازییەکان خۆشکرد، تا لەرێگەی سەرانە وەرگرتن بەدەسەڵات بگەن، ئەمەش تەنها بۆ ئەوە نەبو لە ئاوی لێڵدا ماسی بگرن، چونکە سەبارەت بە بزوتنەوە، توندوتیژی ڕێکخراو، کاریگەرترین دیواری بەدەوری جهانی ساختەیی دەکێشاو چالاکانە پارێزگاری لێدەکرد. "واقعییەتی" ئەم دیوارەش کاتێك تۆکمەو قایم دەبێت کە ئەندامێکی بزوتنەوە زیاتر لە وازهێنانی بزوتنەوە بترسێت تا لە ئاکامی تێوەگلانی لە کردەوەی نایاسایی و بە ئەندامبونی لە ریزی بزوتنەوە زیاتر هەست بە دڵنیایی دەکات تا لەریزی ئۆپۆزیسیۆن بێت. هەستکردن بە دڵنیایی لە پیادەکردنی توندوتیژی سیستماتیکەوە سەرچاوە دەگرێ کە پیکهاتەی دەستەبژێر لە ڕێگەیەوە ئەندامانی حیزب لە جهانی دەرەکی دەپارێزێت، ئەم هەستە بۆ یەکپارچەیی جهانی ساختەیی ڕێکخستنی نازی بە ئەندازەی ترس لە تیرۆر گرنگی هەیە.

لە نێوەندی بزوتنەوەدا، ڕێبەر هەمیشە وەك مۆتۆرێکی بزوێنەر کار دەکات. ڕێبەر لە ڕێگەی بازنەیەك لە دەروێشەکانی دەوروپشتییەوە لە پێکهاتەی دەستەبژێر جیادەکرێتەوە. ئەو دەروێشانە خەرمانەیەکی نهێنیئامێز کە شایستەی "پایەبڵندی نادەستەهەستی . نامەلموس"[83] ڕێبەرە بەچوار دەوریا دەکێشن. پێگەی ڕێبەر لەنێو بازنەی خەڵکە نزیکەکانی لەسەر چاندنی تۆی دوبەرەکی لەنێو ئەندامەکانی و لێهاتویی لە گۆڕینی بەردەوامی سەرکردەکانی راوەستاوە. بەشێوەیەکی ڕەوانتر بەردەوام باڵاکردنی زیاتر دەگەرێتەوە بۆ لێهاتویی بێوێنەی لە دنەدانی ململانێی دەسەڵات لەناو جەستەی حیزبدا تا سیفەتی چۆنایەتی فریودانی خەڵکی یا شایستەیی لە کاری ڕێکخستندا. ڕێبەر بەوە لە دیکتاتۆرەکانی دی جیادەکرێتەوە بەتەنها لە ڕێگەی

توندوتیژییەوە بە دەسەلات نەگەیشتوە. هیتلەر پێویستی بە یەکەی هێرش و دەستەی پاراستن نەبو تا پێگەی خۆی وەك سەرکردەیەك بپارێزێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە، رۆهم، سەرکردەی یەکەی هێرش کە وەك وەفادارێکی هیتلەر حیسابی بۆ دەکرا، یەکێك بو لە دوژمنە ناوخۆیەکانی هیتلەر. ستالین لە جەنگدا هێزو توانای لە تروتسکییەوە وەردەگرت، واتە لە کەسێکەوە بەتەنها خاوەنی بەرفراوانترین جەماوەر نەبو، بەڵکو وەك فەرماندەی لەشکری سور گەورەترین هێزی لە یەکێتی سۆڤێت لەبەردەستدا بو[84] بۆیە ستالین لە بواری رێکخستندا کەسێکی بەتواناو لێهاتو نەبو، بەڵکو تروتسکی شایستەترین بیروکراسی شۆڕشی روسیا بو[85] لە بەرامبەر ئەوەشدا هیتلەرو ستالین مامۆستای وردەکارییەکان بون، چونکە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی چالاکی سیاسیاندا، مەسەلەی فەرمانبەرانی ئیدارەکەیان خەمی سەرەکیان بو، تەنانەت لە دوای چەند ساڵێك بچوکترین لێپرسراو خۆی بە قەرزاریان دەزانی[86].

بە هەر حاڵ، بە مەبەستی بونیاتنانی بزوتنەوەی تۆتالیتاری و سەقامگیرکردنی پرەنسیپی "ویستی رێبەر قانونی حیزبە" و لەدوای ئەوەی زنجیرەی هەرەمی حیزبی بە کارایی بۆ تاکە ئامانجێك . بە زووترین کات گەیاندنی ئیرادەی رێبەر بۆ پلەکانی خوارەوە . بە باشی پەروەردە دەکرێن، ئیدی ئەو سیفەت و توانا شەخسییەی لە قۆناغە سەرەتاییەکانی چالاکی سیاسیدا مەرجێکی سەرەکی بو، مانا یەکلاکەرەوەکەی خۆیان لەدەست دەدەن. ئەگەر ئەو شتانەی سەرەوە رووبدەن، رێبەریش دەبێتە کەسێك کە قابیلی گۆڕان نەبێت، چونکە بونیاتی ئاڵۆزی بزوتنەوە بەبێ فەرمانی رێبەر هۆی مانەوەی لە دەستدەدا. لێرە بەدواوە، سەرباری پیلانی بەردەوامی دەستوپێوەندە نزیکەکانی رێبەرو ئاڵوگۆڕە بەردەوامەکانی نێو فەرمانبەران و کەڵەکەبونی رق و کینەو بێزاری، کەچی پێگەی رێبەر لەدژی راپەرینی بێسەروبەرەی دەربار هەر پارێزراو دەبێت، ئەویش لەبەر لێهاتویی لە رادەبەدەری رێبەر نیە کە زۆرجار دەوروبەرە نزیکەکەی هەڵیدەسەنگێنێت،

بەبێ ئەوەی هیچ وەهمێکیان لەسەر نادروستی قسەکانیان هەبێت، بەڵکو دەوروبەرە راستگۆو ژێرەکەی پێیانوایە هەمو شتێك بەبێ رێبەر بەرەو نەمان و فەوتان دەچێت.

ئەرکی بالای رێبەر لە ئەرکێکی دوانەیی بەرجەستە دەبێت کە هەمو پێکهاتەکانی بزوتنەوەی پێدەناسرێتەوە. لە لایەکەوە دەبێ وەك بەرگریکارێکی سیحراوی بزوتنەوە بەرپەرچی دەستدرێژییەکانی جهانی دەرەکی بداتەوە، لەلایەکی دی پێویستە پردێکی راستەوخۆ بێت کە لە رێگەی خۆیەوە بزوتنەوە بە جهانی دەرەکی ببەستێتەوە. لە راستیدا رێبەر بەشێوازێکی جیاوازتر لە سەرکردەی هەمو حیزبە ئاساییەکانی دی نوێنەرایەتی بزوتنەوە دەکات، خودی خۆی بەرپرسیارە لە هەمو چالاکی و کردارو کەموکورتی کادرو ئەندامەکانی بزوتنەوە کە لە کاتی راپەراندنی ئەرکەکانیان ئەنجامی دەدەن. ئەم بەرپرسیارییە گشتییە لەسەر ئاستی رێکخستن گرنگترین سیمای "پرەنسیپی رێبەر" پێکدەهێنێت، بۆیە کادر نەك تەنها لەلایەن رێبەرەوە دادەمەزرێت، بەڵکو بەرجەستەی کەسایەتی رێبەریش دەکات، هەروەها پێویستە گشت بریارەکانیش هەمیشە لەم تاکە سەرچاوەو هەردەم ئامادەیە دەربچێت. ئاوێتەبونی "نوێنەرانی سەرۆك" بەو رێبەرەی دایمەزراندون و مۆنۆپۆڵکردنی هەمو بەرپرسیارییەك کە بزوتنەوە پێی هەڵدەستێت، دوو نیشانەی تری زۆر جیاوازی یەکلاکەرەوە لە نێوان رێبەری تۆتالیتاری و دیکتاتۆر یا ستەمکارێکی ئاسایی پێکدەهێنێت. چونکە ستەمکار هەرگیز ئاوێتەی مامورەکانی نابێت چ جای ئەوەی بەرپرسیارێتی کردەوەکانیان لە ئەستۆ بگرێت[87] ئەو دەستوپێوەندەکانی وەك قۆچی قوربانی بەکاردەهێنێت یا روبەروی رەخنەیان دەکاتەوە بە مەبەستی ئەوەی خۆی لە رق و کینەو هەڵچونی میللەت بەدوور بگرێت، بەلام هەمیشە مەودایەك لەنێوان خۆی و دەستوپێوەندو هاولاتییەکانی دەهێڵێتەوە. رێبەری تۆتالیتاری بەپێچەوانەوە لەو کەسانە خۆشنابێت کە فەرمانبەرانی رەخنە دەکەن، چونکە ئەوانە هەمیشە

بـه نـاوی ئـەوەوە کـار دەکـەن. ئەگـەر بیـەوێت ئـەو هەڵانـەی دراوەتـە پـاڵی راستبکاتەوە، دەبێ ئەوانـەی هەڵـەیان کـردوە بـە فرمـانی خـۆی لـە نێـوببرێن، ئەگەر بیەوێت هەڵەکانی بخاتە ئەستۆی ئەوانی دی، پێویستە بیانکوژێت[88] بەهەر حاڵ لەم چوارچێوەی رێکخستنەدا هەڵە جگە لـە گزیو فروفێل چی دی نیە: واتە کەسێك هەڵە دەکات، لەراستیدا فێڵبازێکە خۆی وەك بەرجەستەکاری رێبەر نیشاندەدا.

ئەم بەرپرسیارێتیە گشتییەی رێبەر بەرامبەر هەمو کارێکی بزوتنـەوەو ئـەو ئاوێتەبونە گشتییەی رێبـەر لەگـەڵ ئـەو بەرپرسـانەی دایمەزرانـدون، بـەکردەوە ئەو ئەنجامەی لێدەکەوێتەوە کە هیچ ئەندامێکی بزوتنـەوە لـە بارێکی ئـەوتۆدا نیـە لـە کردەوەکـانی خـۆی بەرپرسـیار بێـتو بەڵگەیـەك بـۆ کردەوەکـانی بهێنێتەوە. تا ئـەو شوێنەی رێبـەر مـافی ئاراستەکردنی کردەوەکانی بزوتنـەوە مۆنۆپۆڵ بکـات، ئیـدی ئـەو بەرامبـەر بـەجهانی دەرەوە وادەردەکـەوێت کـە تاکـە کەسێکە دەزانێت چی دەکات، واتـە تـەنها نوێنـەری بزوتنـەوەو تـەنها کەسێکە دەکـرێ بـەزمانی ناتۆتالیتـاری گفتوگـۆی لەگەڵـدا بکرێـت، بۆیـە کاتێـك رەخنـەدەکرێ یـا دەربـارەی کارێك گفتوگـۆی لەگەڵدا دەکرێ، ناتوانێت بڵێت بۆچی لە من دەپرسیت، لـە رێبـەر بپرسـە. تـا رێبـەر لـە چەقی بزوتنـەوە بێت، دەتوانێـت بـە جۆرێـك رەفتـار بکـات وەکئـەوەی لەسـەروی بزوتنـەوەوە بێـت. کەواتـە بێبەڵگـە نیـە کاتێك بیانییـەکان مامەڵـە لەگـەڵ بزوتنـەوە یـا حکومەتـە تۆتالیتارەکاندا دەکەن، هیواو ئومێدیان بەو گفتوگۆیانە بێت کە لەگەڵ رێبەردا ئـەنجامی دەدەن. بـەڵام نهێنی واقعـی رێبـەری تۆتالیتـاری لـە رێکخستنە، ئـەو رێکخستنەی رێگـەی پێدەدا بەرپرسیارێتی ئەو تاوانانـە لـە ئەسـتۆ بگـرێ کـە پێکهاتـەی دەسـتەبژێری بزوتنـەوە پێـی هەڵدەسـتێت، لـە هـەمان کاتیـشدا بانگەشـەی ئـەوە بکـات، لـە سـاکارترینو ئابرومـەندترینو بێتـاوانترین لایـەنگری بزوتنەوە داوین پاکترو ساکارترە[89]

بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بە "کۆمەڵەی نهێنی سەقامگیر لە ڕۆژی ڕوناک"[90] ناودەبرێن. سەرباری ئەوەی زانیارییەکی ناچیزمان لەسەر بونیادی کۆمەڵە کۆمەڵایەتیە نهێنیەکاندا هەیەو بەرامبەر بە پەیبردن بە مێژویی نزیکیشیان زۆر کەمتەرخەمین، کەچی هەر دەبێت بڵێین ئەگەر بونیادی بزوتنەوە، بە حیزب و گرۆپەکانی دی بەراورد بکرێ، هەر لەسەرەتاوە هێندێك سیمای زەقی کۆمەڵە نهێنیەکانمان[91] بیردەکەوێتەوە. کۆمەڵەی نهێنی زنجیرەی هەرەمیی بە پێی پلەکانی "تەڵقین" ڕێکدەخات و ژیانی ئەندامەکانیشی بەپێی بیروباوەڕێکی نهێنی و ساختە ڕێکدەخات، بەجۆرێك کە شتەکان وەك خۆیان دەرناکەون، هەروەها پشت بە ستراتیجییەکی درۆی یەکانگیر دەبەستێت بە مەبەستی گومڕاکردنی ئەو جەماوەرەی تەڵقین نەدراوە. ئەمە سەرباری ئەوەی گوێڕایەڵییەکی کوێرانە بەسەر ئەندامەکانیاندا دەسەپێنێت، ئەوانەی کە زۆرجار وەفا و ئەمەك بۆ ڕێبەریکی نەناسراو و نهێنیئامێز یەکیاندەخات. ڕێبەر بە تیمێکی بچوکی تەڵقیندراوەکان دەورە دەدرێت یا پێویستە دەورە بدرێت، ئەوانیش بەتیمێکی نیمچە تەڵقیندراو دەورە دەدرێن، تا وەك ناوچەیەکی بێلایەن لە نێوان ئەندامان و جهانی کافری دوژمن بمێننەوە[92]. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان چەشنی کۆمەڵە نهێنیەکان، دونیا دەکەن بە دوو بەشەوە، "برایانی سوێند خواردوو" و جەماوەری گێل و بێسیما "دوژمنانی سوێند خواردوو"[93] ئەم جیاوازییە لەسەر دوژمنایەتێکی ڕەهای جهانی دەوروبەر خۆی ڕاگرتوە، بەتەواوەتی لە ڕەوتی حیزبە ئاساییەکان جیاوازە کە جەماوەر دەکاتە دوو بەشەوە، حیزبی و ناحیزبی. حیزب و کۆمەڵە ئاشکراکان تەنها ئەوانەی ڕاستەوخۆ ڕوبەڕویان دەوستنەوە بە دوژمن ناو زەدەیان دەکات، ئەمە لە کاتێکدا هەمیشە پرەنسیپی کۆمەڵە نهێنیەکان بریتیە لە: "هەر کەسێك لە ڕیزی کۆمەڵەی نهێنی نەبێت، دەردەکرێت"[94]. ئەم پرەنسیپە نهێنیئامێزە بە رووکەش وادەردەکەوێت بۆ ڕێکخستنەکانی جەماوەر گونجاو نەبێت، لەگەڵ هەمو ئەوەشدا، نازییەکان بەلانی کەمەوە لەرووی دەرونیەوە،

بەرامبەر بەهاوتابونی سروتی تەلقینی کۆمەڵە نهێنییەکانیان پاداشتی ئەندامەکانیان دەدایەوە، لەجیاتی ئەوەی بەتەواوەتی رێگە لە یەهود بگرن بچێتە ریزی حیزبەوە، ئەندامەکانیان ناچارەکرد نایەهودی یا خزمایەتی نەکردنی یەهودییەت بسەلمێنن و دەزگایەکی ئاڵۆزیان دروستکرد کە لە رێگەیەوە روناکییان دەخستە سەر رەچەڵەکی 80 ملیۆن ئەڵمانی کە بەپێی وتەکانی خۆیان مێژوو پەردەیەکی رەشی بەسەرا داداوەتەوە. هەرچەندە گەڕان بە دوای باوانی هەشتا ملیۆن ئەڵمانی کۆمیدیایەکی پڕ خەرجی بو، بەڵام کاتێک کەسێک لەم ئەزمونە بەسەرکەوتویی دەردەچو، ئیدی هەستیدەکرد لەریزی گروپە هەڵبژاردەکانەو دەبێ دژایەتی ملیۆنان کەسی دی بکات کە ئەو مەرجانەیان تیانیە. هەمان پرەنسیپیش لە مامەڵەی بزوتنەوەی بۆلشەفیک لەگەڵ جهانی دەرەوەدا راستە، چونکە هەڵمەتی پاکتاوکردنە یەک لەدوای یەکەکان خەسڵەتی هەڵبژاردەی بۆ ئەندامانی بزوتنەوە، ئەوانەی لە کۆمەڵگە دەرنەکرابون، پشتراستدەکردەوە.

زەقترین لێکچون لە نێوان کۆمەڵە نهێنیەکان و بزوتنەوە تۆتالیتارەکاندا لەو رۆڵەدابو کە بەسروتەکانیان دەدرا. لەم رووەشەوە، نمایشەکانی گۆڕەپانی سور لە مۆسکۆ لە رێورەسمە پڕشکۆکانی نۆرمبۆرگ کەمبایەخترو جیاوازتر نەبو. لە نێوەندی سروتی نازییەکاندا بەناو "ئاڵای خوێن" دادەنراو لە نێوەندی سروتی بۆلشەفیکەکانیشدا جەستەی مۆمیا کراوی لینین، ئیدی بەمشێوەیە هەر دوولایان رەگەزی زۆر بەهێزی بتپەرستییان دەخستە نێوجەرگەی رێورەسمەکانیانەوە. ئەم دیدوبۆچونە بتپەرستگەرایە بەڵگەیەک نیە لەسەر ئارەزوی نیمچە ئاینیەکان یا لادانێک بێت لە ئایین، هەروەکو هێندێک پێیان خۆشە ئەو قسانە بکەن. ئەم بتانە شێوازێکی رێکخستنەو دەکرێ بە سروتی ئاسایی کۆمەڵە نهێنیەکان تا لە رێگەیەوە ئاشنایەتیان لەگەڵدا پەیدا بکرێ، زۆرجار ئەو کۆمەڵانە لە رێگەی هێمای ترسێنەرەوە ئەندامەکانیان دەتۆقێنن بۆ ئەوەی نهێنی بپارێزن. شتێکی بەڵگەنەویستە کە تاقیکردنەوەی

سروتێکی نهێنیئامێز باشترو تۆکمەتر ئەندامەکان یەکدەخات تا بەشداربونیان لە زانینی خودی نهێنییەکە. چونکە ئاشکرابونی نهێنی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بە زەرورەت هیچ شتێك لە سروشتی ئەو تاقیکردنەوەیە ناگۆڕێت(95)

بەدڵنیاییەوە ئەم لێکچونە شتێکی هەڵکەوت نیەو زۆر بەسادەیی ناتوانرێت بدرێتە پاڵ ئەو واقیعەی کە خودی هیتلەرو ستالین پێشنەوەی بگەن بە پلەی رێبەری بزوتنەوەی تۆتالیتاری، لەریزی کۆمەڵە نهێنیە هاوچەرخەکان کاریان کردوە . هیتلەر لە هەواڵگری نهێنی گاردی ئیمپراتۆری کاریدەکردو ستالینیش لە گروپی پیلانگێری ناو حیزبی بۆلشەفیك کاریدەکرد. ئەم لێکچونە تا رادەیەك دەرهاویشتەیەکی سروشتی پیلانی وەهمی تۆتالیتاریزمە کە بەرووکەش رێکخستنەکانیان بۆ روبەروبونەوەی ئەو کۆمەڵە نهێنییانە دامەزرا بون، واتە بۆ روبەروبونەوەی پیلانگێری کۆمەڵەی نهێنی یەهود یا کۆمەڵەی پیلانگێری تروتسکییەکان. بەلام دیارترین شت لە رێکخستنەکانی تۆتالیتاریزمدا بریتی بو لەوەی کە زۆر شێوازی رێکخستنی لە کۆمەڵە نهێنیەکانەوە وەردەگرت، بەبێ ئەوەی ئامانجی راستەقینەی خۆیان بشارنەوە. نازییەکان دەیانویست جهان داگیربکەنو میللەتانی "نامۆ رەگەز" رابگوێزنو ئەوانەشی "بۆماوە . یەکی بایۆلۆجی نزمیان" هەیە لە نێوبەرن، ئەمە لە کاتێکدا بۆلشەفیکەکان هەولی شۆڕشێکی باننەتەوەییان دەدا: کەواتە، ئەم ئامانجانە هەرگیز نهێنیئامێز نەبون، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەمیشە بەشێك بون لە هەڵمەتی پروپاگەندەکانیان. بەدەستەواژەیەکی دی، بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لاسایی هەمو جومگە سەرەکییەکانی کۆمەڵە نهێنیەکانیان دەکردەوە، بەلام هەمویانی لە پاراستنی نهێنی بەتاڵ کردەوە کە تاکە پاساوی کۆمەڵە نهێنیەکان بو.

لەم رووەوە، هەروەکو لە زۆر رووی دییەوە، نازیزمو بۆلشەفیزم لەسەر بنەمای دوو پێودانگی مێژوویی زۆر جیاواز، بەهەمان دەرئەنجامی رێکخستن گەیشتن. لە کاتێکدا نازییەکان بە بیانوی پیلانی هەڵبەستراو دەستیانکرد بە

دروستكردنی كۆمەڵەكانیان و بەشێوەیەكی وشیارانە كەوتنە لاسایيكردنەوەی كۆمەڵـەی نهـێنی حـەكیمانی زایـۆنیزم، بۆلـشەفیكەكان كـە لـە حیزبێكـی شۆڕشگێرەوە هـەڵقوڵابون و ئامانجی سەرەكییان دیكتاتۆرییـەتی تـاك حیزبـی بـو، ئـەو قۆناغـەیان تێپەڕانـد كـە حیـزب "بەتـەواوەتی گۆشـەگیرو لەسـەروی هەموانـەوە" بـو، گەیـشتن بـە قۆنـاغێكی دی كـە مەكتـەبی سیاسـی "لەلایـەن هەموانـەوە گۆشـەگیرو لەسـەروی هەموانـەوە" بـو[96]. سـەرئەنجام سـتالین دیـسپلینی زۆر تونـدی تۆتالیتـاری لەسـەر شێوازی گروپـی پیلانگێری بەسـەر بونیـادی حیزبـدا سـەپاند كـە تـەنها لـەم قۆناغـەدا هەسـتی بـە پێویـستی ئەفسانەیەكی نێوەنـدی كـرد تـا بـە مـشتێكی ئاسـنین لەسـایەی هەلومـەرجی رێكخستنێكی جەماوەریدا دەست بەسەر كۆمەڵەی نهێنیدا بگرێت. ئەگەرچی گەشەكردنی نازییەت لۆجیكی ترو خودێكی یەكانگیرتری هەبو، بەلام مێژووی حیزبـی بۆلـشەفیك بـە باشـترین شـێوە خەسـڵەتی تۆتالیتـاری سـاختەیی دەخستەروو. چونكە پیلانە جهانیە وەهمییەكانی دژ بە یەكێتی سۆڤێت كە زۆرجار پیلانی بۆلشەفیكەكان بۆ روبەروبونـەوەیان رێكدەخرا، ئایدیۆلۆجیانـە دیارینـــەدەكرا. ئـــەو پیلانانـــە بـــەردەوام دەگـــۆڕان و بـــەپێی پێداویـــستیە هەنوكەییـەكان رێكدەخرانـەوە . هـەر لـە تروتسكیەكانەوە تـا پیلانـي دوو سـەد خێزانـی و پیلانـە جۆراوجۆرەكـانی ئیمپریـالیزم و پیلانـی "فـرە سیاسـیە لێكـدابڕاوەكان" لەگـەڵ ئەوەشـدا، بۆلـشەفیزم لـە هەلومەرجـە هـەرە جیاوازەكانیشدا دەستبەرداری ئەمجۆرە ئەفسانەیە نەدەبو.

سـتالین لـە رێگـەی پاكتـاوكردنی باڵـەكانی نـاو حیـزب و قەدەغـەكردنی دیموكراسیەتی ناوخۆی حیزب و گۆڕینی حیزب و كۆمۆنیستە نەتەوەییەكان بە لقێكی كۆمێنترن بە رێبەرایەتی مۆسكۆ، توانی دیكتاتۆرییـەتی تاك حیزبی بە رژێمێكـی تۆتالیتـاری بگۆڕێـت و حیزبـە كۆمۆنیـست و شۆڕشـگێڕەكانیش بـۆ بزوتنـەوەی تۆتالیتـاری بگۆڕێـت. لە بەرامبەر ئەوەشدا، كۆمەڵە نهێنیـەكان بە شـێوەیەكی گـشتی و دەزگـای پیلانگێـڕی حیزبـە شۆڕشـگێڕەكانیش بـە

شێوەیەکی تایبەتی، هەمیشە بە نەبونی گروپ و سەرکوتکردنی بیروڕای جیاوازو نێوەندێتی ڕەهای سەرکردایەتی جیادەکرێنەوە. سەرجەم ئەو ڕێوشوێنانە مەبەستی سودگەرایان هەبو، ئەویش، ئەندامانی حیزبی شۆڕشگێڕ لە چەوسانەوەو کۆمەڵگەش لە خیانەت دەپارێزێت. گوێڕایەڵی بێقەیدومەرجی هەمو ئەندامان و دەسەڵاتی ڕەهای سەرکردەی حیزب، دەرئەنجامی پێویستییەکی کردەیی حەتمی بو. بەلام ئەوەی جێگەی داخە پیلانگێڕەکان بە ئارەزوویەکی دەرەپەیبردن، لەو بڕوایەدابون سەرکەوتوترین ڕێباز لەسیاسەتدا بەگشتی ڕێبازی کۆمەڵە پیلانگێڕەکانەو ئەگەر بتوانن بە ڕۆژی روناك جێبەجێی بکەن و بە پشتیوانی ئامرازی توندوتیژی تێکرای میللەت ببێتە پشتیوانیان، ئەوا توانای کەڵەکەبونی دەسەلات هەمو سنورێك دەبەزێنێت(97). مرۆڤ دەتوانێت ڕۆڵی باڵی پیلانگێڕی لە حیزبی شۆڕشگێڕیدا، ئەگەر حیزب یەکگرتو،و سەلامەت بێت، بە ڕۆڵی سوپا لەناو جەستەی سیاسیدا بەراورد بکات: لەگەڵ ئەوەی ڕێسای ڕەفتاری تایبەتی بە تەواوەتی لەگەڵ ڕێسای ڕێبازی جەستەی مەدەنی جیاوازە، بەلام دەتوانێت لەخزمەتێدا بێت و لەژێر فەرمان و چاودێریدا کار بکات، بۆیە تەنها کاتێك مەترسی سەرهەڵدانی دیکتاتۆرییەتی سەربازی ڕوودەدا کە سوپا نەیەوێت خزمەت بە جەستەی سیاسی بکات، بەڵکو کۆنترۆڵی بکات. هەروەها مەترسی تۆتالیتاریزم کاتێك سەر دەردەهێنێت کە باڵی پیلانگێڕی حیزبی شۆڕشگێڕ لە چاودێری حیزب ڕزگاری دەبێت و خولیای سەرکردایەتیکردنی دەکەوێتەسەر. لەسەردەمی حوکمی ستالیندا هەمان شت بەسەر حیزبی کۆمۆنیستدا هات، ڕێبازی ستالین تایبەت بو بە مرۆڤێك کە لە دەستەیەکی پیلانگێڕی ناوخۆی حیزبەوە سەری دەرهێنابو، خۆی بە وردەکارییەوە سەرقاڵ دەکردو جەختی لەسەر لایەنی سیاسی کەسێتی دەکردەوەو بەخراپی سودی لە دۆست و یارانی وەردەگرت و پاشان زۆر بێبەزەییانە پاکتاوی دەکردن. بەهەر حاڵ ستالین لە دوای مردنی لینین لە کێشمەکێشی مەسەلەی جێنیشیندا پۆلیسی نهێنی

پشتیوانی لێکرد[98] کە لەو دەمەدا گرنگترین و بەتواناترین گروپی حیزب بو[99] دەبوایە ڕێکخراوی چیکا هاودڵی و هاوسۆزی لەگەڵ نوێنەری گروپی پیلانگێڕی حیزبدا هەبێت، واتە لەگەڵ ئەو کەسەی کە پۆلیسی نهێنی وەك کۆمەڵەی نهێنی دەبینی و دەیتوانی لەیەك کاتدا هەم تایبەتمەندی پێبدات و هەم لەو تایبەتمەندیانەش بێبەشی بکات.

لەگەڵ ئەوەشدا دەست بەسەراگرتنی حیزبە کۆمۆنیستەکان لەلایەن گروپی پیلانگێڕییەوە، یەکەم قۆناغە بۆ ئەوەی بگۆڕێن بە بزوتنەوەی تۆتالیتاری. بەتەنها ئەوەش بەس نەبو پۆلیسی نهێنی و سیخورەکانی لە حیزبە کۆمۆنیستەکانی دەرەوەدا هەمان ڕۆڵ ببینن کە پێکهاتەی دەستەبژێری بزوتنەوەی نازی لە ئەڵمانیا وازیدەکرد، بەڵکو بۆ ئەوەی پاریزگاری لە حوکمی پۆلیسی نهێنی بکرێت، پێویست بو خودی حیزبیش بگۆڕێت. سەرئەنجام پاکتاوکردنی گروپەکان و مایەپۆچکردنی دیموکراسیەت لە ناوخۆی حیزبدا، هاوکات بو لەگەڵ سەربازگیری جەماوەرێکی ناسیاسی و بێلایەندا: حیزبە کۆمۆنیستەکانی دەرەوەش هەر بەزوویی کەوتنە لاساییکردنەوەی ئەو ڕێبازە، لەدوای ئەوەی سیاسەتی بەرەی میللی دەسپێکاری ئەم ڕێبازە بو.

تۆتالیتاریزمی نازی بە ڕێکخستنی جەماوەر دەستپێکرد، ئنجا پێکهاتەی دەستەبژێر هێدی هێدی دەستی بەسەراگرت، ئەمە لە کاتێکدا بۆلشەفیکەکان بە پێکهاتەی دەستەبژێر دەستیان پێکرد، پاشان جەماوەریان لەسەر ئەو فۆرمە ڕێکخست. بەڵام هەر دوو حاڵەتەکە یەك ئەنجامی هەبو. نازییەکان هەر لەسەرەتاوە بە حوکمی نەریت و بڕیاری پێشوەختی سەربازییان لە دروستکردنی پێکهاتەی دەستەبژێردا، ڕێوشوێنی سوپایان گرتەبەر، ئەمە لەکاتێکدا بۆلشەفیکەکان پۆلیسی نهێنیان ڕاسپارد دەسەڵاتی باڵا پیادە بکات. بەڵام لە دوای چەند ساڵێك ئەو جیاوازییەش لە ئارادا نەما، سەرۆکی دەستەی پاراستن، فەرمانەدەی پۆلیسی لە ئەستۆگرت و ڕێکخستنەکانی دەستەی پاراستن بەهێواشی چوە ژێر باڵی دەزگای گەستاپۆوە و بەرپرسەکانیشیان

جێگەی ئەوانیان گرتەوە، سەرباری ئەوەی کارمەندانی گەستاپۆ لە نازییە باوەڕپێکراوەکان بون[100].

ڕێك بە مەبەستی هەمان نزیکایەتی و لێکچونی نێوان کاری کۆمەڵە نهێنییە پیلانگێڕەکان و کاری پۆلیسی نهێنی کە لە پێناوی بەرەنگاربونەوەی ئەو پیلانگێڕانە ڕێکخرابو، ئەو ڕژێمە تۆتالیتارانەی هەر لە بنەڕەتەوە لەسەر ئەفسانەی پیلانی جهانی بونیات نرابون و ئامانجیان فەرمانڕەواییکردنی جهان بو، والێکرد هەمو دەسەڵاتەکان لە دەستی پۆلیسدا چڕبکەنەوە. "کۆمەڵە نهێنیە ئاشکراکان" لە قۆناغی بەر لە دەسەڵات گرتنەدەست، چاکەی دییان پێشکەش بەڕێکخستنی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان دەکرد. ناکۆکی و ململانێی ئاشکرای نێوان ڕێکخستنەکانی جەماوەرو کۆمەڵەی سنوردار کە بەتەنها بۆ پاراستنی نهێنی گونجاوە، لە بەرامبەر ئەم واقیعەی خوارەوە گرنگی خۆی لە دەست دەدا: بونیادی کۆمەڵەیەکی نهێنی دەتوانێت دوانەیی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاری (الثنائیة الایدیولوجیة التۆتالیتاریة)وەرگێڕێتە سەر پرەنسیپێکی ڕێکخراو . دوژمنایەتی کوێرانەی جەماوەر بەرامبەر بە جهانی واقیعی، بەبێ ئەوەی جیاوازییە ناوخۆییەکان و جیاکاری پێکهاتەکانی لەبەرچاو بگرێت. بە دیدو بۆچونی ئەو ڕێکخستنەی بەپێی پرەنسیپێك کار دەکات کە هەر کەسێك لەناو ئێمەدا، نەبێت کەسێکی دەرکراوە، ئەوەی لەگەڵ ئێمەشدا نەبێت، دوژمنی ئێمەیە، جهان گشت هەمەرەنگی و جیاوازی و فرەییەك لەدەست دەدا. ئەم جیاوازی و هەمەرەنگییەش هەمان خەسڵەتی ئەو جهانەیە کە دەبێتە مایەی شڵەژان و دڵەڕاوکێی جەماوەرێك پێگەو رووی خۆیان تیا گومکردوە[101]. دابەشبونی دوانەیی نێوان ئێمەو ئەوانی دی، زیاتر سروشبەخشی دڵسۆزی بێگەردی ئەندامانی کۆمەڵە نهێنییەکان بو تا خودی نهێنی کۆمەڵەکان. بە لاساییکردنەوەی بونیادی ڕێکخستنی کۆمەڵەی نهێنی و پوچەڵکردنەوەی ئامانجە لۆجیکەکانی کە پاراستنی نهێنییە، دەتوانرێ پرەنسیپی دوانەیی وەك خۆی پاریزگاری لێبکرێت. ئەوەش گرنگ نەبو کە

ئایدیۆلۆجیایەکی پیلانگێڕی کوانوی ئەو دوولەتبونە بێت، هەر وەکو لە حاڵەتی نازییەکاندا بەدیدەکرا، یا گەشەکردنی مشەخۆری باڵی پیلانگێڕی حیزبێکی شۆڕشگێڕ زەمینە خۆشکەری ئەم کێشەیە بێت، هەروەکو لە حاڵەتی بۆلشەفیکەکاندا بەدیدەکرا. بانگهێشتەکانی ڕێکخستنێکی تۆتالیتاری بریتییە لەوەی کە هەر شتێك لە دەرەوەی بزوتنەوەی بێت، "روو لەمەرگە"، بانگهێشتێکە لە هەلومەرجی مرۆڤکوژانەی فەرمانڕەوایی تۆتالیتاردا بەشێوەیەکی جیدی دێتەدی، تەنانەت بەر لە قۆناغی دەسەڵات گرتنەدەستیش ئاراستەی ئەو جەماوەرە دەکرا کە لە لێکترازان هەڵدەهات و لەرێگەی گومڕاییەوە باوەشی بۆ نیشتمانە ساختەکەی بزوتنەوە دەگرتەوە.

لە ڕاستیدا بزوتنەوە تۆتالیتارەکان چەندین کەڕەت ئەوەیان سەلماندوە کە دەتوانن هەمان وەفاداری بۆ ژیان و مردن لە ناخی ئەندامەکانیاندا بچێنن کە پێشتر خەسڵەتی کۆمەڵە نهێنی و پیلانگێڕەکان بو(102) لەم بارەیەوە، نەبونی هیچ جۆرە بەرگرییەك لە لایەن هێزی پڕ چەکی مەشقدیدەی وەك یەکەی هێرش لەئاست کوشتنی "رۆهم"ی سەرکردە خۆشەویست و سەدان هاوڕێی نزیکیان، مایەی سەرسوڕمان بو. لەو ساتەوەختەدا خودی رۆهم نەك هیتلەر هێزو توانای سوپای لە پشت بو. بەڵام ئەمرۆ ئەو دیمەنە یەك لەدوای یەکانەی کە تیایە "تاوانبارەکانی" حیزبی کومۆنیست بە ئاشکرا دان بەتاوانەکانیاندا دەنێن، ئەو روداوانەی پەردەپۆش کردوە. ئەو دادگاییانەی لەسەر دانپیانانی ساختە ئەنجامدەدرا، بەشێکی دانەبڕاوی سروتی ئاینێك بو کە لە دیدی ناوخۆدا زۆر گرنگ و لە روانگەی دەرەوەشدا قابیلی پەیپێبردن نەبو. بەڵام لەوە گەڕێن کە قوربانیەکانی ئەوجۆرە دادگاییانە ئەمرۆ بەچ شێوازێك ئامادە دەکرێن، ئەوا پێویستە بوترێت، بوونی ئەم سروتە قەرزاری دانپیانانە تارادەیەك ناساختەییەکەی ساڵی 1936 گاردی بۆلشەفیکی دێرینە. ئەوانەی بە مردن حوکم درابون، تەنانەت لە پێش دادگاییەکانی مۆسکۆشدا، زۆر بە هێمنی حوکمەکەیان قبوڵ دەکرد، ئەم ڕەفتارە "بەشێوەیەکی تایبەتی لە نێو

ئەنـدامانی چیکا بـرەوی هـەبو"[103] تـا ئـەو کاتـەی بزوتنـەوە بـونی هـەبێت، شـێوەی رێکخـستنە تایبەتـەکانی، بـەلانی کەمـەوە پێکهاتـەی دەسـتەبژێری بزوتنـەوە، دڵنیـا دەکـات کـە چـیتر نـاتوانن ژیـان لـە دەرەوەی داورودەسـتە دەستکردەکەیان وێنابکەن. ئەوانە تەنانەت ئەگەر حوکمی مردنیشیان بەسـەرا بـدرێت، دیـسانەوە هەسـتدەکەن لـە جهـانی تـەڵقین نـەدراو باشـترن. تـا ئـەو جێگەیـەی ئامـانجی ئـەم رێکخـستنە دیـاریکراوە فریـودانی جهـانی دەرەوەو شەڕکردنی بێت، تا سەرئەنجام کۆنترۆڵی بکات، ئەندامەکانی ئامادەن گیان خۆیـان بـەخت بکـەن، بـە مـەرجێك ئـەو گیانبـەخت کردنـە بەشـداری لـە گومڕاکردنی جهانی دەرەوە بکات[104].

بـە هـەر حـاڵ گـرنگترین بـەهای بونیـادی کۆمەڵـە نهێنیـەکانو پێـوەرە ئەخلاقییـەکان لـە رێکخـستنی جـەماوەردا، نـە لـە گـرەنتی پـەیمانو وەفـای بێقەیـدو مـەرجی ئەنـدامانی کۆمەڵـە نهێنیەکانـەو نـە لـە دوژمنایـەتیکردنی بێسنوری جهانی دەرەکییە، بەڵکو لە رێگـەی درۆو دەلەسەیەکی بەردەوامەوە توانایەکی بێوێنـەیان لە دامەزراندنو پاراستنی جهانێکی ساختەدا بەدەست هێناوە. سەرتاپای بونیادی هەرەمی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان، هەر لە لایەنگری ساکارەوە تا ئەندامانی حیزب، هەر لە پێکهاتەی دەستەبژێرو بازنە نزیکەکانی چـواردەوری رێبـەرەوە تـا خـودی رێبـەر، دەتـوانرێ هـەمویان بـە گـوزارەی خۆشـباوەڕی تێکـەڵ بـە گاڵتـەجاڕی وەسـفبکرێنو هـەر ئەنـدامێکیش بـەپێی پلەوپایـەی لـەناو بزوتنـەوەدا پێویـستە لەسـەری چـۆن لەگـەڵ ئەفـسانە نەگۆڕەکانی ئایدیۆلۆجیای بزوتنەوە کارلێك دەکات، هەر بەوشێوەیەش لەگەڵ درۆی رێبەرەکاندا کە هەمیشە دەگۆڕێن کارلێك بکات.

ئـاوێزانبونی خۆشـباوەڕی پێشئەوەی بگۆڕێت بـە دیاردەیـەکی رۆژانـەی جـەماوەر، عەقڵییـەتێکی بەرجەسـتەی هەرچیوپەرچـی بـو. جـەماوەر لـە جهـانێکی نـاجێگیرو دەرەپـەیبردن، گەیـشتبو بـە ئاسـتێك، لەلایەکـەوە بـاوەڕی بەهـەمو شتێك دەکرد، لەلایـەکی دی بـاوەڕی بەهیچ شـتێکیش نـەبو، هـەروەها

پێیوابو هەمو شتێك لە توانادایەو هیچ شتێکیش هەقیقەتی نیە. کەواتە خودی ئاوێزانبونی زۆر دیارو بەرجەستە بو بە حوکمی ئەوەی زەنگی خەمی وەهمێکی لێهەبدا کە پوختەکەی بریتی بو لەوەی خۆشباوەڕی جگە لە لاوازی دەرونی سەرەتایی و ناوریایی شتێکی دی نیەو گاڵتەجاریش خەوشی رۆحێکی بالاّ و گەشەکردوە. پروپاگەندەی جەماوەری ئەوەی ئاشکرا کرد کە جەماوەر لە هەمو ساتێکدا ئامادەیە بڕوا بە بێماناترین درۆ بکاتو رقی لەفریودانی خۆیشی نەدەبوەوە، چونکە پێیوابو هەمو قسەیەك کەمو زۆر درۆیە. رێبەرە جەماوەرییەکان لەسەر پرەنسیپی دەرونناسی پروپاگەندەکانیان بونیات دەنا تا لە هەلومەرجێکی لەوجۆرەدا، بتوانرێ خەڵکی والێبکرێ کە رۆژێك باوەڕ بە سەیرو سەمەرەترین لێدوان بکەن و ئەگەر بۆ رۆژی دواتریش بە بەڵگەی کۆنکریتی نادروستی ئەو لێدوانەیان بۆ روونبێتەوە، پەنا بۆ گاڵتەجاری بەرن، بۆیە لەجیاتی ئەوەی لەو رێبەرانە دووربکەونەوە کە درۆیان لەگەڵ دەکەن، تەنها بەوەندە نارەزایی دەردەبڕن کە زۆر دەمێکە دەزانن ئەو قسانە درۆیەکی رووتەو ستایشی رێبەر دەکەن کە زیرەکییەکی تاکتیکی لەرادەبەدەری هەیە. ئەو پەرچەکردارەی جەماوەر بەرامبەر بە پروپاگەندەی تۆتالیتار گۆڕا بۆ پرەنسیپێکی هەرەمی گرنگی رێکخستنی جەماوەر. بە هەرحاڵ ئاوێزانبونی خۆشباوەڕیو گاڵتەجاری هەمو پلەکانی بزوتنەوەی تۆتالیتاری گرتەوە، بەلاّم تا پلە بالاّتربوایە گاڵتەجاریش بەسەر خۆشباوەریدا زاڵتر دەبو. بیروباوەڕی سەرەکی هەمو پلەکانی بزوتنەوەی تۆتالیتاری، هەر لەلایەنگرێکەوە تا خودی رێبەر بریتی بو لەوەی سیاسەت گەمەیەکە گزیو فروفێڵ پیادە دەکاتو یەکەمین راسپاردەی بزوتنەوەش: "پێشەوا هەمیشە لەسەر هەقە"، ئەو بیروباوەڕەی بۆهێنانەدی ئامانجە سیاسیە جهانییەکان پێویست بو، بە گوزارشتێکی دی، بەمەبەستی ساناگەیشتن بە ئامانج لەجەنگێکی هەلاّیساودا، فروفێڵ لە ئاستی جهانیدا بوە رێسای رێبازێکی سەربازی باو(105).

بەلاّم ئەو ماشێنەی درۆ ترسناکەکانی بزوتنەوەی تۆتالیتاری دەخوڵقێنێو بلاّویاندەکاتەوە، پشت بەخودی پێگەی رێبەر دەبەستێت. رێکخستنی

تۆتالیتاری سەرباری سەلماندنی هەڵمەتی پروپاگەندەکانی کە بەشێوەیەکی زانستی بەپێی یاسا سروشتی و ئابورییەکان پێشبینیدەکرێ، پێگەی ئەو پیاوە بێوێنەیەشی دەخاتەپاڵ کە ئەو زانستەی بۆ خۆی قۆرغکردوەو سیفەتی یەکەمی بریتیە لە: "هەمیشە لەسەر هەقەو بەردەوامیش لەسەر هەق دەبێت"(106) سەبارەت بە هەر ئەندامێکی بزوتنەوەی تۆتالیتاری ئەم زانستە هەرگیز پەیوەندی بە راستییەوە نیە، هەروەکو چۆن هەمیشە لەسەر هەقبونی رێبەر پەیوەندی بە راستگۆیی بابەتیانەی وتەکانی رێبەرەوە نیە، هەروەها واقیعیش ناتوانێت بەرپەرچی راستی وتەکانی رێبەر بداتەوە، بەڵکو بە تەنها سەرکەوتن یا ژێرکەوتنی هەوڵەکانی، پێوەری دروستی و نادروستی وتەکانێتی. رێبەر لە کردەوەکانیدا هەمیشە لەسەر هەقە، لەبەرئەوەی کردەوەکانی بۆ سەدەکانی داهاتو بەرنامەرێژی بۆ کراوە، دوا ئەزمونی کردەوە ئەنجامدراوەکانیشی دەستی ئەزمونی هاوچەرخەکانی پێراناگات(107)

لایەنگرانی بزوتنەوە تاکە گروپ بون کە زۆر بە ئەمانەت و بەشێوەیەکی پیشەیی باوەڕی تەواویان بە وشەکانی رێبەر هەبو، ئەو لایەنگرانەی چواردەوری بزوتنەوە بە کەشوهەوایەکی پڕ لە راستگۆیی و یەکرەنگی دەگرن و هاوکاری رێبەر دەکەن بۆ ئەوەی نیوەی ئەرکەکانی کە بزوتنەوە بکات بەجێگەی متمانە، ئەنجام بدات. ئەندامانی حیزب هەرگیز باوەڕیان بە لێدوانە رەسمیەکان نەدەکردو دەبوایە باوەڕیشی پێنەکەن، چونکە پروپاگەندەی تۆتالیتاری بەردەوام ستایشی زیرەکی لە رادەبەدەری دەکردن کە لە جهانی دەرەوەی جیادەکردنەوە، ئەو جهانەی ئەندامانی حیزب تەنها لە رێگەی خۆشباوەری نائاسایی لایەنگرانەوە دەیناسییەوە. لە راستیدا تەنها لایەنگرانی نازی باوەڕیان بەسوێندە بەناوبانگەکەی هیتلەر دەکرد بەرامبەر بە دادگای باڵای کۆماری ڤایمار بەوەی رێز لە یاسا دەگرێت، بەڵام ئەندامانی بزوتنەوە دەیانزانی هیتلەر درۆ دەکات، کەچی تەنها لەبەر ئەوەی توانی رای گشتی و دەسەڵات فریوبدات باوەڕی زیاتری پەیداکرد. کاتێك هیتلەر لەدوای

چەند ساڵێك هەمان نمایشی بەرامبەر بە گشت جهان دوبارەکردەوە، بەوەی لەلایەکەوە سوێندی دەخوارد جگە لە نیازێکی باش شتێکی دی نیە، لەلایەکی دی بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی بۆ دزێوترین تاوان ئامادە دەکرد، ستایش‌و شەیدایی ئەندامانی حیزب بۆ پێشەواکەیان هەمو سنورێکی تێپەڕاند. بەهەمان شێوەش تەنها لایەنگران باوەڕیان بە هەڵوەشانەوەی کۆمێنترن هەبو، تەنها لایەنگرانی دەرەوەی حیزب‌و جەماوەری نارێکخراوی روسی، لەسەردەمی جەنگدا، باوەڕیان بە وتە دیموکراسیخوازەکانی ستالین هەبو. لە بەرامبەر ئەوەشدا بە ئاشکرا ئەندامانی حیزبی بۆلشەفیك ئاگادارکرابونەوە فریوی ئەو جۆرە تاکتیکە نەخۆن‌و لێهاتویی رێبەر لەفریودانی هاوپەیمانانندا ستایش بکەن[108].

بەبێ دابەشبونێکی ئۆرگانی رێکخستنی بزوتنەوە بۆ پێکهاتەی دەستەبژێر، واتە ئەندامانی حیزب‌و لایەنگران، درۆکانی رێبەر کاریگەری نابێت. پلەبەندی گاڵتەجاری کە لە هەرەمێتی درۆو سوکایەتی پێکردن پێکهاتوە، بە لانی کەمەوە بە ئەندازەی خۆشباوەڕی پێویستە بۆ ئەوەی هەردووکیان نەگۆڕەکان رەتبکەنەوە. لەوەش گرنگتر لە رێکخستنەکانی رروکاردا، لایەنگران سوکایەتی بە جەماوەری تەڵقین نەدراو دەکەن، ئەندامانی حیزب بە چاوێکی سوك تەماشای خۆشباوەڕی‌و نارادیکالیەتی لایەنگران دەکەن، پێکهاتەکانی دەستەبژێریش لەبەر هەمان هۆ سوکایەتی بە ئەندامانی حیزب دەکەن، لەناو خودی ئەو پێکهاتانەشدا هەر پێکهاتەیەکی نوێ، کۆنە پێکهاتەکە لە خۆی بە نزمتر دەزانێت[109] بەڵام ئەنجامی ئەمجۆرە سیستمە بریتیە لە: خۆشباوەڕی لایەنگران، درۆکانی بزوتنەوە لەلای جهانی دەرەوە ماقوڵ دەکات، ئەمە لەکاتێکدا پلەبەندی گاڵتەجاری ئەندام‌و پێکهاتەکانی دەستەبژێری بزوتنەوە ئەو مەترسیە بەدوور دەگرێت، رێبەر ناچاربێت لەژێر فشاری قورسی پروپاگەندە، لێدوانەکانی جێبەجێ بکات‌و رێزو ئابرومەندییەکی درۆزنانە بۆ خۆی بتاشێت. بێئاگایی لە رژێمی تۆتالیتاری

یەکێك لە بەدحاڵییەکانی جهانی دەرەوە بو لەسەر شێوەی مامەڵەکردنی لەگەڵ هەمان رژێمدا، هەر لەم رووەشەوە وێنای ئەوە دەکرا کە خودی درۆ سەیرو سەمەرەکانی رێبەرانی تۆتالیتار ببێتە مایەی ئابروبردنیان و دەتوانری رێبەری تۆتالیتار بخرێتە داوی وتەکانی خۆیەوەو سەرباری نیازی سەرەکی، ناچار بکرێت بەوتەکانیەوە دەربەست بکرێت. بەداخەوە رژێمە تۆتالیتارەکان زۆر لەو ئاکامە باوە بەدوورن، چونکە لێهاتویی ئەمجۆرە رژێمانە لەنێوبردنی واقیعێك بو کە بتوانێت دەمامك لەسەر درۆزن لابەرێت تا وایلێبکات دەست لە درۆکانی هەڵگرێت، یا ناچاری بکات درۆکانی جێبەجێ بکات.

لە حاڵەتێکدا ئەندامانی حیزب باوەڕیان بەو لێدوانە تایبەتانە نیە کە بۆ خەڵکی رەشۆکی دەوترێ، کەچی زۆر بە گەرمی باوەر بە دروشمە ئایدیۆلۆجیە کلاسیکیەکان دەکەن، ئەو دروشمانەی کلیلی مێژووی رابردو ودڵنیاتوبون و بزوتنەوە تۆتالیتارەکان لە ئایدیۆلۆجیای سەدەی نۆزدەهەمەوە وەریان گرتبو، لە رێگەی رێکخستنەکانی خۆیانەوە بەواقعێکی بکەریان گۆڕیبو. بەهەر حاڵ، جەماوەر بەشێوەیەکی ئاڵۆزو ئەبستراکت باوەڕ بەم رەگەزە ئایدیۆلۆجیانە دەهێنێت و بە درۆی بابەتی دەگۆڕێن کە مەودایەکی جهانی هەبێت (کۆنترۆڵکردنی جهان لەلایەن یەهودەوە بە تیۆرەی گشتی رەگەزەکان دەگۆڕێ و پیلانی "وۆڵ ستریت جێگەی تیۆرەی گشتی چینەکان دەگرێتەوە) و تێکەڵ بە نەخشەیەکی کردەیی گشتیدا دەکرێن کە تەنها ئەوانەی "روو لەمەرگن" - واتە ئەو چینانەی لە دەوڵەتە سەرمایەدارەکاندا روو لەمەرگن یا نەتەوە سواڵەو نزمەکان . دەتوانن لەسەر رێگەی بزوتنەوە رابوەستن. بەپێچەوانەی درۆ تاکتیکیەکانی بزوتنەوە کە رۆژانە لەرەگوریشەوە دەگۆڕێن، پێویستە درۆکانی ئایدیۆلۆجیا وەك راستیەکی پیرۆزو دوورە دەست باوەڕی پێبکرێت، چونکە ئەو درۆیانەی سەرەوە بە تەواوەتی لەگەڵ سیستمێکدا یەکانگیرە کە لەسەر بنەمای بەڵگەی "زانستی" ئامادەکراوە، هەرچەندە پیویستیش ناکات قەناعەت بەو کەسە نەشارەزایانە بهێنێت کە هیچ پەیمانێکیان بەرامبەر بە بزوتنەوە

نیە، بەڵام دەبێت لەرێگەی "سەلماندنەوە" نزمێتی یەهود یا كلۆڵی ئەو خەڵكانەی لە سیستمێكی سەرمایەداریدا دەژین، گیانی زانستدۆستی عەوامانە تا ئەندازەیەك رازی بكات.

پێكهاتەی دەستەبژێر بەوە لە ئەندامانی ئاسایی حیزب جیادەكرێتەوە كە پێویستیان بە بەڵگەو سەلماندنی لەوجۆرە نیەو مەبەستیشیان نیە باوەڕ بە راستی ناوەرۆكی دروشمی ئایدیۆلۆجیاكان بكەن. ئەو دروشمانە بەمەبەستی وەڵامدانەوەی گیانی راستیخوازی لەنێو جەماوەر دروستبون كە پێداگرتنیان لەسەر رونكردنەوەو بەڵگەهێنانەوەی روداوەكان نیشانیدەدات هێشتا زۆرێك خاڵی هاوبەشیان لەگەڵ جهانی ئاساییدا هەیە. پەروەردە كردنی سەرجەم ئەندامانی دەستەبژێر بە مەبەستی لە نێوبردنی وزەی جیاوازییانە لەنێوان راستیو درۆ، واقیعو ئەفسانە. باڵاكردنیان لەوەدایە كە دەتوانن یەكسەر هەمو دیاردەیەكی واقیعی بۆ لێدوان بگۆڕن. بۆ نمونە، پێكهاتەی دەستەبژێر بەپێچەوانەی جەماوەری ئەندامی بزوتنەوە كە پێویستیان بە كەمێك سەلماندنی رەگەز نزمی یەهود هەیە لە پێشئەوەی داوایان لێبكرێت بەبێ دوودڵی هێندێك یەهود بكوژن، بەتەواوەتی دەزانن جەختكردن لەسەر "یەهود لە خەڵكی نزمترە"، بەمانای "پێویستە هەمو یەهود بكوژرێت"، هەروەها پێكهاتەی دەستەبژێر دەزانن كاتێك پێیان دەوترێ تەنها مۆسكۆ "میترۆ"ی هەیە، مانای وایە دەبێت هەمو میترۆكانی جهان وێران بكرێتو توشی سەرسوڕمانێكی زۆریش نابن كاتێك دەزانن لە پاریس ـ یش میترۆ هەیە. ئەو شۆكە ترسناكەی بە رەوینەوەی وەهم روبەروی لەشكری سور بوەوە لە كاتی گەشتە سەركەوتوەكەی بە ئەوروپادا، تەنها لە رێگەی ئۆردوگای گرتنو دورخستنەوەی زۆرەملێی زۆربەی لەشكری سور دەرماندەكرا. بەڵام رێكخستنەكانی پۆلیس كە هاورێیەتی سوپایان دەكرد، ئامادەكاری زیاتری بۆ روبەروبونەوەی ئەو شۆكە تیابو، ئەوەش بەخاتری ئاگایی زیاترو باشتریان نەبو. لە روسیای سۆڤێتیدا فێرگەی نهێنی نەبو تا فاكتی راستگۆیانە دەربارەی

ژیـان لەسـەر جهـانی دەرەوە بڵاوبکاتـەوە . بـەڵکو زۆر بـە سـادەیی بـۆ ئـەو پەروەردە گشتیە دەگەڕێتەوە کە زۆر بەسوکی تەماشـای هـەمو فاکتو واقعێك دەکات.

عەقلییەتی دەستەبژێر نە دیاردەیەکی بێگەردی جەماوەریەو نە ئاکامێکی پـوختی بێـرەگو ریـشەیی کۆمەڵایـەتی، نـە کارەسـاتێکی ئـابوری یـا بێسەروبەرەییەکی سیاسی، بەڵکو نشونماکردنی ئەم عەقلییەتە پێویستی بە ئامادەکـاریو پەروەردەیـەکی ورد هەیـە، تەنانـەت بـەجۆرێك ئامادەکـاری بـۆ دەکرێ کە بوە بە مادەی فێرگە تۆتالیتارە بەرزەکان، بۆیە سیستمی مەدەنیەتی (Cordeuburgen) نازی سەبارەت بە دەزگـای هـەواڵگری ئەڵمانیاو سـەنتەری مەشـقکردنی بۆلـشەفیك سـەبارەت کـارگوزارانی کـۆمێنترن، ئـەم عەقلییەتـە لـە تەڵقینی بیروباوەڕی نەژادیو هونەری شەڕی ناوخۆ بە گـرنگتر دەزانێت. بەبێ دەسـتەبژێرو بێتوانـایی دەسـتکردیان لـە تێگەیـشتنی واقعێکـی رووتو جیاکرنـەوەی نێـوان راسـتیو درۆ، بزوتنـەوەی تۆتالیتـار هـەرگیز نەیـدەتوانی هەنگاو بۆ بەدیهێنانی ئەفسانەکانی بنێت. سیفەتی نێگەتیڤی دەستەبژێری تۆتالیتاری بریتیە لەوەی کـە هـەرگیز بە ئاراسـتەیەکدا ناڕوات بیر لە جهانێك بکاتـەوە وەکئـەوەی هەیـەو بـە واقیـع بەرپەرچـی درۆ بداتـەوە. لـە بەرامبـەر ئەوەشـدا، وەفـاداری بـۆ رێبـەر، سـیفەتێکی پـۆزەتیڤی دەسـتەبژێرە، واتـە وەفـاداری بـۆ کەسـێك کـە چەشـنی تەلیسمێك دوا سەرکەوتنی درۆو ئەفسانە بەسەر هەقیقەتو راستیدا دەستەبەر دەکات.

لە رێکخستنە تۆتالیتارەکاندا ئەو بازنەیەی دەوری رێبـەر دەگرێ، بالاترین پلـەی هەیە. رەنگە خـودی ئـەو بازنەیـە چەشـنی مەکتـەبی سیاسـی بۆلـشەفیك Politburo، دەزگایەکی رەسمی بێت، یا وەك دەوروبەرە نزیکەکەی هیتلـەر کە لە دارودەستەیەکی بەردەوام گۆڕاو پێکدەهاتو بە زەرورەت هـیچ پۆسـتێکیان نـەبو. سـەبارەت بـەو پێکهاتانـەش دروشمـە ئایـدیۆلۆجیاکان تـەنها بـە رێوشـوێنێکی رووتـی رێکخـستنی جـەماوەر دەژمێردرێـت، بۆیـە هـەر کاتێـك

پیداویستیەکانی هەلومەرجی تازە وابخوازێت ئەو دروشمانە بگۆڕێن، بە مەرجێك پرەنسیپی ڕێکخەری بزوتنەوە ڕێگر نەبێت، بەبێ هیچ دوودڵی و پەشیمانییەك ئەو دروشمانە دەگۆڕێن. لەم بارەیەوە، شایستەیی هیملەر لە ڕێکخستنەوەی ریزەکانی دەستەی پاراستندا . S.S، ڕێبازێکی زۆر ساکاری بۆ "چارەسەری کردەیی مەسەلەی خوێن" دۆزییەوە، واتە هەڵبژاردنی ئەندامانی دەستەبژێر لە ڕێگەی "خوێن پاکییەوە"و ئامادەکردنیان بۆ "ململانێیەکی رەگەزی بێبەزەییانە" لەدژی هەر کەسێك کە نەتوانێت رەچەڵەکی " ئاری"بونی بگێڕێتەوە بۆ پێش ساڵی 1750، یا قەدوبالای لە 172سم کەمتر بێت (دەزانم ئەو کەسانەی بالایەکی دیاریکراویان هەیە، دەبێت خوێنیان بە ستاندارتێکی دیاریکراو گەیشتبێت)، یا چاوی شین و قژی زەرد نەبێت[110] گرنگی ئەم رەگەزپەرستییە ئەوەیە، ڕێکخستنی نازیزمی بە نزیکەیی لە هەر جۆرە هاوبەندییەك بە پەروەردەی هەستپێکراو بە زاراوەی "زانستی" رەگەزی، تەنانەت لە دژی یەهودگەراش وەك بیروباوەڕێکی تایبەت بە چییەتی و ڕۆڵی یەهود،رزگاری دەبێت، چونکە تەوژمی دژە سامییەت بە لەناوچونی یەهود هەمو رۆڵێك لە دەستدەداو پەیوەستبون بەم بیروباوەرە سەرئەنجام بزوتنەوە بە بنبەست دەگەیەنێت[111] هەرکاتێك دەستەبژێر لەلایەن "لیژنەی رەگەزی"یەوە هەڵبژێرێن و لەژێر سەرپەرشتی "دەستەی یاسادانی هاوسەری" تایبەت دابنرێن، رەگەزپەرستیش لە زانستگەری پروپاگندە دوردەکەوێتەوە و لێی رزگار دەبێت[112] لەبەرامبەر ئەوەشدا، لەلایەکی دی، ئۆردوگای زۆرەملێ لەژێر سەرپەرشتی ئەم "دەستەبژێری رەگەزی"یە، لەپێناوی باشتر رونکردنەوە و سەلماندنی "یاسای بۆ ماوە و رەگەز"[113] دامەزرابو. نازییەکان بە هێزی ئەم "رێکخستنە زیندوە" توانیان خۆیان لە کۆت و بەندی بیروباوەری توندوتۆڵ رزگار بکەن و لەگەڵ نەتەوە سامییەکانی وەك عەرەب، دەرگای دۆستایەتی ئاواڵە بکەن یا هاوپەیمانی لەگەڵ نوێنەرانی مەترسی زەرد، واتە ژاپۆنییەکان ببەستن. بۆیە واقعییەتی کۆمەڵگەی رەگەزی و ئەفراندنی

دەستەبژێری هەڵبژاردە، بەپێی دیدوبۆچونێکی باوی ڕەگەزی، لە وردترین سەلماندنی زانستی یا نیمچە زانستیدا، بیروباوەری ڕەگەزییانی باشتر دەپاراست.

ئەوانەی سیاسەتی بۆلشەفیك دیاریدەکەن لەسەر هەمان پایەبەرزییان بیروباوەرە ئاشکراکانیان دەسەلمێنن. ئەوانە بە هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ چینی سەرمایەدار، زۆر بە ئاسانی دەتوانن هەمو ململانییەکی چینایەتی رابگرن، بەبێ ئەوەی ئەو هەڵوێستەیان بیروباوەری کادرەکانیان لەقبکات یا خیانەت لە بیروباوەری ململانێی چینایەتیان بکەن. لەبەر ئەوەی پرەنسیپی جووت ململانێی چینایەتی بەشێوازی ڕێکخستن دەگۆڕێت، هەروەها لەبەر ئەوەی چەقبەستن، لە ڕێگەی پۆلیسی نهێنی روسیا یا سیخوڕەکانی کۆمێنترنەوە لە دەرەوەی وڵات، شێوەی دوژمنایەتییەکی سەودانەکەر بەرامبەر بە هەمو جهان وەردەگرێت ، ئیدی سیاسەتی بۆلشەفیکیش لە هەمو "دادوەرییەکی پێشوەخت" پاکدەبێتەوە.

ئەوەی بڵندترین پایە لە هەرەمییەتی تۆتالیتاری جیادەکاتەوە، ئەو ئازادییە ڕەهایەیە کە دەدرێت بە ڕێکخەرانی بزوتنەوە سیاسیەکان بەرامبەر بە ناوەرۆکی ئایدیۆلۆجیا تایبەتەکەیان. ئەو خەڵکانە لە دیدی ڕێکخستنەوە تەماشای هەمو شتێك و هەمو جهان دەکەن، تەنانەت خودی ڕێبەریش بەتەلیسمێکی سروشبەخش و هەمیشە لەسەر هەق نابینن، بەڵکو بەدەرئەنجامێکی سروشتی ئەمجۆرە ڕێکخستنەی دەزانن، بۆیە ڕێبەر وەك ئەرك، نەك وەك کەسێتی پێویستە و هەر لەم ڕوانگەیەشەوە بوونی بۆ بزوتنەوە پێویستە. بەپێچەوانەی هەمو فەرمانڕەوا ستەمکارەکانی دی کە زۆرجار دارودەستەیەك فەرمانڕەوایی دەکات، خودی فەرمانڕوای ستەمکاریش ڕۆڵێکی نمایشی وازیدەکات، ڕێبەرە تۆتالیتارەکان ئازادن لەوەی هەر کارێکیان پێباش بێت ئەنجامی بدەن و دەتوانن پشت بە دڵسۆزی خەڵکە نزیکەکەی چواردەوریان ببەستن، تەنانەت ئەگەر حوکمی کوشتنی ئەو کەسانەشی دەرکردبێت.

بەڵام گرنگترین هۆی تەکنیکی ئەو دڵسۆزییە خودکوژیە ئەوەیە کە ئەرکی جێنشینی رێبەر بەپێی یاسای میراتی یا یاساکانی دی رێکناخرێت. لەم حاڵەتەدا، شۆڕشێکی سەرکەوتوی ناو کۆشک بە ئەندازەی شکستێکی سەربازی، شوێنەواری کارەساتبار بەسەر سەرلەبەری بزوتنەوەدا بەجێدەهێڵێت. هەروەها لە سروشتی خودی بزوتنەوەیە هەر کە رێبەر دەسەڵات دەگرێتەدەستو دەست بەراپەڕاندنی ئەرکەکانی دەکات، زۆر بەخێرایی رێکخستن بە رەهایی ئاوێتەی رێبەر دەبێت، بەجۆرێك کە داننان بە هەر هەڵەیەکدا یا گۆڕینی شتێکی نەگۆڕو جێگیر، دەبێتە مایەی پوچەڵکردنەوەی ئەفسونی ئەو پاکییەی چوار دەوری رێبەری گرتوە، ئەوانەشی بە بزوتنەوەوە پەیوەستن دوچاری بەڵاو کارەسات دەبن. ئەو بنەمایەی بونیادی رێکخستنی تۆتالیتاری لەسەر بونیات دەنرێت، وتەکانی رێبەر نیە، بەڵکو بێهەڵەیی کردەوەکانێتی. بەبێ ئەو پاکییەو لە گەرمەی هەر گفتوگۆیەکدا کە ببێتە مایەی ئەوەی هەڵەی رێبەری لێبکەوێتەوە، ئیدی سەرلەبەری جیهانی ساختەی تۆتالیتاریزم لەبەریەکهەڵدەوەشێتەوەو بابەتی جیهانی واقیعی دەیهاڕێت. واتە هەمان ئەو جیهانەی کە بزوتنەوە لەرێگەی رێنوێنی دەستی بێگەردی رێبەرەوە دەتوانێت لێی دوور بکەوێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، سەبارەت بەدڵسۆزی ئەوانەی باوەڕیان بە دروشمی ئایدیۆلۆجیاو بێهەڵەیی رێبەر نیە، بەڵگەی تەکنیکی قوڵتر هەیە. بیروباوەڕی تۆکمەو راستگۆیی بە توانای رەهای مرۆڤ ، ئەو مرۆڤانە پێکەوە دەبەستێتەوە. گاڵتەجاری رەوشتییانو بڕواو ئیمانیان بەوەی هەمو شتێك رێگە پێدراوە، پشت بەو بیروباوەڕەیان دەبەستێت کە هەمو شتێك لە توانادایە. راستە ئەو خەڵکە کەمەی ناو بزوتنەوەی تۆتالیتاری بە ئاسانی دوای درۆیەك ناکەون کە خۆیان هۆنیویانەتەوە یا تەبەنیان کردوە، هەرچەندە لەوانەیە بڕوایان بە زەرورەت، رەگەزپەرستی، ئابوریو پیلانگێڕی یەهود یا ۆوڵ ستریت نەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خودی ئەو کەسانە فریوی ئەو ئایدیا لەخۆباییو

لوتبەرزانەیان دەخۆن کە دەتوانرێ هەمو شتێك ئەنجامبدرێ و دەکەونە داوی ئەو بیروباوەرە فیرعەونیەشەوە کە شتەکان تەنها لەمپەرێکی کاتییەو بەدڵنیاییەوە رێکخراوێکی باشتر دەتوانێت رایانماڵێت. زۆرجار ئەو خەڵکانە پێیانوایە دەسەڵاتی رێکخستن دەتوانێت دەسەڵاتی واقیع لە نێوبەرێت، هەروەکو چۆن کۆمەڵێك چەتەی رێکخراو لەرێگەی توندوتیژییەوە دەتوانن سامانی دەوڵەمەندێك بەتاڵان بەرن کە بەباشی نەپارێزرێت. هەروەها بەردەوام لە بایەخی توانای سەرەکی کۆمەڵە جیگیرەکان کەمدەکەنەوە، ئەمە لە کاتێکدا زیادەڕەوی لە هەڵسەنگاندنی هێزی بزوێنەری بزوتنەوە دەکەن. بۆیە تا ئەو جێگەیەی باوەڕیان بە هەبونێکی بابەتیانەی پیلانێکی جهانی نەبێ کە لەدژیان ئەنجامبدرێت، لەوەش تێنەدەگەیشتن کە ئەو پیلانەی دەیهۆننەوە، رەنگە سەرئەنجام هەمو جهان لەدژیان یەکبگرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە هەر شێوازێك وەهمی دەستەبژێر دەربارەی دەسەڵاتی رەهای مرۆڤ ، ئەو دەسەڵاتەی لەسەر رێکخستن بونیات نراوە، شکست بهێنێت، ئاکامی کردەیی ئەو وەهمە لە ناو بزوتنەوەدا وادەخوازێت، لە حاڵێکدا دەوروبەرە نزیکەکەی رێبەر جیاوازی بیروڕایان لەگەڵدا هەبێت، هەرگیز متمانە بە بیروڕا تایبەتەکەی خۆیان نەکەن، چونکە ئەو کەسانە راستگۆیانە پێیانوایە جیاوازییەکەیان لەرووی واقعییەوە هیچ بایەخێکی نیەو تەنانەت شێتانەترین شێوازیش ئەگەر بە باشی رێکبخرێت چانسی سەرکەوتنی هەیە. دڵسۆزی ئەو کەسانە بە هەڵەنەکردنی رێبەر لە بیروباوەڕیانەوە سەرچاوەی نەگرتوە، بەڵکو پێیانوایە ئەوەی ئامرازەکانی توندوتیژی لەبەر دەست بێت، دەتوانێت لەرێگەی میتۆدێکی باڵا لەرێکخستنی تۆتالیتاریدا، ببێت بە کەسێکی پاکی بێهەڵە. ئەم وەهمە کاتێك گەورە دەبێت کە رژێمە تۆتالیتارەکان دەسەڵاتی سەلماندن و رونکردنەوەی رێژەیی سەرکەوتن و ژێرکەوتنی هەبێت و بتوانێت نیشانی بدات کە زیانێکی مادی لە گەوهەردا بە قازانجی رێکخستن بگۆڕێت. خراپی ئیدارەی پیشەسازی لە یەکێتی سۆڤیتدا، پارچەپارچەبونی چینی کارگەرانی لێکەوتەوە،

بەدرەفتاریش بەرامبەر بە دانیشتوانی مەدەنی ئەوروپای رۆژهەلاَت کاتێك لەلایەن نازیەوە داگیرکرا، ئەگەر چی بوە مایەی "کەمبونەوەی خەفەتبارانەی هێزی کار"، بەلاَم "ئەگەر بەپێی بەرژەوەندی نەوەکانی داهاتو بیری لێبکەینەوە، جێگەی داخ نەبو"(114). شکست یا سەرکەوتن لە هەلومەرجی تۆتالیتاریدا، تا رادەیەکی زۆر، مەسەلەیەکە پەیوەستیی بەرای گشتی دیسپلینکراوی ترساوەوە هەیە. بە هەر حالّ لە جهانێکی سەرتاپا ساختەدا، نابێت شکستەکان تۆمار بکرێن، یا قبولّ بکرێن، یا یادبکرێنەوە. لە پێناوی ئەوەی راستی بابەتی درێژە بەبوونی خۆی بدات، پێویستی بە بوونی جهانی ناتۆتالیتاری هەیە.

## پەراوێزەکان:

1ـ بۆ نمونە بڕوانە، ئی کۆهین . برامستید، دیکتاتۆری‌و پۆلیسی سیاسی: تەکنیکی کۆنترۆڵکردن لە ڕێگەی ترسەوە، لەندەن، 1954، ل164 ئەو کتێبەی سەرەوە ئەوە روندەکاتەوە کە "تیرۆر بەبێ پروپاگەندە، زیاتر کاریگەری دەروننناسی لە دەستدەدا، هەروەکو چۆن ڕاگەیاندنیش بەبێ تیرۆر ناتوانێت چالاکی خۆی بەتەواوەتی ئەنجام بدات" ل157 ئەوەی لەم گوزارەیەو گوزارە دوورو زنجیرە لێکچوەکانی فەرامۆشدەکرێ، ئەو واقیعەیە کە نەك تەنها پروپاگەندەی سیاسی، بەڵکو سەرلەبەری پروپاگەندەی جەماوەری هاوچەرخیش، تۆخم‌و رەگەزی هەڕەشەی تیا بەدیدەکرێ. لەلایەکی دی، ئەو مەسەلەیەی کە تیرۆر بەبێ پروپاگەندەش دەتوانێت بەتەواوەتی کاریگەرو چالاك بێت، تەنها لە دۆخی تیرۆری سیاسی باوی حکومەتە دیسپۆتیزمەکاندا ڕاستی تیایە. کاتێك تیرۆر هەر بەوەندە وازناهێنێت مل بەدەرەوە کەچ بکات، بەڵکو هەوڵدەدا مل بەناوەوەش کەچ بکات، کاتێك ڕژێم لە دەسەڵات زیاتری دەوێت، ئیدی تیرۆر پێویستی بە پروپاگەندە دەبێت. هەر لەمرووە تیوریستی نازی "ئۆجین هادامۆڤسکی لە کتێبی "پروپاگەندەو دەسەڵاتی نەتەوەیی" propaganda und National Macht، 1939، دەڵێت: "پروپاگەندەو توندوتیژی هەرگیز ناکۆك نین، بەکارهێنانی توندوتیژی دەشێت بەشێك لە پروپاگەندە پێکبهێنێت"، ل22.

2ـ لەو ماوەیەدا بەرەسمی ئەوە ڕاگەیەنرا کە "بێکاری" لە یەکێتی سۆڤێتدا بەتەواوەتی لەناوبراوە. ئاکامی ئەو لێدوانەش لەناوبردنی هەمو مافێکی بێکاری بو. (ئەنتوان سیلیگا، لوغزی روسی، لەندەن، 1940، ل109).

3. "ئۆپراسیۆنی کۆکردنەوە" کە لە 16/شوبات/ 1942 لەسەر فەرمانی هیملەر دەربارەی "خەڵکی ئەڵمانی بە رەگەز پۆڵۆنی" دەرچوەو تیایە هانی ئەو خەڵکانە دەدا تا بەبێ هیچ دڵەڕاوکێیەك کورەکانیان بۆ ئەو خێزانانە بنێرن کە ئامادەییان تیایە پێشوازییان لێبکەن، ئەویش تەنها لەرووی خۆشەویستیان بەو خوێنە پاکەی لە دەمارەکانیان دەسوڕێت"، (دیکۆمێنتی نۆرمبۆرگ، ر 135، لەلایەن سەنتەری بەڵگەنامەی یەهود لە پاریس کۆپی کراوە). لە حوزەیرانی 1944، سوپای نۆ ی ئەڵمانیا 40 . 50 هەزار منداڵی رفاندوەو رەوانەی

ئەڵمانیای کردوە. راپۆرتێك لەسەر ئەم مەسەلەیە لەلایەن کەسێکەوە بەناوی براندبۆرگ رەوانەی فەرماندەیی گشتی سوپای ئەڵمانیا لە بەرلین کراوەو باس لە پلانێکی لەو جۆرەش بۆ ئۆکرانیا دەکات (بەڵگەنامەی ژمارە 31، لیۆن پۆلیاکۆڤ لە کتێبی breviaire de la haine، ل317 بڵاویکردۆتەوە). خودی هیملەر چەندین کەرەت ئاماژەی بەم پلانە کردوە، (بڕوانە پیلانگێڕیو دەستدرێژی نازی، ئەنجومەنی ئەمریکا بۆ راوەدونانی سوێندخۆرەکان، لە بڵاونامەکانی حکومەتی ئەمریکا، واشنتن، 1946، بەرگی سێیەم)، ل640، چەپکێك لە وتەکانی هیملەری لە کراکۆڤیا لە ئایاری /1942 لە خۆگرتوە، هەروەها بڕوانە کورتەیەك لە گوتاری هیملەر لە Bad Schachen، سالی 1943، لە کتێبی کۆهن . برامستید، سەرچاوەی پێشو، ل244. ئەم بەڵگەنامانە ئەوەمان بۆ روندەکەنەوە کە چۆن ئەو منالانە لە رێگەی گەواهینامەی پزیشکییەوە هەڵدەبژێردران، کە یەکەیەکی پزیشکی لە مینسك لە 10/تەموز/ 1942 ئامادەی کردبو: "ئازمایشی رەگەزی ناتالی هارپ، لەدایك بوی 15/تەموز/ 1922، ئەوەی دەرخستوە کە کچێکە نشونمایەکی سروشتی هەیە، لەنمونەی باڵتیکی رۆژهەلاتە، سیمای ئەوروپای باکوری هەیە". ئازمایشی ئەرنۆڵد کۆرنیز، لەدایك بوی 19/ ئازار/ 1930، کۆرێکی نشونما سروشتیەو لە نمونەی رۆژهەلاتەو سیمای باکوری هەیە" ن. ئۆف هەر دوو بەڵگەنامەکەی واژو کردوە، بەڵگەنامەکان لە ئەرشیفی پەیمانگەی تایبەتی یالدیش پاریزراوە، نیویۆرك، No.occ E 3a 17 –. سەبارەت بە لەناوبردنی روناکبیرانی پۆلۆنیاش کە بە بڕوای هیتلەر دەبێ "بەبێ هیچ دوو دڵییەك پاکتاوبکرێن"، بڕوانە پۆلیاکۆڤ، سەرچاوەی پێشو، ل321، بەڵگەنامەی ژمارە 2.472.

4. بڕوانە " وتەکانی سەر خوانی هیتلەر"، لە هاوینی 1941، ئەو هێشتا هەر قسەی لەسەر "دەرکردنی دوا یەهود لە ئەوروپا"، ل113 و جێگیرکردنیان لە سیبیریا، ئەفریقیاو ماداکاسکار (مەدەغشقەر) دەکرد، کەچی لە واقیعداو لەپێشئەوەی پەلاماری روسیا بداتو رەنگە سالی 1941 یش بڕیاری "دوا چارەسەری" دەرکردبێت، بەوەی لە پایزی 1941 کورەی گاز دروست بکرێ (بڕوانە پیلانگێڕیو بەستدرێژی نازی، جلدی دوەم، ل265). خودی هیملەر لە بەهاری 1941، بە باشی لەوە ئاگادار بو کە " دەبێ یەهود لە پێش تەواوبونی جەنگ، تا دواکەسیان لەناوبرێن، ئەوەش حەزو بڕیاری دەرە رەتکەرەوەی پێشەوا بو" (بەڵگەنامەی کیرستین، نێوەندی بەڵگەنامەی یەهود).

5. لەم بارەیەوە راپۆرتێکی پڕبایەخ دەربارەی گفتوگۆیەك هەیە، کە لە بەرواری 16/ تەموز/ 1940 لەسەرکردایەتی گشتی فوهرەرو بەئامادەبونی رۆزنبۆرگو لامریزو کاتێل، ئەنجامدراوە. هیتلەر لە وتارەکەیدا جەخت لەسەر ئەم پرەنسیپە سەرەکیانە" دەکاتەوە: " لێرە بەدواوە کاری سەرەکیمان ئەوەیە بە ئاشکرا بەرامبەر بەجهان قسە لەسەر دوا ئامانجەکانمان نەکەین... کەواتە لەم کاتەدا نابێت ئەوەش ئاشکرا بێت کە ئەو بڕیارانەی پەیوەستە بە پاراستنی ئاشتیو نەزمی

ناوچە داگیرکراوەکانەوە بەرەو دواچارەسەر دەچێت. لەگەڵ ئەوەشدا، هەمو رێوشوێنە پێویستەکان. لەسێدارەدان و راگواستنی دانیشتوان . دەتوانرێ و دەبێت ئەنجام بدرێت" لەدوای ئەم گفتوگۆیەشەوە، وتووێژێکی دی دێت، ئاماژە بە وتەکانی هیتلەر نادات و هیتلەر بەشداری تیا نەکردوە. وادەردەکەوێت هیتلەر زانیارییەکی تەواوی لەسەر ئەو وتووێژانە نەبێت (بەڵگەنامەی L 221، نێوەندی بەڵگەنامەی یەهود).

6ـ دەربارەی ئەو قەناعەتەی ستالین کە هیتلەر پەلاماری روسیا نادات، بروانە ئیسحاق دویچەر، ستالین: بیوگرافیای سیاسی، نیویۆرك و لەندەن، 1949، ل454، بە تایبەتی تێبینی لاپەرە 458: "سەرۆکی لیژنەی پلاندانان و جێگری سەرەك وەزیران، ن. ڤۆزنزنسکی، ساڵی 1948، ئەوەی ئاشکرا کرد کە پلانی ئابوری بۆ نۆ مانگی یەکەمی ساڵی 1941، لەسەر پایەی ئاشتی ئامادەکرابو، بەڵام ئەو پلانە نوێیەی لەگەڵ جەنگدا دەگونجا، تەنها لە دوای هەڵایسانی جەنگ دارێژرا". ئەمرۆ، راستی رەئی دویچەر، لەرێگەی راپۆرتەکەی خرۆچۆف دەربارەی پەرچەکرداری ستالین بەرامبەر بە هێرشی ئەڵمانیا، بەتەواوەتی دەسەڵمێنرێت. بروانە "گوتارەکەی خرۆچۆف دەربارەی ستالین" لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبدا، نیویۆرك تایمز، 5/ حوزەیران/ 1956

7ـ پەروەردە (لەئۆردوگا زۆرەملێکان) دا، تەنها لەسەر رەفتارو هەڵسوکەوتە و لەسەر هیچ جۆرە پەروەردەیەکی ئایدیۆلۆجیا نیە، چونکە زۆرینەی زیندانیەکان گیانی کوێلە ئاسایان هەیە"، (هێنریش هیملەر، پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل616).

8ـ بەرهەمەکەی ئۆجین هادامۆڤسکی لەسەر لێکۆڵینەوەی هەڵمەتی پروپاگەندەی تۆتالیتار، پڕبایەخترین بەرهەمە. چونکە نوسەر بێئەوەی ناوی هیتلەر بهێنێت، چارەسەرێکی هیتلەرانەی پرۆپاگەندەو رێکخستن دەکات، بەوەی بەراڵەیەکی روون و ئاشکراو زیرەکانە لایەنگری لە تیزی نازی دەکات. نەبەردی من، کتێبی دوەم، بەشی یازدەهەم. هەروەها بروانە

F. A. six, die politische propaganda der N. S. D. A. pim ) kampf die Macht. 1936, p.21).

9ـ شیکردنەوەی هیتلەری بۆ "پروپاگەندەی تایبەت بە جەنگ" (نەبەردی من، کتێبی یەکەم، بەشی یازدەهەم)، جەخت لەسەر لایەنی بازرگانی پروپاگەندە دەکاتەوە، بۆ نمونە سود لە ریکلامی سابون وەردەگرێت. بە هەر حاڵ زۆرجار ئەم شیکردنەوەیە زڵکراوەتەوەو زیادەرەوی لە هەڵسەنگاندنی کراوە، ئەمە لە کاتێکدا بیروڕا پۆزەتیڤەکانی دواتری دەربارەی "پروپاگەندەو رێکخستن" پشتگوێ خراوە.

10ـ بروانە ئاهەنگی یادکردنەوە گرنگەکەی مارتین بۆرمان، دەربارەی "پەیوەندی نێوان ناسیونال سۆسیالیزم و مەسیحییەت"، پیلانگێری نازی، جلدی شەشەم، ل 1036 چەندین

فۆرمو دارِشتەی هاوبەش لە بلاوکراوەکانی دەستەی پاراستن دەربارەی تەلقینی ئایدیۆلۆجیا بۆ تازە دەرچوانی بەدیدەکەین. "یاسا سروشتیەکانی ئیرادەیەکی نەگۆڕ، هیچ شتێك کاریگەری لەسەر نابێت، کەواتە پێویستە دان بەو یاسانەدا بنرێت"
"s.s: Mann und Blutsfrage", schriftenreihe fur die )
.(Weltanschauliche schulung der Ordnungspolizei, 1920
هەمو ئەو شتانە وێنەیەکی کۆپیکراوی هێندێك گوزارەی کتێبی (نەبەردی مـن)ی هیتلەرە، یەکێك لەو گوزارانەش ئەم دەستەواژەیەی خوارەوەیە: "ئەگەر مرۆڤ بیەوێت لەدژی لۆجیکی ئاسنینی سروشت بجەنگێت، ئەوا ململانێی ئەو پرەنسیپە بنەرەتیانە دەکات کە بوونی خۆی وەك مرۆڤ، قەرزبارێانە"

11. ج. ستالین، لینینزم، 1933، بەرگی دوەم، بەشی سێیەم.
12- ئەریك ڤۆجیلین، "بنەماکانی زانستگەرا"، لە گۆڤاری لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی (Social Research)، 1948
13. بڕوانە ف. ا. ڤ هایك "شۆڕشی چەواشەی زانستی"، گۆڤاری Economica، جلدی هەشتەم، شوبات، ئایار . تەموز. 1941، ل13
14- هەمان سەرچاوە، ل137 - The quotation is from the seint simonist magazine, producteur, 1, 399.
15. ڤۆجیلین، سەرچاوەی پێشو.
16- ویلیام ئەبینستاین، کە لە کتێبی "دەوڵەتی نازی" نیویۆرك، 1943، چارەسەری "ئابوری جەنگی بەردەوام"ی دەوڵەتی نازی دەکات، رەنگە تاکە رەخنەگر بێت لەوە تێگەیشتوە کە "لێکۆڵینەوەی ناکۆتا... دەربارەی سروشتی سۆسیالیزم یا سەرمایەداری ئابوری ئەڵمانیا لە سایەی رژێمی نازیدا، تا ئەوپەری رادە بێپایەو رووکەشییە (سطحیة)، چونکە ئەو لێکۆڵینەوانە ئەو واقیعە پشتگوێ دەخەن کە سەرمایەداریو سۆسیالیزم دوو توێژن بە ئابوری خۆشگوزەرانی رۆژئاواوە پەیوەستن" (ل239).

17. گەواهینامەکەی کارڵ براندت، یەکێك لەو پزیشکانەی کە هیتلەر بۆ جێبەجێ کردنی بەرنامەی کوشتنی میهرەبان رایسپاردبو، لەم ناوکۆیەدا گرنگییەکی زۆری هەیە. (دادگاییکردنی پزیشکی حکومەتی ئەمریکا لە دژی کارڵ براندتو ئەوانی دی. دادخوزای "المرافعه" 14/ ئایار/ 1947). براندت زۆر بە توندی دژایەتی ئەو گومانەی دەکرد کە پێیوابو ئەو پرۆژەیە بۆ لە ناوبردنی زارە بێسودو بێکەڵکەکان بوە، بۆیە پێی لەسەر ئەوە دادەگرت ئەو ئەندامانەی پەنایان بۆ پاساوی لەوجۆرە دەبرد، زۆر بە توندی سزا دەدران. ئەو لەو بڕوایەدابو، ئەو رێوشوێنانەی سەرەوە لە "سەرنجی ئەخلاقی"یەوە

سەرچاوەیان دەگرت. هەمان شتیش لەسەر راگواستن راستە. بە هەر حاڵ زۆرێک لە دۆسیەی ئەو جەنەراڵە ئەڵمانیانەی پڕە لە سەرنج و تێبینی، گلەیی لەوە دەکەن کە راگواستنی ملیۆنان یەهودی و پۆڵۆنی بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ "پێویستییەکی سەربازی و ئابوری" ئەنجام دەدرا. بڕوانە پۆڵیاکۆڤ، سەرچاوەی پێشو، ل321، هەروەها بڕوانە ئەو بەڵگەنامانەی لەم کتێبەشدا هاتوە.

18. ئەو فەرمانە یەکلاکەرەوەی جڵەوی بۆ هەمو کوشتنە بە کۆمەڵەکانی دی شل دەکرد، لە 1/ ئەلول/ 1939 . ئەو رۆژەی شەڕی تیا هەڵایسا . لەلایەن خودی هیتلەرەوە واژو کرلوە. ئەم فەرمانە بەتەنها شێتەکانی نەدەگرتەوە (بەپێچەوانەی هەمو گومانە نادروستەکانەوە)، بەڵکو هەمو ئەوانەشی دەگرتەوە کە دەردی بێدەرمانیان گرتبو، بەڵام شێتەکان لەسەروی لیستەکەوە بون.

19. بڕوانە فریدریش پێرسیڤال:

**Reck- Malleczewen, Tageclrich eines verzweifelten, )**
**(Stuttgart, 1947, p. 190**

20ـ هیتلەر بالآیی بزوتنەوە ئایدیۆلۆجیاکانی بەسەر حیزبە سیاسیەکاندا لەسەر ئەو بنەمایە دامەزراندبو کە ئایدیۆلۆجیاکان (**Weltanschauungen**) هەمیشە "پاکێتی خۆیان رادەگەیەنن" (نەبەردی مـن، کتێبی دوەم، بەشـی پێنجەم، ئایدیۆلۆجیاکان و رێکخستن). لاپەرە یەکەمەکانی رێبەری رەسمی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە گشت ئەو مەسەلە ئایدیۆلۆجیانەی پێشتر بە ناواقیعی و دەرەتێگەیشتن ناو زەدە دەکران "ئەمڕۆ ئەوەندە روون و سانایە هەمو هاوڕێیەک دەتوانێت لێی تێبگات و لە چارەسەرکردنی مەسەلەکانی سەرەوە، هاوکارییان بکات".

21. یەکەم "سوێندی ئەندام لەحیزبدا" کە لە **Organsiationbuch der N. S. D. A. P.** تۆمار کراوە، بەمجۆرەیە: "هەمیشە فۆهرەر لەسەر هەقە"، چاپی 1936، ل8. بەڵام ئەم سوێندە لەسەرچاوەکانی دی **Deinstvorschrift fur die p.o der N. S. D. A. p. 1932, p.38** بەمشێوەیە هاتوە: "هیتلەر هەرگیز لە بڕیارەکانی پاشگەزنابێتەوە!" جیاوازییان لە رستەبەندیان دەردەکەوێت. "بانگەشەی بێهەڵەیی ستالین و تروتسکی بەوەی هەرگیز کەسیان هەڵەی نەکردوە، جیاوازی یەکلاکەرەوەی نێوان ئەو دوو کەسەو لینین دەردەخات. بڕوانە بۆریس سۆڤارین، ستالین: لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی لەسەر بۆلشەفیزم، نیۆیۆرک، 1939، ل583.

22. شتێکی ئاشکرایە کە دیالیتیکی هیگلی ئامرازێکی نایاب دەستەبەر دەکات بۆ ئەوەی مرۆڤ هەمیشە لەسەر هەق بێت، چونکە لەم دیالیکتیکەدا، هەمو شکستێک وەک سەرەتای سەرکەوتنێک گوزارشتی لێدەکرێ. درەوشاوەترین نمونەش لەسەر ئەمجۆرە سەفسەتەیە لەدوای 1933 هاتەگۆڕێ، کاتێک حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا بۆ ماوەی دوو ساڵ ملینەدا بەوەی کە سەرکەوتنی هیتلەر شکستێکی گەورەی حیزبی کۆمۆنیستی ئەڵمانیا بو.

23. ڕۆژنمێری گۆبلز 1942 . 1943، لویس لۆخنەر بڵاویکردۆتەوە، نیویۆرك، 1948، ل148

24. ستالین، سەرچاوەی پێشو.

25ـ کاتێك پرۆسەی لەناوبردنی یەهود لە لوتکەدا بو، هیتلەر لە ئەیلولی 1942 لە وتەیەکیدا، زۆر بەراشکاوی ئاماژەیدا بە وتارەکەی 30/ کانونی دوەمی/ 1939 (لە نامێلکەیەکدا بڵاوبۆتەوە بە ناونیشانی Der Fuhrer vor deun ersten Reichtag Grossdeut schlands, 1939)، هەروەها لەو وتەیەیدا ئاماژەی بەدانیشتنەکەی 1/ ئەیلول/ 1939، ئەنجومەنی نوێنەرانی رایخیش داوە کە تیایە وتویەتی: "ئەگەر یەهود جەنگی جهانییەکی دی بۆ لەناوبردنی میللەتانی ئاری ئەژاد هەڵایسێنێ، ئیدی ئەمجارە نەك ئارییەکان، بەڵکو خودی خۆیان (دەبن بە قوربانی . ئەم بەشەی رستەکە لەنێو چەپڵەرێزانی ئامادەبوان بە تەواوەتی نەدەبیسترا).

(voie der fuhrer zun kriegsuinterhilfswerk, sebriften N. S. V,no, 14,p. 33).

26. گوتاری 30/ کانونی دوەم/ 1939، ل19، سەرچاوەی پێشو.

27. کونراد هایدن، لە "فۆهرەر: گەیشتنی هیتلەر بەدەسەڵات"، بۆستن، 1944، جەختدەکاتەوە لەسەر "نارەوایی ئاشکرای هیتلەر"و "ناواقیعیبونێکی دیار لە هەمو لێدوانەکانی"و "کەمتەرخەمی بەرامبەر ئەو واقیعەی گرنگییەکی ئەوتۆی پێنادات"، (ل368و374). لەبەرامبەر ئەوەشدا، خرۆچۆف، بەدەستەواژەیەك کە زۆر لەو وتانەی سەرەوە دەچێت، "بێزکردنەوەی ستالین لە تێڕوانینی راستیەکانی ژیانو دانپیانیان"و "کەمتەرخەمی بەرامبەر باروبۆخی هەمو کاروبارە واقیعییەکان" وەسفدەکات. هەمان سەرچاوە. بە هەرحاڵ رەئی ستالین دەربارەی گرنگی واقیع بە باشترین شێوە لە پیاچونەوەی دەوریی مێژوی روسیا دەردەکەوێت.

28. رێبەری لاوانی هیتلەر.

29ـ جێگەی خۆیەتی مرۆڤ یادی ئەوە بکاتەوە کە بۆلشەفیکەکان لەسایەی حکومەتی ستالیندا پیلانیان لەسەر پیلان کەڵەکە دەکرد، بەجۆرێك کە ئاشکرا کردنی پیلانێکی نوێ بەهیچ جۆرێك بەمانای رەتکردنەوەو بێبایەخکردنی پیلانی پێشو نەبو. ساڵی 1930 پیلانی تروتسکی دەستی پێکرد، پاشان لەسەردەمی بەرەی میللی پیلانی سێ سەد خێزانی خرایەپاڵو لەدوای ساڵی 1935 یشەوە، لەماوەی هاوپەیمانی نێوان ستالینو هیتلەردا، ئیمپریالیزمی بریتانی بوە پیلانێکی واقیعی، بە کۆتایی هاتنی جەنگی جهانی دوەمیش، هەواڵگری نهێنی ئەمریکا بوە بابەتی پیلانگێری، بەڵام دوا پیلان، پیلانی کۆزمۆپۆلیتی بو (واتە بە جهانی بونی هاوڵاتیانی یەهود) کە لێکچونێکی ئاشکراو تەکاندەری لەگەڵ راگەیاندنی نازیزمدا هەبو.

30. بڕوانە گەشتی ژیانی "شایم وایزمان"، دادگاییو هەڵە، نیویۆرك، 1949، ل185

31. بروانە، ئۆتۆ بۆنهارد .Judische Geld – und weltherrschaft? 1926, p.157

32. هیتلەر ساڵی 1922 بۆ یەکەمینجار ئەم وێنەیەی بەکارهێنا: "لەلایەکەوە، موسا کۆهن، کۆمپانیاکەی هانەدەدا داواکاری کرێکارەکان رەتبکاتەوە، لەلایەکی دی، ئیسحاقی برای کریکارەکانی کارخانەی بۆ راپەڕین بانگهێشت دەکرد" (گوتەکانی هیتلەر، 1922 . 1939، خانەی باینز، لەندەن، 1942، ل29).

شایانی وەبیرهێنانەوەیە کە کۆی گوتارەکانی هیتلەر هەرگیز لە ئەڵمانیا چاپ نەکرا، بۆیە دەبێ بە ناچارییەوە پەنا بۆ چاپە ئینگلیزییەکەی ببرێت. ئەمەش کارێکی راگوزەری نەبو، هەروەکو فیلیب بۆهڵز کە بیلۆگرافیایەکی لەم بارەیەوە ئامادە کردوە، ئەو گومانەی هەبو.
Die Reden des Fuhrers nach der Machtubernahme, 1940.

تەنها وتارە گشتییەکانی تایبەت بەجەنگ وشە بە وشەی لە رۆژنامەی " پاریزگای میللی" volkischer Beobachter بڵاودەکرایەوە. بەڵام سەبارەت بە وتارەکانی بەرامبەر بە دیپلۆماتەکانی فۆهرەرو یەکە حیزبییەکان دی، لە رۆژنامەی ناوبراودا تەنها ئاماژەی پێدەدرا. ئەمجۆرە وتارانە هەرگیز بۆ بڵاوکردنەوەو چاپکردن نەبو.

33. بەرنامە بیست و پێنج خاڵەکەی "فیدیر" لە کۆمەڵێك رێوشوێنی تەقلیدی پێکهاتبو کە خواست و داخوازی هەمو تیمە دژە سامییەکان بو: دەرکردنی یەهودە هاونیشتمانییەکان و وەك خەڵکی بیانی مامەڵەیان لەتەکدا بکرێ. لەلای نازییەکان رەوانبێژی دژە سامییەت لە خودی بەرنامەکەیان پڕ بایەختر بو.

واڵدمار گۆریان، "دژایەتی کردنی سامییەت لە ئەڵمانیای هاوچەرخدا"، لە "لێکۆڵینەوە دەربارەی دژە سامییەت"، لە بڵاوکردنەوەی "کۆپیل س. پێنسۆن، نیویۆرك، 1946، ل243، لەپرسی دژە سامییەتدا، جەخت لەسەر بزری نوێ بونەوە دەکات: "هیچ کام لەو خواستانە رەسەنایەتی تایبەت بەخۆیان نەبو، بەڵکو ئەو خواستانە لە هەمو نێوەندەکانی دژە سامییەت، خۆبەخۆ لە ئارادا بون. ئەوەی شایانی سەرنج راکێشانە، ئەوەیە کە نازییەکان خواستە ئەنتی سامیزمەکانیان بە شێوەیەکی فریودەرانەو بەرەوانبێژییەکی لێهاتوانە پێشکەش دەکرد"

34ـ لە چوارچێوەی بزوتنەوەی نازیدا، خودی نمونەکەی رۆهم، نمونەی دژە سامییەتی نەتەوەگەرایە کە لەم بارەیەوە دەنوسێت: "لێرەدا رەئی من لە رەئی هاوڵاتییەکی ئاسایی جیاواز دەبێت، نابێت لە هەمو کارێکدا یەهود سەرەکۆنە بکرێ! بەڵکو پێویستە ئێمە سەرزەنشت بکرێین کە رێگەدەدەین یەهود حوکمڕانیمان بکات"

(Ernst Rohm. Die Geschichte eines Hochverrater. 1933. volksausgabe. P. 284)

35. پاڵێورانی دەستەی پاراستن دەبوایە رەچەڵەکیان تا ساڵی 1750 روون بکەنەوە، بەڵام ئەوانەی بۆ نێوەندە باڵاکانی حیزب دەپاڵێوران دەبوایە وەڵامی ئەم سێ پرسیارە بدەنەوە:

1. چیت بۆ حیزب کردوە؟

2. ئایا لەرووی جەستەو هزرو ئەخلاقەوە، بەتەواوەتی ساغو سەلامەتی؟

3. ئایا رەچەڵەکتان بێخەوش و بێگەردە؟ بڕوانە رێبەری لاوانی هیتلەر.

ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنج راکێشانە ئەوەیە، لە رژێمی بۆلشەفیکیشدا ئەندامانی پۆلیس و دەستەبژێری بۆلشەفیك NKVD رەچەڵەكنامەیان لێداوادەكرا.

36. حەزو ئارەزوەکاتی توتالیتاری میککارتیزم لە وڵاتە یەکگرتوەکاندا تەنها لە راوەدونانی کۆمۆنیستەکان دەرنەدەکەوت، بەڵکو زیاتر لەناچارکردنی هاوڵاتیان دەردەکەوت بۆ ئەوەی ناکۆمۆنیست بونی خۆیان بسەلمێنن.

37ـ نابێت لە هەڵسەنگاندنی کاریگەری راگەیاندندا زیادەڕەوی بکرێ... هاورێ لەگەڵ زیادبونی دەسەڵاتی رێکخستندا کاریگەری راگەیاندنیش کەمدەبێتەوە (هادامۆڤسکی، سەرچاوەی پێشو، ل64). "رۆژنامەکان ناتوانن بەرامبەر بە هێزی سەرکوتکەرانەی رێکخراوێکی زیندوو خۆیان رابگرن" (هەمان سەرچاوەی پێشو، ل65). ئەو دەسەڵاتەی بە تەنها پروپاگەندە هەڵیدەسەنگێنێت، دەسەڵاتێکی ناپایەدارە، بۆیە ئەگەر توندوتیژی رێکخستن پشتگیری لەو پروپاگەندەیە نەکات، هەر بەزوویی لەناودەچێت (سەرچاوەی پێشو، ل21).

38. کۆبونەوەی جەماوەری باشترین و بەهێزترین شکڵی پروپاگەندەیە، "لەبەر ئەوەی هەر تاکێك هەست بە زۆرترین دڵنیایی دەکات و لە یەکێتی جەماوەریشدا زیاتر هەست بەهێزو توانای خۆی دەکات. (هەمان سەرچاوەی پێشو، ل47). "لە رێگەی رێکخستن و پەروەردەی سیستماتیك و دیسپلینەوە، جۆش و خرۆشی ئەو کۆبونەوانە دەبێتە پرەنسیپ و رێبازێکی رۆحی" (سەرچاوەی پێشو، ل21 . 22).

39ـ هیتلەر لە بۆنە دەگمەنەکاندا بایەخی بەم مەسەلەیە دەداو بەشێوەیەکی گشتیش جەختی لەسەر دەکردەوە: "بە هەر حاڵ من وەك دیکتاتۆر یا پاشایەك، سەرۆکی دەوڵەتێك نیم، بەڵکو من رێبەری میللەتی ئەڵمانیام"
(voir Ausgewahlte Reden des Fuhrers. 1939, p. 114).

هانس فرانك . یش لەسەر هەمان شێواز دەدوێت: "رژێمی رایخی ناسیونال سۆسیالیست رژێمێکی دیکتاتۆری یا لەوەش خراپتر رژێمێکی هەرەمەکی نیە، بەڵکو رایخی ناسیونال سۆسیالیست پشت بە دڵسۆزی بەرابەری نێوان رێبەرو میللەت دەبەستێت" (لە کتێبی "ماف و حوکم" وەرگیراوە، میونیخ، 1939، ل 15).

40ـ هیتلەر زۆرجار ئەوەی دوبارە کردۆتەوە: "دەوڵەت تەنها ئامرازێکە بۆ گەیشتن بە ئامانج، ئامانجیش پاراستنی رەگەزە" (ریدن، 1939،ل 15). هەروەها پێی دادەگرت لەسەر ئەوەی کە بزوتنەوەکەی لەسەر ئایدیای دەوڵەت دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر راپرسییەکی میللی

هاوبەش"ی (Voltsgemeinschaft) دامەزراوە (بڕوانە ریدن، 1933، ل 125، گوتارەکەی هیتلەر بەرامبەر بە نەوەی نوێی رابەرە سیاسییەکان Fuhrer Nachurwuchs، 1937، وەك پاشکۆی وتەکانی سەرخوانی هیتلەر بڵاوکراوەتەوە، ل466). هەمان گوزارشت بە دەربڕینێکی جیاواز، ناوکی نێوەندی لێکۆڵینەوە دولایەنەکەی ستالین لەسەر "تیورەی دەوڵەت" پێکدەهێنێت: "ئێمە لایەنگری لە لەناوبردنی دەوڵەت دەکەین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا پاڵپشتی لە بەهێزکردنی دیکتاتۆرییەتی پرۆلیتاریاش دەکەین کە بەهێزترینو بەتواناترین دەوڵەتە تا ئەمرۆ هەبوبێت. مەزنترین گەشەسەندنی دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ هاتنەدی لەناوبردنی دەوڵەت: بریتیە لە فۆرمی مارکسیزم" (هەمان سەرچاوەی پێشو).

41. ئەسکەندەر ستاین، رۆدۆڵف هیتلەر، "ئەو قوتابیەی زایۆن دەردەکات" Schuler der "weisen von Zion"، کارلسباد، 1936، یەکەم کەس بوە ناسنامەی بیروباوەری ئایدیۆلۆجیای نازیو بیروباوەری پیرانی زایۆن لە ڕێگەی بەراوردکردنی زمانناسییەوە، شیکردۆتەوە (واتە پەنابردن بۆ زانستی فیقهی زمانی هاوچەرخ کە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی وشەو چاوگو داتاشینو فۆنۆتیکی وشە دەدا)، هەروەها بڕوانە ر. م. بلانك، ئەدۆڵف هیتلەرو پرۆتۆکۆڵەکانی پیرانی زایۆن، 1938

تیودۆر فریتش، کە لە دوای جەنگ بە باتریارکی دژە سامییەتی ئەڵمانیا دەژمێردرێت، یەکەم کەسە خۆی بە قەرزارباری بیروباوەری پرۆتۆکۆڵەکان دەزانێت. تیودۆر لە پێشەکی چاپی پرۆتۆکۆڵەکانی ساڵی 1924دا دەنوسێت: "پێویستە سیاسەتمەدارو دیپلۆماتەکانی ئایندەی ئێمە، تەنانەت ئەلفبای حکومەتیش لە مامۆستایانی رۆژهەڵاتەوە فێربن، بۆ ئەم مەبەستەش، پرۆتۆکۆڵەکانی زایۆن، باشترین قوتابخانەی ئامادەیی فەراهەمدەکات"

42ـ دەربارەی مێژووی پرۆتۆکۆڵەکان بڕوانە جۆن. س. کۆرتیس "هەڵسەنگاندنی پرۆتۆکۆڵەکانی زایۆن"، 1942 دروستیو ساختەیی ئەو پرۆتۆکۆلانە سەبارەت بە پلانی هەڵمەتی پروپاگەندە شتێکی لاوەکیو بێبایەخ بو. نوسەری روسی س. ا. نیلۆس، کاتێك چاپی دوەمی چاپە روسییەکەی لە ساڵی 1905 بڵاوکردەوە، بەتەواوەتی لە ساختەیی ئەو پرۆتۆکۆلانە بەئاگا بو، ئەم تێبینیە دروستانەی تۆمار کردوە: "بەڵام ئەگەر شەرعییەتی ئەو پرۆتۆکۆلانە لە ڕێگەی بەڵگەنامە یا شاهیدی متمانەپێکراو، بسەلمێنرێ، ئەگەر ئاشکرا کردنی ئەو کەسانەی لەسەروی ئەو پیلانە جهانیەن، لەتواناادا بێت ئەو کاتە "چەوسانەوەی نهێنی" تێکدەشکێنرێ.."، لە کتێبی کۆرتیسەوە وەرگیراوە، سەرچاوەی پێشو.

هیتلەر پێویستی بە نیلۆس نەبو تا پەنا بۆ هەمان قۆڵبڕینو تەڵەکەبازی بەرێت: باشترین بەڵگەش بۆ دروستی پرۆتۆکۆڵەکان، ئەوەیە کە ساختەییان سەلمێنراوە. ئەو بەڵگەیەك دەخاتە سەر ماقوڵییتەکەیو

دەڵێت: "ئەوەی زۆرێك لە یەهودییەكان نائاگایانە ئەنجامی دەدەن، لێرەدا بەوپەڕی ئاگاییەوە گوزارشت لە خۆی دەكات، ئەم خاڵەش گرنگە" (نەبەردی من، كتێبی یەكەم، بەشی یازدەهەم).

43. Fritsch, op. eit, " (Der juden) oberster Grundsatz lautet : Alles, was den volke juda nutzt, ist moralisch und ist heilig".

44. ئیمپراتۆرە جهانیەكان لەسەر پایەی نەتەوەییەوە دەست پێدەكەن، بەڵام هەر بەزوویی سنوری نەتەوەیی دەبەزێنن (ریدن).

45ـ هێنری رۆلین، لە كتێبی " خەونی سەردەمەكەمان"، پاریس، 1939، پێیوایە فرەیی جەماوەری پرۆتۆكۆڵەكان لە دوای فرەیی جەماوەری كتێبی پیرۆزەوە لەنگەر دەگرێت (ل40). هەروەها پێ لەسەر ئەوەش دادەگرێت كە لێكچون لەنێوان پرۆتۆكۆڵەكانو كتێبی ئاگاداركردنەوەكان "پێشبینی كردنی نهێنیەكان" monita secreta هەیە، یەكەمجار لە ساڵی 1612بڵاوبۆتەوەو تا ساڵی 1939یش لەسەر جادەكانی پاریس كڕیاری هەبوە. ئەو ئاگاداركردنەوانە بانگەشەی بوونی پیلانێكی یەسوعی دەكرد، پیلانێك: "رێگەی بە هەمو كارێكی شەڕەنگێزو دزێو دەدا... ئەو كارەش هەڵمەتێكی راستەقینە بو لە دژی دەسەڵاتی ئەودەمە" (ل32).

46. هەمو ئەو ئەدەبیاتە لە رێگەی "Malet" لە " ئەو لێكۆڵینەوە سیاسیو مێژوویانەی بوونی گروپێكی شۆڕشگێر دەسەلمێنێت"، 1817، زۆر بە جوانی خراوەتە روو. هەروەها وتەی زۆرێك لە نوسەرەكانی پێش خۆی بە نمونە دەهێنێتەوە. بە بۆچونی ئەو هەمو پاڵەوانەكانی شۆڕشی فەرەنسا، مانوكانی Mannequin ئاژانسی نهێنی agence secrete بون، واتە ئاژانسی فراماسۆنی (ماسۆنی). بەڵام فراماسۆنییەت بەتەنها ناوێكی هاوچەرخی "تیمە شۆڕشگێڕەكانە"، ئەو تیمانەی لە هەمو سەردەمێكدا بوونیان هەبوەو سیاسەتیشیان هەمیشە پەلاماردانو مانەوەیان بوە لە پشتی پەردەوە، بە مەبەستی جوڵاندنی ئەو لەیبوكانەی پێویستە لەسەر شانۆی روداوەكان بەدیاربكەون..." ئەو نوسینەكانی بەم دەستەواژانە دەست پێدەكات: "رەنگە زەحمەت بێت خەڵكی بڕوا بكەن بەوەی پلانێك لەسەردەمی دێرینەوە دارێژراوەو تاكو ئێستاش بەهەمان وردەكارییەوە بەدواداچونی بۆ دەكرێ... زۆرینەی دامەزرینەرانی شۆڕشی فرەنسا، ئەڵمانی، ئیتاڵی، ئینگلیزو هی دی بون، تا فرەنسی. ئەم دارودەستەیەی شۆڕش، میللەتێكی تایبەت پێكدەهێنن كە لە تاریكیو لەنێو میللەتە پێشكەوتوەكانەوە گەشەیان كردوەو ئامانجیشیان ئەوەیە هەمو میللەتانی دونیا بخەنە ژێر ركێفی خۆیانەوە"

لە پێناوی گفتوگۆیەكی تێروتەسەلی ئەم ئەدەبە بڕوانە ئی. لۆسوێر، ماسۆنیەتی سەدەی هەژدەهەم، كتێبخانەی مێژوویەكی شۆڕشگێڕ، 1946 ئەفسانەی ئەم پیلانگێرییە دەتوانرێ لە ئەدەبیاتی ناماقوڵو گەورەی دژە ماسۆنیەتی فرەنسا بەدیبكرێ كە زۆر لە هەلومەرجی دژە سامییەت ئاوارتە نیە. مرۆڤ دەتوانێت كورتەیەك لەو تیوریانەی شۆڕشی فرەنسا بە بەرهەمی

پیلانی نهێنی دەزانێت لەم بەرهەمەدا بدۆزێتەوە، ج. بۆرد، ماسۆنییەت لە سەرەتای دەست پێکردنییەوە تاکو 1815، (1908).

47ـ ریدن، بڕوانە پوختەی کۆبونەوەکەی لیژنەی دەستەی پاراستن، بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی هێزی کار (فەرماندەیی گشتی دەستەی پاراستن، بەرلین، 12/ کانونی دوەم/ 1934)، لەم دانیشتنەدا پێشنیازکرا وشەی "نەتەوە" کە مانای لیبرالی هەیە، بەهۆی نەگونجانی لەگەڵ میللەتانی جیرمانی، لابرێت. (بەڵگەنامەی 75 .p.s، پیلانگێڕیو دەستدرێژی نازی، بەرگی پێنجەم، ل515).

48. گوتەکانی هیتلەر، چاپی باینز، ل6.

49ـ گۆبلز، سەرچاوەی پێشو، ل377. ئەو وتەیەی دەخزێنرایە هەمو پروپاگەندەی دژە یەهودی نازییەکانەوە، لەم رستەیەی هیتلەرەوە سەرچاوە دەگرێ: "یەهود، سەرسەخترین نەیاری رەگەزی ئارییە" (نەبەردی من، کتێبی یەکەم، بەشی یازدەهەم).

50. دۆسیەی کێرستن، سەنتەری دوکیومێنتی یەهود.

51. ئەو وتە سەرەتاییەی هیتلەر (ریدن)، "ئەو مافەی بە میللەتی ئەڵمانیای بەرەوا دەبینم، هەرگیز بە میللەتانی دی رەوا نابینم"، کرابو بە بیروباوەری رەسمی: رێسای ناسیونال سۆسیالیست دەربارەی ژیان بریتی بو لە لێکنەچونی مرۆڤەکان" رێبەری لاوانی هیتلەر، ل5.

52ـ بۆ نمونە، هیتلەر لە ساڵی 1923دا دەڵێت: "میللەتی ئەڵمانیا، سێیەکی قارەمان، سێیەکی ترسنۆکو دوا سێیەکیشی خائینە" (گوتەکانی هیتلەر، باینز، ل76).

نازییەکان لەدوای ئەوەی دەسەڵاتیان گرتەدەست، بەئاشکرا باسیان لەم رەوتە دەکرد. بۆ نمونە گۆبلز لە ساڵی 1934، بەمشێوەیە دەدوێت:" کێ مافی ئەوەی هەیە رەخنەمان لێبگرێت؟ ئەندامانی حیزب؟ نەخێر، باقی خەڵکی ئەڵمانیا؟ دەبێ ئەوانە بەختەوەربن کە تاکو ئێستا بە زیندویێتی ماونەتەوە. کارێکی ساوێلکەو کاڵفامانایە گەر رێگە بدەین ئەو کەسانە رەخنەمان لێبگرن کە بەرەحمەتی ئێمە بەزیندویێتی ماونەتەوە" کۆهن . برامستید، سەرچاوەی پێشو، ل178 . 179. هیتلەر لەکاتی جەنگدا رایگەیاند: "من موگناتیزمو بەنیو میللەتی ئەڵمانیا دەکێشێمو پۆڵای ناخیان کێشدەکەم. من چەندین کەرەت ئەوەم دوبارەکردۆتەوە کە هەمو ئەڵمانیەکی خاوەن بەها لە ئۆردوگاکەی مندا خربۆتەوە، ئەوانەی لەم ئۆردوگایەشدا نەبن، خەڵکانێکی پروپوچن". ئیدی هەر لەو دەمەوە هیتلەر بۆی روون بووە کە چی بەسەر ئەو خەڵکە بێبەهایانە بهێنێت.

voir der grossdeutsche Freiheitskampf. Reden Hitlers von )
.(1.9.1939 -10.3.1940. p. 174

هیملەریش هەمان هەست دەردەبڕێت کاتێك دەڵێت: "هیتلەر بەدەستەواژەی ئەڵمانیا بیرناکاتەوە، بەڵکو بەدەستەواژەی جیرمانی بیردەکاتەوە". (دۆسیەی کیرستن، بڕوانە سەرچاوەی

سەرەوە). بەڵام لە ڕێگەی (وتەکانی سەر خوانی هیتلەر، ل315) لەوە تێدەگەین کە هیتلەر لەو ساتانەدا گاڵتەی بە "بانگەشە زەقەکانی جیرمەنی" دەکردو بە دەستەواژەی "ئاری" بیری لە مەسەلەکان دەکردەوە.

53. هیملەر لە گوتارێکیدا بەرامبەر بە ئەفسەرانی هەواڵگری نهێنی ئەڵمانیا لە خازکۆڤ لە نیسانی 1943دا دەڵێت: "هەوڵدەدم دەستەکانی دەستەی پاراستنی جێرمەنی لەسەرجەم وڵاتاندا دروست بکەم..." (پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل572). خودی هیتلەر ماوەیەکی زۆر پێشنەوەی دەسەڵات بگرێتەدەست، ڕێنمایی ئەم سیاسەتە نانەتەوەییەی خستۆتەڕوو (ریدن): "بەدڵنیاییەوە نوێنەرانی میللەتانی دی لەم چینە سەرورە تازەیە، قبوڵ دەکەین، ئەوانەی بە بەشداربونیان لەم جەنگەی ئێمەدا، شایستەیی ئەوەیان پێشان داوە.

54. هادامۆڤسکی، سەرچاوەی پێشو.

55. هایدن. سەرچاوەی پێشو، ل139: پروپاگەندە، "هونەری بڵاوکردنەوەی ڕەئیەك نیە لەنێو جەماوەردا، بەڵکو لە واقیعدا هونەری خواستنی ڕەئیەکی دیاریکراوە لە جەماوەر"

56ـ هادامۆڤسکی. سەرچاوەی پێشو، لێرەو لەوێ، ئەم چەمکە لە هیتلەرەوە وەرگیراوە، نەبەردی من (کتێبی دوەم، بەشی یەکەم)، "ڕێکخستنێکی زیندو" لەگەڵ "میکانیزمێکی مردوی" حیزبێکی بیروکراسی جیاوازی هەیە.

57ـ هەڵەیەکی گەورەیە گەر مرۆڤ ڕێبەرانی تۆتالیتار بەپێی گروپی "سەرکردەی شکۆمەند"ی ماکس ویبەر، لێکبداتەوە. بڕوانە هانس گیرت، حیزبی نازی، لە "گۆڤاری کۆمەڵناسی ئەمریکا"، 1940، جلدی 6. (یەکێك لە کەموکورتیە گەورەکانی ژیاننامەی هیتلەر، لە نوسینی هایدن، لە هەمان بەد حاڵی بونەوە، سەرچاوە دەگرێ). گێرت، هیتلەر وەك سەرکردەیەکی شکۆمەندو ساحیری حیزبێکی بیروکراسی وەسفدەکات. بە بڕوای ئەو، سەرباری "ناکۆکی ئاشکرای نێوان وتەو کرداری نازییەکان، هەمان واقیعییەت دەبێتە مایەی ئەوەی کە هیچ شتێك نەتوانێت ڕێکخستنەکەیان لەقبکات، مادامەکی بناغەیەکی تۆکمەی هەیە" ئەم ناکۆکییەش زیاتر تایبەتمەندی ستالین بو بەوەی " هەمیشە هەوڵیدەدا بەپێچەوانەی وتەکانی خۆی ڕەفتار بکاتو بەپێچەوانەشەوە، شتێك بڵێت کە کاری پێنەکات" (سوڤارین. سەرچاوەی پێشو، ل 431).

بۆ ڕونکردنەوەی زیاتری ئەو هەڵەیە، بڕوانە ئەلفرید ڤۆن مارت، "دەربارەی سۆسیۆلۆجیای هاوچەرخ"

**Alfred von Martin. "Zur soziologie der Gegenwart", dans "Zeitsehrrift fur kulturgeschichte, Band 27, et Arinold koettgen, " Die Gesettzmassigkeit der verwaltungin Fuhrerstaat", dans Reichsverwaltungsblatt, 1936.**

هەردوکیان دەوڵەتی نازی وەك دەوڵەتێکی بیروکراسی شکۆمەند تەماشا دەکەن.

58ـ هادامۆڤسکی، سەرچاوەی پێشو، ل21، سەبارەت بە ئامانجی تۆتالیتاریا، شتێکی هەڵەیە ئایدیۆلۆجیا لە ڕێگەی پەروەردەو قایلکردن، بڵاوبکرێتەوە. بە بڕوای ڕۆبێرت لی، ئایدیۆلۆجیا نە فێردەکرێ‌و نە تەلقین دەدرێ، بەڵکو پیادە دەکرێ‌و جێبەجێ دەکرێ.
(voir Der weg Zur ordeusburg).

59. ر. هۆهن، تیوریستێکی بەرجەستەی نازییە، بەمشێوەیە گوزارشت لە نەبونی بیروباوەر یا تەنانەت کۆی ئامانج‌و بیروباوەڕەکانی بزوتنەوە دەکات: "لە ڕوانگەی کۆمەڵێکی میللیەوە، هەمو کۆمەڵێك لەسەر بەهای هاوبەش بونیات نرابێت، وێرانکارە"
(Reichsgemeinschaft und Volksgemeinschaft, Hambourg 1935, p.83).

60ـ هیتلەر لە چوار چێوەی گفتوگۆکانی دەربارەی پەیوەندی نێوان ئایدیۆلۆجیا و ڕێکخستن، وەك واقعێك ئەوەی پێقبوڵ بو نازییەکان "ئایدیای نەژادی" لە گروپ‌و حیزبەکانی دی وەربگرن، بەڵام بە جۆرێك هەڵسوکەوتیان دەکرد وەکئەوەی نوێنەرایەتی راستەقینەی ئەو ئایدیایە بکەن، چونکە نازییەکان یەکەم کەس بون لەسەر بنەمای ئایدیای نەژادی ڕێکخراوێکی جەنگاوەریان دروستکردو لەپێناوی ئامانجی پراکتیکیشدا فۆرمۆڵە بەندیان کرد (سەرچاوەی پێشو، کتێبی دوەم، بەشی پێنجەم).

61ـ بڕوانە هیتلەر "پروپاگەندەو ڕێکخستن"، سەرچاوەی پێشو، کتێبی دوەم، بەشی یازدەهەم.

62. فەرمانی سەرسەختانەی هیملەر کە ئاراستەی بێرجەری کردوە بەوەی بریار بە "دەستەواژەی یەهود" نەدرێت، حاڵەتێکە دەلالەت لەسەر ئەم میتۆدە دەکات، چونکە "بەودەربەستە گیلانەیە، تەنها دەست‌و پای خۆمان کۆت دەکەین". (بەڵگەنامەی نۆرمبۆرگ، ژمارە 626، نامەیەك بۆ بێرجەر، 28 / تەموز/ 1942، وێنەیەك‌و سەنتەری بەڵگەنامەی یەهود).

63. فۆرمی "ویستی فۆهرەر یاسای باڵایە" لە گشت پێڕەوە ناوخۆ ڕەسمیەکاندا بەدیدەکرێ کە حیزب‌و دەستەی پاراستن بەڕێوەدەبەن، لەم بارەیەوە ئۆتۆ گوایلەر، باشترین سەرچاوەیە، ( Recht seinrichtungen und Rechtsaufgaben der Bewegung. 1939).

64ـ هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل292، بەمشێوەیەی خوارەوە جیاوازی نێوان چاپی یەکەم‌و چاپەکانی دی نەبەردی من دەخاتەروو: لە چاپی یەکەمدا پێشنیاز دەکرێ لە پێشدا کادرەکانی حیزب هەڵبژێردرێن، پاشان "دەسەڵات‌و توانای بێسنوریان" پێبدرێت. بەڵام لە چاپەکانی دواتردا دەبێ بەرپرسە حیزبیەکان لە سەرەوەو راستەوخۆ لەلایەن بەرپرسی پایە بەرزترەوە دابنرێن. بەهەر حاڵ، پرەنسیپی دامەزراندن لەسەرەوە بۆ بەردەوامی و سەقامگیری ڕژێمە تۆتالیتارەکان زۆر لە پرەنسیپی "دەسەڵاتی بێسنوری" بەرپرسی هەڵبژێردراو، گرنگترە.

دەسەڵاتی نوێنەرانی سەرۆك بەکردەوە زۆر سنوردارترە گەر لەگەڵ دەسەڵاتی رەهای رێبەر بەراورد بکرێ.

ستالینیش کە خۆی هەڵبژاردەی دەزگای پیلانگێری حیزبی بۆلشەفیك بو، هەرگیز لەم مەسەلەیەدا گرفتێکی بەدینەدەکرد. چونکە سەبارەت بە ستالین دامەزراندنی ناوخۆی ماشینی حیزب، مەسەلەی کەڵەکەبونی دەسەڵاتی کەسێتی بو. (لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەرەتای ساڵانی سییەکاندا، لەدوای ئەوەی بە تەواوەتی نمونەی هیتلەری تاوتوێی کرد، ئنجا رێگەیدا ناوی "رێبەر"ی لێنرێ).

لێرەدا پێویستە دان بەوەدا بنرێت کە ستالین دەیتوانی بەپشت بەستن بە تیورەی لینینزم، ئەمجۆرە میتۆدە دابرێژێت کە بە پێی ئەو تیورەیە: "مێژووی هەمو وڵاتانی دونیا ئەوە دەردەخات، ئەگەر چینی کرێکاران، بە تەنها پشت بە هێزی تایبەتی خۆی ببەستێت، هەر دەتوانێت گەشە بەوشیاری سەندیکایی بدات"، بەڵام سەرکردەکانی بەزەرورەت لە دەرەوەی چینی کرێکارانەوە دێن (بڕوانە دەبێ چ بکرێ؟ یەکەمجار لە ساڵی 1902بە چاپ گەیەنرا، کۆی بەرهەمەکان، بەرگی چوارەم، کتێبی دوەم). لە راستیدا لینین پێیوابو حیزبی کۆمۆنیست پێشکەوتوترین توێژی چینی کرێکارەو لە هەمان کاتیشدا بە "نوێڵی رێکخستنی سیاسی" دەزانی و دەبێ سەرکردایەتی جەماوەری پرۆلیتاریا بکات، واتە رێکخستنێکی دەرەکیو باڵاتر لە چینی کرێکار، (بڕوانە ف.ه. چامپرلاین، شۆڕشی روسیا، 1917ـ 1921، 1935، بەرگی دوەم، ل360). لەگەڵ ئەوەشدا، لەلای لینین یاسایی دیموکراسی ناوخۆی حیزب جێگەی پرسیار نەبو، هەرچەندە ئارەزوی ئەوەی هەبو دیموکراسییەت تەنها چوار چێوەی چینی کرێکاران قەتیس بکات.

65. هیتلەر، سەرچاوەی پێشو، کتێبی دوەم، بەشی یازدەهەم.

66. هەمان سەرچاوە. نازییەکان لەدوای ئەوەی دەسەڵاتیان گرتەدەست ئەم پرەنسیپەش بەوپەری وردەکارییەوە جێبەجێ کرا. لە کۆی حەوت ملیۆن ئەندامی لاوانی هیتلەر تەنها پەنجا هەزار کەسیان لە حیزب بە ئەندام وەرگیران. "تەنانەت تاکە حیزبیش نابێت تا ئەو ئاستە گەشە بکات کە هەمو دانیشتوان بکات بە ئەندامی خۆی. گشتگیری حیزب تەنها بەهۆی کاریگەری ئایدیۆلۆجیاوە لەسەر یەك بەیەکی تاکەکانی میللەتەوە دەبێت، نەك لەرێگەی بە ئەندامبونی تاك بە تاکی میللەت"

Voir Gottfried Nesse. "Die Verfassungrechtliche Gestatlung der )
Einpartie", dans Zeitschrift fur die gesante Staatsurissenschaft 1938, Band,
.(p.678

67. بڕوانە جیاکارییەکەی هیتلەر لە نێوان "رادیکاڵەکان"، ئەوانەی بە تەنها شایانی ئەوە بون بەئەندامی حیزب وەرگیرێنو سەدان هەزار لایەنگر، ئەوانەی لەوە ترسنۆکتربون قوربانی پێویست بدەن سەرچاوەی پێشو.

68. بڕوانە هیتلەر، ئەو بەشەی دەربارەی یەکەی هێرشە، سەرچاوەی پێشو، کتێبی دوەم بەشی نۆیەم.

69ـ تیمەکانی شۆك . shock troops کە لە وەرگێڕانی Verfugunstruppe هاتوە، واتە یەکەی تایبەتی دەستەی پاراستن، لە بنەرەتدا بەو مەبەستە ڕێکخرابون بۆ ئەوەی وەك هێزێکی تایبەت لەژێر دەسەڵاتی هیتلەردا بێت.

The Gestapo, oxford pamphlets on world Attairs, No. 36, 1940.

70. باشترین سەرچاوە بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ڕێکخستنی دەستەی پاراستن و مێژووی ئە دەزگایە، کتێبەکەی خودی هیملەرە بەناونیشانی ( "Wesen und Aufgabe der S.S und der polizei", dans Sammelhefte ausgeuahlter vatrage und Reden, 1939).

لەسەرو بەندی جەنگدا، ئەو کاتەی دەستەی پاراستنی چەکدار بە هۆی زەرەرو زیانە بێشومارەکانی لە بەرەکانی شەڕدا، ناچار بو بە سەرباز شوێنیان پڕبکاتەوە، ئیدی ئەم دەزگایە لە چوارچێوەی دەستەی پاراستندا خەسڵەتی دەستەبژێری لە دەستدا، تا ئەو رادەیەی دەستەی پاراستنی گشتی، واتە یەک تایبەتە سیاسییەکانی فۆهرەر جارێکی دی بوە ناوکی نێوەندیو دەستەبژێری بزوتنەوە.

بەڵگەنامەی گەلێك بەنرخ کە بەراشکاوی دوا قۆناغی دەستەی پاراستن روندەکاتەوە، دەتوانرێ لە ئەرشیفی کتێبخانەی هۆڤەر، لەدۆسیەی هیملەر، فۆڵدەری 278 پەیدا بکرێ. ئەم بەڵگەنامانە ئەو نیشاندەدەن کە چۆن دەستەی پاراستن، ئاگایانە لاسایی شێوەو ڕێسای تیمە بیانیەکانی دەکردەوە لەنێو کرێکارانی بیانیو لەنێو دانیشتوانی ناوخۆدا هێزی سەربازیی هەڵدەبژارد. سەربازگیری دەستەی پاراستن لەنێو ئەڵمانییەکاندا لە دیسامبەری 1942 بە فەرمانی هیتلەر (هەرگیز بڵاونەکرایەوە) دەستی پێکرد، بە پێی ئەو فەرمانە "گروپی ژمارە 1925 دەدرایە دەستەی پارستنی چەکدار"، (نامەیەکی هیملەر بۆ بۆرمان). سەربازگیریو ئەندامگیری بەرووکەش خۆبەخش بو. بەمەبەستی زانیاری ورد دروست لەماناى ئەم خۆبەخشییە، بگەڕێڕەوە بۆ ڕاپۆرتی ئەو ئەفسەرانە لەم کارە بەرپرسیار بون. لە ناوکۆیەدا ڕاپۆرتێك بە بەرواری 21/ تەموز/ 1943 لەبەردەستەو باس لەوە دەکات کە چۆن پۆلیس بە مەبەستی گرتنی ئەو کرێکارە فەرەنسایانەی کە بۆ خزمەتی سەربازی لە ڕیزەکانی دەستەی پاراستن بانگهێشت کرابون، گەماڕۆی ساڵۆنێك دەدا، کەچی زۆرێك لەو کرێکارانە لە دوای خوێندنەوەی سرودی مارسیز، هەوڵیان دەدا لە پەنجەرەکانەوە خۆیان فڕێبدەنە خوارەوە. هەر چەندە ئەندامگیری لاوانی ئەڵمانیش زۆر لەوە باشتر نەبو. ئەگەر چی ئەو لاوانە لەژێر گوشارێکی مەزندا بونو پێیان دەوترا "بەدڵنیاییەوە ئێوە ناتانەوێت پەیوەندی بە کۆمەڵێك چەتەی جل خۆڵەمیشیو پیسی سوپاوە بکەن" کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لە کۆی 220 لاوی هیتلەری کە بۆ بەئەندامبون لە دەستەی پاراستن لەبەرچاو گیرابون، تەنها 18 کەسیان پەیوەندی بەدەستەی پاراستنەوە کردو باقیەکەیان پێیان باش بـ

پەیوەندی بە سوپاوە بکەن (بەپێی ئەو راپۆرتەی هۆسلەر، فەرماندەی سەربازگیری دەستەی پاراستنی چەکدار لەرۆژئاوای ئەڵمانیا پێشکەشی کردبو). رەنگە بێشوماری زەرەروزیانی هێزەکانی دەستەی پاراستن لەچاو زیانەکانی سوپا کاریگەری لەسەر بریاری ئەو کەسانە هەبوبێت.

Voir Karl o. paetel, "Die S.S" dans viertlahreshefte fur )
(Zeitgeshiehte, janvier 1945

بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین کە ئەم هۆکارەش ئەوەندە یەکلاکەرەوە نەبو، بگەڕێرەوە بۆ ئەم راپۆرتە: لە کانونی دوەم/ 1940دا، هیتلەر فەرمانی دەرکردبو بەوەی پێویستە پیاوانی یەکەی هێرش پەیوەندی بە هێزی دەستەی پاراستنەوە بکەن، دەرئەنجامی ئەو بریارەش بەپێی راپۆرتێکی بەردەست لەسەر کۆنیگسبۆرگ بە مشێوەیە بو: لە کۆی 1807 کەس کە بۆ خزمەتی پۆلیسی بانگهێشت کرابون، 1094 کەسیان ئامادەنەبونو بەپیر بانگەوازەکەوە نەچون، بەڵام لەوانەی ئامادەش بون 630 کەسیان شیاوی ئەو کارە نەبونو تەنها 82 کەس توانایان هەبو لە ریزەکانی دەستەی پاراستن خزمەت بکەن.

71. ورنەر بێست، سەرچاوەی پێشو، ل99.

72ـ لەگەڵ ئەوەشدا، هیتلەر پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ناوی یەکەی هێرش sturmbeteilung بەڵگەیە لەسەر ئەوەی "بەشێکە لە بزوتنەوە"، هەروەکو چۆن پێکهاتەکانی دی بەشێکن لە بزوتنەوە وەك دەزگای پروپاگەندە، رۆژنامە، پەیمانگە زانستیەکانو هتد. لەلایەکی دی، هەوڵی دەدا ئەو وەهمەش لەسەر بەهای سەربازی رێکخراوێکی نیمچە سەربازی برەوێنێتەوەو خوازیاری ئەوەش بو پەروەردەی یەکەی هێرش بەپێی پرەنسیپی حیزب بێت، نەك لەسەر پرەنسیپی سوپا. سەرچاوەی پێشو.

73ـ دامەزراندنی یەکەی هێرش بەرەسمی لە پێناوی پاراستنی کۆبونەوەکانی نازی بو، ئەمە لەکاتێکدا بەشێوەیەکی سەرەکی ئەرکی دەستەی پاراستن، پاراستنی سەرکردە نازییەکان بو.

74. هیتلەر، سەرچاوەی پێشو.

75. ئێرنست بایەر، Die S.A، بەرلین، 1938

76ـ ژیاننامەی "رۆهم" بەرونی ئەوە نیشاندەدا کە قەناعەتی سیاسی خۆی لەگەڵ بیروباوەری نازییەکان جیاوازو ناتەبابوە. هەمیشە لایەنگری لە "دەوڵەتی سەربازی" soldatenstaat دەکردو بەردەوامیش سەربازی بەسەر سیاسەتمەداردا پەسەند دەکرد des solaten vordens politiker (سەرچاوەی پێشو، ل349). ئەم برگەیەی خوارەوە بەڵگەیەکی رونو ئاشکرایە لەسەر رێبازی ناتۆتالیتارانەی هیملەر، یا راستتره بڵێن، ناتوانایی پەیبردنێتی بە تۆتالیتاریزمو داوا "گشتگیرەکانی": " من نازانم بۆچی نابێت ئەم سێ مەسەلەیەی خوارەوە پێکەوە تەبا و گونجاوبن: دڵسۆزیو وەفاداریم بۆ شانشینی میراتگری

خانەدانی ویتلسباخ و میراتگری تاجی باڤاریا، سوپاس و ستایشم بۆ بەها گشتییەکانی جەنگی جهانی (مەبەستم لۆداندۆرفە) کە تائێستاش بەرجەستەی ویژدانی میللەتی ئەڵمانیا دەکات و هاورێیەتیم لەگەڵ بانگەوازدەرو ئالاهەڵگری ململانێ سیاسییەکان، ئۆدلۆف هیتلەر" (ل348).

ئەو هەڵوێستەی بۆ دواجار سەری خودی هیملەری خوارد، ئەوەبو لەدوای ئەوەی نازی دەسەڵاتی گرتەدەست، خەونی بە دامەزراندنی یەك دیکتاتۆرییەتی فاشی هاوشێوەی نمونەی ئیتاڵیا دەبینی کە تیایە پێویستە حیزبی نازی "کۆت و بەندی حیزب" بپچرێنێت و "هەر خۆیشی ببێت بە دەوڵەت"، ئەمەش رێك ئەو شتەبو کە هیتلەر هەوڵیدەدا بەهەر نرخێك بوە خۆی لێ بەدوور بگرێت. بڕوانە ئێرنست رۆهم، warum S.A لە گوتارێکیدا بەرامبەر بە دەستەی دیپلۆماتیك، لە دیسامبری 1933، بەرلین.

لەچوار چێوەی حیزبیشدا پیلانگێری نێوان یەکەی هێرش و پاسەوانانی رایخ لەدژی دەسەڵاتی دەستەی پاراستن و پۆلیس هەرگیز لەبەین نەبرا. هانز فرانك، فەرمانڕەوای گشتی پۆلۆنیا، لەساڵی 1942، واتە هەشت ساڵ لە دوای کوشتنی رۆهم و جەنەراڵ شلایخەر، بەوە تاوانبار کرا کە ویستویەتی "لەدوای جەنگ.. بەدەستیاری هێزی سوپا و یەکەی هێرش، گەورەترین شەڕ لە پێناوی دادوەری لەدژی دەستەی پاراستن دەست پێبکات" (پیلانگێری نازی، جلدی شەشەم، ل745).

77. هیتلەر لە نەبەردی من، کتێبی دوەم، بەشی یازدەهەم، دەڵێت: دەبێ پروپاگەندە کار بکات بۆ ئەوەی بیروباوەڕێك بەسەر سەرجەم دانیشتواندا بسەپێنێت، ئەمە لەکاتێکدا پێویستە رێکخستن رێژەیەکی کەم لە تێکۆشەرترین ئەندام لە خۆی بگرێت، هەروەها بڕوانە ج. نیسە، سەرچاوەی پێشو.

78. هیتلەر، هەمان سەرچاوەی پێشو.

79. هادامۆڤسکی، سەرچاوەی پێشو، ل28.

80. یەکەکانی پێشەنگی مەرگ دەستەی پاراستن، پێڕەویان لەم رێسایانەی خوارەوە دەکرد:

1. نابێت هیچ دەستەیەك لە شوێنی لەدایك بونی ئەرکەکانی ئەنجام بدات.

2. دەبێ هەر یەکەیەك لەدوای سێ هەفتە لە خزمەتکردن، شوێنی کارەکەی بگۆڕێت.

3- پێویستە لەسەر ئەندامان بەتەنها بەسەر شەقامەکاندا هاتوچۆ نەکەن، هەروەها نابێت نیشانەی پێشمەرگایەتێکەیشیان نمایش بکەن. بڕوانە گوتاری نهێنی هیملەر بەرامبەر بەفەرماندەی گشتی سوپای ئەڵمانیا، 1938 (لە راستیدا ئەم وتەیە لەساڵی 1937 خوێندراوەتەوە، بڕوانە پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل616، تەنها هەڵبژاردەی لێیاداشتکراوە). لیژنەی ئەدەبی دژە سامی ئەمریکا بڵاویکردۆتەوە.

81. Heinrich Himmler, Die Schutztaffel als antibolschewistische Kanspforganisation: Aus dem Schwarzen Korps, No.3, 1936.

هیملەر بە ئاشکرا دەڵێت: "من دەزانم لە ئەڵمانیا خەڵکانێك هەیە، تەنها بە بینینی کراسی رەش نەخۆش دەکەون. ئێمە لەوە تێدەگەین و پێشبینی ئەوەش دەکەین کە هەمو خەڵك ئێمەی خۆشنەوێت..."

82 . هیملەر لە ئاخاوتنەکانی بۆ دەستەی پاراستن، هەمیشە جەختی لەسەر تاوانە ئەنجامدراوەکان دەکردەوەو ئاماژەی بە گرنگیشیان دەدا. بۆ نمونە سەبارەت بە پاکتاوکردنی یەهود دەیوت: "لێرەدا دەمەوێت زۆر بەراشکاوی دەربارەی مەسەلەیەکی زۆر مەترسیدار قسەتان بۆ بکەم. لەنێوان خۆماندا دەتوانین بەئازادییەکی رەها لەسەر ئەم مەسەلەیە بدوێین، بەڵام نابێت هەرگیز لەبەرامبەر خەڵکیدا قسەیان لەسەر بکەین". سەبارەت بە پاکتاوکردنی دەستەبژێری روناکبیرانی پۆڵۆنیش دەڵێت: "پێویستە لێرەدا گوێبیستی ئەم مەسەلەیە بین، بەڵام دەبێت یەکسەر لە یادی بکەین" (پیلانگێری نازی، جلدی پێنجەم، ل553 تا 558).

گۆبڵزیش لە هەمان کتێبدا لەلاپەرە 266 لەسەر هەمان حاڵەت قسە دەکات: " سەبارەت بە مەسەلەی یەهود هەڵوێستێکمان گرتۆتەبەر کە دەبوایە بیگرینەبەر... ئەزمون ئەوەی فێرکردوین، بزوتنەوەو میللەت کاتێك پردەکانی دوای خۆیان روخاندوە، زیاتر بەپەرۆشەوە شەریان کردوە تا ئەوەی رێگەیەکیان بۆ پاشەکشێ هەبێت"

83 . سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل648، ئەو رەوشەی هەر دوو بزوتنەوە تۆتالیتارەکە گرتبویانەبەر بۆ ئەوەی ژیانی هەر دوو رێبەرەکەیان بەنهێنی بپارێزن، ناکۆك بو، لەگەڵ بەهای راگەیاندنی سەرجەم وڵاتە دیموکراسیەکان، ئەو وڵاتانەی ژیاننامەی تایبەتی سەرکردەکانیان بڵاودەکردەوە، ئیدی چ پاشا، سەرۆك کۆمار یا سەرەك وەزیران بێت. ئەمە لە کاتێکدا شێوازەکانی تۆتالیتاری رێگەنادەن تەماهی لەگەڵ ئەو قەناعەتەدا بکرێ: هەر کەسێك چەند پلەوپایەشی بەرز بێت، تەنها مرۆڤێکەو هیچی دی.

سۆڤارین لە هەمان کتێبدا بە دروشمی جۆراوجۆر ستالین وەسفدەکات: "ستالین، خانەخوێی نهێنی ئامێزی کرملینە"، "ستالین، کەسایەتییەکی دەرەهەستە"، "ستالین، ئەبوهۆلی کۆمۆنیستە"، "ستالین، لوغزە"، "ستالین، نهێنییەکی سەرمۆرە"، هتد...

84 . ئەگەر تروتسکی بریاری بدایە کودەتای سەربازی بکات، رەنگە توانای ئەوەی هەبوایە شکست بە دەستەی سێ کەسی، ستالین، کامنیف و زینۆڤیف بهێنێت. بەڵام بەبێ بچوکترین هەوڵ و کۆشش نوسینگەکەی خۆی بەجێهێشت، بێئەوەی پەنا بۆ سوپایەك بەرێت کە خۆی دروستی کردبوو ماوەی حەوت ساڵیش فەرماندەی بو. (ئیسحاق دویچەر، هەمان سەرچاوە، ل297).

85 . لەسەردەمی تروتسکیدا کۆمیساری جەنگ "دەزگایەکی نمونەیی" بو، بۆیە لە هەر شوێنێك پشێوییەك رویدایە، تروتسکی بانگهێشت دەکرا. (سۆڤارین سەرچاوەی پێشو، ل288).

86 . ئەو واتەواتەی لەسەر مردنی ستالین لەسەر زمان بو، بێخەوشی ئەم میتۆدە بەدرۆدەخاتەوە. ڕەنگە ستالین لەپێش مردنی کە بەدڵنیاییەوە پیلانی بۆ پاکتاوکردنێکی گشتی دی دادەرشت، بەدەست یەکێك لەچواردەورە نزیکەکەی کوژرابێت. چونکە ئیدی کەس هەستی بەسەلامەتی گیانی خۆی نەدەکرد، بەڵام سەرباری سەلماندنە ناراستەوخۆکانیش، کەچی ئەستەم بو کارێکی لەمجۆرە پشتراست بکرێتەوە.

87 . هیتلەر بەرپرسیارێتی کوشتنی پۆتمپا . یَ لە ئەستۆ گرت کە ساڵی 1932 لە ڕێگەی بکوژانی دەستەی پاراستنەوە ئەنجام درابو. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەرێکی بەهێز هەیە، خۆی هیچ رۆڵێکی لەو روداوەدا نەبوبێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە سەقامگیربونی پرەنسیپی ئاوێتەبونە، یا بەزمانی نازی "دڵسۆزیو وەفاداری نێوان ڕێبەرو میللەتە" کە رایخ پشتی پێدەبەست (هانس فرانك، هەمان سەرچاوەی پێشو).

88 . یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی ستالین.. ئەوەبو کە تاوانو کردەوە دزێوو هەڵە سیاسییەکانی... دەخستە ئەستۆی ئەو کەسانەی پیلانی سوککردنو ماڵ وێرانکردنی لە دژیان دادەرشت". (سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل655). شتێکی ئاشکرایە کە ڕێبەری تۆتالیتاری دەتوانێت بەوپەری ئازادییەوە هەڵەکانی بخاتە ئەستۆی ئەو کەسەی هەڵیدەبژێرێت، مادامەکی ئەو کردەوانەی دەستیارانی سەرۆك ئەنجامی دەدەن لەسروشتی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، بەجۆرێك، دەکرێ هەمو کەسێك رۆڵی فێڵبازانە وازی بکات.

89 . خودی هیتلەر . نەك هیملەر یا بۆرمان یا گۆبلز . بە کردەوە کارپایی (اجرات) ریشەییو رادیکاڵی دەردەکردو تێزە داهێنەرەکانی هیتلەریش هەمیشە لە پێشنیازی خەڵکە نزیکەکەی دەوروبەری رادیکاڵانەترو پەرگیرتر بو. تەنانەت خودی هیملەر توشی شاگەشکە بو کاتێك جێبەجێ کردنی "دواچارەسەری" مەسەلەی یەهود خرایە ئەستۆی، ئەمڕۆ هەمو ئەو شتانە بە گەلێك بەڵگەنامە پشتگیری لێدەکرێ. هەروەها چیدی ناتوانرێ باوەڕ بە خوشنودی ئەو داستانانە بکەین کە دەڵێت ستالین لە هاورێ چەپڕەوەکانی ناو حیزبی بۆلشەفیك میانڕەوتر بوە. کەواتە، جێگەی خۆیەتی مرۆ ئەوەی یادبکەوێتەوە کە سەرکردە تۆتالیتارەکان بێپەروا هەوڵدەدەن وەك کەسانێکی میانڕەو لەبەرامبەر دیدی دونیای دەرەوە بەدیاربکەونو رۆڵی واقیعیشیان . واتە بە هەر نرخێك بوە بزوتنەوە بەرەو پێشەوە بەرنو سود لە هەمو شێوازێك وەربگرن بۆ ئەوەی جوڵەی بزوتنەوە خێراتر بکەن . زۆر بەوردی بشارنەوە. بۆ نمونە بڕوانە یادی ئەمیراڵ "ئەریك رایدا" دەربارەی "پەیوەندیم لەگەڵ ئەدلۆف هیتلەرو حیزب"دا لە کتێبی پیلانگێڕی نازی، جلدی هەشتەم، ل707. "هەر کاتێك زانیارییەك یا واتەواتێك دەربارەی رێوشوێنی ریشەیی حیزب یا گەستاپۆ، درزەی دەکرد، لە رێگەی هەڵسوکەوتی هیتلەرەوە ئەو دەرئەنجامە هەڵدەگۆزرا کە رێوشوێنێکی لەوجۆرە بە فەرمانی هیتلەر دەرنەچوە... لەدوای

ماوەیەکی زۆر، هێدی هێدی گەیشتمە ئەو دەرئەنجامەی کە خودی فوهرەر هەمیشە حەزی بەچارەسەری ریشەیی کردوە، بێئەوەی ئەو ئارەزوەی ئاشکرا بکات"

ستالین پێشئەوەی بەدەسەلات بگات، لە ململانێی ناوخۆی حیزبدا، هەمیشە هەولیدەدا وەك "کەسێکی میانڕەو" دەربکەوێت (بڕوانە دویچەر، هەمان سەرچاوەی پێشو، ل295). هەر چەندە ستالین کەسێکی سازشکار نەبو، بەلام هەرگیز وازی لەو رۆلەی خۆی نەهێنا، بۆ نمونە کاتێك لە سالی 1936 رۆژنامەنوسێکی بیانی لەسەر ئامانجی شۆڕشی جهانی پرسیاری لێکرد، بەمشێوەیە وەلامی دایەوە: "هەرگیز ئێمە پلان و نیازێکی لەو جۆرەمان نیە... ئەم دیدە جۆرێك لە بەدحالی بونی تیایە... بەدحالی بونێکی پێکەنیناوی یا لەوەش خراپتر تراجیدیایەکی پێکەنیناوی" (دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل422).

90ـ بڕوانە ئەسکەندەر کوێرە Koyre، "ئەرکی سیاسی درۆ هاوچەرخەکان"، گۆڤاری "تیانوسی یەهودی هاوچەرخ"، حوزەیران، 1945

هیتلەر لە کتێبی (نەبەردی من)، کتێبی دوەم،بەشی نۆیەم، وەك نمونەگەلێك لەبەردەم بزوتنەوە تۆتالیتارەکاندا، بەدوورودرێژی گفتوگۆ لەسەر چاکەو خراپەی کۆمەلە نهێنیەکان دەکات. هەر زۆر بەزوویی تێروانینەکانی بەهەمان هەلهێنجانی کوێری گەیاند، واتە پشت بەستن بە پرەنسیپی کۆمەلە نهێنییەکان بەبێ رەچاوکردنی خەسلەتی نهێنی بوونیان و جێبەجێ کردنی ئەو پرەنسیپانەش "بەرۆژی نیوەرۆ" نازییەکان لەپێشئەوەی دەسەلات بگرنەدەست بچوکترین نهێنیان نەبو. تەنها لەسەردەمی جەنگداو کاتێك رژێمی نازی بە تەواوەتی تۆتالیتاریزە بو، رێبەری حیزب لەهەمو لایەکەوە بەهەرەمییەتی سەربازی دەورەدرا کە بۆ ئیدارەدانی کاروباری جەنگ پێوەی وابەستەبو، ئیدی بەراشکاوی فەرمانی بۆ پێکهاتەکانی دەستەبژێری بزوتنەوە دەرکرد کە هەر کارێك پەیوەندی بە "دواچارەسەر"ەوە هەبێت، واتە ریشەکێش کردن و لەناوبردنی بەکۆمەل، دەبێ بەتەواوەتی بە نهێنی بمێنێتەوە. هەر لەو ساتەوە هیتلەر وەك سەردەستەی پیلانگێڕان رەفتاری دەکرد، بێئەوەی بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی لە راگەیاندنی ئەو واقیعە بدزێتەوە. هیتلەر لە مایس/ 1939، لەمیانەی گفتوگۆیەکیدا لەگەل فەرماندەی گشتی، بریاری لەسەر ئەم رێسایانەی خوارەوەدا، رێسایەك کە مرۆڤ پێیوایە لە ئەلفبای کۆمەلە نهێنیەکانەوە کۆپی کراوە:

1. ، ئەو کەسەی پێویست نیە بزانێت، نابێت ئاگادار بکرێتەوە.
2. نابێت کەس لە ئاستی خۆی زیاتر بزانێت.
3. دەبێت هەمو کەسێك لەئانوساتی خۆیدا ئاگادار بکرێتەوە.

Heins Holdack, was wirklieh geschah, 1949, p. 378.

91. ئەم شیتەڵکارییە زۆر نزیکە لە شیکردنەوەکەی جۆرج سیمڵ "سۆسیۆلۆجیای نهێنیو کۆمەڵە نهێنییەکان، لە گۆڤاری سۆسیۆلۆجیای ئەمریکا، جلدی چوارەم، کانونی دوەم/ 1906، بەشی پێنجەم لە کتێبی سۆسیۆلۆجیا، لایپزیگ، 1908،و کۆرت ھ. وۆڵف ھەڵبژاردەیەکی بەناونیشانی "سۆسیۆلۆجیا لەلای جۆرج سیمڵ، 1950، لێوەرگێراوە.

92. لەبەر ئەوەی پلە نزمەکانی کۆمەڵگەی نهێنی، رۆڵی نێوەنجی لە سەنتەری کۆمەڵگەی ناوبراو وازیدەکەن، بۆیە پلە نزمەکانی چواردەوری پلە نێوەندییەکان، گوشارێکی لەسەرخۆی ئەوتۆ دروستدەکەن کە دەسەڵاتی لە دابینکردنی ئاسایشدا لەھەر جۆرە گاردێکی جیگیر لە ناوەوەو لە دەرەوە زیاترە. (ھەمان سەرچاوە، ل89).

93ـ دەستەواژەی "برا سوێندخۆرەکان"، "ھاورێ سوێندخۆرەکان"و "کۆمەڵە سوێندخۆرەکان"و ھتد، لە ئەدەبیاتی نازیدا تا ئاستی بێزاربون، دوبارە دەبونەوە، ئەوەش بە ھۆی ئەو کێشەی لەسەر رۆمانسییەتی لاوان پیادەی دەکرد، ئەو کێشەی لەنێو بزوتنەوەی لاوانی ئەڵمانیا برەوی ھەبو. ھیملەر بە شێوازێکی زۆر وردبینانەتر ئەو دەستەواژانەی بەکارھێناو کردی بە چەقی "بریاری نێوەندی" دەستەی پاراستن. "بەمشێوەیە بەپێی یاساگەلێکی نەگۆڕ کە سیستمی ناسیونال سۆسیالیستی وایکینگەکانی لەسەر دامەزراوەو وەك کۆمەڵە سوێندخۆرەکان لە پاراستنی نهێنیدا کە بە مانای دژایەتی کردنی رەھای ئەوانی دی دێت، بەیەك ریز بەرەو دوارۆژ ھەنگاو دەنێین. (بڕوانە دالکوێن، سەرچاوەی پێشو). "ئەو دەمەی 1 تا 5ر1 ملیار مرۆڤ لەدژی ئێمەی میللەتی جێرمانی، ریز دەبەستن "، بڕوانە وتەکەی ھیملەر لە کۆبونەوەی ئەفسەرانی دەستەی پاراستن لە پۆزن، 4/ تشرینی یەکەم/ 1943، پیلانگێری نازی، جلدی پێنجەم، ل558.

94. سیمڵ، سەرچاوەی پێشو، ل490. ئەم پرەنسیپە وەك زۆرێك پرەنسیپی دی لەدوای ئەوەی مانای "پرۆتۆکۆڵەکانی پیرانی زایۆن" خوێندنەوەیەکی وردی بۆ کرا، لەلایەن نازییەکانیشەوە پیشتی پێبەسترا. بۆیە ھەر لەم ناوکۆیەدا ھیتلەر لە ساڵی 1922 رایگەیاند: "برادەرانی راست" ھەرگیز لەوە تێنەگەیشتون کە زەروری نیە مرۆڤ دوژمنی یەھود بێت تا رۆژێك لە رۆژان بەرەو تابوت پەلکێش بکرێ بەڵکو تەنھا یەھودی نەبوون بەسە بۆ ئەوەی تابوت دابین بکات (گوتارەکانی ھیتلەر، ل12). لەو دەمەدا، ھیچ کەسێك نەیدەتوانی مانای واقیعی ئەم فۆرمە تایبەتەی ئەو پروپاگەندەیە بەمجۆرە بخەملێنێت: رۆژێك دێت پێویست ناکات ئەو کەسەی بەرەو تابوت پەلکێش دەکرێ، دوژمنی ئێمە بێت، بەڵکە بەتەنھا یەھودی بوون بەسە یا لەدواجاردا، تەنھا ئەوەندە بەسە کە سەر بەمیللەتێکی دی بێت، بۆ ئەوەی لەلایەن لیژنەی تەندروستییەوە وەك رەگەزی ناشایستە بەژیان بە قەڵەم بدرێ. بەڵام ھیملەر بەراستی لەو باوەڕەدا بو کە ھەمو رێکخستنەکانی دەستەی پاراستن لەسەر ئەم پرەنسیپە دروست بوە:

"پێویسته بهشهرهف و بهدڵسۆزیو گیانی هاوڕێیهتیهوه کار لهگهڵ هاوخوێنهکانی خۆماندا بکهینو دوژمنایهتی ئهوانی دی بکهین" (سهرچاوهی پێشو).

95. بڕوانه سیمڵ، سهرچاوهی پێشو، ل480. 481.

96. سۆڤارین، سهرچاوهی پێشو، ل319، سهرلهنوێ دارشتهکهی بۆخارین دادهرێژێتهوه.

97ـ بڕوانه سۆڤارین، سهرچاوهی پێشو، ل113، ستالین ههمیشه ئهو کهسانهی بهدڵ بو که له "لێدانێک"دا سهرکهوتو دهبون، چونکه پێیوابو سیاسهتیش وهك "لێدان" پێویستی بههرهو لێهاتویی ههیه.

98. لهسییهکانی سهدهی بیستهمدا، لهکاتی ململانێو کێشمهکێشی ناوخۆی حیزب، "هاوکارانی پۆلیسی نهێنی سۆڤێت، بێئهوهی کهسیان ئاوارته بکرێ، بهدوژمنی سهرسهختی ڕاستو لایهنگری ستالین دهژمێردران. کهواته، لهودهمهدا، ههمو دهزگاکانی پۆلیسی نهێنی پشتو پهنای ستالین بون"، (سیلیگا، سهرچاوهی پێشو، ل48). سۆڤارین لههمان کتێبو لهلاپهڕهی 289دا دهڵێت؛ ستالین بهردهوام بو لهسهر ئهو چالاکییه پۆلیسیانهی له کاتی جهنگی ناوخۆوه دهستی پێکردبو"، ههروهها نوێنهرایهتی مهکتهبی سیاسیشی دهکرد لهناو پۆلیسی نهێنیدا.

99. ڕاستهوخۆ لهدوای کۆتایی هاتنی شهڕی ناوخۆ، پراڤدا بڵاویکردهوه که فۆرمۆلهی " ههمو دهسهڵات بۆ سۆڤێتهکان" گۆڕاوه به فۆرمۆلهی "ههمو دهسهڵات بۆ چیکا، واته پۆلیس" دهسهڵاتی سوپاش به کۆتایی هاتنی کردهوه دوژمنکارهکان کهمبووه... بهڵام پۆلیس بهلقه جۆراوجۆرهکانیهوه مایهوه که بهسادهکردنی چالاکییهکانی، کارهکانی تۆکمه دهکرد". سۆڤارین، سهرچاوهی پێشو، ل251.

100ـ گۆرینگ سالی 1933 گهستاپۆی دامهزراند، لهسالی 1934یشدا هیملهری فهرماندهی دهستهی پاراستن، کرا به سهرۆکی گهستاپۆ، ئهویش دهستوبرد کهوته دانانی پیاوانی دهستهی پاراستن له شوێنی کارمهندانی گهستاپۆ، بهجۆرێك له کۆتایی ساڵهکانی جهنگدا له 75٪ کارمهندانی گهستاپۆ له پیاوانی دهستهی پاراستن بون. دهبێ ئهوهش بزانرێت که کارمهندانی دهستهی پاراستن ههروهکو چۆن هیملهر ڕێکیخستبون، تهنانهت لهپێشئهوهی بزوتنهوهش دهسهڵات بگرێته دهست، به مهبهستی سیخوری کردن بهسهر ئهندامانی حیزبهوه پهروهرده کرابون. (هایدن، سهرچاوهی پێشو، ل308)، بۆ زانینی گهستاپۆ، بڕوانه جێلز، سهرچاوهی پێشو، پیلانگێڕی نازی، جلدی دوهم، بهشی دوازدهههم.

101. ڕهنگه یهکێك له ههڵه ئایدیۆلۆجیا یهکلاکهرهوهکانی ڕۆزنبۆرگ که بوه مایهی ئهوهی نزیکایهتی لهگهڵ هیتلهرو دهسهڵاتی له نێو بزوتنهوه لهدهست بداتو خهڵکانی لهبابهت هیملهرو بۆرمانو تهنانهت سترایشهر . یش جێگهی بگرنهوه، ئهوه بو له کتێبی "ئهفسانهی سهدهی بیستهم" دا جگه له یههود، جۆرێك له فره ڕهگهزی پێقبوڵ بو. چونکه بهو کارهی ئهو

پرەنسیپەی پێشێل کردبو کە پێیوایە، ئەوەی لەنێو "میللەتی جێرمانی" نەبێت، دەرکراوی "هەمو قەوارەیەکی مرۆڤایەتیشە"، بڕوانە تێبینی ژمارە 87.

102- سیمن، سەرچاوەی پێشو، ل492، ئەو کۆمەڵە نهێنیە تاوانبارانە دەژمێرێت کە ئەندامەکانی خۆبەخشانە، سەرۆکێك بۆ خۆیان دەست نیشاندەکەن، پاشان بەبێ هیچ نارەزایی و رەخنەیەك ملکەچی دەبن.

103- سیلیگا، سەرچاوەی پێشو، ل96- 97، وەسفی ئەوە دەکات کە چۆن لەدەیەی بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، تەنانەت زیندانیە ئاساییەکانی لیژنەی میللی کاروباری ناوخۆ، "بێئەوەی وشەیەکی نارەزایی دەربڕن یا هاوارێك بکەن لەدژی ئەو حکومەتەی لەسێدارەی دەدان"، بەرەو شوێنی مردن پەلکێش دەکران. ل183

104. سیلیگا دەیگێڕێتەوە، ئەندامانی حیزبی بۆلشەفیك، ئەوانەی حوکمی مردنیان بەسەرا درابو "پێیان وابو ئەگەر لە سێدارەدانیان سەرلەبەری دیکتاتۆری بیرۆکراسی رزگار دەکات، ئەگەر لە سێدارەدانیان جوتیارە راپەریوەکان هێور دەکاتەوە (یا راستترە بڵێین فریویان دەدا)، ئەوا گیان بەختکردنیان بەفیڕۆ ناڕوات" (هەمان سەرچاوەی پێشو، ل 96. 97).

105- دیدوبۆچونی گۆبلز دەربارەی رۆڵی دیپلۆماتیك لەم بارەیەوە زۆر دیارو جیاکارە، "گومانی تیانیە کە بێئاگاکردنی دیپلۆماتەکان لە روداوی پشت پەردەوە، دەبێتە مایەی ئەوەی بە باشترین شێوە کارەکانی سەرشانیان ئەنجام بدەن... بەجێهێنانی رۆڵی هێورکردنەوەو ئاشتکردنەوە لەلایەن دیپلۆماتەکانەوە، قانعترین بەڵگەیە لەسەر راستگۆیی سیاسیان. (هەمان سەرچاوە، ل87).

106. لێوانێکی رادیۆیی رۆدۆلف هیس، ساڵی 1934، پیلانگێری نازی، جلدی یەکەم، ل193

107- ورنەر بیست لە سەرچاوەی پێشودا، مشێوەیە قسە لەسەر کارەکە دەکات: "ئایا ئیدارەی حکومەت رێسای عادیلانە دادەنێت یا نا... ئیدی ئەم کارە مەسەلەی هەق تێدەپەڕێنێت و دەبێتە مەسەلەیەکی چارەنوسساز. چونکە پێشێلکاری واقیعەکان.. بەدڵنیاییەوە مێژوو سزای دەدا تا دادگای نێو دەوڵەتی سزای لەسەر بدات، چارەنوسی ئەو کەسانەش کە یاسای ژیانیان پێشێلکردوە، بەدبەختی سەرنگونی و وێرانی دەبێت "

108. بڕوانە کراڤچینکۆ، سەرچاوەی پێشو، ل422. "کاتێك حیزب بە ئاشکرا بانگەشەی سیاسەتێکی دیاریکراو دەکات و بە پەنهانیش لەدژی ئەو سیاسەتە کار دەکات، هیچ کۆمۆنیستێکی تەڵقیندراو هەرگیز هەست ناکات حیزب درۆ دەکات"

109- "ناسیونال سوسیالیست رقی لە هاوڵاتیانی ئەڵمانی دەبێتەوە، ئەندامی یەکەی هێرش رقی لەناسیونال سۆسیالیستێکی ئاسایی دەبێتەوەو دەستەی پاراستن رقی لەیەکەی هێرش دەبێتەوە" (هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل308).

110ـ سەرەتا هیملەر پاڵیوراوەکانی لەسەر وێنەی فۆتۆگراف هەڵدەبژارد. پاشان دەبوایە پاڵێوراوەکە لەبەردەم لیژنەیەکی رەگەزی ئامادەبێت بۆ ئەوەی رووی رەگەزی قبوڵ یا رەتبکاتەوە. بڕوانە هیملەر دەربارەی "رێکخستن و ئەرکی دەستەی پاراستن و پۆلیس"، پیلانگێری نازی، جلدی پێنجەم، ل616.

111. هیملەر بە باشی لەوە بەئاگابو کە یەکێك لە گرنگترین و پایەدارترین دەسکەوتەکانی، گۆڕینی مەسەلەی رەگەزی بو لە "چەمکێکی نێگەتیڤەوە کە لەسەر دژایەتیکردنی سامیزم بونیات نرابو" بۆ "ئەرکی رێکخستن بە مەبەستی پاڵپشتی کردنی دەستەی پاراستن" لەپێناوی ئەوەی هێزی پۆلیس بۆ ئەرکی تایبەت بەکاربهێنێت.

**Der Reichsfuhrer S.S und chef der Dentschen, polizei**

بەمشێوەیە بۆ یەکەمجار مەسەلەی رەگەز پێگەی نێوەندی وەرگرت، یا راستترە بڵێین بو بەخودی نێوەند، بەجۆرێك ئەو چەمکە نێگەتیڤەی تێپەڕاند کە خۆی لەرق لێبونەوەیەکی سروشتی بەرامبەر بەیەهود دەنواند. بەمجۆرەش ئایدیای فوهرەر تێکەڵ بە خوێنێکی گەرمی ژیان بو"

**Der megder S.S Der Reichsfuhrer S.S. S.S Hauptant – Schulungsamt.**، بۆ بڵاوکردنەوە نیە، ل25.

112ـ کاتێك هیملەر لەساڵی 1929 بوە فەرماندەی دەستەی پاراستن، پرەنسیپی هەڵبژاردنی رەگەزی و یاسای هاوسەرێتی گەڵاڵە کردو ئەوەشی خستەپاڵ: "ئەندامانی دەستەی پاراستن بە باشی دەزانن کە ئەم سیستەمە گرنگییەکی مەزنی هەیە. گاڵتەجاری و قەشمەری کردن و بەدحاڵی بون، پێمانەوە نانوسێت، چونکە دوارۆژ بۆ ئێمەیە"

**Quoted from d'Alquen. Op. cit.**

هیملەر لەدوای چواردە ساڵ لە وتەیەکیدا لە خارکۆف (پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل572)، وەبیر ئەفسەرانی دەستەی پاراستنی دەهێنێتەوەو پێیان دەڵێت: "ئێمە یەکەم کەس بوین مەسەلەی خوێنمان بەکردەوە چارەسەر کرد، هەڵبەتە مەبەستی ئێمە لە مەسەلەی خوێن دژایەتی کردنی یەهود نیە. دژایەتیکردنی یەهود رێك لەفلیقانەوەی ئەسپێ دەچێت. مەسەلەی خۆپاککردنەوە لە ئەسپێ، مەسەلەیەکی ئایدیۆلۆجیا نیە، بەڵکو مەسەلەی پاك و خاوێنیە... بەڵام سەبارەت بە ئێمە، مەسەلەی خوێن بەهای تایبەتی خۆمان وەبیردەهێنێتەوە، ئەو بناغە واقیعییەمان وەبیردەهێنێتەوە کە میللەتی ئەڵمانیا یەکدەخات.

113. هیملەر، سەرچاوەی پێشو، پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل 616.

114. وتەکەی هیملەر لە پۆزن، پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل558.

هەر کاتێك بزوتنەوەیەك لە وڵاتێکدا دەسەڵات بگرێتەدەست، ئیدی ئەو بزوتنەوەیە چ رێکخستنێکی نێونەتەوەیی هەبێت، یا لە ئامانجی ئایدیۆلۆجیدا جهانیو لە تێڕوانینی سیاسیدا گەردونی بێت، پێگەکەی بەرەو ناکۆکییەکی ئاشکرای دەبات. بزوتنەوەی سۆسیالیستی دەیتوانی خۆی لە قەیرانێکی لەو جۆرە بەدوور بگرێت، مادامەکی مەسەلەی نیشتمانی . واتە ئەو مەسەلە ستراتیجییەی شۆڕشێك دەیسەپێنێت . لەلایەن مارکسو ئەنگلسەوە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر فەرامۆش کرابو، لەلایەکی دی، کاتێك بزوتنەوە روبەروی مەسەلەی حوکمڕانی بوەوە کە جەنگی جهانی یەکەم دەسەڵاتی نێونەتەوەیی دوەمی بەسەر لقە نەتەوەییەکانیدا نەهێشتبو، هەروەها باڵاکردنی هەستی نەتەوایەتی بەسەر هاوکاری نێونەتەوەییدا وەك واقعێکی نەگۆڕ پێقبوڵ بو. بە گوزارشێکی دی، کاتێك بزوتنەوە سۆسیالیستەکان دەرفەتی ئەوەیان بۆ رەخسا لە وڵاتەکەی خۆیان دەسەڵات بگرنەدەست، ئیدی بەحیزبی نەتەوەیی گۆڕدران.

ئەم گۆڕانە هەرگیز بزوتنەوەی تۆتالیتاری بۆلشەفیزمو نازیزمی نەگرتەوە. چونکە کاتێك ئەو دوو بزوتنەوەیە دەسەڵاتیان گرتەدەست، ئەومەترسییەی هەڕەشەی لێیان دەکرد لەم دوو شتەدا خۆی دەنواند: لەلایەکەوە ئەوەندەی دەزگای دەوڵەتیان گرتەدەست، خەریك بو فۆرمی حکومەتێکی چەقبەستویان وەردەگرت[1]، لەلایەکی دی، ئەگەری ئەوەش هەبو کە ئازادی جوڵەی ئەو دوو بزوتنەوەیە لە سنوری ئەو دوو وڵاتەی دەسەڵاتیان تیا گرتۆتەدەست، سنوردار بکرێت. ئەو دوو مەترسییە بۆ بزوتنەوەیەکی تۆتالیتاری یەکسانە بە مردن: گۆڕان بەرەو رەهاگەری رەنگە سنورێك بۆئەنگیزەو هاندانی ناوەوەی بزوتنەوە دابنێت، ئەمە لە کاتێکدا گۆڕان بە ئاراستەی ناسیونالیزم رەنگە بەربەستێك

لەبەردەم پەلهاویشتنی بزوتنەوە بەرەو دەرەوە دروستبکات کە بزوتنەوەی تۆتالیتاری بەبێ ئەو پەلهاویشتنە ناتوانێت درێژە بە بەردەوامی ژیانی خۆی بدات. ئەگەر تەماشای فۆرمی حوکمڕانی بکەین کە لەم دوو بزوتنەوەیە سەرهەڵدەدا، یا راستتر، خۆبەخۆ لە بانگەشەکانی بالادەستی کاملّو لە سیستمی جهانی یەکگرتوی ئەو بزوتنەوانە سەرچاوەدەگرێ، دروشمەکەی تروتسکی "شۆڕشی بەردەوام" گونجاوترین دروشمە کە بەرجەستەی ئەو بانگەشانە بکات، هەرچەندە تیورەکەی تروتسکی تەنها پێشبینییەکی سۆسیالیستی بو لە شێوەی زنجیرەیەك شۆڕشی یەك لەدوای یەك، هەر لە شۆڕشی بۆرجوازی لەدژی دەرەبەگایەتییەوە تا شۆڕشی پرۆلیتاریا لەدژی بۆرجوازییەت، لە ئاسۆی دوارۆژێکی دووردا، دەرفەتی گۆڕان دەرەخسێنێ، پرۆسەیەك دەبێت لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دی گەشەبکات تا سەرتاسەری جهان دەگرێتەوە[2] خودی دروشمەکەی تروتسکی، بەدەر لەناوەرۆکەی تیۆرییەکەی و لەگەڵ گشت گرەنتیە نیمچە ئانارچیستەکانی، بە مانای "بەردەوامی شۆڕشەکان" دێت، لە واقیعدا جگە لە ناوێك شتێکی دی نەبو، کەچی لینین زیاتر دارشتەی زاراوەکەی بەدڵ بو تا ئەوەی ناوەرۆکە تیورەکەی پەسەندبکات. لە راستیدا شۆڕشەکانی یەکێتی سۆڤێت، لە سایەی رژێمی ستالیندا، لەدوای سالّی 1934، بە تایبەتی لە سایەی هەڵمەتەکانی پاکتاوکردندا شێوەی دەزگایەکی هەمیشەیی وەرگرتبو[3] ئیدی لێرە بەدواوە، ستالین لە هەمو بۆنەیەکدا، پەلامارەکانی بۆ سەر دروشمە نیوە لەیادچوەکانی تروتسکی خەستتر دەکردەوە، چونکە خودی ستالین بریاریدابو سود لە هەمان تەکنیك وەربگرێت[4] لە ئەڵمانیای نازیشدا بەئاشکرا ئارەزویەکی لەو چەشنە هەستی پێدەکرا، هەرچەندە نازییەکان بە هەمان رادە دەرفەتی پێویستیان بۆ پیادەکردنی ئەمجۆرە شۆڕشە لەبەردەستدا نەبو. ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنجراکێشانە، شۆڕشی بەردەوام لە ئەڵمانیا لەگەڵ پاکتاوکردنی باڵی حیزبی نازی دەستپێکرد کە ئازایەتی نواند "قۆناغی دوای شۆڕش"[5] بە

ئاشكرا رابگەیەنێت، ئەمە لە كاتێكدا "پێشەواو گاردە دێرینەكەی بە تەواوەتی دەیانزانی هەنوكە نەبەردی راستەقینە هەڵایساوە"(6) لێرە بەدواوە لەجیاتی چەمكی شۆڕشی بۆلشەفیكی، چەمكی "هەڵبژاردنی نەژادی بێبەزەییانە" بەدیدەكەین كە بە ریشەتركردنی پێوەری هەڵبژاردنی نەژادی بەدوادادێت، واتە لەناوبردنی ئەو نەژاد نزمانەی ئەو پێوەرانەیان بەسەرا پیادەنابێت(7) ئەوەی شایانی ئامارژە بۆ كردنە هەر یەك لە ستالین و هیتلەر بەڵێنی سەقامگیركردنی بارودۆخەكەیان دەدا، لە پێناوی ئەوەی نیازی خۆیان دەربارەی ئەفراندنی حاڵەتێكی شلۆق و ناجیگیری بەردەوام بشارنەوە.

بەرامبەر بە زەحمەتی و دژوارییەكانی پێكەوە هەڵكردنی دەوڵەت و بزوتنەوە، بەرامبەر بە بانگەشەی تۆتالیتاری لەگەڵ دەسەڵاتی سنوردار لە وڵاتێكی سنور دیاریكراودا، لە روبەروبونەوەی ئەندامێتی رووكەشی لە بۆتەی نەتەوەكاندا كە هەر نەتەوەیەك رێزی سەروەری ئەوی دی و تێڕوانینی لە فەرمانڕوایی كردنی جهاندا بگرێت، جگە لەم فۆرمۆڵە بێناوەرۆكە رێگە چارەسەرێكی دی باشتر نەبو. پێویستە رێبەری تۆتالیتاری ئەركێكی دوانەیی ئەنجامبدات كە لە یەكەم تێروانیندا تا رادەی پوچی ناكۆكئامێز دەردەكەوێت، چونكە لە لایەكەوە، دەبێ واقعێكی هەستپێكراو و ئەركێكی جیاكار لە ژیانی رۆژانە بە جهانی ساختەیی بزوتنەوە ببەخشێت، لەلایەكی دی، پێویستە رێگە لە ئەفراندنی هەرجۆرە سەقامگیرییەكی نوێ لەم جهانە نوێیە بگرێت. لەبەر ئەوەی كاركردن بۆ سەقامگیركردنی یاسا و دەزگاكانی، بەدڵنیاییەوە خودی بزوتنەوەو هیوای داگیركردنی سەرتاپای جهان بەرەو لەناوچون دەبات. بۆیە پێویستە لەسەر رێبەری تۆتالیتاری بە هەر بەهایەك بوە رێگە نەدات ئاسایی بونەوەی بارودۆخەكە بگاتە ئاستێك شێوە ژیانێكی نوێ جێگیر بێت شێوەیەكی نوێ كە بە تێپەربونی كات سیمای ناڕەوایەتی خۆی لە دەستدەداو لەنێو تێكرای شێوە جیاوازو ناكۆكەكانی ژیانی نەتەوەكانی سەر رووی زەمین شوێنێك بۆ خۆی پەیدا بكات. لەو ساتەوەختەی دەزگا شۆڕشگێڕەكان دەبێتە

یــەکێك لــە شــێوەکانی ژیــانی نەتــەوەیی (لــەو ســاتەوەختەی هیتلــەر دووپاتیدەکردەوە کە نازیزم "کالآیەکی هاوردە نیە"و ستالینیش دامەزراندنی سۆســیالیزمی لــە تاکــە ولآتێکــدا پــشتڕاستدەکردەوە، لــە راســتیدا ئــەم جەختکردنەوەو پشتڕاستکردنەوەیە زیاد لە هەوڵێك بو بە مەبەستی فریودانی جهـانی ناتۆتالیتـاری)، تۆتالیتـاریزمیش سـیمای "گـشتگیری" لەدەسـتدەدا. ئەمەش یاسای پەیوەندی نێوان نەتەوەکان راڤەدەکات، بەپێی ئەو یاسایە هەر نەتەوەیـەك سـەرزەمین‌و میللـەت‌و نـەریتی مێـژویی تایبـەت بەخۆی هەیـەو لـە نەتـەوەکانی دی نزیـك دەخاتـەوە . ئەم فرەییـە . پلورالیزم . لە رێگـەی هێـزی بوونیـەوە، لێکۆڵینـەوەو مـشتومڕ دەربـارەی بایـەخ‌و متمانـەی رەهـای هـەر فۆرمێکی تایبەت لە حوکمڕانی بەکردەوە رەتدەکاتەوە.

ناکۆکی تۆتالیتاریزم لەسەر کورسی دەسەلآت، لەو پانتاییە پراکتیکەی جوڵـەی تیادەکـات لەوەدایـە کـە خاوەنـدارێتی هـەمو ئامرازەکـانی دەسـەلآت‌و توندوتیژی لە ولآتێکدا، خەسڵەتێکی رەهای نیە. سوکایەتی کردنی بزوتنـەوە بە واقیع‌و لایـەنگیری سەرسەختانەی لـە یاسـای جهـانێکی سـاختە، دوو ئەرکە زۆر بـە زەحمـەت دەتـوانرێ تـا سـەر پاریزگـاری لێبکرێـت، چـونکە جەوهـەری هەنوکـەن، هـەروەکو چـۆن جەوهـەری دوێنـێش بـون. لەبەرئـەوەی دەسـەلآت لـە حکومەتی تۆتالیتاریدا بەمانای روبەروی واقیع دێت، بۆیـە دەبی تۆتالیتـاریزم لە دەسەلآتدا ئەم روبەروبونەوەیە بۆ رەنگاربونەوەیەکی بـەردەوام بەرزبکاتـەوە. بەلآم پروپاگەندەو رێکخستن هەرگیز بەس نیە بۆ ئەوەی بانگەشەی ئەوە بکرێ کە مەحاڵ لە تواناداية، باوەرنـەکردەنی حەقیقەتـەو لـۆجیکێکی سەرشێتانەش بەسەر جهاندا بالآدەستە. کۆڵەکەی سەرەکی دەرونی لە ئەفسانەی تۆتالیتاریدا کـە گرنگییـەگی زۆری هەیـە . بێزاری زۆر لـە بـارودۆخی بـاو، واتـە هـەمان ئـەو شتەی کە جـەماوەر وەك تاکـە جهـانی مومکین رەتیدەکاتـەوە . چیدی لـە ئارادا نیـە. هـەر جـۆرە زانیارییـەکی ناچـیز، بـەلآم واقیعـی کـە لـە درزی پـەردەیـەکی ئاسنینەوە دزە دەکـات، پەردەیـەك هـەر لـە بنەرەتـەوە بـۆ ئـەوە دروسـتکراوە تـا

بەربەستێکی بە هێز لەبەردەم لێشاوی واقعێکی هەڕەشەکەر پێکبهێنێت، کە زۆرجار لە کەنارێکی دیپیەوە دێت، واتە کەناری جهانی ناتۆتالیتاری، هەڕەشەیەك لەدژی بالادەستی تۆتالیتاریزم پێکدەهێنێت زۆر لە مەترسی پروپاگەندەی چەواشە توندترو بە بەلاترە.

هەوڵ و کۆشش لە پێناوی بالادەستی گشتگیر بەسەر هەمو میللەتانی سەر زەمین و راماڵینی هەمو واقیعێکی ناتۆتالیتاری پێشبڕکێکار، لە ناخی رژێمی تۆتالیتاریدا خۆی متکردوە، بۆیە ئەگەر ئەو رژێمانە فەرمانڕەوایی جهان نەکەن بە دوائامانجیان، ئەگەرێکی زۆر بەهێز هەیە، ئەوەی بەدەستیان هێناوە لە دەستی بدەن. بە هەر حاڵ تەنها لەلایەن دەسەڵاتی رژێمی تۆتالیتارییەوە کە دەستی بەسەر جهاندا بگرتبێت، دەتوانرێ تاکی گۆشەگیر بەتەواوەتی و بەرەهایی دەستەمۆ بکرێت. لەم رووەوە هەوڵی بزوتنەوەی تۆتالیتاری بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە وڵاتێکدا دەبێ بەپلەی یەکەم، سەرکردایەتییەکی گشتی (یا لقەکانی لە وڵاتانی پاشکۆی بزوتنەوە) بەرەسمی دامەزرێنێت یا بەرەسمی دانیپیابنرێت، بەدەستهێنانی جۆرە تاقیگەیەك بۆ ئەوەی بزوتنەوە بتوانێت لەسەر واقیع و لەدژی واقیع درێژە بە تاقیکردنەوەکانی بدات و خەڵکی بەپێی دوا ئامانجخوازی بزوتنەوە رێکبخات کە تاك و میللەت لەبەرچاو ناگرێت، هەرچەندە لەم زەمەندا هەلومەرجی بەدیهاتنی تۆتالیتاریزم بەگوێرەی پێویست کامڵ نیە، بەڵام بە رادەیەك لەبارە کە دەرئەنجامێکی هەندەکی گرنگ بەدەست بهێنرێ. دەسەڵاتی تۆتالیتاری بۆ ئەوەی لە دەست بەسەراگرتنی جهان و لە ئاراستەکردنی لقەکانی دەرەوەی بزوتنەوە سەرکەوتو بێت، دەبێ ئیدارە بۆ گەیشتن بە ئامانجە دوور مەوداکانی بەکاربهێنێت: بۆ ئەمەش پۆلیسی نهێنی دادەمەزرێنێت تا هەوڵە ناوخۆکانی پێ جێبەجێ بکات کە بە بەردەوامی و بەدڵنیایی واقیع بە ئەفسانە بگۆڕێت و پاریزگاری لێبکات، سەرئەنجام ئۆردوگای زۆرەملێ وەك تاقیگەیەك بۆ تاقیکردنەوەی پراکتیکی بالادەستی گشتگیر دادەمەزرێنێت.

## 1. دەوڵەتی تۆتالیتاری

مێژوو فێرمان دەکات کە گەیشتن بە دەسەڵاتو بەرپرسیارێتی، سروشتی حیزبە شۆڕشگێرەکان بە قووڵی دەگۆڕێت. ئەزمونو عەقلی دروست گرەنتیەکە خەڵکی والێدەکات پێشبینی ئەوە بکەن کە تۆتالیتاریزم لە دەسەڵاتدا هێدی هێدی پەرۆشی شۆڕشگێری لە دەست دەداو لە خەسڵەتە تۆباوییە سەرەتاییەکانی دوور دەکەوێتەوە: کاری ڕۆژانەی حکومەتو پیادەکردنی دەسەڵاتی واقیعی، بانگەشەکانی پێش بەدەسەڵات گەیشتن بزوتنەوە رووتوش دەکاتو جهانی ئەفسانەی ڕێکخستنەکانیان هێدی هێدی لەنێودەبات. سەرئەنجام بەحوکمی سروشتی کارەکان ئیدی چ گشتی بێت یا تایبەتی وادەخوازێت پێداویستیو ئامانجە رادیکاڵەکان بە هەلومەرجی بابەتی پارسەنگ بدرێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا، واقیعیەت بە مانای وشە بایەخێکی ناچیزی لەلایەن کۆمەڵگەی ئەتۆمییەوە پێدەدرێت، ئەو کۆمەڵگەیەی ئارەزوی ئەفسانەی تیایە باڵادەستە.

شتێکی ئاشکرایە کە زۆرێک لە هەڵەی جهانی ناتۆتالیتاری لەبواری پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ حکومەتە تۆتالیتارەکاندا (دیارترین جۆری ئەم هەڵانە متمانەی جهانی ناتۆتالیتاری بو بە پەیماننامەی میونیخ لەگەڵ هیتلەرو ڕێکەوتننامەی یالتا لەگەڵ ستالین بو)، لە ئەزمونو عەقلێکی دروستەوە سەرچاوە دەگرێ کە لەناکاو پەیوەندی بە واقیعەوە لەدەستدا. بە پێچەوانەی ئومێدی هێندێك کەس، ئەو دەستبەرداربونە بەرامبەر دەوڵەتە تۆتالیتارەکان سەرکەوتنی بەدەست نەهێناو گەشەکردنی دەسەڵاتی نێودەوڵەتیشیان کۆمەکی بەو دەوڵەتە تۆتالیتارانە نەکرد بچنە بۆتەی نیونەتەوەییەوەو وازیان لەو سکاڵا درۆزنانەیەش نەهێنا کە پێیوایە سەرتاسەری جهان لەدژیان یەکریزی بەستوە. لە راستیدا ئەو نەرمی نواندنە نەك تەنها ئەو دەوڵەتانەی پاشگەز نەکردەوە، بەڵکو سەرکەوتنە دیپلۆماسیەکان ئارەزوی پەنابردن بۆ

ئامرازی توندوتیژی لەلای ئەو دەوڵەتانە دوو هێندەتر کردو بوە مایەی زیاتر دژایەتیکردنی ئەو هێزانەش کە خوازریار بون سازشیان لەگەڵدا بکەن.

نائومێدی سیاسەتمەدارو دیپلۆماتەکان سەردەمانێك پێش نائومێدی چاودێرە خێرخوازو لایەنگرانی حکومەتە شۆڕشگێڕە نوێیەکان کەوتبو. چونکە ئەوانە هەوڵیاندەدا دەزگای نوێو سیستمی یاسایەکی نوێ دامەزرێنن کە بە حوکمی ناوەرۆکە شۆڕشگێڕەکەی دەبووە مایەی جۆرە سەقامگیرییەكو بەوجۆرەش دەیتوانی جڵەوی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان بگرێت، بەلانیکەمەوە لەو وڵاتانەی دەسەڵاتیان تیا گرتۆتە دەست. بەڵام لەجیاتی ئەوە ئاستی توندوتیژی رووداوەکان لە یەکێتی سۆڤێتو ئەڵمانیای نازی، بەپێچەوانەوەی بوونی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی ناوخۆوە بەرز دەبووەوە، بەجۆرێك نەیاریی کردنی سیاسی وەك بەهانەی پیادەکردنی تیرۆر بەدیارنەدەکەت (هەروەکو رەخنەگرە لیبرالەکان خوویان بەسەلماندییەوە گرتبو)، بەڵکو دوا بەربەست بو لەبەردەم ئەوەی تیرۆر بەچڵەپۆپە بگات(8).

شێوازی رژێمە تۆتالیتارەکان لە چارەسەرکردنی مەسەلە یاساییەکاندا، زیاتر بوە مایەی دڵراوکێ. لە راستیدا نازییەکان لە ساڵانی یەکەمی دەسەڵاتیاندا، لێشاوێك یاساو فەرمانیان دەرکرد، بەڵام هەرگیز بیریان لەوە نەکردەوە بەرەسمی دەزگای "ڤایمار" هەڵوەشێننەوە. بەڵکو هێندێك لە ئیدارەیان وەك خۆی هێشتەوە، ئەمەش هێندێك چاودێری ناوخۆو بیانی ئومێدەوار کرد کە سنورێك بۆ چالاکی حیزب دابنرێتو پێشبینی خێرای ئاساییکردنەوەی سیستمی نوێش بکەن. بەڵام دەرکردنی یاسای نۆرمبۆرگ سنورێکی بۆ ئەم گۆڕانکارییە داناو دەرکەوت کە خودی نازییەکان هەرگیز بە مەسەلەی ئاساییبونەوە پەیوەست نەبون، بەلانیکەمەوە لەسەر ئاستی یاساکانی خۆشیاندا. نازییەکان بەجۆرێك بایەخیان بە: "هەنگاونانی جێگیرو نەگۆڕی بەردەوام بەرەو ئامانجی نوێ" دەدا کە "ئامانجی پۆلیسی نهێنی دەوڵەتو بواری کارکردنی" یا ئامانجی هەر دەزگایەکی دی دەوڵەتو حیزب کە خۆیان

دایانەمزراندبو، "بەهیچ شێوەیەك لە شێوەكان نەدەچوە چوارچێوەی ئەو یاساو بڕیارانەی كە لەپێناوی ئەم ئامانجە نوێیانەدا دارێژرابون"[9] تەنانەت ئەگەر مرۆڤ لەسەر ئاستی كردەوەش تەماشای بكات، دۆخێكی بێسەروبەرەیی لەم واقیعەدا بەدیدەكات كە "ژمارەیەك لە یاسا رەچاوكراوەكان رێگەی ئاشكرابون ناگرنەبەر"[10]. بەڵام لەسەر ئاستی تیۆری، ئەم نایاساییە لەگەڵ ئەو وتەیەی هیتلەر یەكدەگرێتەوە: "دەبێ دەوڵەتی تۆتالیتاری هەمو جیاوازییەك لە نێوان یاساو رێسای ئەخلاقی پشتگوێبخات"[11]، گریمان لەرووی پرەنسیپەوە یاسای رەچاوكراو هاوشێوەی رەوشتە گشتییەكانە، ئەو رەوشتەی هەمیشە لە ویژدانی كۆوە دەردەچێت، ئیدی پێویست ناكات لەرێگەی بڕیاری یاساییەوە ئاشكرا بكرێت. لە یەكێتی سۆڤێتدا ئیدارە مەدەنییەكانی پێش شۆڕش لە روداوەكانی شۆڕشدا لە نێوچون، بۆیە لە قۆناغی گۆڕانكاری شۆڕشگێڕانەدا هیچ گرنگییەكی بە مەسەلەی یاسایی نەدەدا، تەنانەت تا ئەو رادەیەی لە ساڵی 1936دا لە دەركردنی یاسایەكی زۆر بەرفراوان و گشتگیرو سەرتاپا نوێ، كەمتەرخەمی نەدەكرد (ئەوەش سەرپۆشێك بو لە رستەو پرەنسیپی لیبراڵی كە لە پشتی ژیانی سیاسەتی واقیعەوە دەخرایە بەر گیوتین ـ مقصلة . guillotine)[12]، ئەم كارەش روداوێك لە روسیاو لەدەرەوەی روسیا پشتیوانییەكی گەرمی لێكراو بە دوا قۆناغی شۆڕشگێری دانرا. لەگەڵ ئەوەشدا، دەركردنی ئەو یاسا نوێیانە نیشانەی دەستپێكردنی پاكتاوكردنێكی مەزن بو كە لە ماوەی نزیكەی دوو ساڵدا توانی ئیدارەی ئەو دەمە لە رەگوریشەوە هەڵكەنێت و شوێنەواری هەمو ژیانێكی ئاسایی بسڕێتەوەو ئەو گەشەكردنە ئابورییەی وڵاتیش لە ماوەی چوار ساڵی دوای لە نێوبردنی كوڵاك (یا جوتیاران و دەرەبەگە روسەكان، ئەوانەی روبەروی ریفۆرمی كۆمۆنیستی لە بواری كشتوكاڵداو داماڵینی موڵكایەتی بونەوە) و سەقامگیركردنی كاری بە كۆمەڵی زۆرەملێی گوندنیشینەكان بەدیهاتبو، لە ناوبەرێت[13]. لەو ساتەوەختەوە، یاسای ساڵی 1936 هەمان رۆڵی دەبینی كە یاسای ڤایمار لە سایەی نازییەتدا دەیبینی:

ئەم یاسایە لەگەڵ ئەوەی هیچ حیسابێکی کردەیی بۆ نەدەکرا، کەچی رژێم هەرگیز هەڵینەوەشاندەوە. ئەمە لە کاتێکدا تاکە جیاوازی نێوان ئەم دوو رژێمە بریتی بو لەوەی، ستالین هەنگاوێکی دزێوتری نا: جگە لە ڤیشینسکی Vishinsky هەمو ئەو کەسانەی وەك خائین لە سێدارەدا کە ئەو یاسایەیان دارشتبو.

بەدڵنیاییەوە ئەوەی چاودێری دەوڵەتێکی تۆتالیتار توشی سەرسوڕمان دەکات، تاك بونیادیی نیە. بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەمو لێکۆڵەرە جیدییەکان ئەم بابەتە بەلانیکەمەوە دەربارەی هاوژیانی (یا روبەروبونەوەی) دوو سەرچاوەی دەسەلاتی حیزب و دەوڵەت، هاودەنگییان هەیە. ئەمە لە کاتێکدا زۆرێك لە لێکۆڵیاران جەختیان لەسەر سیمای "بێشکڵی" حکومەتی تۆتالیتاری دەکردەوە[14]. تۆماس مازاریك Thomas Masaryk یەکەم کەس بو سەرنجی ئەوەیدا کە: "رژێمی بۆلشەفیك بەتەواوەتی رژێمی تیا بزر نەبو"[15]، هەروەها ئەوەش بە تەواوەتی دروستە: "تەنانەت ئەگەر پسپۆرێك لە رایخی سێیەمدا هەوڵبدات حیزب و دەوڵەت لەیەك جیابکاتەوە، ئەو کارەی بەرەو شێتی دەیبات"[16] زۆرجار دەوترێ پەیوەندی نێوان دوو سەرچاوەی دەسەلات، دەوڵەت و حیزب، لە هەمان پەیوەندی نێوان دەسەلاتی واقیعی و رووکەش پێکدێت، بەجۆرێك دەزگای حکومەت بەگشتی وەك رووکارێك وەسفدەکرێ کە دەسەلاتی واقیعی حیزب دەشارێتەوەو پاریزگاری لێدەکات[17].

لە سەردەمی رایخی سێیەمدا دەزگای ئیداری لە هەمو ئاستەکانی بواری خزمەتگوزاریدا توشی دوالیزم (ئیزدواجییەت) هاتیبو. نازییەکان بۆ ئەوەی بالادەستی تەواو بەسەر دەزگای دەوڵەتدا مسۆگەر بکەن، زۆر بە وردی هەوڵیان دەدا بۆ هەر ئەرکێك لە ئیدارەی دەوڵەت لە پاڵ فەرمانبەرە رەسمییەکەی دەوڵەت، ئەندامێکی حیزبیشی بۆ دابنێن و بۆ هەر دەزگایەکی دەوڵەت، ئۆرگانێکی حیزبی بۆ داتاشن[18] دابەشکردنی ئەڵمانیا بەپێی یاسای ڤایمار بۆ هەرێم و کەرت، دابەشکردنە نازییەکەیشی خرایە پاڵ کە لەسەر یەکەی شوێن دامەزرابو، زیاتر لە ناوچەشەوە . Gaue ـ نزیك بو: ئەگەر

سنوری ئەم دوو دابەشکردنە پێکەوە بەراورد بکرێن، ئنجا بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازی زۆریان هەیە، بەجۆرێك هەر ناوچەیەك لەم دابەشکردنە تەنانەت لە رووی جوگرافیشەوە، یەکەی ئیداری زۆر جیاوازتری لە دابەشکردنە ئیدارییەکەی ڤایمار تیا بەدیدەکرێت[19] لە سالّی 1933 ەوە، کاتێك کەسایەتیە ناودارەکانی حیزبی نازی وەزارەتە رەسمییەکانی دەولّەتیان پێرسپێردرا، دیسانەوە دەستبەرداری ئەو دوالیزمە وەزیفییە نەبون، بۆ نمونە کاتێك (فریك) بوە وەزیری ناوخۆ، ئۆگۆرتنریش (Guerthner) بوە وەزیری داد. ئەندامە دێرینو باوەڕپێکراوەکانی حیزب ئەو رۆژەی دەست بە چالاکی ناحیزبیو رەسمی دەکەن، دەسەلاّت لە دەستدەدەنو چەشنی فەرمانبەرانی دی رەسمی دەولّەت هیچ جۆرە دەسەلاّتێکیان نامێنێت. بۆیە ئەو دوو وەزیرەش کەوتنە ژێر دەسەلاّتی هیملەرەوە کە فەرماندەی پۆلیسی نهێنی بو، ئەمە لە کاتێکدا دەبوایە خودی هیملەر لەژێر دەسەلاّتی وەزیری ناوخۆ بێت[20] هەمو دەزانین لە دەرەوەی ئەلّمانیا چی بەسەر وەزارەتخانە کۆنەکەی ئەلّمانیا هات. نازییەکان دەستیان لە پێکهاتەی خزمەتگوزاری پێشوی وەزارەتی دەرەوە نەداو هەرگیز هەلّیاننەوەشاندەوە، سەرباری پالّپشتی نوسینگەی کاروباری دەرەوەی حیزب کە رۆزنبۆرگ سەرۆکایەتی دەکرد، ئەو نوسینگەیەی پێشئەوەی دەسەلاّت بگرنە دەست دایانمەزراندبو[21]. ئەم دەزگایە تایبەت بو بە پالّپشتیکردنی پەیوەندی لەگەلّ رێکخراوە فاشیستەکانی ئەورووپای رۆژهەلاّتو بالّکان، بۆیە نازییەکان رێکخراوێکی دییان دامەزراند کە پێشبڕکێی دەزگای وەزارەتی کاروباری دەرەوەیان پێدەکرد: نوسینگەی "رێبینترۆپ" لە ولاّتانی رۆژئاوا دەستێکی بالاّی بەسەر کاروباری دەرەوەدا هەبو، تەنانەت لە دوای گواستنەوەی سەرۆکەکەیو دامەزراندنی وەك بالّوێز لە ئینگلترا، واتە سەرباری تێکەلّبونی لە دەزگای رەسمی وەزارەتی کاروباری دەرەوە، کەچی لەسەر کارەکەی پێشوی هەر بەردەوام بو. سەرئەنجام، کاروباری دەرەوە، سەرباری ئەو دەزگایانە،

نوسینگەی هەواڵگری ئەڵمانیاشی بۆ زیادکرا کە ئەرکی "گفتوگۆی لەگەڵ گروپە ئەڵمانی رەگەزەکانی دانیمارك و نەرویج و بەلجیکا و هۆڵەندای"[22] پێسپێردرا. ئەم نمونە کۆنکریتیانە لەسەر دوانەیی دەزگاکان لەلای نازییەکان مەسەلەی پرەنسیپ بو، نەك ئامرازێکی رووت لە پێناوی دۆزینەوەی کار بۆ ئەندامەکانی حیزب.

لە راستیدا هەمان دابەشبون لە نێوان حکومەتی واقیعی و حکومەتی رووکەش لە روسیای سۆڤێتیشدا هەبو، ئەگەر چی لەسەر بنەمایەکی زۆر جیاوازتر بو[23]. حکومەتی رووکەش هەر لەسەرەتاوە گوزارشتی لەدەسەڵاتی کۆنگرەی سۆڤێتەکانی هەمو روسیا دەکرد کە لە کاتی شەڕی ناوخۆدا دەسەڵات و توانای بۆحیزبی بۆلشەفیکی بە جێهێشت. کەواتە، ئەم رێڕەوە کاتێك کەوتە سەر رێچکەی خۆی کە لەشکری سور سەربەخۆی وەرگرت و لە پاشکۆیەتی کۆنگرەی سۆڤێتەکان قورتاری بو، هەروەها کاتێك پۆلیسی نهێنی وەك ئۆرگانێکی حیزب نەك وەك ئۆرگانێکی وابەستە بە کۆنگرەی سۆڤێتەکانەوە چاوی پیاخشێنرایەوە[24]، سەرئەنجام لە ساڵی 1923دا، واتە ئەو ساڵەی ستالین ئەرکی سکرتێری گشتی پێسپێردرا، ئەو رێڕەوەش بە دوا رێچکەی خۆی گەیشت[25] دوا بەدوای ئەوەش سۆڤێتەکان بون بە حکومەتی سێبەر، ئیدی شانەکانی ئەندامانی حیزبی بۆلشەفیك وەك نوێنەرانی دەسەڵاتی راستەقینە کە لەلایەن کۆمیتەی نیوەندی لە مۆسکۆ دادەمەزارن و لە بەرامبەر هەمان کۆمیتەشدا بەرپرسیار بون، کەوتنە کارو چالاکی کردن. بەڵام خاڵی سەرەکی لەم دوا گۆڕانکارییەدا، حیزب ئەنجومەنی سۆڤێتەکانی داگیر نەکرد، بەڵکو ئەم فاکتە بو: "هەڵوەشاندنەوەی سۆڤێتەکان هیچ دژوارییەکی بۆ بۆلشەفیکەکان دروست نەدەکرد، بۆیە ئەنجومەنەکانیان هەڵنەوەشانەوە، بەڵکو وەك دەزگایەکی جوانکاری و هێمای دەسەڵاتیان بۆ جهانی دەرەوە سودییان لێیوەردەگرت"[26]

بەهەر حاڵ هاوژیانی نێوان حکومەتی رووکەش‌و حکومەتی راستەقینە ئاکامی خودی شۆڕش بو کە لەپێش دامەزراندنی دیکتاتۆرییەتی ستالینیشدا بوونی هەبو. نازییەکان دەزگا ئیدارییەکانیان وەك خۆی هێشتەوەو تەنها دەسەلاتیان لێسەندنەوە، بەلام ستالین حکومەتە شەبەنگییەکەی سەرلەنوێ زیندوکردەوە، چونکە ئەم حکومەتە لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمدا هەمو ئەرکەکانی خۆی لەدەستدابو، لەروسیاش نیمچە بیرچونەوەیەك بیرچوبووە. کەواتە لەسەر دەستی ستالین دەزگا سۆڤێتیەکان گۆڕا بە هێمای بوون (رمز الوجود)، هەروەکو چۆن هێمای بێدەسەلاتی سۆڤێتەکانیش بو. هیچ یەکێك لە برگەکانی ئەو یاسایە بایەخێکی کردەیی بۆ ژیان‌و یاسادانانی روسیا نەبو. لەبەر ئەوەی حکومەت بە تەواوەتی هەمو جیاکارییەکی لەدەستدابو کە بەشێوەیەکی ئاسایی نەریت (تقلید) پێیدەبەخشی، جیاکارییەك بۆ حکومەتی رووکەش زۆر پێویست بو، بۆیە ئەم حکومەتە بە لانیکەمەوە بە رووکەش پێویستی بە خەرمانەیەك یاسای نوسراوی پیرۆز هەبو. وریایی تۆتالیتاری بەرامبەر بە یاساو رەوایەتی (سەرباری گۆڕانکارییە مەزنەکان هەمیشە گوزارشت لە ئارەزویەکی نەگۆڕی نەزمەدەکات)[27]، چ لە یاسای نوسراوی سۆڤێت‌و چ لە یاسای "ڤایمار"دا کە هەرگیز هەڵنەوەشێنرانەوە، زەمینەیەکی نەگۆڕی بێسەروبەرەیی‌و بەرەنگاربونەوەیەکی بەردەوام بەرامبەر بە جهانی ناتۆتالیتاری‌و پێوەرەکانی تیا بەدیدەکرێت، ئەو جهانەی بوار بە تۆتالیتاریزم دەدا هەمیشە کەموکورتی‌و دەبەنگییەکانی ئاشکرا بکات[28].

دوانەیی دەزگای ئیداری‌و دابەشبونی دەسەلات‌و هاوژیانی نێوان دەسەلاتی واقیعی‌و دەسەلاتی رووکەش، جۆرە شلەژانێك دەخولقێنێت، بەلام سیمای " بێفۆرمی" بونیادی خودی تۆتالیاریزم راڤەناکات. لەم بارەیەوە، نابێت ئەوەمان لە بیربچێتەوە کە تەنها بینا بونیادی هەیە، ئەمە لە کاتێکدا بزوتنەوە . ئەگەر ئەم دەستەواژەیە بە هەمان ئەو مانایەی کە نازییەکان

مەبەستیان بو، بە جیدی وەربگیرێت . تەنها یەك ئاراستەی هەیە: ئەمەش وادەکات هەمو جۆرە بونیادێکی حکومی یا یاسایی وەك بەربەستێك نەهێڵێت بزوتنەوە بە خێراییەکی بەردەوام هەنگاو بۆ لایەنێکی دیاریکراو بنێت. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پێشئەوەی دەسەڵات بگرنەدەست نوێنەرایەتی جەماوەرێکیان دەکرد کە هەمو بونیادێکی رەتدەکردەوە: جەماوەرێك ئەو سنورە یاسایی و جوگرافییە رادەماڵی کە پێشتر حکومەت زۆر بەتوندیو بە پەرۆشەوە دیاریکردبو. ئەگەر لەسەر بنەمای زانیاریو تێگەیشتنمان دادوەری لەسەر بونیادی دەوڵەتو حکومەت بکەین، ئەوا ئەو بزوتنەوانە هەوڵ دەدەن هەمو جۆرە بونیادێك وێرانبکەن، مادامەکی لە چوارچێوەی بونیادی دەوڵەتدا خۆیان لەسەر زەمینێکی دیاریکراوی سنوردار دەبیننەوە. بۆیە لە پێناوی ئەوەی ئیرادەی وێرانکردنێکی لەو جۆرە بێتەدی، بەتەنها دوانەیەکی پوخت لە هەمو دەزگاکانی نێوان حیزبو دەزگاکانی دەوڵەتدا بەس نیە. چونکە ئەو دوانەییەی پەیوەندی نێوان رووکاری دەوڵەتو ناوکی حیزب پێکدەهێنێت، رەنگە سەرئەنجام بونیادێکی دیاریکراوی لێهەڵهێنجرێت، ئەو بونیادەی پەیوەندی نێوان حیزبو دەوڵەت خۆبەخۆ دەسەڵاتێکی دادوەری تیا پەیدا دەکاتو دەسەڵاتیان دیاریدەکاتو لە سنورێکی جێگیریشدا رایاندەگرێت(29)

لە راستیدا دوانەیی (دوالیزم) لە دەزگا ئیدارییەکاندا کە وەك ئەنجامی دیاردەی مەسەلەی دەوڵەتی حیزب لە گشت دیکتاتۆرە تاك حیزبیەکاندا بە دیاردەکەوێت، ئاشکراترین نیشانەی دیاردەیەکی ئاڵۆزترە، بۆیە باشتروایە دەستەواژەی "فرە دەزگایی" بۆ بەکاربهێنرێت تا ناوی دوالیزمی لێبنرێت. نازییەکان تەنها بە دامەزراندنی ناوچە Gaue لە زۆربەی کەرتە کۆنەکان وازیان نەهێنا، بەڵکو دابەشکردنی جوگرافی دییان زیادکرد کە هاوشانی رێکخستنە جیاوازەکانی حیزب بو: بۆ نمونە یەکەی دابەشکردنی وڵات لەسەر پێوەری "یەکەی هێرش نە لەگەڵ دابەشکردنی ناوچەکان یەکیدەگرتەوە، نە لەگەڵ دابەشکردنەکەی دەستەی پاراستنیش دەگونجا، هەروەها هیچ کام لەو

دابەشـــبەندییە جوگرافیایـــەش لەگـــەڵ دابەشـــکردنی ناوچـــەیی ڕێکخـــراوی گەنجانی هیتلەر نەدەگونجا[30] ئەم پەشێوییە حوگرافیایە دەبێ ئەو فاکتەشی بخرێتـە پـاڵ کـە پەیوەنـدی نێـوان دەسـەڵاتی واقیعـی و دەسـەڵاتی ڕووکەشـی لەسەرتاسـەری ئـەو یەکانـە بەشـێوەیەکی گـۆڕاو دوبـارە دەبـووە. لەسـەردەمی ڕایخـی سـێیەمدا هاوڵاتیـان نـەك تـەنها لـە سـایەی دەسـەڵاتێکی هاوزەمـانی پێشبڕکێکار . زۆرجـار ململانێکـار . لەبابەت ئیـدارە، حیزب،یەکـەی هێـرش، دەستەی پاراستن، ژیانیـان دەگوزەرانـد، بەڵکو هـەرگیز نەیانـدەتوانی لـەوەش دڵنیابن چ دەزگایەکیان سەرچاوەی بەرزترین دەسەڵاتە، هەروەها هەرگیز ئەم کارەشیان بە ئاشکرا پێنەدەوترا. بۆیە هاوڵاتیان بۆ ئەوەی لە ساتە وەختێکی دیاریکراودا بزانن گوێڕایەڵی کام دەزگابن و کامیـان فـەرامۆش بکـەن، پشتیان بەهەستی شەشەم دەبەست.

لەلایەکی دی، باری ئەو کەسانەی دەبوایە فەرمانگەلێك جێبەجێ بکەن کە ڕێبەر بۆ بەرژەوەندی بزوتنەوە بە پێویستی دەزانی، لە باری خەڵکی باشتر نـەبو جێبـەجێ کردنـی ئـەوجۆرە فرمانانـە بـە پێـچەوانەی ڕێوشـوێنی حکومەتـەوە، تـەنها بـە پێکهاتـە حیزبیـەکان دەسـپێردرا. زۆرجـار ئـەو بڕیارانـە "بەدەستی ئەنقەست ئاڵۆز دەکران، بەحوکمی ئەوەی بڕیاردەر بە پەرۆشەوە بە هیـوا بـو بڕیـاروەرگر لـە مەبەسـت و نیـازی بڕیـاردەر تێبگـات و لەسـەر ئـەو بنەمایـەش ڕەفتـار بکـات"[31]، چـونکە پێکهاتـەی دەسـتەبژێر ناچـار نـەبو بڕیارەکانی پێشەوا موو بە موو جێبەجێ بکات (بە هەر حاڵ، پێویست بـو هـەمو ڕێکخـستنەکان بـەو بڕیارانـەوە پابەنـدبن)، بـەڵکو هەمیـشە هەوڵیـدەدا "ویـستی ڕێبـەر جێبـەجێ بکرێ"[32] لەبەرئەوەی بەپێی کۆمـەڵێك لـە یاسـای کـارڕایی (اجرائـی) دەکـرا بەرامبـەر ئەنجومـەنی دادوەری حیـزب، فـەرمانی "پەرگیری" بەسـەر ئەو بڕیارانـەدا بدرێت، بۆیـە هـەرگیز هیچکام لـەو بڕیارانـە لەیـەك نەدەچـون. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی پێکهاتـەی دەسـتەبژێر تـەڵقینی تایبـەت

بەمجۆرە ئەرکانە درابو، بە باشی تێدەگەیشتن کە هێندێك "ئامارژە مانایەکی زیاتر لە ناوەرۆکە سەرزارەکییەکەی هەڵدەگرێ"[33]

بە گوزارشتێکی تەکنیکی، بزوتنەوە لە چوار چێوەی دەزگای تۆتالیتاریدا، جوڵەی لەو واقیعەوە وەردەگرێت کە رێبەر نێوەندی دەسەلاتی کردەیی بەردەوام لە رێکخراوێکەوە بۆ رێکخراوێکی دی دەگۆرێت، بەبێ ئەوەی ئەو رێکخراوەی دەسەلاتی لێسەنراوەتەوە هەڵوەشێنێتەوە، تەنانەت ئەو کەسانەش ئاگادار ناکاتەوە کە دەسەلاتی لێسەندۆنەتەوە. لە قۆناغی یەکەمی رژێمی نازیدا، رێك لەدوای سوتانی ئەنجومەنی ئیمپراتۆری Reichstag، یەکەی هێرش بە کردەوە دەسەلاتی واقیعی پیادە دەکرد، ئەمە لە کاتێکدا حیزب تەنها رووکارێك بو، ئنجا دەسەلات لە یەکەی هێرشەوە بۆ دەستەی پاراستن گوێزرایەوە، لەویشەوە بۆ دەزگای ئاسایش[34] ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت ئەوەیە، هیچ ئۆرگانێك ماف بانگهێشتی بەرجەستەکردنی ئیرادەی رێبەری لێنەسەنرایەوە[35] بەلام نەك تەنها ویستی رێبەر ئەوەندە دەمدەمی و ناجێگیری بو کە هەوەسبازی ستەمکارە رۆژهەلاتیەکان لە بەرامبەریدا بە نمونەیەکی درەوشاوەی سەقامیگری دەژمێردرێت، بەڵکو گۆرانکارییە یەك لەدوای یەکەکانی نێوان دەسەلاتی واقیعی نهێنی و دەسەلاتی رووکەش، پێگەی دەسەلاتی واقیعی کردە رازو نهێنییەکی ئەوتۆ کە ئەندامانی داورودەستەی حوکمران نەتوانن لە هەرەمییەتی دەسەلاتی نهێنیدا بەتەواوەتی پەی بە پێگەی خۆیان بەرن. بۆ نمونە ئەلفرد رۆزنبۆرگ، سەرباری پێشینەیەکی دوورودرێژی لە ناو حیزبداو ئەو دەسەلاتە سەیرەی بەرووکەش هەیبو، هەروەها سەرباری ئەو فرەئەرکانەی لە هەرەمێتی حیزبدا پێیدرابو، کەچی هێشتا قسەی لەسەر زەرورەتی زنجیرەیەك دەوڵەت لە ئەورووپای رۆژهەلات دەکرد، وەك دیوارێکی ئەمنی بەرامبەر بە مۆسکۆ، ئەمەش لە ساتەوەختێکدا بو کە دەسەلاتدارانی واقیعی بڕیاریان دابو لەسەر ئەوەی، نابێت لە دوای شکستی یەکێتی سۆڤێت بونیادی دەوڵەت دروست بکرێت،

بەوشێوەش دانیشتوانی سەرزەمینە داگیرکراوەکان لە ئەوروپای رۆژهەلات بە تەواوەتی بێدەولەت دەبنو لە دوایشدا دەکرێ قەلاچۆ بکرێن[36] بە گوزارشتێکی دی، تا ئەو جێیەی زانیاری لەسەر سەرچاوەی بریارەکانو سەقامگیرییەکی تا رادەیەك بەردەوام لە زنجیرەی هەرەمێتی دەسەلاتدا، رەنگە رەگەزێکی سەقامگیر گەلالە بکات کە فەرمانرەوایانی تۆتالیتاری هەر لە بنەرەتەوە ئەو رەگەزیان لەدەستداوە، نازییەکانی والێکرد دەسەلاتی واقیعی، هەر کاتێك لەپشتی پەردەوە بێتە دەرەوە، رەتبکەنەوەو دەزگایەکی نوێ دروستبکەنو دەزگا کۆنەکەش بکرێتە حکومەتێکی شەبەنگ. ئەو گەمەیەش بەرووکەش هەرگیز کۆتایی نایەت. گرنگترین جیاوازی هونەری لە نێوان رژێمی سۆڤێتیو ناسیونال سۆسیالیستی ئەلمانی بریتی بو لەوەی، ستالین هەر کاتێك بیویستایە نێوەندی دەسەلات لە دەزگایەکەوە بۆ دەزگایەکی دی ناو بزوتنەوە بگوێزێتەوە، دەویست دەزگاو کارمەندەکانیشی پاکتاو بکات، ئەمە لە کاتێکدا هیتلەر بەتەواوەتی بە پێچەوانەوە هەلسوکەوتی دەکرد، هەرچەندە بە چاوێکی سوك تەماشای ئەو خەلکانەی دەکرد کە "ناتوان لەسێبەری خۆیان هەنگاوی زیاتر بنێن"[37]، ئەوا دیسانەوە بە پەرۆش بو، لە ئەرکی دی، سود لەو سێبەرانە وەربگرێت.

فرەیی دەزگاکان سودێکی زۆری بۆ کواستنەوەی بەردەوامی دەسەلاتەکان هەبو. لەگەل ئەوەشدا تا رژێمی تۆتالیتاری زیاتر لە دەسەلات بمێنێتەوە، ژمارەی ئەو دەزگاو نێوەندانەی پەیوەستە بە بوونی بزوتنەوە زیاتر دەبێت، چونکە هیچ دەزگایەك لەو دەزگایانە هەرگیز هەلنەدەوەشایەوە، هەرچەندە دەسەلاتیشی لێدەسەنرایەوە. رژێمی نازی رێبازی ئەم فرە دەزگاییەی بە جۆرێك دیاریکردبو کە هەمو کۆمەلەو کۆمپانیاو دەزگاکان هاوئاهەنگییەکیان لە نێواندا هەبێت. بەلام ئەوەی لە ناوکۆی ئەم چارەسەرە نیشتمانییە دورر مەودایە شایانی ئامارەیە، هاوئاهەنگی نێوان ئەو دەزگایانەی باسیان لێوەکراوە هەرگیز بە مانای یەکخستنیان نەبو لە دەزگا حیزبییە

پەیوەندیدارەکان یا ئەو ڕێکخراوانەی دی کە پێشتر هەبون. تەنانەت کاتێك ڕژێمی نازی بەرەو دواساتەکانی تەمەنی دەچو، لە جیاتی ڕێکخراوێك، دوو ڕێکخراوی خوێنکارانی سۆسیال ناسیونال، ژنان، مامۆستایانی زانکۆ، پاریزگاران و پزیشکان لە تەنیشت یەکەوە کاریاندەکرد[38] بەهیچ شێوەیەك نابێت بە دڵنیاییەوە بوترێت، ڕێکخراوی حیزبی لە هەمو دۆخێکدا لە هاوبیچمەکەی خۆی بەهێزترو بەتواناترە[39] بۆیە هیچ کەسێك نەیدەتوانی بەدڵنیاییەوە پێشبینی ئەوە بکات چ ئۆرگانێکی حیزبی لە زنجیرەی هەرەمی ناو حیزبدا بالا دەکات[40].

ڕێکخستنی دژە سامییەتی زانستی Scientific anti-Semitism نمونەیەکی کاملی بەم بێشکڵییە بەرنامەرێژکراوە بەخشی. ساڵی 1933 پەیمانگەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر مەسەلەی یەهود لە میونیخ دامەزرا. Institut Zur Erforschung der Juden Frage. لەبەر ئەوەی سەرپەرشتیارانی پەیمانگەکە پێیان وابو مەسەلەی یەهود گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی بۆ سەرتاپای مێژووی ئەڵمانیا هەیە، بۆیە زۆری نەخایاند لق و پۆپێکی زۆری لێکەوتەوە تا بوە پەیمانگەیەکی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی مێژووی هاوچەرخ دەربارەی ئەڵمانیا. ئەم پەیمانگەیە لە لایەن والتر فرانك بەڕیوەدەبرا، بۆیە زانکۆ تەقلیدییەکانی بە نێوەندی زانیاری رووکەش، بە مانایەکی دی بە زانیاری رووکار گۆڕی. لە ساڵی 1940دا پەیمانگەیەکی دی بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلەی یەهود لە فرانکفۆرت دامەزراو ئەلفرید رۆزنبۆرگ کرا بە بەڕێوەبەری پەیمانگەکە، لەبەر ئەوەی ئەلفرید پێگەیەکی بەرزتری لە حیزبی نازیدا هەبو، بۆیە ناوبانگێکی زۆری لە بەڕیوەبردنی ئەم پەیمانگەیە دەرکرد. سەرئەنجام پەیمانگەی میونیخ بوە سێبەری پەیمانگە تازە دامەزراوەکەی فرانکفۆرت. پەیمانگەی فرانکفۆرت هەمو گەنجینەو هەڵبژاردە بە تالانکراوەکانی ئەورووپای لەلای خۆی هێشتەوە، تا کتێبخانەیەکی تەواوی دەربارەی یەهود بەدەستهێنا. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێك ئەو هەڵبژاردانە لە دوای چەند ساڵێك گەیشتنە ئەڵمانیا، پارچە بە نرخەکانی رەوانەی فرانکفۆرت و پەیمانگەی لێکۆڵینەوەی رۆزنبۆرگ

نەکرا، بەڵکو رەوانەی بەرلین کرا، رەوانەی هیملەرو بەشی گەستاپۆی تایبەت بە پاکتاوکردنی یەهود (نەك لێکۆڵینەوەی)، لەو دەمەدا ئایخمان ئەو بەشەی بەڕیوەبرد. هیچ یەکێك لەو پەیمانگایانە هەڵنەوەشایەوەو تا ساڵی 1944 بارودۆخەکەش بەوشێوەیە مایەوە: لەپشت رووکاری (الواجهه) ئەو بەشانەی مێژوو لە زانکۆکاندا، دەسەڵاتی واقیعی پەیمانگەی میونیخ هەبو، لەپشت ئەویشەوە پەیمانگەی رۆزنبۆرگ لە فرانکفۆرت خۆی حەشاردابو، لەپشت ئەو سێ رووکارەشەوە نێوەندی دەسەڵاتی راستەقینە، واتە بەشی گەستاپۆی تایبەت بە مەسەلەی یەهود خۆی مەڵاسدابو Reichssicher Heits Hauptamt.

بەڵام رووکاری حکومەتی سۆڤێتی سەرباری یاسا سەرەکییەکەی کە تایبەت لە پێناوی چاودێرە بیانییەکان دامەزرابو، لە ئیدارەی دەوڵەتی نازی کە لە کۆماری ڤایمار بە میراتی بۆی مابووە، بێرەنگ و ناجیگیرتر بو. رژێمی سۆڤێتی بە پێچەوانەی رژێمی نازییەوە لە قۆناغی یەکەمی هاوئاهەنگیدا خاوەنی دەزگاگەلێکی سەرەکی نەبو، بەڵکو بۆ ئەوەی نێوەندی دەسەڵاتی کۆن بەرەو پەراوێز بەرێت، بە بەردەوامی دەزگای زیاتری دروستدەکرد. بۆیە دەزگا بیرۆکراسیەکان کە بەپێی ئەمجۆرە میتۆدە بەردەوام هەڵدەئاوسا، تەنها لە رێگەی پاکتاوکردنە یەك لەدوای یەکەکانەوە چارەسەر دەکرا. لەگەڵ ئەوەشدا، دەکرێ بارودۆخی ئەڵمانیا بە روسیای هاوبیچمی بەراورد بکرێ، چونکە دەتوانین لە روسیا سێ رێکخستنی بە تەواوەتی جودا لە یەکتری بناسینەوە: دەزگای سۆڤێتی یا دەوڵەت، دەزگای حیزب و دەزگای میللی بۆ کاروباری ناوخۆ N.K.V.D (دەزگای پۆلیسی نهێنی)، هەر یەکێك لەو سێ دەزگایە بەشی ئابوری، سیاسی، پەروەردەیی، کولتوری و سەربازی و هتد، تایبەت بە خۆی هەبو(41).

لەراستیدا ناکۆکی نێوان دەسەڵاتی رووکەشی بیروکراسی حیزب و دەسەڵاتی واقیعی پۆلیسی نهێنی لە دوانەیی سەرەکی نێوان حیزب و دەوڵەتی ئەڵمانیای نازی دەچو. فرەیی ئیداری بە شێوەیەکی حەتمی تەنها لە دەزگای پۆلیسی نهێنی خۆی دەردەخات. لەم دەزگا ئاڵۆزەدا تۆڕێکی چەند لقی هەیە

کە هەر بەشێکی چاودێریو سیخوری بەسەر ئەوی دی دەکات. لە یەکێتی سۆڤێتدا دەزگایەك نیە هۆبەیەکی تایبەتی بە پۆلیسی نهێنی نەبێ بۆ ئەوەی سیخوری بەسەر ئەندامانی حیزبو ئەندامە ئاساییەکانی دی دەزگاکەوە نەکات. بەکەناری ئەم هۆبەیەوە، لقێکی پۆلیسی حیزبی هەیە چاودێری هەمو کەسێك دەکات بە سیخورەکانی پۆلیسی نهێنیشەوە، ئەندامانی ئەم لقە لەلای لقەکانی دی پۆلیسی نهێنی نەناسراون. دەبێ یەکێتی سەندیکاکانیش بخەینە پاڵ ئەو دوو رێکخستنە سیخورییە کە ئەرکیان چاودێریکردنی کارگەران بو تا لەو پشکەی بۆیان دیاریکراوبو کەمتر بەرهەمنەهێنن. هۆبەی تایبەت، لە "کۆمیسیۆنی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ" لە هەمو هۆبەو لقەکانی دی دەزگاکە گرنگترو بەدەسەڵاتتر بو، چونکە بریتی بو لە کۆمیسیۆنی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ، لەناو کۆمیسیۆنی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ، واتە پۆلیسی نهێنی لەناو خودی پۆلیسی نهێنی[42] هەمو راپۆرتەکانی ئەو دەزگا پۆلیسیە پێشبڕکێکارانە رەوانەی کۆمیتەی ناوەندیو مەکتەبی سیاسی دەکرێ لە مۆسکۆ، بۆیە شتێکی سروشتیە لەویدا بەرپرسیاران بریار بدەن چ راپۆرتێك هەڵبژێرنو چ هۆبەیەك دەبێ درێژە بەکاری پۆلیسی خۆی بدات. هەڵبەتە هیچ هاولاتیەکی ئاساییو هیچ دەزگایەکی پۆلیس نازانێت کۆمیتەی ناوەندی چ بریارێك دەردەکات، رەنگە ئەمرۆ بریار لە بەرژەوەندی هۆبەی تایبەت لە "کۆمیسیۆنی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ" بدرێت، سبەینێ لە بەرژەوەندی تۆڕی سیخورەکانی حیزبو دوو سبەی بە لیژنەی نیوەندی یا هەر بەشێکی هەرێم. بەلام لەنێو ئەو بەشانەدا هیچ جۆرە هەرەمییەك لە تواناو لە دەسەلاتدا نیە تا بە شێوەیەکی یاسایی رەگوریشە داکوتێ. سەرئەنجام تاکە راستی رەها ئەوەیە کە یەکێك لەو بەشانە هەڵدەبژێردرێت بۆ ئەوەی "ویستی رێبەر" بەرجەستە بکات.

تاکە رێسای باوەڕپێکراو لە دەوڵەتی تۆتالیتاریدا ئەوەیە، تاوەکو دەزگای دەوڵەت ئاشکراتر بێت، دەسەلاتی کەمتر دەبێتەوە، تا دەزگاکەش نادیارترو

نهێنیتر بێت، دەسەڵات و توانای زیاتر گەورەتر دەبێت. بەپێی ئەو ڕێسایەی سەرەوە، ئەنجومەنی سۆڤێتەکان بە گوێرەی یاسا بەرزترین دەسەڵاتی دەوڵەت بو، کەچی لە حیزبی بۆلشەفیك دەسەڵاتی کەمتر بو، حیزبی بۆلشەفیکیش کاتێك ئەندامانی بە ئاشکرا وەردەگرت و وەك چینی حوکمران بەرەسمی ناسرا، دەسەڵاتی لە پۆلیسی نهێنی کەمتر بو. کاتێك دەسەڵاتی واقیعی دەکەوێتەگەڕ نهێنیش دەست پێدەکات. لەم روەوە، هەر دوو دەوڵەتی نازی و بۆلشەفیك زۆر لەیەکدەچون، تەنها ناکۆکیی سەرەکییان ئەوەیە، دەزگای پۆلیسی نهێنی لە ئەڵمانیای نازیدا لە ژێر رکێفی هیملەر بو، هەمو بڕیارەکانیش لەخۆیەوە دەردەچون، ئەمە لە کاتێکدا چالاکیی پۆلیسی نهێنی لە روسیا هیچ جۆرە هاوبەندی و پەیوەندییەك لە نیوانیاندا نەبو.

ئەگەر تەنها وەك ئامرازێکی دەسەڵات تەماشای دەوڵەتی تۆتالیتار بکەین، مەسەلەی چالاکی ئیداری و وزەی پیشەسازی و بەرهەمی ئابوری لەبەرچاونەگرین، بۆمان دەردەکەوێت کە سیمای بێفۆرمی ئەو دەوڵەتە ئامرازێکی نمونەییە بۆ ئەوەی پرەنسیپی رێبەر بەدیبهێنێت. لە راستیدا کێبەرکێی بەردەوامی نێوان دەزگاکان، ئەوانەی بەتەنها ئەرکەکانیان تێهەڵکێش نابێت، بەڵکو ئەرکەکانیشیان لەیەکدەچێت[43]، هیچ دەرفەتێك لەبەردەم ئۆپۆزیسیۆن یا تێکدەران ناهێڵێتەوە بۆ ئەوەی ئامانجیان بێتەدی. گواستنەوەی خێرای نێوەندی دەسەڵات لە دەزگایەکەوە بۆ دەزگایەکی دی، هەمو کێشەیەك چارەسەردەکات، بە بێئەوەی بوار بۆ کەسێك بهێڵێتەوە لەو گۆڕانکارییە تێبگات یا هەستبکات ئۆپۆزیسیۆنێك لەبەرامبەریدا هەیە. یەکێك لە جیاکارییەکانی دی رژێمی تۆتالیتار بریتیە لە: ئەو دەزگایەی ئاگاداری رووداوەکان نیە، هیچ شتێکیش دەربارەی کەوتنی نازانێت، ئەگەر ئەوەش روویدات ئەوا رژێم ئەو دەزگایە هەڵناوەشێنێتەوە ( هەروەکو لە حاڵەتی رژێمی نازیدا)، یا لەدوای ماوەیەکی دوورودرێژ پاکتاوی دەکات، بێئەوەی هیچ پەیوەندییەکی دیار بە هۆکارە راستەقینەکەوە هەبێت. تا ئەو جێگەیەی جگە

له چەند کەسێکی نزیك، هیچ کەسێکی دی شارەزایی لەسەر پەیوەندی نێوان دەسەڵاتەکان نیە، ئەم کارە زۆر بەئاسانی دەتوانرێت ئەنجامبدرێت. بەلام جهانی ناتۆتالیتاری تەنها کاتێك ئاگاییەکی ناچیز لەسەر ئەم بارودۆخە پەیدا دەکات، دیپلۆماتێکی گەورەی رژێم ئەوە بدرکێنێت کە سکرتێرێکی نەناسراوی باڵیۆزخانە لە هەرەمی حیزبایەتیدا سەرۆکی راستەوخۆی بوە. زۆرجار لە رێگەی ئاوردانەوە لە رابردو دەتوانین ئەو هۆیانە دەستنیشان بکەین کە بۆچی لەناکاو دەسەلات لەدەستدەدا یا بۆچی هەر لە بنەرەتەوە ئەمجۆرە کارانە روودەدەن. بۆ نمونە ئەمرۆ زۆر بە ئاسانی لەوە تێدەگەین کە بۆچی لە کاتی هەڵایسانی جەنگی جهانی دوەمدا، خەڵکانی لە بابەت ئاڵفێرد رۆزنبۆرگ یا هانز فرانك پلەو پایەی حکومییان پێدراو سەرئەنجامیش لە نێوەندی دەسەڵاتی واقیعی، واتە لە بازنە نزیکەکەی دەوری هیتلەر دوور خرانەوە[44] لەو دەمەدا ئەوەی گرنگ بێت، ئەو کەسانە نەیاندەزانی و تەنانەت هەستیشیان پێنەدەکرد کە پلەوپایەی وەك فەرمانداری گشتی پۆڵۆنیا یا وەزیری رایخی هەمو سەرزەمینە داگیرکراوەکانی رۆژهەڵات، بەمانای ئەوە نیە لە حیزبی نازیدا بەچڵەپۆپەی پلەوپایەی خۆیان گەیشتون، بەڵکو کۆتایی سەردەمو هەوڵ و تواناکانیان بو.

پرەنسیپی رێبەر چ لە دەوڵەتی تۆتالیتاریداو چ لە ناو بزوتنەوەدا زنجیرەی هەرەمی دروستناکات، چونکە لە دەوڵەتی تۆتالیتاریدا بەپێچەوانەی رژیمە ستەمگەرەکانەوە، دەسەلات لە سەروی هەرەمی هێزو لە رێگەی ئاستە نێوەنجییەکانەوە بۆ ناو جەستەی سیاسی شۆڕنابێتەوە. بەلام بەڵگەی راستەقینەی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە بەبێ دەسەلات، هیچ هەرەمییەك نیە، سەرباری زۆرێك لە بەدحاڵیبونیش دەربارەی "کەسایەتی دەسەلاتگەر" پێویستە بوترێ، پرەنسیپی دەسەلات لە هەمو رووە گرنگەکانیەوە لەگەڵ پرەنسیپی بالادەستی تۆتالیتاریدا ناکۆکی راستەوخۆی هەیە. ئەگەر لەسەرچاوە ئەسڵەکەوە، واتە لەدەسەلاتی رۆمانیاوە، تەماشای دەسەلات بکەین و بزانین چ فۆرمێکی وەرگرتوە، دەبینین هەمیشە

بەمانای سنوردارکردنی ئازادی بوە، نەك لەناوبردنی ئازادی. ئەمە لە کاتێکدا بالادەستی تۆتالیتاری نەك هەر دەیەوێت ئازادی لەناوبەرێت، بەڵکو دەیەوێت هەمو دیاردەیەکی هەرەمەکی مرۆڤیش لەناوبەرێت و هەرگیز بە بەرتەسکردنەوەی سنوری ئازادی داناسەکێت، هەروەکو چۆن رژێمە ستەمگەرەکان ئازادی سنوردار دەکەن. لەرووی هونەریشەوە، ئەوەی رژێمی تۆتالیتاری جیادەکاتەوە نەبونی هەرجۆرە دەسەلات یا هەرەمی زنجیرەییە کە شێوەی حوکم دەستنیشان دەکات، ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەتی لە نەبونی ئاستی نێوەنجی بەرپرس لە نێوان پێشەوا و دەستوپێوەندەکانی بەدیاردەکەوێت کە پشکی دیاریکراو لە دەسەلات و فەرمانبەرییان پێببەخشێت. ویستی (ارادە) پێشەوا دەتوانێت لەهەمو سات و زەمانێکدا بەرجەستە بێت و خۆیشی ملکەچی هیچ پلەبەندییەك نابێت، تەنانەت ئەگەر ئەو پلەبەندییەش خۆی دایانابێت. کەواتە راست نیە گەر پێمانوابێت بزوتنەوەی تۆتالیتاری لەدوای ئەوەی دەسەلات دەگرێتەدەست، ژمارەیەك میرنشین دادەمەزرێنێت و لە هەر میرنشینێکیشدا میرێکی بچوك بەلاساییکردنەوەی رێبەری مەزن، ئازادانە و بەئارەزوی دڵی خۆی رەفتاردەکات[45]. بۆیە جەختکردنەوەی نازییەکان لەسەر "حیزب، رژێمی پێشەواکانە"[46]، درۆیەکی رووت بو. هەروەکو چۆن بێشوماری دامودەزگاکان و ئەو تەمومژەی دەوری سەرچاوەی دەسەلاتی دەگرت، لەو وێناکردنەوە (تصور) سەرچاوەی دەگرت کە هەمو هاولاتیەك هەستدەکات راستەوخۆ روبەروی ویستی رێبەر دەبێتەوە و رێبەر بەدڵی خۆی ئەندامێك هەڵدەبژێرێت و بۆ جێبەجێکردنی بریارەکانی رایدەسپێرێت، ئەم دوو کارەش ملیۆن و نیوێك وردە پێشەوای حوکمی رایخی سێیەم[47] ی والێدەکرد بەتەواوەتی واتێبگەن کە دەسەلاتیان راستەوخۆ لەلایەن هیتلەرەوە دەردەچێت، بێئەوەی ئاستە نێوەنجییەکانی زنجیرەی هەرەمی رۆڵی نێوەنجی لەم کارەدا وازیبکەن[48] پاشکۆیەتی راستەوخۆ بەرێبەرەوە واقعێك بو، ئەمە لەحالێکدا زنجیرەی هەرەمی، سەرباری گرنگی کۆمەلایەتی، بەجۆرە گزی و ساختەکارییەکی دەوڵەتی دەسەلاتگەر دەژمێردرێت.

بێگومـان قـۆرغکردنی ڕەهـای دەسـەڵات لـە دەسـتی ڕێبـەری تۆتالیتاریـدا، بەشێوەیەکی حەتمیو ئاشکرا لە پەیوەندی نێوان ڕێبەرو فەرماندەی پۆلیسدا دەردەکەوێت، چونکە فەرماندەی پۆلیس لە وڵاتێکی تۆتالیتاریدا بە تواناترین پێگـەی ڕەسمـی هەیـە. لەگـەڵ ئەوەشـدا سـەرباری ئـەو دەسـەڵاتە بەرفراوانـە مـادیو ڕێکخـستنەی ژێردەسـتی، وەك فەرمانـدەی پـۆلیسو لێپرسـراوی پێکهاتـەی دەسـتەبژێر، هێـشتا ئەسـتەمە بتوانێـت دەسـەڵات بگرێتەدەسـتو فـەرمانڕەوایی وڵات بکـات. بۆیـە هیملـەر لـە پـێش ئـەوەی هیتلـەر تـەواوەتی بکەوێت، هەرگیز لە خەیاڵدانی نەبو چاو بەو سەرکردایەتیە باڵایە بخشێنێتەوە کـە هیتلـەر دانیپیـانبو[49]، بـەهیچ شـێوەیەك لـە شـێوەکانیش خـۆی وەك جێنیشینی هیتلەر پێشنیاز نەکرد. لەم بارەیەوە، هەوڵی "بیریا" بۆ ئەوەی لە دوای مردنـی ستالین دەسەڵات بگرێتەدەست، گرنگییـەکی لەبەرچاوی هەیە. ئەگەرچی ستالین هەرگیز ڕێگەی نـەدابو هیچ یـەکێك لـە فەرمانـدەکانی پـۆلیس هـەمان پێگـەی هیملـەری لـەدوا سـاڵەکانی حـوکمرانی ڕژێمـی نازیـدا هـەبێت، کەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا بیریـا تـوانی چـەندین تـیم لـەدوای مردنـی سـتالین کۆبکاتـەوە کـە توانـای ئـەوەی هـەبێت ڕوبـەڕوی حیـزب ببێتـەوە. بیریـا لـەو باوەڕەدابو ئەوەندەی هێز بەسە تا سەرتاسەری مۆسکۆو گشت دەروازەکـانی کرملین کونترۆڵ بکات. لە ڕاستیدا جگە لە لە لەشکری سور هیچ دەزگایـەکی دی سۆڤێت نەیـدەتوانی ڕێگـەی ئـەوەی لێبگرێـت کـە دەسـەڵات بگرێتەدەسـت، بەڵام ڕوبەڕوبونەوەی لەشکرو پۆلیسی نهێنی ئەگەر شەڕێکی ناوخۆی ئەوتۆی لێدەکرا کە ئەستەم بو پێشبینی پێشهاتەکانی بکرێتو بزانرێت چارەنوسی ئەو شەڕە بەکوێ دەگات. بـەڵام ئەوەی گرنگ بو "بیریا" چەند ڕۆژێك بـەر لـە مردنـی سـتالین بەویـستی خـۆی وازی لـە هـەوڵو ئامانجـەکانی هێنـا: شـتێکی حاشاهەڵنەگرە دەبوایە بیریا بەباشی بزانێت کە بەو کارەی ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە، چونکە لەو چەند ڕۆژەدا ئازایەتی ئەوەی نواندبو هێزی پۆلیسی نهێنی لەدژی حیزب بەکاربهێنێت[50]

هەڵبەتە نەبونی دەسەلاتێکی رەها رێگر نەبو لەبەردەم فەرماندەی پۆلیسی رژێمێکی تۆتالیتار بۆ ئەوەی دەزگایەکی مەزنی پۆلیس بە پێی پرەنسیپی دەسەلاتی تۆتالیتاری رێکبخات. هەر لەم روەوە، شێوازەکەی هیملەر بۆ رێکخستنەوەی پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیا لە دوای دامەزراندنی بە فەرماندەی پۆلیسی نهێنی کە فرە دەزگایی خستە ناو دەزگایەکی نێوەندییەوە، شایانی سەرنج و تێبینیە، چونکە هیملەر دەستی بۆ کارێك برد کە ئەو کاتە بە پێی دیدی پسپۆرەکانی بواری کاروباری دەسەلات لە قۆناغی پێش رژێمی تۆتالیتاریدا، نانێوەندییان بە ترسناك دەزانی، لەبەر ئەوەی دەسەلاتی بەرەو لاوازی دەبرد. بە هەر حاڵ، سەرەتا هیملەر دەزگای ئاسایشی خستە ناو دەزگای گەستاپۆوە کە تیمێك بو لە پۆلیسی نهێنی و بە تایبەتیش بۆ ئەوە دامەزرابو تا پەیکەری پۆلیسی ناوخۆ لە ناو حیزبدا دروستبکات. ئەمە لە کاتێکدا دەزگای سەرەکی گەستاپۆ و دەزگای ئاسایش نێوەندەکەیان لەبەرلین بو، لقە ناوچەییەکانی هەر یەکێك لەو دوو دەزگا نهێنیە زەبەلاحەش پاریزگاری لە ناسنامەی تایبەتی خۆیدەکرد و راپۆرتەکانیشیان راستەوخۆ رەوانەی نوسینگەی تایبەتی هیملەر دەکرد لە بەرلین[51] لەکاتی جەنگدا هیملەر دوو دەزگای هەواڵگری دی دامەزراند: یەکێکیان لە پشکێنەران دامەزرابو کە چاودێری دەزگای ئاسایش و پۆلیس و هاوئاهەنگی نێوانیانی پێسپێردرابو، ئەم دەزگایە سەر بە دەسەلاتی پۆلیسی نهێنی بو. دەزگای دوەم، نوسینگەی هەواڵگری سەربازی بو، بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە هێزی رایخ و سوپاکەی کاریدەکرد، تا سەرئەنجام توانی دەزگایەکی دژە زانیاری هێزی سوپای تایبەت بەخۆی دروست بکات[52]

نەبونی شۆڕش لە کۆشکدا، ئیدی چ شۆڕشی سەرکەوتو یا ناسەرکەتو، بە یەکێك لە خەسڵەتە هەرە دیارەکانی دیکتاتۆرییەتی تۆتالیتاریزم دەژمێردرێت. (جگە لە کەسێك، هیچ نازییەکی ناڕازی لە حوکمی هیتلەر بەشداری لە پیلانی ساڵی تەموزی 1944دا نەکرد). ئەمە لە حاڵێکدا بەرووکەش وادەردەکەوێت

پرەنسیپی رێبەر ببێتە مایەی گۆڕانکاری خوێناوی لە نێو دەسەڵاتداراندا، بێئەوەی گۆڕانکارییەکە گۆڕینی رژێمی لێبکەوێتەوە. ئەم گۆڕانکارییە یەکێکە لە نیشانەکانی شکڵی حوکمڕانی تۆتالیتارییەت کە پەیوەندییەکی ناچیزی بە چلێسی و شەهوەتی دەسەڵات یا پەیوەندی بە ئارەزوی دامەزراندنی میکانیزمی دروستکردنی دەسەڵاتەوە نیە، هەروەها ئاشنایەتیشی بە گەمەی دەسەڵاتەوە نیە کە دوا قۆناغی فەرمانڕەوایی ئیمپریالیزمی پێدەناسرێتەوە. لە رووی تەکنیکییەوە، یەکێك لە گرنگترین نیشانە بەرزەکانی حکومەتی تۆتالیتار، سەرباری دیاردەکانی، ئەوەیە کە حکومەتی داروەدەستە یا حکومەتی تاقمێك چەتە نیە[53] دیکتاتۆرییەتی هیتلەر چەشنی دیکتاتۆرییەتی ستالین ئەو واقیعە لەبەرچاو دەگرێت کە گۆشەگیرکردنی خەڵکانی ئەتۆمی بە تەنها بنکەیەکی جەماوەری بۆ حوکمڕانی تۆتالیتاری فەراهەم ناکات، بەڵکو ئەو گۆشەگیرییە تا لوتکەی گشت بونیادی تۆتالیتاریش درێژ دەبێتەوە. لە راستیدا ستالین ئەو کەسانەی لە نێودەبرد کە لاف و گەزافی ئینتمابونیان بۆ تاقمی دەسەڵاتدار لێدەدا، سەبارەت بە مەکتەبی سیاسیش پەنای بۆ گەمەی داگرتن و بەرزکردنەوەی پلەوپایەیان دەبرد، کاتێك دەیبینی داروەدەستەکەی خەرێکە بەتوندی لە پێگەی خۆیان رەگ دادەکوتن. ئەمە لە کاتێکدا هیتلەر چارەسەری ناپیشەتری بەکاردەهێنا لە پێناوی ئەوەی دەستەو تاقمگەری لە ئەڵمانیای نازی لەنێوبەرێت و خوێناویترین پاکتاوکردنیش داروەدەستەکەی رۆهمی گرتەوە، لەبەر ئەوەی داروەدەستەکەی لە رێگەی کاری سێکسی هاورەگەزەکانی خۆیانەوە بە توندی وابەستەی یەکتری ببون. هیتلەر پێکهاتەی ئەوانی دی دەهێشتەوە، تەنها گۆڕانکاری لە دەسەڵات و توانایان دەکرد و بە شێوەیەکی بەردەوام بازنەی دۆستە نزیکەکانی نوێدەکردەوە بۆ ئەوەی رێگە لەدەستەگەری دەسەڵاتداران بگرێت، تا بە تەواوەتی هەمو هاوکارییەك لەنێو ئەو کەسانە نەهێڵێت کە لە دەسەڵاتدا هاوڕێی بون. لە راستیدا بەدگومانی ترسناك کە خەسڵەتی سەرەکی هیتلەر و ستالین بو رێگەی

پینەدەدان حوکمی داروەدەستەیەکی تۆکمەو تاڕادەیەك بەردەوام بکەن. هەر چۆنێك بێت، گرنگ ئەوەیە پەیوەندییەکی دەرونی لە نێوان فەرمانڕەوایاندا نەبێت. بۆیە دەبینین ئەوانەی لەحاڵەتێکی یەکساندا لە ناو هەرەمی سیاسیدا لەدایکدەبون، ئەوانەی لە پەیوەندی نێوان سەردەست و ژێردەستدا پێدەگەیشتن و تەنانەت ئەوانەش کە چەتە گومانلێکراوەکان دەسەڵاتی یاسایی پێدەدان، هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان لەنێواندا نەبو. لە روسیای سۆڤێتدا هەمو کەسێك دەزانێت، بەڕێوەبەرێکی گشتی دەزگایەکی پیشەسازی یا وەزیری کاروباری دەرەوە، دەکرێ لە شەوو رۆژێکدا بۆ نزمترین ئاستی کۆمەڵایەتی یا سیاسی دابەزێنرێت و کەسێکی نەناسراو لەجێگەی دابنرێت. لەلایەکی دی ، دەست تیکەڵکردن لە تاوانی چەتەگەری کە لە سەرەتای دیکتاتۆرییەتی نازیدا رۆڵێکی گەورەی وازیدەکرد، هێزی یەکانگیری خۆی لە حکومەتێکی تۆتالیتاری لەدەستدەدا، چونکە تۆتالیتاریزم هەمو توانای خۆی بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی دەست تێکەڵکردن لە تاواندا بۆ ناخی هەمو دانیشتوان بڵاوبکاتەوەو رێکخراوێك دروستبکات کە لە ژێر باڵادەستی خۆیدا هەمو تاکەکانی میللەت ئالودەی گوناه بکات[54]

نەبونی داروەدەستەیەکی حاکم مەسەلەی جێشنشینی دیکتاتۆری تۆتالیتاری کردە مەسەلەیەکی دژوارو پڕ دەردەسەری. لەراستیدا هەمان مەسەلەش هەمو دەستدرێژیکارانی ئەم پلەوپایەی دوچاری بەڵاو کارەسات کرد. سەیر ئەوەیە هیچ یەکێك لەو دیکتاتۆرە تۆتالیتارانە پەنای بۆ شێوازە کۆنەکە نەبرد: بنەماڵەی فەرمانڕەوا دەستنیشان بکات و یەکێك لە نەوەکانی بۆ فەرمانڕەوایی دیاریبکات. هیتلەر ئەوەندە جێنشینی دامەزراندبو کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتێکی شکستی دەهێنا، ستالینیش سودی لە میتۆدێکی جیاواز وەردەگرت، بەپێی ئەو میتۆدە پلەی جینشین یەکێك لە گرنگترین و مەترسیترین نێوەندی شکۆمەندی بو لە یەکێتی سۆڤێتدا. لە بارودۆخی تۆتالیتاریدا، شارەزایی پەیداکردن لە هەمو هێڵە بەیەکاچوەکانی بزوتنەوە،

هاوشـــان و هاوتـــای بـــەرزترین دەســـەڵات بـــو، بۆیـــە هـــەمو جێنـــشینێکی دەستنیشانکراو دەگەیشتە ئاستێك کە پەی بەراستی روداوەکان ببات، ئیدی لـەدوای ماوەیـەك خۆبـەخۆ لادەبـرا. دامەزرانـدنی جێنـشینێکی یاسـایی و تارادەیەك هەمیشەیی، بەدڵنیاییەوە داورودەستەیەکی دەوێت کە ئەندامەکانی لەگـەڵ رێبـەردا زانیاریـان لەسـەر سـەرەتاکانی هـەمو دەزگاگانـدا هـەبێت و بەکردەوە تاوتۆیی کێشەکان بکەن، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە رێبەر بە هەر نرخێك بێت خـۆیی لـێ دوور دەخاتـەوە. لـەم بارەیـەوە، هیتلـەر بـە شـێوازە تایبەتەکـەی هەڵوێستی خـۆی لەسـەر ئـەم مەسـەلەیە بـۆ فەرمانـدە بـەرزەکانی سـوپا روونەدەکاتـەوە و وایانلێـدەکات لـە گەرمـەی شـەڕدا گفتوگـۆ لەسـەر چارەسـەرکردنی مەسـەلەی جێنـشینی بکـەن، لـەم بارەیـەوە دەڵێـت: "ئنجـا، پێویـستە لەسـەرم بەوپـەری لێبوردەییـەوە، خـۆم وەك کەسـێك وەسـفبکەم کـە قـابیلی گـۆڕان نیـە... چارەنوسـی رایخ تـەنها بـە منـەوە بەنـدە"[55] پێویـست ناکـات بگەڕێینـەوە تـا گاڵتـەجاری لـە وشـەی لێبـوردەیی بەدیبکـەین، چونکە رێبەری تۆتالیتاری لە ململانێی راشکاوی لەگەڵ هەریـەکێك لەدەسـتدرێژیکارە کۆنـەکانی دەسـەڵاتدا، هـەر لـە زۆردارەوە تـا سـتەمکار، بەراسـتی پێیوایـە مەسـەلەی جینـشین زۆر گـرنگ نیـە، ئـەم کـارەش پێویـستی بـە شایـستەیی و ئامادەکارییەکی تایبەت نیە، سەرئەنجام وڵات ملکەچی هەر کەسێك دەبێت کە رێبەر لە کاتی سەرەمەرگدا دەسنیشانی دەکات، هیچ پێشبڕکێکارێکی تینوی دەسەڵاتیش، ناوێرێت ململانێی رەوایەتی جینشینە هەڵبژاردەکەی بکات[56]

میتۆدی تۆتالیتاری لەرووی تەکنیکی حوکمەوە، زۆر ساکارو کاریگـەر بـو. ئەو میتۆدانە بە تـەنها قۆرغکردنی رەهـای دەسـەڵات دەستەبەر ناکات، بەڵکو متمانەیـەکی بێوینـەش پەیـدا دەکـات کـە پێویـستە هـەمو بڕیارەکـان هەمیـشە جێبەجێ بکرێ. فرەیی هێڵـی پەیوەنـدی و بـەدحاڵیبون لـە زنجیرەی هەرەمیدا، سەربەخۆی تەواوی دیکتاتۆر لـە بەرامبـەر داورودەستەکەی دەستەبەر دەکـات و رودانی کودەتای سیاسـی غـافڵگیرو سـەیریش لـەتوانا دەکـات کـە تۆتالیتـاریزم

ناوبانگی تیا پەیداکردوە. بەڵام جەستەی سیاسی وڵات، بەهۆی بێشکڵییەوە لە هەمو شۆکێك بەدوور دەبێت.

ئەو هۆیانەی پێشتر هەمو دەزگاکانی حوکمی ناکارا دەکرد، بەهەمان ئەندازەی کاراکردنی میتۆدی حوکمی تۆتالیتاری، سادەوساکار بون. فرەیی دەزگاکان هەمو جۆرە شایستەیی وهەستکردن بە بەرپرسیارێتی لەناودەبات. فرەیی دەزگاکان بە تەنها هەڵاوسانێکی مەزن و بێبەروبوم نیە کە توشی ئیدارە دەبێت، بەڵکو بەربەستێکیشە لەرووی بەرهەمهێناندا، چونکە فەرمانە ناکۆکەکان دەبێتە هۆی دواخستنی کاری واقیعی تا دەگاتە ئەوەی رێبەر لەرێگەی بریارە تایبەتەکانییەوە لەمەسەلەکە جیادەکاتەوە. دەمارگیری کادرانی دەستەبژێر، بۆ رێبازی بزوتنەوە جەوهەرێکی پێویستە، چونکە هەمو بایەخپێدانێکی راستەقینە بە مەسەلە تایبەتەکان لەنێودەبات و ئامادەکارییەکی دەرونی بەرهەمدەهێنێت کە هەر کارێك وەك ئامرازێك بۆ ئامانجێکی بەتەواوەتی جیاواز روندەکاتەوە[57] ئەم حاڵەتە دەرونیە بە تەنها دەستکردی دەستەبژێر نیە، بەڵکو هێدی هێدی هەمو هاوڵاتیان دەگرێتەوە، ئەوانەی وردو درشتی ژیان و مردنیان بە بریارە سیاسییەکانەوە پەیوەستە. واتە بەو هۆکارو هاندەرە نهێنیانەی بە رووکەش هیچ پەیوەندییەکیان بە کردەوە ئەنجامدراوەکانەوە نیە. بەهەر حاڵ کاری لابردنی بەردەوام لە دەسەڵات و داگرتن و بەرزکردنەوە، کاری جیدی گروپ بە ئەستەم دەکات و رێگە لە تەواوکردنی ئەزمونی هەمو کارێکی پێویست دەگرێت. لەرووی ئابوریشەوە، کاری زۆرەملێی ئۆردوگاکانی سۆڤێت، هێندە بە قورسی تەواو دەبو کە روسیا باجێکی قورسی ئەو کردەوەییەی دەدا. لە کاتێکدا روسیا بەدەست کەمیی پسپۆرانی تەکنیکییەوە دەیناڵاند، ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێ لە "ئەندازیارانی زۆر لێهاتو جمەی دەهات، ئەوانەی لەپێناوی ئەوەی کارێکی نزمی لە بابەت بۆری دانان و چاککردنەوەی کاتژمێری ئاگادارکەرەوەو کارەبا و تەلەفونەوە لە نێوخۆیاندا پێشبرکێیان دەکرد"[58]. هەڵبەتە لە

روانگەیەکی سودگەرای رووتەوە پێویست بو روسیا هەڵمەتی پاکتاوکردن لە سالانی سییەکان ئەنجام نەدات، چونکە ئەو رابونە ئابورییەی راگرت کە خەڵکی چاوەڕوانیان لێیدەکرد، یا پێویست نەبو ئەفسەرانی فەرماندەیی گشتی لەشکری سور بکوژرێن کە کوشتنیان بوە مایەی بەزینی سوپای روسیە لە بەرامبەر فینلەندە.

بارودۆخی ئەڵمانیا لەرووی هەستیارییەوە لە روسیا جیاوازتر بو. سەرەتا نازییەکان جۆرە ئارەزوویەکیان نیشاندا بۆ ئەوەی پاریزگاری لە توانا تەکنیکی و ئیدارییەکان بکەن و رێگەیاندا بە کەرتی تایبەت سودوقازانج لە کارەکانیان وەربگرن و بەبێ ئەوەی لەگەڵ دەستێوەردانە کراوەکان دەوڵەتدا روبەروببنەوە، بالادەستییان بەسەر ئابوریدا هەبێت. کاتێک جەنگ هەلایسا هێشتا ئەڵمانیا بە تۆتالیتاری نەکرابو: ئەگەر مرۆڤ خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ وەك ئامانجێکی لۆجیکی قبوڵ بکات، دەبێ دان بەوەشدا بنێت کە ئابوری ئەڵمانیا تا ساڵی 1942 بەشێوەیەك لە شێوەکان لۆجیکی تیابوە[59] بەهەر حاڵ خۆ ئامادەکردن بۆ جەنگ، سەرباری مەزنی تێچونی، خۆی لەخۆیدا لەدژی سودگەرا نیە، چونکە لەگەڵ مەزنی تێچونی، بەدڵنیاییەوە "ئەگەر ولاتانی دی داگیربکرێ و دەست بەسەر دارایی و سەروەت و سامانی میللەتانی دی بگیرێت، تێچویەکی کەمتری دەبێت، لەجیاتی ئەوەی لە ولاتانی دی بکڕێت یا لە کارگە ناوخۆییەکاندا بەرهەمبهێنرێ"[60] یاسای وەبەرهێنان و بەرهەمهێنانی ئابوری و یاسای هاوسەنگی نێوان سود و پرەنسیپی سودوەرگرتن لەسەرچاوە، پراکتیکی نابێت و کاری پێناکرێت، ئەگەر مەبەست ئەوە بێت بە سەرچاوەی تالانکراوی ولاتانی بیانی بۆشایی ئابوری داتەپیوی ناوخۆ پڕبکرێتەوە. ئەم مەسەلەیەش بە تەواوەتی راستی تیایە کە دروشمی "تۆپ یا کەرە . مدفع أو زبدە" بە واقیعی بەمانای دابینکردنی "کەرە بو لە رێگەی تۆپەوە"[61]، میللەتی ئەڵمانیا سەرەتا پاڵپشتی لەم دروشمە کرد، بەلام دواتر پەی بەماناکەی برد. تەنانەت دەکرێ پێدابگیرێت لەسەر ئەوەی کە

یاسای بالادەستی تۆتالیتاری تەنها لەساڵی 1942 کاری پێکراو پێگەی پێشەنگی پێبەخشرا.

کاتێك جەنگ هەڵایسا رژێمی نازی مامەڵەیەکی ریشەیی لەگەڵ ئابوریدا دەست پێکرد: مرۆڤ دەتوانێت بە گریمانەیی گەلاڵەی ئەوە بکات لە نێو ئەو هۆیانەی هیتلەری والێکرد جەنگ هەڵایسێنێت، ئەوەیە رەنگە جەنگ توانایەك لە خێراکردنی پرۆسەی ئابوریدا بخولقێنێت کە لە سەردەمی ئاشتیدا وێنای ناکرێت[62] ئەوەی لەو پرۆسەیەی سەرەوە مایەی سەرسوڕمانە، رەوتی توندڕەوی بزوتنەوە، تەنانەت بە شکستە گەورەکەی ستالینگرادیش چارەسەر نەکرا، بەڵکو مەترسی دۆڕاندنی جەنگ، وەك داینەمۆی زیاتر لەبەرچاونەگرتنی سەرنج و تێبینی سودگەرا (نفعیە) و هەوڵ و کۆششی هەمەلایەنە بەمەبەستی هێنانەدی ئامانجەکانی ئایدیۆلۆجیای نەژادپەرستی تۆتالیتاری، لە رێگەی رێکخستنێکی گشتگیرو بێبەزەییانەوە لەکارابو، ئیدی گرنگ نەبو ئەم ئامانجانە لە زەمەنێکی کورتخایاندا بێتەدی[63] لەدوای شکستی ستالینگراد، پێکهاتەی دەستەبژێر کە بەتەواوەتی لە میللەت جودابو، بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەیدەکردو ئەو بریارەی هەڵوەشانەوە کە رێگەی نەدەدا سەربازەکان بچنە ریزی حیزبەوەو فەرماندە سەربازییەکانیش بون بە پاشکۆی فەرماندەکانی دەستەی پاراستن (S.S). کردەوەی تاوانئامێز کە پێشتر لەلایەن دەستەی پاراستنەوە قۆخکرابو، بەسەربازانی سوپاش سپێردرا، ئیدی ئەوانیش دەیانتوانی تاوانی بە کۆمەڵ ئەنجامبدەن[64] هیچ سەرنج و تێبینییەکی سەربازی، ئابوری و سیاسی نەیدەتوانی بەربەستێك لەبەردەم هاتنەدی بەرنامەی پڕخەزینەو بارگرانی قەلاچۆکردن و دورخستنەوەی بە کۆمەڵ دروستبکات.

دوا ساڵەکانی رژێمی نازیمان باسکردو شێوازی " پیلانی پینج ساڵەی نازییەکان" یشمان چارەسەر کرد کە چۆن کاتی پێویستیان لەبەردەمدا نەبو تا

بە باشترین شێوە جێبەجێیان بکەن، وەلێ ئامانجی لە نێوبردنی هەر دوو میللەتی پۆلۆنیا و ئۆکرانیا و سەدوحەفتا ملیۆن روسی (هەروەکو لە پلانەکەدا هاتوە)و هێرش و پەلاماری هەوالگری لە هەمو ئەوروپای رۆژئاوادا (بۆ نمونە هۆلەنداو هەرێمی ئەلزاس و لۆرین)، لەپاڵ ئەو ئەلمانیا ناشایستانەی بەپێی بەرنامەی تەندورستی رایش یا بەپێی پرۆژەی " ئەو یاسایەی بۆ بیانیەکان کاری پێدەکرا" روبەروی لەنێوبردن دەبونەوە، بەپێویستی دەزانین بەراورد بکرێ بە بەرنامەی پێنج ساڵەی بۆلشەفیکەکانەوە (ساڵی 1929)، واتە کاتێك دیکتاتۆرییەتی روسیا بە تەواوەتی روخساری خۆی وەرگرت. لەلایەکەوە، دروشمی دروستی نەژادی بەرزدەکردەوە، لەلایەکی دی، دەربارەی ئابوری بانگەشەی پڕ هەراوهوریای دەکرد کە هەر هەمویی پێشەکی "بەرنامەیەکی سەرشێتانەی سەخت و ئاوەژو کردنەوەی گشت رێساکانی لۆجیك و یاساکانی ئابوری" [65]بو.

بێگومان دیکتاتۆری تۆتالیتاری بە شێوەیەکی وشیارانە رێگەی شێتی ناگرێتەبەر. راشکاوانەتر بڵێین، سەرسوڕمانی ئێمە بەرامبەر بە سیمای سەرشێتانەی بونیادی دەوڵەتی تۆتالیتاری لەو بیرۆکە نادروستەوە سەرچاوەدەگرێ کە پێمانوایە لەگەڵ دەوڵەتێکی ئاسایی لە بابەت دەوڵەتی بیرۆکراسی . حوکمی ستەمگەری و دیکتاتۆری سەروکارمان هەیە. لە راستیدا هەر کە فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاری لە وڵاتێکدا دەسەڵات دەگرنەدەست، بەدڵنیاییەوە رایدەگەیەنن کە وڵاتەکەیان بوە بە نێوەندی بزوتنەوەیەکی کاتی و قۆناغێك لە قۆناغەکانی داگیرکردنی جهان دەستی پێکردوە، شکست و پیرۆزی بەپێی سەدەو هەزاران ساڵ هەڵدەسەنگێنن و بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە بەرژەوەندییە جهانییەکانیان هەمیشە لەسەرووی بەرژەوەندییە ناوچەییەکانە، ئەوا دیسانەوە ئێمە ئەم کێشەیە پشتگوێدەخەین[66] ئەو دروشمە بەناوبانگەی دەڵێت "هەق هەمان ئەو شتەیە کە بۆ میللەتی ئەلمانیا باش بێت"، تەنها بۆ مەبەستی پروپاگەندەی جەماوەری بەکاردەهێنرا. ئەمە لە کاتێکدا بەنازییەکان

دەوترا "هەق هەمان ئەو شتەیە کە بۆ بزوتنەوە باش بێت"[67]، بۆیە ئەم دوو دروشمە هەرگیز بە یەك نەدەگەیشتن. نازییەکان لەو باوەڕەدا نەبون ئەڵمانییەکان ڕەگەزێکی سەروەرن و دەبێ جهان پێیانەوە پەیوەست بێت، بەڵکو پێیانوابو دەبێ ئەڵمانەکانیش وەك میللەتانی دی لەلایەن ڕەگەزی سەروەرەوە سەرپەرشتی بکرێن، ئەو ڕەگەزەی هێشتا لە قۆناغی لە دایك بونە[68]. کەواتە، دەستەی پاراستن S.S نەك ئەڵمانەکان، سەرقافڵەی ڕەگەزی سەروەر بو[69] بۆیە بەپێی وتەکانی هیملەر " ئیمپراتۆرییەتی جهانی ئەڵمانیا" یا بەپێی وتەکانی هیتلەر "ئیمپراتۆرییەتی جهانی ئاری" لە دوا ڕۆژێکی نزیکدا بەدینەدەکرا[70]. بزوتنەوە زۆری بەلاوە گرنگ بو ئەوەی بۆ ڕونبێتەوە کە بە لە ناوبردنی ڕەگەزەکانی دی باشتر دەتوانرێ ڕەگەزێکی بالاتر دروستبکرێ تا لە جەنگێکی ئامانج دیاریکراودا سەرکەوتو بێت. ئەوەی بەشێوەیەکی ناشیرین لە "نمایشێکی مەزنی شێتانە" بۆ چاودێرێکی بیانی دەردەکەوێت، جگە لە پایە بڵندی ڕەهای بزوتنەوە بەسەر دەوڵەت و نەتەوەو خەڵکی، تەنانەت دەسەلاتدارانی فەرمانڕەوای تۆتالیتاریش، شتێکی دی نیە. ئیدی جێگەی خۆیەتی ئەم پرسیارە بکەین: بۆچی ئەم ڕژێمە زیرەکەی حکومەتی تۆتالیتاری نێوەندێتی ڕەهاو دەسەلاتی بالا دەخاتە ژێردەستی تاکە کەسێکەوە کە لە رابردودا هەرگیز تاقینەکراوەتەوە؟ چونکە هیچ ستەمگەرێکی ئاسایی ئاستی شێتی نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی هەمو بەرژەوەندییە سنوردارو ناوچەییەکان . ئیدی چ بەرژەوەندی ئابوری بێت یا نیشتمانی یا مرۆڤایەتی یا سەربازی . بکاتە قوربانی بەرژەوەندی واقعێکی بە تەواوەتی ساختەو وێناکراوی ئەوتۆ کە کەس پەی بە دوارۆژێکی دوری نابات.

تا ئەو جێگەیەی تۆتالیتاریزم لە دەسەلاتدا دڵسۆزی پرەنسیپی بنەرەتی بزوتنەوە بێت، چیدی زەقی لێکچونی نێوان ڕێکخستنی بزوتنەوەو شێوازی ڕێکخستنی " دەوڵەتی تۆتالیتاری"، نابێتە مایەی سەرسوڕمان. جیاوازی نێوان ئەندامانی حیزب و لایەنگرانی لە ڕێکخستنی ڕووکاردا، بێئەوەی

لەبەرچاو بزربن، هەمو دانیشتوان، وەکئەوەی لە شێوەی لایەنگرانی بزوتنـەوە ریکخـرابن بـە "هاوئـاوازی" ئامـادە دەکـات. مـەزنیی هەڵاوسـانی ژمـارەی لایەنگران، لەرێگەی قەتیسکردنی دەسەڵاتی حیزب لە یەك "چینی" جیاکاری چەند ملیۆن کەسی و دروستکردنی پێکهاتـەی دەستەبژێری بانحیزبی چەند هەزار کەسی، هاوسەنگ دەبێتەوە. فرەیی دەزگاو دوانەیی ئەرك و یەکانگیری پەیوەندی لایەنگرانی حیزب لەگەڵ بارودۆخی نوێدا، زۆر بە سادەیی مانای وایە بونیادی تایبەتی بزوتنەوە، ئەو بونیادە زیاد شۆرشگێرەی شەکڵی پیازی هەیـە، بـەجۆرێك هـەر بـەرگێک پێکهاتـەی ئـەوی دی دادەپۆشـێت، هێـشتا بڕواپێکراوو پارێزراوە. لەم ناوکۆیەشدا دەزگای دەوڵەت دەبێتە رێکخستنی رووکاری لایەنگرە بیروکراتەکانی بزوتنـەوە کە رۆڵیـان لـە کاروباری نـاوخۆدا، بڵاوکردنەوەو فراوانکردنـی متمانەیە لە نێو جەماوەری هاوئاوازدا، ئەوانەی تـەنها هاوکـاری لەگـەڵ دەسـەڵاتداراندا دەکـەن، بـەڵام لـە کاروبـاری دەرەوەدا، رۆڵیان خـۆی لـە فریـودانی جهانی ناتۆتالیتـاری دەنوێنێت. ئەمـە لـە کاتێکدا رێبـەر بە حـوکمی دەبێ سیفەتی، وەك سـەرۆکی دەوڵـەت و رێبـەری بزوتنـەوە، لەلایەکەوە، لوتکەی بێبەزەییانەی شۆرشگێر، لەلایەکی دی، حاڵـەتی دروستی متمانەبەخش، لە کەسایەتی خۆی کۆدەکاتەوە.

یـەکێك لـە گرنگترین جیـاوازی نێـوان بزوتنـەوەی تۆتالیتـاری و دەوڵـەتی تۆتالیتاری ئەوەیە کە دیکتاتۆری تۆتالیتاری دەتوانێت و دەبێ هونـەری درۆی تۆتالیتـاری بەشـێوازێکی گونجـاوترو کاریگـەرترو بـەرفراوانتر لـە رێبــەری بزوتنــەوە بــەکاربهێنێ. بەشـێکی ئـەم کێـشەیە، دەرئـەنجامێکی خۆبـەخۆی پەنــەمانی ژمــارەی هاوڕێیــانی بزوتنــەوە بــو، بــەڵام ئــەوەی ئــەو درۆیانــە شیاودەکات بریتیـە لـە: گوتـەکانی فـەرمانڕەوای دەوڵـەت بـە هـەمان بێشەرمی وتـەکانی سـەرکردەی حیزبێکـی دیمـاگۆگی پاشـگەزبونەوەی تیـا نیـە. لەبـەر هـەمان مەبەسـتیش هیتلـەر پـەنای بـۆ ناسـیونالیزم بـرد، ئەمـە لـە حاڵێکـدا پێشئەوەی بە دەسـەڵات بگـات چەندین کەڕەت شـەرمەزاری کردوە. هیتلـەر بە

پێڕەوی کردنی لە توندەرەوی نەتەوەگەراو بانگەشەکردنی ئەوەی حیزبی ناسیونال سۆسیالیزم " کالآیەکی هاوردە" نیە، ترسی ئەڵمانی و نائەڵمانی دەرەواندەوەو سروشی بە بەدیهاتنی بەرخوازییەکانی نازیزمیش دەبەخشی، ئەو بەرخوازییانەی بەهاتنەدی داخوازییە نەریتییەکانی سیاسەتی دەرەوەی میللخوازی ئەڵمانیا دێتەدی . گێڕانەوەی ئەو سەرزەمینانەی لە پەیماننامەی ڤێرسای لە ئەڵمانیا زەوتکرابو، وەرگرتنەوەی نەمسا و یەکخستنەوەی ئەو ناوچانەی لەسەرزەمینەکانی بۆهیما بەزمانی ئەڵمانی دەدوێن. بەهەمان شێوەش ستالین بایەخێکی زۆری بەرای گشتی روسی و جهانی ناروسی دەدا کاتێك تیورەی " سۆسیالیزمی لە ولآتێکدا" داهێنا و بیرۆکەی شۆڕشی جهانی خستە ئەستۆی ترۆتسکی[71]

درۆکردنی سیستماتیك بەرامبەر بە گشت جهان، تەنها لە سایەی هەلومەرجی دەسەلآتی تۆتالیتاریدا بێناکام ئەنجامدەدرێ، واتە لە سایەی هەلومەرجێکدا کە ساختەیی سیمای واقیعی رۆژانە، هەڵمەتی پروپاگەندە بێسود و بێکەڵك دەکات. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان پێشئەوەی دەسەلآت بگرنەدەست هەرگیز نەیاندەتوانی بەم ئەندازەیە ئامانجە راستەقینەکانیان بشارنەوە . دواتر ئەو ئامانجانە بەجۆرێك داڕێژرا تا ببێتە سروشبەخشی رێکخراوە جەماوەرییەکانی بزوتنەوە. بەلآم کاتێك لە توانادا دەبێت یەهود وەك میشولە (Bug) بە گازی ژەهراوی لەناوببرێت، ئیدی پێویست ناکات ئەو بیرۆکەیە بلآوبکرێتەوە کە دەڵێت یەهود لە مێشولە دەچێت[72]. هەروەها کاتێك بتوانرێت مێژوی شۆڕشی روسیا بەبێ ناوهێنانی تروتسکی بە میللەت بوترێتەوە، ئیدی هەڵمەتی پروپاگەندە لە دژی تروتسکی مانای خۆی لەدەستدەدا. بەلآم بەکارهێنانی ئەو میتۆدانەی رێگە بۆ گەیشتن بە ئامانجی ئایدیۆلۆجی خۆشدەکەن، بەتەنها لە کەسانێك پێشبینی دەکرێ کە "دیدێکی ئایدیۆلۆجی توندڕەویان" هەیە . جیاوازی نیە توندڕەوی بیروباوەر لە فێرگەکانی کۆمێنترنەوە بەدەست هاتبێت یا لە نێوەندی تایبەتی تەڵقینی نازی

ـ تەنانـەت ئەگـەر رای گـشتیش زانیـاری لەسـەر ئـەو ئامانجانـە هـەبێت. لـە هەلومەرجێکی لەوجۆرەدا لایەنگرانی سادە هەرگیز لە روداوەکان تێناگەن[73]
ئەم کێشەیەش بە هەمان ناکۆکی دەگات کە "کۆمەڵەی نهێنی لە رۆژی روناك"
لە دوای ئـەوەی لـە کۆمـەڵی نێودەوڵـەتی دەبێـت بـە ئەنـدامێکی تـەواو، سیما و میتۆدی لە هەر ساتێکی دی نهێنیئامێزتر دەبێت. بۆیە کارێکی زۆر لۆجیکانـە بو، هیتلەر پێشئەوەی دەسەلات بگرێتەدەست هـەمو هـەوڵێکی بۆ رێکخستنی حیـزب و تەنانـەت پێکهاتـەی دەسـتەبژێریش لەسـەر بنـەمای نهێنیئـامێز، رەتـدەکردەوە. بـەلام ئـەوەی لێـرەدا مایـەی سەرسـوڕمانە، هیتلـەر لـە سـاڵی 1933 و لـەدوای ئـەوەی دەسـەلاتی گرتەدەسـت، بەتـەواوەتی بەپـەرۆش بـو رێکخـراوی دەسـتەی پاراسـتن بـە کۆمەڵەیـەکی نهـێنی بگۆڕێـت[74] بەهـەمان شێوەش حیزبە کۆمۆنیستەکانی ژێر رکێفی دەسەلاتی مۆسکۆ، لەهەنگاوێکی دژ بە ئەوانەی پێش خۆیان، ئارەزوییەکی سەیریان بۆ بارودۆخێکی نهێنیئـامێز پێشاندەدا، تەنانەت لەو شوێنانەشدا کە توانـای تـەواوی بـە یاسایی بوونیـان لەبەردەمدا ئاواڵەبێت. بۆیە تـا دەسەلاتی تۆتالیتـاری ئاشـکراتر بێـت، ئامانجە راسـتەقینەکانی نهێنـیتر دەبێـت. ئەگـەر مـرۆڤ بخوازێـت لـە دوا ئامانجـەکانی رژێمـی هیتلـەر لـە ئـەڵمانیا تێبگـات، پێویـستە زیـاتر بـڕوا بـە گوتـارە پروپاگەندەییـەکان و کتـێبی "تێکۆشـانی مـن" بهێنێـت تـا بڕواکـردن بـە ئاخاوتنـەکانی وەك راوێـژکاری رایخـی سـێیەم، بـە هـەمان شـێوەش نابێـت دەربارەی "سۆسیالیزم لە تاکە ولاتێکدا" بڕوا بە وتەکانی ستالین بهێنین کە بە مەبەسـتی دەسـەلات گرتنەدەسـت لـە دوای مردنـی لیـنین داهێنـرا، بـەڵکو دوژمنایـەتی کردنـی ولاتـە دیموکراسـیەکان جیـدیتر وەربگیرێـت. دیکتـاتۆرە تۆتالیتارەکـان سـەلماندیان وشـیارانە لـە مەترسـی ئاسـایی کردنـەوەی بارودۆخەکە تێدەگەن، واتە هەمان ئەو مەترسییەی لە پیادەکردنی سیاسـەتی ناسـیونالیزم یـا لـە دامەزرانـدنی سۆسـیالیزم لـە تاکـە ولاتێکـدا دێتـەئاراوە. لـەمڕووەوە دیکتاتۆرەکـان هەوڵـدەدەن بـە هێشتنەوەی نـاکۆکی قـووڵی نێـوان

گوتـه ئارامبەخـشەکانیان و واقیعـی رژێمەکـەیان ئـەو مەترسـییەی سـەرەوە تێپـەڕێنن و میتۆدێـك جێبـەجێ بکـەن کـە بـەردەوام بەپێچەوانەی وتـەکانیان کاربکـەن[76] ئـەو هونـەری هاوسـەنگییەی لـە کـاری ئاسـایی و دیپلۆماسـی ڕۆژانـەدا، پێویـستی بـە لێهاتویی وسـەلیقەی بـەرزتر هەیـە، ستالین بـە جۆرێـك بەکاریدەهێنا کە میانڕەوی لە سیاسەتی دەرەوە یا لە هێڵی سیاسی کۆمێنترن، هەمیشە هاوکات بوە لەگەڵ هەڵمەتی پاکتاوکردنی ریشەیی لە ناو ریزەکانی حیزبی روسیادا. بێگومان کارێکی ڕێکەوت نەبو کە سیاسەتی بەرەی گەل و دارشتنی یاسای سەرەکی لیبرالانەی سۆڤێتی، لەگەڵ دادگاییە نمایشییەکانی مۆسکۆ هاوزەمان بو.

لـە ئـەدەبیاتی بۆلـشەفیزم و نازیزمـدا بەڵگـەی کـۆنکریتی هەیـە کـە حکومەتـە تۆتالیتارەکان حەزدەکەن هـەمو گـۆی زەمین داگیربکـەن و کۆنترۆڵی گشت وڵاتـانی جیهان بکەن. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەرنامە ئایدیۆلۆجیانەی لە بزوتنـەوەکانی پێش تۆتالیتاریەت بە میرات مابونەوە (سەبارەت بە نازییـەکان، حیزبە باننەتەوەییـەکان، ئـەنتی سـامیزم و خەونـەکانی ئیمپراتۆرییـەتی بانئـەڵمانی، سـەبارەت بـە بۆلشەفیکەکانیش، چەمکی نێونەتـەوەیی سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕ) یەکلاکـەرەوە نـەبون. بـەڵام ئـەوەی یەکلاکـەرەوە بـو، رژێمـە تۆتالیتارەکـان بـە شـێوەیەکی سەرکێشانە سیاسـەتی دەرەوە لەسـەر ئـەو گریمانەیـە دەگرنەبـەر کـە سـەرئەنجام بەدوا ئامانجی خۆیـان دەگـەن، مەبەسـت داگیرکردنـی هـەمو جیهـان بـو. هەرچـەندە گەیشتن بەو ئامانجانـە دورر مـەودا بێـت و خواستە ئایدیاکانیان لەگەڵ پێویستیە هەنوکەییـەکان ناتـەبا بێـت، دیـسانەوە هـەر دەسـتبەرداری ئامانجـەکانیان نـابن. کەواتە، هیچ وڵاتێك بۆ ئەوان بێگانە نەبو، بەڵکو بەپێچەوانەوە هـەمو وڵاتێکیـان بـە هێزی دانەبڕوای خۆیان دەزانـی. گەیشتنی بزوتنـەوە بە دەسـەڵات و ئەو واقیعـەی کە جهانی وێناکراوی بزوتنـەوە لـە وڵاتێکدا بوە بـە واقیعێکـی هەستپێکراو، جـۆرە پەیوەندییـەك بەرهەمـدەهێنێت، یەکسانە بـە بارودۆخی حیزبێکـی تۆتالیتـاری لـە سـایەی فـەرمانڕەوایی حکومـەتێکی ناتۆتالیتـاری: واقیعێکـی ئەفـسانەیی

هەستپێکراوی تۆتالیتاری لە وڵاتێکدا دەتوانرێ بە پشتیوانی دەسەڵاتی دەوڵەتێك کە لەلایەن کۆمەڵی نیودەوڵەتیەوە بەرەسمی ناسرابێت، هەناردە (تصدیر) بکرێت، هەر بەو شێوازەی کە بێزاری لە پارلەمان لە بەرژەوەندی پارلەمانێکی ناتۆتالیتاری هاوردە (استیراد) دەکرێت. لەم بارەیەوە، ئەو چارەسەرەی لە پێش جەنگ بۆ مەسەلەی یەهود پێشنیازکرا، چارەسەرێکی تایبەتی بازرگانی هەناردە بو کە ئەڵمانیای نازی لەو بوارەدا زۆر لێهاتو بو: ڕاگواستنی یەهود بەشێکی گرنگی لە نازیزم بۆ وڵاتانی دی هەناردەکرد، ناچارکردنی یەهود بە جێهێشتنی وڵات بەبێ پارەو پاسپۆرت، ئەفسانەی یەهودی سەرگەردانی بەرجەستەکرد، بۆیە نازییەکان بەڕاگواستنی یەهود، وڵاتانی دی هاندەدا دوژمنایەتی بکەن، بەوەش بیانویەکیان دەدۆزییەوە بۆ ئەوەی دەست لە سیاسەتی ناوخۆی میللەتانی دی وەربدەن(77)

ساڵی 1940 خەڵکی لەو واقیعە تێگەیشتن کە نازییەکان تاچ ئاستێك ئەفسانەی پیلانگێڕییان بەجیدی وەرگتوە، ئەو ئەفسانەیەی پێیوابو ئەوان فەرمانڕەوایی ئایندەی جهان دەکەن، واتە کاتێك دەستیان بە جێبەجێ کردنی سیاسەتی ڕاگواستنی دانیشتوانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات کرد، کەمبونەوەی هێزی کارو ئاکامە خراپە سەربازییەکانیان لەبەرچاونەگرت، یاسای سزادانی تایبەت بەڕایخی سێیەمو ئیدارەیەکی ئێرتجاعیان، هاوردە کرد(78)، سەرباری پێویستیو هەبونی توانای واقعی بۆ ئەوەی دڵنەوایی خەڵکی ئەوروپای داگیرکراو بکرێ. باشترین شێواز بۆ ئەوەی خەڵکی دان بە بانگەشەکانی نازیزمدا بنێت لە فەرمانڕەوایی کردنی جهاندا، هەر وشەیەك یا هەر کارێك لەدژی ڕایخی سێیەم، بێئەوەی هەلومەرجو شوێنو پلەوپایەی کەسەکە لەبەرچاو بگیرێت، بە خیانەتی مەزن دەژمێردرێتو توندترین سزای لەسەر دەدرێت. بۆیە یاسای نازی بەزەبری هێز هەمو جهانی دەخستە ژێر حوکمی دادوەری خۆیەوە، بە جۆرێك سوپای داگیرکار تەنها ئامرازێکی داگیرکردنی

ولاتان نەبو کە یاسایەکی نوێی داگیرکارانی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبێت، بەڵکو وەك ئۆرگانێکی جێبەجێکار چاودێری لە یاسایەك دەکرد کە لەسەر هەمو کەسێك پێویست بو جێبەجێی بکات.

لەبەر ئەوەی یاسای نازی لە سنوری ئەڵمانیا زیاتر پەلیدەهاویشتو سزای نا ئەڵمانییەکانی دیاریدەکرد، بۆیە بەتەنها ئامرازێکی سەرکوتکردن نەبو. رژێمە تۆتالیتارەکان لە گرەنتیە لۆجیکییەکان کە داگیرکردنی جهان پێویستی پێی هەیە، بێباك بون، تەنانەت ئەگەر ئەو گرەنتیانە ئاراستەیەکی پێچەوانەش بگرنەبەرو لەبەرژەوەندی میللەتەکەی خۆشیان نەبێت. لەرووی لۆجیکییەوە شتێکی بەڵگەنەویستە پلانی داگیرکردنی جهان پێویستی بە سڕینەوەی جیاوازی نێوان ولاتی داگیرکەرو سەرزەمینە داگیرکراوەکان هەیە، هەروەها دەبێ جیاوازی نێوان سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەش نەهێڵێت کە هەمو دەزگاو پەیوەندییە نێو نەتەوەییە ناتۆتالیتارەکانی لەسەر بونیات نراوە. لەبەر ئەوەی داگیرکەری تۆتالیتاری لە هەمو شوێنێك وەکئەوەی لەسەر خاکی خۆی بێت، زۆر دڵرەقانە رەفتار دەکات، بۆیە هەمو لە حاڵەتێکدا پێویستە بەدڵرەقی داگیرکەرێکی بێگانە مامەڵەش لەگەڵ میللەتەکەی خۆی بکات[79] ئەو خاڵەش بە تەواوەتی دروستە کە بزوتنەوەی تۆتالیتاری کاتێك دەسەلات دەگرێتە دەست چەشنی داگیرکەرێکی بیانی کە ولاتێك داگیردەکات، رەفتار دەکاتو بۆ بەرژەوەندی شتێك یا کەسێکی دی، نەك بۆ بەرژەوەندی ولات حوکمرانی دەکات. بەهەر حاڵ نازییەکان لەئەڵمانیا وەك داگیرکەرێکی بیانی لەدژی بەرژەوەندی میللی رەفتاریان دەکردو هەوڵیاندەدا شکستەکانیان بە دوا کارەساتێکی قووڵی ئەوتۆ بگۆڕن کە هەمو میللەتی ئەڵمانیا بگرێتەوە، لەو هەوڵەشیاندا کەمێك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. بۆیە نیازیان هەبو لە کاتی سەرکەوتنی تەواودا سیاسەتی پاکتاوکردنی "ئەڵمانییە رەگەز ناشایستەکان"[80] پیادە بکەن.

لەدوای جەنگ تەرزێکی لەوجۆرەش سروشبەخشی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤێت بو. بەهای شەڕەنگیزی ئەم سیاسەتە زۆر بە گرانی لەسەر خەڵکی سۆڤێت کەوت. ئەم سیاستە بوە مایەی ئەوەی قەرزێکی گەورەی ئەمریکا لە دوای جەنگ رەتبکاتەوە، قەرزێك دەرفەتی ئەوەی بۆ روسیا دەرەخساند ناوچە وێرانکراوەکانی پێ بینابکاتەوەو وڵات بەشێوەیەکی لۆجیکیو بەرهەمهێن بە پیشەسازی بکات. دامەزراندنی حکومەتی کۆمۆنیستی لە وڵاتانی باڵکانو داگیرکردنی سەرزەمینێکی بەرفراوان لە ئەوروپای رۆژهەڵات، نەك هەر هیچ سودێکی هەست پێکراوی نەبو، بەڵکو بەپێچەوانەوە گوشارێکی گەورەی لەسەر سەرچاوەکانی روسیا دروستکرد. بەڵام ئەم سیاسەتە خزمەتی بەرژەوەندی بزوتنەوەی بۆلشەفیکی دەکرد، چونکە نزیکەی نیوەی دانیشتوانی جهانی لەژێر دەستدا بو. دیکتاتۆری تۆتالیتاری چەشنی داگیرکەرێکی بیانی دەروانێتە سەرچاوە سروشتیو پیشەسازییەکانی هەر وڵاتێك بە وڵاتەکەی خۆیشییەوە، وەکئەوەی سەرچاوەی تاڵانییەکی بەردەوامو ئامرازێك بێت بۆ ئامادەکاری قۆناغی داهاتو لە بەرفراوانکردنی دەستدرێژییەکانیدا. تا ئەو جێگەیەی ئەم سیاسەتی ئابورییە تاڵانگەرە سیستماتیکە بۆ بەرژەوەندی بزوتنەوە کار بکات، نەك لە بەرژەوەندی میللەت، هیچ میللەتو وڵاتێکی سودمەند لەو هێزە (لەپیادەکردنی ئەو سیاسەتە) ناتوانێت سنورێك بۆ تێربونی ئەم پرۆسە تاڵانگەرایە دیاریبکات. دیکتاتۆری تۆتالیتاری چەشنی داگیرکارێکی بیانی نازانرێ لە کوێوە هاتوەو بەری تاڵانییەکەیشی سودی کەسی تیانیە. هەروەها تاڵانییەکەی بۆ پاڵپشتی ئابوری وڵاتەکەی دابەش ناکرێت، بەڵکو لەسەر بنەمای مانۆرێکی تاکتێکی کاتی بەکاردەهێنرێت. رژێمە تۆتالیتارەکان لە چارەسەرکردنی مەسەلە ئابورییەکاندا هەمان خەسڵەتیان هەیە کە کوللە لەسەر کێڵگەی کشتوکاڵی هەیەتی. ئەو واقیعەی کە دیکتاتۆری تۆتالیتاری وەك داگیرکەرێکی بیانی فەرمانڕەوایی وڵاتەکەی دەکات، کاروباری وڵاتەکەی خراپتر دەکات، چونکە

دڵرەقی بەرامبەر وڵاتەکەی خۆی لە حکومەتێکی ستەمگەری بیانی کاراتر دەکات. لەم بارەیەوە، ئەو شەڕەی ستالین لەدژی ئۆکرانیا لە سییەکانی سەدەی بیستەم هەڵیگیرساند، لەرووی زیانی مرۆیی و مادییەوە لە داگیرکردنی روسیا لەلایەن ئەڵمانیاوە، دڕندانەترو خوێناویتر بو[81] بۆیە تۆتالیتاریزم لە وڵاتەکانی ژێر دەسەڵاتیدا، حکومەتی دەستنیشان کراوی خۆی لە حوکمڕانی راستەوخۆ بە باشتر دەزانێت، سەرباری ئەو مەترسیانەی لەمجۆرە رژێمانەش دەکەوێتەوە.

گرفتی رژێمە تۆتالیتارەکان بەشێوەیەکی زۆر دڵرەقانە یاری بە دەسەڵاتی سیاسییەوە ناکەن، بەڵکو لە پشت سیاسەتی گشتی و سیاسەتی پراکتیکیان، چەمکێکی نوێی بێوێنە لە دەسەڵات خۆی مەڵاس داوە. بێباکییەکی زۆر بەرامبەر بە ئاکامی راستەوخۆ، نەك بێبەزەیی، بێزاری لە ئەنگیزەی سودگەرا، لەجیاتی هەوڵدان بۆ بەدواداکەوتنی بەرژەوەندی تاکەکەسی، بێ رەگوریشەیی و فەرامۆشکردنی بەرژەوەندییە نەتەوایەتییەکان، لەجیاتی بایەخدان بە نەتەوەگەرایی، ئایدیالیزم، واتە ئیمانێکی پتەوو نەگۆڕ بە جهانی ئایدیۆلۆجیایەکی ساختە، نەك چڵێسی دەسەڵات، هەمو ئەوانە پێکەوە هۆکارێکی نوێ و شڵۆقیان لە سیاسەتی نێودەوڵەتی هێنایەئاراوە کە دوژمنایەتییەکی رووت و پەتی هەرگیز نەیدەتوانی کارێکی لەوجۆرە ئەنجامبدات.

دەسەڵات لە روانگەی تۆتالیتاریزمەوە، بەتایبەتی لەتوانای رێکخستندا خۆی حەشارداوە. رێك وەکئەوەی ستالین هەمو دەزگایەکی بە سەربەخۆ لە ئەرکە واقعیەکەی، وەك "زنجیرەیەك پەیوەندی نێوان حیزب و جەماوەر" دەبینی[82] ستالین باوەڕێکی تەواوی هەبو بەوەی بەنرخترین گەنجینەی یەکێتی سۆڤێت لە سامانی سروشتی یا لە وزە بەرهەمهێنە مەزنەکەی نیە کە توانا مرۆییە مەزنەکەی دەستەبەری دەکرد، بەڵکو لە کادرە حیزبیەکانە[83] (واتە پۆلیسی نهێنی). هەر لەسەر هەمان شێواز، هیتلەریش لە ساڵی

1929دا پێیوابو "مەزنترین دەرکەوتە"ی بزوتنەوە لەوەدایە، ئەگەر لە دەرەوە تەماشای "شەست هەزار لە پیاوەکانی" " بکرێ، لەیەک کەس دەچن، ئەو کەسە هاوبیچمانە بە تەنها لەفیکردا لەیەکناچن، بەڵکو لە روخساریشدا لەیەکدەچن، لە چاوی پڕ لە پێکەنینیان و هەستی پڕ دەمارگیریان بروانن، ئنجا بۆتان دەردەکەوێت چۆن سەد هەزار کەسی بزوتنەوە، دەبن بەتاکە نمونەیەک"[84] پەیوەندی دەسەلات لەگەڵ دارایی مادی و سامان و گەنجینەو سەرچاوە دەوڵەمەندەکان، لە جۆرێک میکانیزمی نامادی دەتوێتەوە، لەم میکانیزمەدا هەمو جوڵەیەک دەسەلات بەرهەمدەهێنێت، هەروەکو چۆن لێکخشاندن یا تەوژمی ڤۆڵتاج کارەبا بەرهەمدەهێنێت. دابەشکردنی وڵاتان بە وڵاتی دەوڵەمەندو هەژار لەلایەن حکومەتە تۆتالیتارەکانەوە، زیاتر فێڵێکی دیماگۆگیانە بو، چونکە ئەوانەی ئەم جیاکاری و دابەشکردنەیان دەکرد، لەو باوەڕەدابون دەسەلاتی دارایی مادی نەک تەنها هیچ بەهاونرخێکی نیە، بەڵکو لە گەشەکردنی دەسەلاتی رێکخستنیش کەمدەکاتەوە. لەلای ستالین گەشەسەندن و گەورەکردنی بەردەوامی هێزی پۆلیس و چەند هێندەکردنی ژمارەیان زۆر لە نەوتی باکۆ، خەڵوزو ئاسنی ئۆڕاڵ و دانەوێڵەی ئۆکرانیا و گەنجینەی بە هێزی سیبریا گرنگتر بو . بە کورتی لە گەشەکردنی ماتەوزەی روسیا گرنگتر بو . هەمان حاڵەتیش هیتلەری والێکرد هەمو ئەڵمانیا بکات بە قوربانی دەستەی پاراستن: کاتێک هەمو شارەکانی ئەڵمانیا وێران دەبون و توانای پیشەسازی وڵات نابود دەبو، هیتلەر هەستی بەشکست نەدەکرد، بەڵکو تەنها کاتێک هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە چیدی لە توانادا نیە پشت بەدەستەی پاراستن ببەسترێت، هەستی بەشکست کرد[85] کەسێک باوەڕی بە سوڵتانی رەهای رێکخستن هەبێت بەسەر هۆکارە مادییەکاندا، ئیدی سەربازی بێت یا ئابوری، کەسێک مەودای سەرکەوتنەکانی بە پێی سەدەکان بخەمڵێنێت، لەلای ئەو شکست بەمانای کارەساتێکی سەربازی و هەڕەشەی برسێتی لە دانیشتوانەکەی نەبو، بەڵکو بەمانای لەناوبردنی پێکهاتەی دەستەبژێر بو کە

دەبوایە پیلانی داگیرکردنی جهان نەوە لەدوای نەوە بەدوا کاروان بگەیەنێت، ئەمە ئەگەر دوایی هەبێت.

سیمای پێشکلی دەولەتی تۆتالیتاری، لەبەرچاونەگرتنی بەرژەوەندی مادی، رزگاربوونی لە هاندانی بەرژەوەندیو رەفتاری دژە سودگەرای، لە هەر هۆکارێکی دی زیاتر لە پێشبینی نەکردنی سیاسەتی هاوچەرخدا رۆڵیان هەبو. لە بەرامبەر ئەوەشدا، جهانی ناتۆتالیتاری لە عەقلیەتێك تێنەدەگەیشت کاری ناحیسابی ئەوتۆ بکات کە مرۆڤ و سەرچاوەی مادی لەبەرچاونەگرێت، عەقلیەتێك بە تەواوەتی بەرامبەر بەرژەوەندی نەتەوەییو خۆشگوزەرانی میللەتەکەی کەمتەرخەم بێت، بەراشکاوی خۆی لە حوکمێکی دوو رووی سەرسوڕهێنەر پیشان بدات: ئەوانەی بە باشی لە چالاکی تۆقێنەری رێکخستنو پۆلیس تێدەگەن، زیادەڕۆیی لە خەملاندنی هێزی مادی دەولەتی تۆتالیتاری دەکەن، لە لایەکی دی، ئەوانەی لە بێتواناییو بێفەڕی ئابوری تۆتالیتاری تێدەگەن، توانای دەسەلاتی دەولەتی تۆتالیتاری بەهەند وەرناگرن کە دەتوانێت لەسایەی دژایەتیکردنی هەمو هۆکارە مادییەکان، بەرهەمبهێنرێ.

## 2. پۆلیسی نهێنی

هەتا ئەم ساتە وەختە، تەنها لەگەڵ دوو فۆرمی سەرەکی لە باڵادەستی تۆتالیتاری ئاشنایەتیمان هەیە، دیکتاتۆری ناسیونال . سۆسیالیزم لەدوای ساڵی 1938 و دیکتاتۆرییەتی بۆلشەفیزم لە ساڵی 1930 بەدواوە. ئەم دوو فۆرمەی باڵادەستی بەشێوەیەکی بنەرەتی لە هەمو رژێمە دیکتاتۆرەکانی دی، ئیدی ستەمگەر بێت یا زۆردار، جیاواز بون. ئەگەر چی ئەم دوو فۆرمە لە گۆڕانی بەردەوامی دیکتاتۆری حیزبیەوە پەیدابون، بەڵام گەوهەری خەسڵەتە تۆتالیتارەکانیان شتێکی تازەیەو ناتوانرێ بدرێتە پاڵ رژێمە تاک حیزبیەکان. ئامانجی رژێمە تاک حیزبییەکان بە تەنها دەسەڵات بگرتنەدەست نیە، بەڵکو بە دامەزراندنی ئەندامانی حیزب لە هەمو نێوەندەکانی دەوڵەت، هەوڵدەدەن دەوڵەت و حیزب بە تەواوەتی تێکەڵ بکەن، بەجۆرێك لەدوای ئەوەی حیزب دەسەڵات دەگرێتەدەست، دەبێتە دەزگایەك تەنها پروپاگەندە بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت دەکات. بەڵام شێوازی فەرمانڕەوایی کردنی تاک حیزبی تەنها بە مانا نێگەتیفەکەی گشتگیرە: واتە حیزبی فەرمانڕەوا هیچ لێبوردەیەکی بەرامبەر بە هیچ حیزبێکی دی و ئۆپۆزیسیۆن نیەو مل بۆ ئازادی بیروباوەری سیاسی نادات. کاتێك دیکتاتۆرییەتی تاك حیزب دەسەڵات دەگرێتە دەست، پەیوەندی هێزی نێوان دەوڵەت و حیزب پێشتر چۆن بوە وەك خۆی دەهێڵێتەوەو بواریش بەدەوڵەت و سوپا دەدا دەسەڵاتی پێشویان پیادە بکەن. بەڵام "شۆڕش"ی ئەم رژێمە لە ساتەوەختی سەرکەوتنییەوە گشت نێوەندە حکومییەکان بە ئەندامانی حیزب دەبەخشێت. لە هەمو ئەو حاڵەتانەشدا دەسەڵاتی حیزب جەخت لەسەر قۆرغکردنێك دەکات کە لە لایەن دەوڵەتەوە دابینەکرێ، ئیدی حیزب نێوەندێکی سەربەخۆی دەسەڵاتی نامێنێت.

شۆڕشــی بزوتنــەوە تۆتالیتارەکــان لــەدوای ئــەوەی بەدەســەڵات دەگــەن، چییەتی (ماهیە) بەشێوەیەکی ریشەیی دەگۆڕێت. بزوتنەوە تۆتالیتارەکان هەر لە سەرەتای حوکمڕانییانەوە هەوڵدەدەن دەستکاری جیاوازی سەرەکی نێوان دەوڵـەت و حیـزب نەکـەن و رێگـە نـەدەن دەزگـا شۆڕشـگێڕەکانی حیـزب لـەناو دەوڵەتدا بتوێتـەوە(86) مەسـەلەی گرتنەدەسـتی دەزگـای دەوڵـەت بـەبێ تێکـەڵ بون لەگەڵیدا، بەو شێوەیە چارەسەر دەکرێ کە تەنها ئەو ئەندامانەی حیـزب بایەخی پلە دوویان بۆ بزوتنەوە هەیە، رێگەیان پێدەدرێ لە زنجیرەی هـەرەمی دەوڵەتدا پێگەیان هەبێت. لەبەرامبەر ئەوەشدا، هەمو دەسـەڵاتە واقعییـەکان لـە دەزگـا تایبەتـەکانی بزوتنـەوە و لـەدەرەوەی دەزگـا دەوڵـەتی و سـەربازییەکان وەگـەڕدەخرێن. لـەناو بزوتنـەوە کـە نێوەنـدێکی چالاک و سـەرەکی وڵاتـە، هـەمو بڕیارە یەکلاکەرەوەکانی تیا دەدرێت. تەنانـەت زۆرجار ئیدارە رەسمییـەکانی وڵاتیش نازانن چ شتێك لە ئارادایە. هێندێك لەو ئەندامە حیزبییانـەی سـەودای بوون بە وەزیریان هەیە، زۆرجار بە بەهای لەدەستدانی دەسەڵات لە بزوتنەوە و دۆڕاندنی متمانەی رێبەر، بەو ئارەزووە "بۆرجوازییانەیان" دەگەن.

تۆتالیتاریزم لە دەسەڵاتدا وەك رووکارێك سود لـە دەوڵـەت وەردەگرێت کە لە جهانی ناتۆتالیتاریدا نوێنەرایـەتی وڵات دەکات. بۆیـە دەوڵـەتی تۆتالیتـاری میراتگرێکــی لــۆجیکی بزوتنــەوەی تۆتالیتارییــەو رێکخــستن و بونیــادی حکومەتەکـەیشی لـە بزوتنەوە دەخوازێـت (استعارە). هـەر لـەم ناوکۆیەشـدا، سەرکردە تۆتالیتارەکـان بـەو شێوەیە مامەڵە لەگـەڵ حکومەتـە ناتۆتالیتارەکان دەکەن، هەروەکو چۆن پێشئەوەی بەدەسـەڵات بگـەن مامەڵـەیان لەگـەڵ حیزبـە پارلەمانییـەکان یـا باڵـەکانی نـاو حیـزب کـردوە. هـەروەها لـەدوای ئـەوەی بـە دەســەڵاتیش دەگــەن، لەســەر شــانۆیەکی فــراوانتری نێودەوڵــەتی روبــەروی مەســەلەیەکی دوانــەیی دەبنــەوە: جهــانی ســاختەی بزوتنــەوە (یــا وڵاتــی تۆتالیتـاری) لـە کاریگـەری واقعـی جهـانی دەرەوە دەپارێزن، بـەوەی روویـەکی ئاسایی و عەقڵێکی دروست پێشکەش بە جهانی ناتۆتالیتاری دەکەن.

لەسەروی دەوڵەتو لەپشت رووکاری دەسەڵاتی رووکەشو چەواشەیی فرەیی دەزگاو لەدوتویی ئەو گۆڕانکارییانەی لەدەسەڵات روودەداو ئەو پشێوییەی لە ناکارییەوە سەرهەڵدەدا، کوانوی دەسەڵاتی وڵات، مەبەست لە دەزگای پۆلیسی نهێنییە لە هەموویان کاراترو بە تواناتر کار دەکات[87] جەختکردن لەسەر پۆلیس وەك تاکە دەزگای دەسەڵاتو هەمیشە لەبەرچاو و پشتگوێ خستنی بە ئەنقەستی ئەو توانا مەزنەی سوپا بەرووکەش پێکیدەهێنێت . بە دوو فاکتەری رژێمە تۆتالیتارەکان دەژمێردرێت . دەتوانن بە شێوەیەکی هەندەکی (جزئـي) ئارەزوی تۆتالیتاری لە فەرمانڕەوایی کردنی جهان راڤەبکاتو جیاوازی نێوان دەوڵەتی بیانیو نیشتمان، جیاوازی نێوان کاروباری دەرەوەو ناوەوە هوشیارانە نەهێڵێت. هێزی سوپا کە بۆ بەرەنگاربونەوەی دەستدرێژیکاری بیانی پەروەردە کرابو، ئامرازێکی گومانلێکراوی شەڕی ناوخۆو بارودۆخەکەی بو، چونکە لە هەلومەرجی تۆتالیتاریشدا بۆ سوپا زەحمەت بو بە چاوی داگیرکەرێکی بیانی لە میللەت بڕوانێت[88] لێرەدا خاڵی هەرە گرنگتر ئەوەیە لە رژێمێکی تۆتالیتاریدا، بەهای هێزی سەربازی، تەنانەت لەکاتی جەنگیشدا گومانی لێدەکرێ. لەبەرئەوەی رێبەری تۆتالیتاری سیاسەتی لەسەر گریمانەی حوکم کردنی جهان ئاراستە دەکات، بۆیە بە هەمان ئەندازەی دڵرەقی هەڵگەڕاوەکان، مامەڵە لەگەڵ قوربانیەکانیشی دەکات، واتە ئەوانەی بە خیانەتی مەزن تاوانبار دەکرێن: ئیدی هەر لەم رووەوە پێی باش بو لەرێگەی پۆلیسەوە، نەك هێزی سوپا، حوکمی سەرزەمینە داگیرکراوەکانیش بکات.

بزوتنەوەی تۆتالیتاری تەنانەت پێشئەوەی بەدەسەڵات بگات، خاوەنی پۆلیسی نهێنیو دەزگای سیخوری بو، کە پەلو پۆپی لە زۆرێك لە وڵاتانی جهاندا هەبو. بەڵام لەدوای ئەوەی بزوتنەوە دەسەڵاتی گرتەدەست، سیخورەکانی لە دەزگای هەواڵگری سەربازی پارەو دەسەڵاتی زیاتریان پێدرا،

زۆربەشیان سەرۆکی باڵویزخانە نهێنی و کۆنسوڵگەرەکانی دەرەوە بون[89] ئەرکی سەرەکی سیخورەکان دروستکردنی ستونی پێنجەم (طابور الخامس)، رێنمایی کردنی لقەکانی دەرەوەی بزوتنەوە، کارکردنە سەر سیاسەتی ناوخۆی وڵاتە پەیوەندیدارەکان بو، بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لەو ئەرکانە سازکردنی بارودۆخێك بو تا ئەو کاتەی رێبەر . لە دوای کودەتایەك بەسەر حکومەتدا یا لە حاڵەتی سەرکەوتنی سەربازیدا . وادەزانیٚ لە ماڵی خۆیەتی و هەست بەنامۆیی ناکات. بە وتەیەکی دی، لقە نێودەوڵەتییەکانی پۆلیسی نهێنی بە جۆرێك لە ناوچەی گواستنەوە بزوتنەوە دەژمێردرێت کە رێگە دەدات سیاسەتی رووکەشیی دەرەوەی تۆتالیتار بە سیاسەتی فیعلی ناوخۆی بزوتنەوەی تۆتالیتاری بگۆڕێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو ئەرکانەی پۆلیسی نهێنی بەدییان دەهێنێت بۆ ئەوەی رێگە خۆشبکات تۆباویەتی تۆتالیتاری بەسەر جهاندا باڵادەست بێت، لە ئاست ئەو ئەرکانەی پێویستە بۆ هاتنەدی هەنوکەیی ئەفسانەی تۆتالیتاری لە تاکە وڵاتێکدا، گرنگییەکی لاوەکی هەیە. بە هەر حاڵ رۆڵی گەورەی پۆلیسی نهێنی لە سیاسەتی ناوخۆی وڵاتە تۆتالیتارەکاندا وێنەیەکی نادروستی لە یادەوەری زۆرێك دروستکردبو، ئەمەش لەو وێنا نادروستەوە سەرچاوەی گرتبو کە هەستێکی هاوبەش دەربارەی تۆتالیتاریزم دایرشتبو. لە راستیدا هەمو حکومەتە دیسپۆتیزمەکان پشت بە دەزگای هەواڵگری نهێنی دەبەستن، چونکە زیاتر بەرامبەر بە میللەتەکەی خۆیان هەست بە مەترسی دەکەن تا میللەتە بیانییەکان. بەڵام ئەم لێکچونەی نێوان تۆتالیتارییەت و حکومەتی دیسپۆتیزم تەنها بۆ قۆناغە سەرەتاییەکانی سەردەمی تۆتالیتاریزم راستە، واتە کاتێك ئۆپۆزیسۆنی سیاسی بوونی هەیە. تۆتالیتاریزم ئەم وێنا نادروستە چەشنی وێنا نادروستەکانی دی جهانی ناتۆتالیتاری بە خراپی سودی لێوەردەگریٚ، لەوانەشە ئەو وێنا نادروستە بەلایەوە ناپەسەند بێت،

کەچـی دیـسانەوە هەوڵـدەدا بـەهێزی بکـات. هیملـەر لـە سـاڵی 1937 لـە وتەیەکیدا بۆ فەرمانـدەیی گـشتی، لەچوارچێوەی شیـکردنەوەی هەڵئاوسـانی هێزی پۆلیس لەسەر گریمانەی بوونی "شانۆی ئۆپراسیۆنی چوارەم لەحاڵەتی هەڵگیرسـانی جەنگـدا لـە نـاوخۆی ئـەڵمانیا"[90]، رۆڵـی سـتەمکارێکی ئاسـایی وازیـدەکرد. لـە هـەمان کاتیـشدا سـتالین تـوانی گـاردی بۆلـشەفیکی کـۆن بـەوە قایـل بکـات کـە پێویـستی بـەدانپیانانیان هەیـە، لەبـەر ئـەوەی مـەترسـی جـەنگ لەهـەمو لایەکـەوە یەخـەی بـە یـەکێتی سـۆڤێت گرتبـو، بۆیـە دەبـو وڵات لـە هەلومـەرجێکی پڕمەترسـی لـەوجۆرەدا، تەنانـەت ئەگـەر لـەژێر فـەرمانڕەوایی کەسێکی ستەمکاریشدا بێت، بەیەکگرتوویی بمێنێتـەوە. بەڵام سیمای زەقی ئەم دوو لێدوانە ئەوەیە لە کاتێکدا وتـراون کە ئۆپۆزیـسیۆنی سیاسـی لـە هـەر دوو وڵاتەکەدا بە تەواوەتی لەنێو برابو: دەزگـای هـەواڵگری نهێنی لـە کاتێکدا گەشـەیدەکرد کـە بـەکردەوە هـیچ جـۆرە ئۆپۆزیـسۆنێك لـە ئـارادا نـەمابو تـا سیخوری بەسەرەوە بکات. کاتێك جەنگ هەڵایسا هیملـەر لە ئەڵمانیا تـەنها لە ئیـدارەدانی ئۆردوگـای گـرتنی بـە کۆمـەڵ و چـاودێری کردنـی کـاری زۆرەملێـی بیانییەکان سودی لە دەستەی پاراستن وەردەگرت. بەشی هەرە زۆری دەستەی پاراسـتن بـە مەبەسـتی "ئـەرکی تایبـەت" ـ بەشـێوەیەکی گـشتی کوشـتنی بـە کۆمـەڵ . لـە بـەرەی رۆژهـەڵات خزمـەتیان دەکـرد و پـشتگیرییان لـە سیاسـەتێك دەکرد کە زۆرجار پێچەوانەی هەرەمـی نازییـەت بـو، ئیـدی چ سـەربازی بێـت یـا مـەدەنی. پێکهاتـەی دەسـتەی پاراسـتنی ئـەڵمانیا، چەشـنی پۆلیـسی نهـێنی یەکێتی سۆڤێت ، کاتێك تیمەکانی سوپا هێمنی بەسەر ناوچە داگیرکراوەکانـدا دەسـەپاند، هـەمو جـۆرە بەرگرییـەکی سـەربازی لەبەریەکهەڵدەشـاندەوە، ئنجـا دەگەیـشتنە ئـەو ناوچـانە، بۆیـە بـە تـەنها روبـەروی ئۆپۆزیـسۆنی سیاسـی دەبونەوە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئـەو رۆڵـەی پۆلیـسی نهـێنی و پێکهاتـەی دەسـتەبژێر لـە یەکەم قۆناغی رژێمی تۆتالیتاریدا وازیـدەکرد، هاوشـێوەی ئـەو رۆڵـە بـو کـە لـە

سایەی شێوەکانی دی دیکتاتۆرییەت، وازیدەکرد. بەڵام دڵڕەقی لە رادەبەدەری شێوازەکەیان تەنها لە مێژووی وڵاتانی رۆژئاوای هاوچەرخدا وێنەی نەبینرێ. قۆناغی یەکەمی کاری پۆلیس دەرکردنی دوژمنی نهێنی لە حەشارگەکانیان و راوەدونانی دوژمنە کۆنەکان بو، ئەمەش هاورێ بو لەگەڵ رێکخستنی گشت دانیشتوان لە رێکخراوەکانی رووکارداو بەگەڕخستنەوەو ئامادەکردنەوەی ئەندامە کۆنەکانی حیزب بە مەبەستی سیخوڕیکردنی خۆبەخش، بەجۆرێك چاودێریکردنی کاروپیشەی لایەنگرانی گومانلێکراو، پێویستی بەخەڵکانی مەشقدیدەی پۆلیس نەکات. لەم قۆناغەدا، بۆ ئەو کەسانەی "بیروباوەری ترسناك"یان لە مێشکدا بێت، دراوسێیەك لە کارمەندێکی پۆلیس مەترسی زیاتری هەیە. قۆناغی یەکەم بە لەناوبردنی دوژمنە وەسفکراوەکان و پاکتاوکردنی هەمو بەرگرییەکی سیستماتیکی ئاشکراو نهێنی کۆتایی دێت. دەتوانین ئەم قۆناغە بە نزیکەیی لە ئەڵمانیا بە ساڵی 1935 و بۆ یەکێتی سۆڤیێتیش بە ساڵی 1930 دیاریبکەین.

تیرۆر تەنها کاتێك دەبێتە جەوهەری راستەقینەی رژێمە تۆتالیتارەکان کە لەناوبردنی دوژمنە واقیعەکان کۆتایی هاتبێت و راوکردنی "دوژمنە بابەتیەکان" دەست پێبکات. بە بیانوی بونیاتنانی سۆسیالیزم لە تاکە وڵاتێکدا یا بەکارهێنانی سەرزەمینێك وەك تاقیگەیەك بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی شۆڕشگێڕی تیا ئەنجام بدرێ یا بۆ هێنانەدی "ئابوری کۆمەڵ" Volksgemeinschaft ، داوای دوەمی تۆتالیتاریزم، واتە باڵادەستی گشتگیر لە رێگەی روداوەکانەوە دەخرێتە بواری جێبەجێ کردنەوە. ئەگەرچی لەرووی تیورییەوە بەدیهاتنی باڵادەستی گشتگیری رژێمە تۆتالیتارەکان تەنها لەدوای فەرمانڕەواییکردن بەسەر جهاندا لە تواناندا دەبێت، بەڵام رژێمە تۆتالیتارەکان سەلماندیان ئەم بەشەی تۆباویەتی تۆتالیتار، مادامەکی لەرووی زەمەنەوە لەدەرەوەی شکست و سەرکەوتنە، رەنگە تا ئاستی کەماڵ بێتەدی. بەمشێوەیە هیتلەر لە نێو شکان و پاشەکشێی سەربازیدا بەقەڵاچۆکردنی یەهودو

دامەزراندنی کارگەی مردن شادمان بو. دوا ئاکامەکانی جەنگ هەرچییەك بێت، دیسانەوە دەبێت بڵێین، بەبێ جەنگ "سوتاندنی پرد" و هاتنەدی هێندێك لە ئامانجەکانی بزوتنەوەی تۆتالیتاری لە تواناداا نەبو(91)

پێکهاتەی دەستەبژێری حیزبی نازیو "کادرەکانی" بزوتنەوەی بۆلشەفیکی زیاتر بە مەبەستی بالادەستی گشتگیر کاریان دەکرد تا پارێزگاری لە رژێمی دەسەلاتدار بکەن. هەروەکو چۆن بانگەشەی تۆتالیتاری لە فەرمانڕەوایی کردن بەسەر جهاندا تەنها بەرووکەش لە سروشتی فراوانخوازی ئیمپریالیزم دەچێت، بانگەشەی بالادەستی گشتگیری تۆتالیتاریزمیش تەنها بەرووکەش لەلای لێکۆڵیارانی دیسپۆتیزم ناسراوە. ئەگەر جیاوازی سەرەکی نێوان فراوانخوازی تۆتالیتاریو فراوانخوازی ئیمپریالی لەوەدابێت کە فراوانخوازی تۆتالیتاری بەهیچ جیاوازییەکی نێوان نیشتمانو ولاتی بێگانە قاییل نابێت، ئەوا جیاوازی سەرەکی نێوان پۆلیسی نهێنی رژێمی ستەمکارو پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری لەوەدایە کە پۆلیسی تۆتالیتار بەدوای بیروباوەری نهێنیدا ناگەڕێتو رەوشە کۆنەکەی پۆلیسی نهێنیش، واتە شێوازی بزواندن(92) . Provocation . بەکارناهێنێت.

لەبەر ئەوەی پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاریزم لەدوای سەقامگیربونی ئاشتی لە ولات دەست بەکار دەبێت، بۆیە زۆرجار بوونی سەبارەت بە چاودێرانی بیانی بێکەڵك دەردەکەوێت . یا بەپێچەوانەوە غافگیریان دەکات تا بەو شێوەیە بیربکەنەوە کە هێشتا بەرگری نهێنی لە ولاتدا بوونی هەیە(93) بەلام بێکەڵکی دەزگا نهێنییەکان شتێکی تازە نیە. بۆیە هەمیشە خەمی ئەوەیان هەبو، تەنانەت لەدوای کۆتایی هاتنی ئەو ئەرکە سەرەکییەی دەزگا نهێنییەکەیان لە پێناویدا دامەزراوە، سودمەندی خۆیان بسەلمێنن، تا لەو رێگەیەوە پارێزگاری لە پێگەی خۆیان بکەن. بەلام ئەو میتۆدانەی بۆ ئەم ئامانجە پشتی پێدەبەسترێت، لێکۆڵینەوەی مێژووی شۆڕشەکانی کردە پرۆژەیەکی دژوار. بۆ نمونە لە سایەی فەرمانڕەوایی لویس ناپلیۆندا هیچ چالاکییەکی دژ بە حکومەت نەبو،

خودی پۆلیسی نهێنی له پشتەوە نەبێت[94] بەهەمان شێوەش، لێکۆڵەران پێیانوایە رۆڵی هەواڵگری نهێنی لەناو سەرجەم حیزبە شۆڕشگێڕەکانی روسیای تزاریدا، ئەو گومانە پشتڕاست دەکاتەوە کە بەبێ چالاکی بزواندن‌و "سروشبەخشی" ئەو دەزگایە، بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی روسیا تا ئەو رادەیە سەرکەوتنی بەدەست نەدەهێنا[95] بە واتایەکی دی، پۆلیسی نهێنی بەهەمان ئەندازەی بزواندن (استفزاز) کە توانیبوی چەندین کەڕەت رێکخراوە شۆڕشگێڕەکان لێکبترازێنێت، بەشداری‌و هاوکاری لە بەردەوامبونی نەریتی رێکخراوە شۆڕشگێڕەکانیش بکات.

رەنگە رۆڵی ئاڵۆزی بزواندن یەکێك لەو هۆیانە بێت، رێبەرە تۆتالیتارەکانی والێکرد، بەکارینەهێنن. چونکە بەکارهێنانی بزواندن لەسەر پایەی ئەو گریمانەیە زەرورەت پەیدا دەکات کە بە تەنها گومان بۆ گرتن‌و سزادانی تاوانبار بەس نیە. هیچ سەرکردەیەکی تۆتالیتاری هەرگیز بیری لە هەڵوێستێکی لەوجۆرە نەدەکردەوە کە بەناچاری پەنا بۆ بزواندن بەرێت‌و لە داوێکی تۆکمەو مەحکەمدا دوژمنێکی وێناکراو دەستگیربکات. ئەوەی لەو تێبینیە تەکنیکییەی سەرەوە گرنگتر بێت، تۆتالیتاریزم پێشئەوەی دەسەڵات بگرێتەدەست، بەجۆرێك دوژمنانی ئایدیۆلۆجی خۆی دیاریکردبو کە چیدی پێویستی نەدەکرد لە رێگەی زانیاری پۆلیسەوە توێژە "گومانلێکراوەکان" دەست نیشان بکات. هەر لەم رووەوە دەبینین یەهود لە ئەڵمانیای نازی‌و پاشماوەی چینە فەرمانڕەوا کۆنەکان لە روسیا، بەهۆی ئەنجامدانی کاری دوژمنکارانەوە لە خانەی گومانلێکراوەکان نەبون، بەڵکو بەپێی ئایدیۆلۆجیای ئەو دوو رژێمە تۆتالیتارییە وەك دوژمنی "بابەتی" پێناسە دەکران. بەڵام جیاوازی گەورەی نێوان پۆلیسی نهێنی رژێمی دیسپۆتیزم‌و پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری لە دیاریکردنی وتەزای "گومانلێکراو" و "دوژمنی بابەتی" دەستنیشان دەکرێ. چونکە "دوژمنی بابەتی" بەپێی هێڵی سیاسی حکومەت، نەك لەسەر ئارەزوی خستنی حکومەت، دەستنیشان دەکرێ. بۆیە

تۆتالیتارییەت پێیوایە نابێت هیچ کەسێك لەرێگەی بزواندنەوە ترسناکی بیروباوەری ببزوێنرێ، یا رابردوە خراپەکەی گومانی حکومەت بجولێنێت، بەڵکو کەسێکە ئارەزوەکانی ژیانی، چەشنی "ماك و نیشانەکانی نەخۆشی" ترسناکە[97] فەرمانڕەوای تۆتالیتار بەکردەوە وەك کەسێك رەفتار دەکات کە ئەوەندە سەرکێشانە جنێو بە کەسێکی دی دەدا تا هەمو کەسێك بە دوژمنی بزانێت، ئنجا بە بیانوی بەرگری لەخۆکردن، بیکوژێت، رەنگە کەمێك چانسی ئەوەشی هەبێت کە بڕوای پێبکرێت. بێگومان ئەم رەوشە قەدەرێکی ناشیرینە، بەڵام لەدواجاردا ئەم واقیعە دێتەدی . رەنگە هەر کەسێك دەرفەتی ئەوەی بۆ برەخسێت بەوردی چاودێری کاروبارەکان بکات، تێبگات چۆن هێندێك کەسی خۆویست بە سانایی پێشبڕکێکارەکانیان فت دەکەن.

سەبارەت بە رژێمە تۆتالیتارەکان، هێنانی چەمکی "دوژمنی بابەتی" بۆ ناو زمانی تۆتالیتاریزم، لەدیاریکردنی ئەو ئایدیۆلۆجیایەی توێژە نەیارەکانی پێوەسفدەکرا، یەکلاکەرەوەتر بو. ئەگەر بە تەنها مەسەلەی رق و بێزاری بەرامبەر یەهود و بۆرجوازی لەئارادابێت، دەبێت رژێمە تۆتالیتارەکان لەدوای ئەنجامدانی تاوانێکی بەرفراوان لەدژی ئەو دوو دەستەیە، بۆ رێسای ژیان و حکومەتێکی سروشتی بگەرێتەوە. بەڵام تا ئەو شوێنەی ئێمە ئاگادارین، مەسەلەکە بە پێچەوانەوە بو. توێژی دوژمنانی بابەتی لە سنوری یەکەمین دوژمنانی ئایدیۆلۆجیای بزوتنەوە دوورتر دەڕوات، چونکە دوژمنانی نوێی بابەتی بەپێی هەلومەرجە گۆڕاوەکان ئاشکرا دەکرێن: نازییەکان پێشئەوەی قەلاچۆکردنی یەهود تەواو بکەن، رێوشوێنی پێویستیان بۆ پاکتاوکردنی میللەتی پۆلۆنیا دەگرتەبەر، هەر لەهەمان کاتدا هیتلەر پلانی بۆ کوشتنی هێندێك توێژی ئەڵمانی دادەڕشت[98] لەهەمان ناوکۆشدا بۆڵشەفیکەکان لە دوای لە ناوبردنی ئەو کەسانەی سەر بەچینی فەرمانڕەوایانی پێشو بون، کەوتنە تیرۆرکردنی کۆلاکەکان (لە سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەمدا)، ئنجا پاکتاوکردنی ئەو روسانەی بە

رەگەز پۆلۆنی بون (لە نێوان ساڵەکانی 1936 تا 1938)، لە گەرمەی جەنگدا کەوتنە لەناوبردنی تەتەرو ئەڵمانەکانی دانیشتوی ڤۆڵگا، لەدوای جەنگیش زیندانەکانی جەنگ‌و یەکە داگیرکەرەکانی لەشکری سور، لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیلیش یەهودەکان بون بە ئامانجی تیرۆرو پاکتاوکردن. تا ئەو جێگەیەی هەڵبژاردنی دوژمنان بۆ رای گشتی بڵاودەکرایەوەو بە مەبەستی پروپاگەندەی بزوتنەوە لە دەرەوەی وڵات سودی لێوەردەگیرا، ئەوجۆرە هەڵبژاردنە بە تەواوەتی هەرەمەکی نەبو، بەڵکو دەبوایە وەك دوژمنێکی چاوەروانکراو لەبەرچاو بگیرێت. هەڵبژاردنی توێژێکی تایبەت پەیوەندی بە هێندێك پێداویستی پروپاگەندەی بزوتنەوە هەبو . بۆ نمونە دەرکەوتنی لەپڕو بێپێشینەی دژە سامییەت لە حکومەتی یەکێتی سۆڤێتدا، پەیوەندی بەو نیازەوە هەبو تا هاوسۆزی وڵاتانی بلۆکی ئەوروپا سەبارەت بە سۆڤێت بەدەست بهێنرێ. دادگا نمایشییەکان دەچنە ریزی هەمان پلەبەندییەوە کە تیایە تاوانبارەکان ناچار دەکران وەك دوژمنی "بابەتی" دان بە گوناهەکانی خۆیاندا بنێن‌و هەر بەو شێوەیەش دەناسێنران. ئەوەش باشترین نواندن بو، چونکە ئەو کەسانەی بۆ ئەم کارە دەهێنرانە سەر شانۆ، دەبوایە ئەوەندە تەڵقینی تۆتالیتارانەیان پێبدرێ تا بتوانن بەشێوەیەکی "زاتی" لە ئازاری "بابەتی" تێبگەن‌و "بەخاتری حیزب" دان بە گوناهەکانی خۆیاندا بنێن[99] چەمکی "دوژمنی بابەتی" کە شوناسی بە پێی هەلومەرجی دەگۆڕێت . بەجۆرێك توێژێك پاکتاو دەکرێت، دەمودەست دەوڵەتی تۆتالیتاری شەڕ لەدژی توێژێکی دی رادەگەیەنێت . پەیوەستی بەو بارودۆخە باوە هەیە کە لەلایەن فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاریزمەوە بەردەوام دوبارەدەبێتەوە: لەبەر ئەوەی رژێمی ئەو فەرمانڕەوایانە، حکومەت بە مانا تەقلیدییەکەی نیە، بەڵکو بزوتنەوە لە ناوکۆی پێشکەوتنیدا روبەروی بەربەستگەلێك دەبێتەوە، پێویستە لەبەردەم خۆیدا لایبەرێت. ئەگەر لەچوارچێوەی رژێمی تۆتالیتاریدا بتوانرێت لە هەرجۆرە بیرکردنەوەیەکی یاسایی، وتەیەك بهێنێتە ئاراوە، پێویستە چەمکی "دوژمنی بابەتی" وەك ئایدیایەکی نێوەندی لەبەرچاو بگرێت.

گـۆڕینی گومـانلێکراو بـۆ دوژمـنی بابـەتی لـە دەوڵـەتی تۆتالیتاریـدا پەیوەندییـەکی پتـەوی بە گۆڕانکـاری پێگـەی پۆلیسەوە هەیـە. بە هـەر حـاڵ دەزگـای نهـێنی کـە بەراسـتی وەك دەوڵـەت لـەناو دەوڵـەت دەخوێنرێتـەوە، گوزارشتێکە نەك تەنها لە رژێمە دیسپۆتیزمەکان، بەڵکو دەربارەی حکومەتە دەستوری، یـا نیمچە دەستورییەکانیش راستی تیایـە. هـەر کـەرتێك زانیـاری نهـێنی بەدەسـت بهێنێـت، هەمیـشە توانـای یەکلاکـەرەوەی بەسـەر هـەمو کەرتـەکانی دی دەبێـت، زۆرجـار ئـەوەش هەڕەشـەیەکی ئاشـکرا لەسـەر ئەندامـەکانی دی حکومـەت دروسـتدەکات[100] بەپێـچەوانەوە، پۆلیـسی تۆتالیتـاری بە تـەواوەتی سـەر بە ئیـدارەی رێبـەرە و رێبـەر تـەنها کەسێکە کە دەتوانێـت بەفیعلی دوژمنی ئاینـدە دەستنیشان بکـات، یـا هـەروەکو ستالین، کادرەکـانی پۆلیسی نهێنیـشی بـۆ پاکتـاوکردن دیـاری دەکـرد. لـەو کاتـەوە دەوڵەتی تۆتالیتاری رێگەی نەدا پۆلیسی نهێنی سود لە بزواندن (الاستفزاز) وەربگرێت، لەو ئامرازانەش بێبەش کران کە دەرفەتی پێدەدان سەربەخۆیی خۆیان بەرامبەر بە حکومەت بپارێزن و بە مەبەستی پاراستنی وەزیفەکەیان بە توندی بەدەسەڵاتە بالاکانەوە وابەستەبون. پۆلیس لە وڵاتە تۆتالیتارەکاندا، چەشـنی سـوپای وڵاتـە ناتۆتالیتارەکـان، سیاسـتە رەچـاوکراوەکانی رژێـم جێبەجی دەکات و هەمو ئەو جیاکاری و خەسڵەتانەشی لەدەستدا کە لە رژێمە بیروکراتە دیسپۆتیزمەکاندا بە دەستی هێنابو[101]

ئـەرکی پۆلیـسی تۆتالیتـاری ئاشـکراکردنی تـاوان نیـە، بـەڵکو دەبـێ هـەر کاتێك حکومەت بڕیاریدا توێژێك لە دانیشتوان دەستگیر بکات، ئامادە بێت خزمەت بکات. خەسڵەتی پۆلیسی نهێنی لەرووی سیاسییەوە ئەوەیە کە تاکە دەزگایە بەشداری لە نهێنییەکانی دەسـەڵاتی بالا دەکات و لەوەش تێدەکات لەسـەر کـام هێڵـی سیاسـی پێدابگرێت. ئـەم مەسـەلەیە تـەنها پەیوەسـتی بـە کاروبـاری هێڵـی سیاسـی بـالاوە نیـە، بـۆ نمونـە پاکتـاوکردنی چـینێك یـا کەمینەیـەك (لـە سـییەکانی سـەدەی بیـستەمدا تـەنها کادرەکـانی چ.پ.ئـۆ

Gepeou زانیاریـان لەسـەر ئامانجـە راسـتەقینەکانی حکومـەتی سـۆڤێت هـەبو، هـەروەها لـە سـەرەتای سـاڵی 1940 ەوە تـەنها کادرەکـانی هـەواڵگری نهـێنی ئەڵمانیا دەیانزانی، پێویستە یەهود لەناوببرێت)، بەڵکو لە سایەی تۆتالیتاریدا گشت ئەو کاروبارانەی پەیوەستی بە ژیانەوە هەیە، هەمان رێچکە دەگرێتەبەر. بەتـەنها کارمەنـدانی پۆلیسی نهـێنی لەوە تێدەگەیشتن کە مۆسکۆ چ گەرەکە، کاتێك فەرمانی بۆ دەزگایەکی پیشەسازی دەردەکرد بەرهـەمهێنانی لولـە چـەند بەرامبـەر بکـەن، بـۆ نمونـە رەنگـە مۆسـکۆ بـە مەبەسـتی مـاڵ وێرانکردنـی بەرێوەبـەری کارخانـە فـەرمانی زیـاد کردنـی لولـە دەربکـات، یـا بـە مەبەسـتی پاکتاوکردنی هەمو ئیدارە، یا هەڵوەشانەوەی هەمو پرۆژەکە، یا لەسەر ئاسـتی نیشتماندا بەسەرتاسەری هەمو کارخانەکـانی ولاتدا بچێتەوە، بەجۆرێك رێگەی ئەوەی پێبدات هەڵمەتێکی پاکتاوکردنی نوێ دەست پێبکاتەوە.

یـەکێك لـە هۆیـەکانی دوانـەیی دەزگـا هـەواڵگرە نهێنیـەکان کـە وادەخوازێـت کارمەندەکانی یەکتری نەناسن، ئەوەیە، بالادەستی گشتگیر پێویستی بەوپەری نەرمی هەیەو دەبێ بەتەواوەتی دەستکراوە بێت: بەپێی ئەو نمونـەی سـەرەوە، لەوانەیە خودی مۆسکۆ لە کاتی دەرکردنی فەرمانی زیـادکردنی بەرهـەمهێنانی لولەدا، نەزانێت چ نیـازێکی لـە دەرکردنـی ئـەو فەرمانـە هەیـە، ئایـا لـە راسـتیدا لولـەی زیـاتری دەوێـت . کـە هەمیـشە پێویـستی پێـی هەیـە . یـا دەیـەوێت هەڵمەتێکی پاکتاوکردن دەست پێبکات. بەلام فرەیی دەزگا نهێنیەکان گـۆڕینی بڕیارەکـە تـا دواسـات مـومکین دەکـات، بـەجۆرێك یـەکێك لـە دەزگاکـان بیر لـەوە دەکاتەوە خەلاتی لینین پێشکەش بە بەریوەبەری کارگە بکات، ئەمە لە کاتێکدا یەکێکی دی خۆی بۆ دەستگیرکردنی ئامادەکات. دەرئەنجام پۆلیسی تۆتالیتار دەتوانێت لەیەك کاتدا کاری ناکۆك و دژ بەیەك ئەنجام بدات و لـە هەوڵەکانیشی سەرکەوتو بێت.

پۆلیسی نهێنی لـە سـایەی رژێمـە تۆتالیتارەکـان و رژێمـەکانی دی، هێنـدێك زانیاری گرنگ قۆرغدەکات. بەلام جۆری ئەو زانیاریانەی بە تەنها لەژێر دەستی

پۆلیسی نهێنییە، گۆڕانکاری گرنگی بەسەرا دێت: پۆلیسی نهێنی رژێمی تۆتالیتاری کاری بەسەر ئەوەوە نیە چ شتێك بە مێشکی قوربانیەکانی ئایندەی دەگوزەرێ (زۆرجار تەنانەت ناشزانێت قوربانیەکانی چ جۆرە کەسێکن و روبەروی چ چارەنوسێك دەبنەوە)، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا گەنجینەداری مەزنترین نهێنی دەوڵەتە. ئەم بارودۆخە، لەلایەکەوە، پلەوپایەی پۆلیسی نهێنی خۆبەخۆ زۆر بەرز دەکاتەوە، لەلایەکی دی، دەسەڵاتی راستەقینەی بەشێوەیەکی دیار کەمدەکاتەوە. تەنانەت دەزگاکانی هەواڵگری لە هیچ بوارێکدا لەرێبەر بەئاگاترو شارەزاتر نین. ئەگەر بمانەوێت بەدەستەواژەی دەسەڵات ئەوە وەسفبکەین، دەڵێین: ئەو دەزگایانە بۆ بنکی جێبەجێکاری کارە مەزنەکان دابەزیون.

لەرووی تیۆرییەوە، گۆڕینی تاوانی مومکین بۆ هەڵەی گومانلێکراو، لە گۆڕینی گومانلێکراو بۆ دوژمنی بابەتی گرنگترە. کاتێك گومانلێکراو دەستگیر دەکرێ و بەخاتری ئەوەیە ئامادەیی تیایە تاوانێك ئەنجام بدات کە کەموزۆر لەگەڵ کەسایەتی (یا کەسایەتی گومانلێکراو)[102] دەگونجێت، چونکە فۆرمی تۆتالیتاری بۆ تاوانی مومکین لەسەر بنەمای پێشبینی لۆجیکی گۆڕانی بابەتی بونیات نراوە. لەم بوارەشدا، دادگاییەکانی مۆسکۆ کە گاردی بۆلشەفیك و سەرانی لەشکری سوور تیا تاوانباردەکران، بە نمونەیەکی تەقلیدی سزادانی تاوانی لەتوانا (مومکین) دەژمێردرێت. بەڵام لەپشت ئەو تومەتە سەیروسەمەرە دروستکراوانەشەوە، زۆر بەسانایی دەتوانرێ ئەم حیسابە لۆجیکییە روونبکرێتەوە: رەنگە گۆڕانکاری لە یەکێتی سۆڤێتدا قەیرانی لێدروست بێت، رەنگە ئەو قەیرانەش کۆدەتایەکی لەدژی دیکتاتۆرییەتی ستالینی لێبکەوێتەوە، روداوێکی لەوجۆرە دەبێتە مایەی لاوازکردنی هێزی سەربازی وڵات و بارودۆخێك لەگەڵ خۆیدا دەهێنێتە ئاراوە کە حکومەتی نوێ ناچاردەکات ئاگربەستێك یا هاوپەیمانییەك لەگەڵ هیتلەردا مۆر بکات. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش ستالین رایگەیاند پیلانێك بە مەبەستی سەرنگونکردنی

حکومــەت و دەســت تێکــەڵاوکردنێك بــۆ هاوپــەیمانێتی لەگــەڵ هیتلــەر لــە ئارادایە[103] لەبەرامبەر ئەم توانا "بابەتیانە"شدا، تەنها هۆکاری زەینی هەبو، هۆکاری زەینی وەك دڵسۆزی تاوانباران، ماندویی و بێتوانایيان لە تێگەیشتنی روداوەکـان و قەناعـەتی تـەواویان بـەوەی بـەبێ سـتالین هـەمو شـتێك لەدەسـت دەچێت و راستگۆیی بێزارییـان بەرامبەر بە فاشـیزم . واتـە زۆرێك لـەو فاکتـە تەواوبوانـەی . متممـە . بەشـێوەیەکی سروشـتی تـاوانی لـۆجێکی مـومکین کەمدەکاتـەوە. کەواتـە گریمانـەی نێوەنـدی تۆتالیتـاریزم . هـەمو شـتێك لـە توانادایە . دەبێتە مایەی لابردنی هـەر بەربەستێك کە رەنگە رێگە لەهێنانـەدی بەرژەوەندییـە ترسـناك و پروپۆچـەکانی بگرێـت: هـەر تاوانێـك فـەرمانڕوا وێنـای بکـات، ئیـدی بێئـەوەی گـوێ بدرێتـە رودانـی یـا رونـەدانی تاوانەکـە، دەبـێ سـزا بدرێت. لەم حاڵەتەدا، تاوانی لەتوانا، چەشنی دوژمنی بابەتی هیچ پەیوەندییـەکی بـە لێهـاتویی و شایـستەیی پۆلیـسەوە نیـە، چـونکە پـۆلیس نـە دەتوانێـت تـاوان ئاشکرا بکات، نـە دەتوانێـت تاوان دابهێنێـت، نەدەشتوانێت هـانی روداندی بدات. ئیـدی لێرەوە هـەمو دەزگـا نهێنیـەکان بـە تـەواوەتی ملکەچـی دەسـەڵاتی سیاسـی دەبن. سەربەخۆیی پێشوییان، وەك دەوڵەت لەناو دەوڵەت، لەدەستدەدەن.

پۆلیـسی نهـێنی تۆتالیتــار تــەنها لێکــچونێکی نزیکــی لەگــەڵ دەزگــای هــەواڵگری نهــێنی دەوڵەتــە ناتوتالیارەکانــدا هەیــە. پۆلیــسی نهــێنی هــەر لەســـەردەمی فۆشــیە . وە (Fouche، 1820 ـ 1759، سیاســەتمەداری فرەنــسی و ئەنــدامی ئــەو رێکەوتننامەیــە بــو کــە پیلانــی ســەرنگونکردنی رۆبــسپیری رێکخــست و لەســـەردەمی ناپلیۆنیــشدا وەزارەتــی نــاوخۆی پێسپێردرابو)، هەمیشە بەشێوەیەکی تەقلیدی سودی لە قوربانییـەکانی خـۆی وەرگرتـوە و لـەپاڵ بودجـەی رەسمـی دەوڵەتیـشەوە لەرێگـەی دەسـت تێکـەڵ کردنی لە چالاکییە نایاساییەکانی لـە بابـەت قومـارو سۆزانیەت (دعـارە)[104]، داهاتێکی بۆ خۆی پەیدا دەکرد، ئەمە لە کاتێکدا دەبوایە رێگە لە درێژەپێدانی

ئەمجۆرە چالاکیانە بگرێت. ئەو شێوازە نایاساییە بۆ خۆمایەدانی (التمويل الذاتي)، هەر لە وەرگرتنی بەرتیلو شیرینی دۆستانەوە تا سەرانەی رووت، بە هۆکارێکی سەرەکی سەربەخۆیی هەوالگری نهێنی بەرامبەر بە دەسەلاتە گشتییەکان دەژمێردرێتو پێگەیانی وەك دەولەت لەناو دەولەتدا تۆکمەتر دەکرد. ئەوەی مایەی ئافتوشی (فضول) مرۆڤە، مایەدانی چالاکی پۆلیس لە رێگەی بەرتیل یا سەرانەوەرگرتن لە خودی قوربانیەکانی پۆلیس بەرامبەر هەمو گۆڕانکارییەکان وەك خۆی مایەوە. لەروسیای سۆڤیێتیدا، دەرامەتی پۆلیسی نهێنی بە تەواوەتی ملکەچی وەربەرهێنانی کاری زۆرەملێ بو، واشدەردەکەوت کە کاری زۆرەملێ جگە لە مایەدانی دەزگا زەبەلاحەکەی پۆلیسی نهێنی هیچ سودو مەبەستێکی دی نەبو[105] سەرەتا هیملەر خەزێنەی دەستەی پاراستن، کە لە کادرەکانی پۆلیسی نهێنی نازی پێکهاتبون، لەرێگەی مالو مولکە دەست بەسەرگیراوەکانی یەهودەوە دابیندەکرد، پاشان رێکەوتنێکی لەگەل داریە Darre، وەزیری کشتوکال بەست، بەپێی ئەو رێککەوتننامەیە داریە بە ملیۆن مارکی لە رێگەی کڕینی بەروبومی کشتوکالی لەدەرەوەی ولات دەست دەکەوت، بەوەی بە نرخێکی زۆر هەرزان لەدەرەوەی ولات دەیکڕیو بە نرخێکی زۆر بەرزیش لە ئەلمانیا دەیفرۆشتەوە[106]

سەرچاوەی ئەم دەرامەتە رێکوپێکە لە کاتی جەنگدا خەریك بو بەرەو نەمان دەچو. "ئەلبێرت سپێر"، جێگری "تودت" لەدوای سالی 1942، گەورەترین سەرکارو وەگەڕخەری هێزی کاری ئەلمانیا بو، سالی 1942 پێشنیازێکی لەو بابەتەی پێشکەش بە هیملەر کرد، ئەگەر هیملەر رازی بێت لەسەر ئەوەی دەستەی پاراستن چاوپۆشی لە هێزی کاری کرێکارانی ولاتە داگیرکراوەکان بکات کە زۆرجار کارێکی ناچیزیان ئەنجامدەداو ئەو خەلکانە ببخاتە بەردەستی سپێر، ئەوا ئەویش لە بەرامبەر سود وەرگرتن لە هێزی کاری ئەو

کرێکارانە، دەرسەدێك لە قازانجی کاری ئەو کەسانە بە هیملەرو دەستەی پاراستن دەدا[107] هیملەر لە کاتی قەیرانە داراییەکاندا، سەرباری ئەو سەرچاوەی داهاتە کە تا رادەیەك سیستماتیکی بو، ئامرازە کۆنەکەی دەزگای پۆلیسی نهێنیشی بۆ وەرگرتنی سەرانە بەکاردەهێنا: بە هەرحاڵ دەستەی پاراستن لە خەڵکانی خۆی "هاوبەندی دۆستانی دەستەی پاراستنی ئەڵمانی" دروستکرد، مەبەست لە دروستکردنی ئەو هاوبەندییەش ئەوەبو تا لەرێگەی باربودان (التبرع)، دارایی پێویست بۆ پێداویستییەکانی نوێنەرە ناوچەییەکانی دەستەی پاراستنی ئەڵمانیا پاشەکەوت بکرێت[108] ئەوەی شایانی ئامارە بێت پۆلیسی نهێنی نازی لە پرۆسەی مایەدانیە جۆراوجۆرەکاندا، تەنها لە دوا ساتەکانی جەنگدا، زیندانییەکانی بەکاردەهێنا، ئەویش کاتێك کە هیملەر دەسەڵاتی رەهای بەسەر بەکارهێنانی وزەی مرۆیی، لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکاندا نەما، چونکە کارکردن لە ئۆروگاکاندا جگە لە دوو هێندە کردنی زەحمەت و ئەشکەنجەدانی زیندانییە کلۆڵەکان، ئامانجێکی لۆجیکی نەبو[109]

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم سەرپێچییە دارایییەی پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری تاکە پاشماوەی تەقلیدی پۆلیسی نهێنی ناتۆتالیتاری نیە. ئەوەش ئەوەندە گرنگ نیە . چونکە بێزاری رژێمە تۆتالیتارەکان بەرامبەر بە مەسەلە ئابوری و داراییەکان ئەم سەرپێچییانەی لە تواناکردوە، بەجۆرێك ئەو شێوازانەی لە هەلومەرجی سروشتیدا بە نایاسایی لە قەڵەمدەدرێ و پۆلیسی نهێنی لە بەشە ئیدارییە لێهاتوەکانی دی جیادەکاتەوە، بەو مانایە نیە کە ئێمە ئاشنایەتیمان لەگەڵ بەشێکی سەربەخۆدا هەیە و لەلایەن هیچ دەسەڵاتێکی دییەوە چاودێری ناکرێت و لە کەشوهەوایەکی بێسەروبەرەیی و بێئابرو پڕئاژاوەدا دەژیت و چالاکی دەنوێنێت. بەپێچەوانەوە، پێگەی پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری تۆکمە و پتەوو هەواڵگریش بەتەواوەتی لەگەڵ ئیدارەی وڵاتدا لێکدرابو. رێکخراوی پۆلیسی نهێنی نەك هەر ئەو سنورە نابەزێنێ کە یاسا بۆی دیاریکردوە، بەڵکو

یاساش بەرجەستە دەکات، بۆیە ڕێزو ستایشکردنی گومان هەڵناگرێ. ئیدی ئەم ڕێکخراوە بە داهێنانی خۆی کوشتن ڕێکناخات، تاوان لەدژی دەوڵەتو کۆمەڵگە دنەنادات و دژایەتییەکی سەرسەختانەی هەمو جۆرە گەندەڵی و سەرانەو قازانجە داراییە قەدەغەکراوەکانیش دەکات. ئامۆژگارییەکەی هیملەر لە گەرمەی جەنگدا بۆ پیاوانی دەستەی پاراستن کە ئاوازێکی هەرەشەئامێزی زۆر واقیعانەی هەبو "مافێکی ڕەوشتی خۆمانە گەلی یەهود لەسەر ڕووی زەمین بسڕینەوە کە دەیانەوێت لەنێومان بەرن، بەڵام بەهیچ شێوەیەك ئەو مافەمان نیە وەزعی خۆمانیان پێ چاك بکەین، تەنانەت ئەگەر ئەو شتەی وەریدەگرین پاڵتۆیەکی خوری، کاتژمێرێك یا جگەرەکیش بێت"[110]

خاڵێکی ورووژاند لەمێژوی پۆلیسی نهێنیدا بێوێنە بو. ئەگەر پۆلیسی نهێنی هێشتا بە دوای "بیروباوەری وێرانکەر"دا دەگەرێت، پێویستی بەوە نیە خەڵکە گومانلێکراوەکە لە وێرانکاری بیروباوەرکەیان تێبگەن. بەحیزبی کردنی هەمو ژیانی هونەری و فیکری پێویستی بە نوێکردنەوەو پیاچونەوەی پێوەرەکان هەیە، ئەم پیاچونەوەیەش بە شێوەیەکی سروشتی پەیوەستە بە کوشتنی بەردەوامی ئەو روناکبیرانەی "بیروباوەری تێکدەرانە"یان هەیە، ئەوانەی تا دوێنێ بە ڕەسانەیەتی و ڕاستگۆیی وەسفدەکران. هەروەکو دەزانین ئەو ڕۆڵە پۆلیسییەی لە ڕژێمی تۆتالیتاریدا بە پۆلیسی نهێنی دەدرێت بە هەمو مانایەکی وشە کارێکی بێبەرو زیاد بوە، بەپێچەوانەی ئەوەشەوە کە هێندێك جار وێنادەکرێت، نابێت ئەمە بەو دەرئەنجامەمان بگەیەنێت، ڕۆڵە ئابورییەکەی جێگەی ئەرکە کۆنەکەی گرتۆتەوە. ڕۆڵی ئابوری پۆلیسی نهێنی لە ڕژێمی تۆتالیتاریدا تەنانەت لە کارە نەریتییەکەی پۆلیس گومان زیاتر هەڵدەگرێت. ئەگەر چی شتێکی ڕاستو دروستە کە کۆمیسیۆنی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ (پۆلیسی نهێنی)، بەشێوەیەکی دەوری دەرسەدێك لە دانیشتوانی سۆڤێت وەردەگرتو ڕەوانەی ئۆردوگا گەلێکی دەکرد کە بەناوی فریودەرانەی "ئۆردوگای زۆرەملێ"[111] ناسرابون، ئەگەرچی دەشێت ئەم

شێوازەی رژێمی سۆڤێتی مەبەستی چارەسەرکردنی بێکاری بێت، بەڵام هەمو کەسێك دەزانێت داهاتی ئەو ئۆردوگایانە لە داهاتی کاری ئاسایی ناو یەکێتی سۆڤێت زۆر نزمتر بو، بەجۆرێك کە بەزەحمەت بەشی دابینکردنی تێچوی دەزگای پۆلیسی دەکرد.

بەلام رۆڵی پۆلیسی نهێنی سیاسی نە جێگەی گومانەو نە بێکەڵکیشە، بەڵکو لە نێو سەرجەم دەزگاکانی دەسەلات لە رژێمی تۆتالیتاریدا بە"رێکخراوترین و کاراترین"[112] کەرتی حکومەت دەژمێردرێت. لە راستیدا دەزگای پۆلیس راستەقینەترین ئۆرگانی جێبەجێکاری حکومەت پێکدەهێنێت و هەر لەرێگەی ئەم دەزگایەشەوە هەمو فرمانەکان کاپرایی دەکرێت. لەبەرامبەر ئەوەشدا فەرمانڕەوای تۆتالیتار لە رێگەی تۆڕێك لە کارمەندانی نهێنی هێڵێکی پەیوەندی راستەوخۆی جێبەجێکار دروستدەکات کە پێچەوانەی بونیادی پیازئاسای زنجیرەی هەرەمی رووکار، بەتەواوەتی لە هەمو دەزگاکانی دی جیاوازو دابڕاوە[113] واتە کارمەندانی پۆلیسی نهێنی تاکە چینە بە تەواوەتی حوکمی دەوڵەتی تۆتالیتاری دەکات، بۆیە پێوەرو بەهاکانی کاریگەری لەسەر سەرتاپای شانەکانی کۆمەڵگەی تۆتالیتارییەوە دەبێت.

لەم روانگەیەشەوە، نابێت هێندە بەلامانەوە سەیر بێت کاتێك دەبینین هێندێك خەسڵەتی تایبەتی پۆلیسی نهێنی تایبەت، زیاتر سیفاتی گشتی کۆمەڵگەی تۆتالیتاریە تا تایبەتمەندی پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری بێت. لەجهانی تۆتالیتاریدا توێژی گومانلێکراو سەرلەبەری دانیشتوان دەگرێتەوە: هەر ئایدیایەك لە زنجیرە چالاکیەکانی مرۆڤدا لەو چوارچێوە رەسمییەی بەردەوام لە گۆڕاندایە، لابدات، گومانی لێدەکرێ. مرۆڤی گومانلێکراو بەپێی ئەو پێناسەیەی بۆی کراوە، کەسێکە توانای بیرکردنەوەی هەیە، بەجۆرێك کە رەفتارێکی نمونەییش مرۆڤ لە گومانلێکردن دوورناخاتەوە، چونکە ئەو وزە مرۆڤانەیەی وا لە مرۆڤدەکات بیربکاتەوە، هەر ئەوەش دەبێتە مایەی ئەوەی

بیروبـاوەری بگۆڕێـت. لەبەرامبـەر ئەوەشـدا، تـا ئـەو جێگەیـەی ئەسـتەم بێـت فەرمانڕەوا بتوانێت بەتەواوەتی ناو دڵی مرۆڤی حوکمدراو ئاشکرا بکـات . لـەم ناوکۆیەشدا ئەشکەنجەدان هەوڵێکی کلۆڵانەیەو بەدرێژایی مێژوو نائومێد بوە لە بەدەستهێنانی ئەوەی کە دەستی پێناگات . ئەگەر بەشداربون لـە بـەهاکان لـە ئارادا نـەبێتو رەفتاری پێشبینی کراویش کـە لەسـەر بەرژەوەنـدی تاکەکەس بونیات نرابێت، وەك واقعێکی کۆمەڵایـەتی بوونی نـەبێت (لـەواقعێکی دەرونـی رووت جیاواز بێـت)، ئیدی گومـان هـەر دەمێنێتـەوەو هـەرگیز نارەوێتـەوە. لـەم روەوە، لە وڵاتانی تۆتالیتاریدا، گومان بەرامبەر بە هـەمو بوارەکـانی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی دزە دەکـاتو سەرتاسـەری وڵات دەگرێتـەوەو تەنانـەت بـواری تایبەتی پۆلیسی نهێنیش تێدەپەرێنێت.

لە رژێمە تۆتالیتارەکاندا شێوازی دنەدان کە سەردەمانێك پەیوەست بو بـە پۆلیسی نهێنی ناتۆتالیتارییـەوە ، بـوە شـێوازی رەفتـاری مـرۆڤ بەرامبـەر بـە دراوسـێکەی، شـێوازێك مرۆڤ پێـی خـۆش بوایـە یـا نـا ناچـار دەکـرا پـەیرەوی بکات. کەواتە هـەمو کەسـێك بـە شـێوەیەك لـە شـێوەکان "کارمەنـدی دنـەدەری" ئەوی دییـە، چـونکە تەنانـەت ئاڵوگۆڕێکی دۆسـتانەی "بیروبـاوەری وێرانکـەر" (یا ئەوەی وەك بیروباوەری وێرانکار دەناسرێت)، رەنگە سەرنجی بەرپرسیاران بـەلای خۆیـدا راکێشێت. بێگومـان هاوکـاری خـەڵکی لـە پێنـاوی خەبـەردان لـە ئۆپۆزیـسیۆنە سیاسـییەکانو نمایـشکردنی خزمـەتی خۆبەخـشانە، کـارێکی تازە نەبو، بەڵام لە سایەی دەوڵـەتی تۆتالیتاریـدا هێنـدە رێکخـراوو بەنـەزم بـو، کـاری پۆلیـسی نهـێنی بێـسود کردبـو، لـە رژێمێکـی سـیخوری هەمەلایـەنو هەمەڕەنگــدا، هــەمو کەســێك ســیخورێکی نهێنییــەو هــەمو کەســێکیش هەستدەکات چاودێری دەکرێت، لەهەلومەرجێکی لەوجۆرە هەمو پیشەیەك زۆر مەترسیدارو سەرەخۆرەیەو باڵاکردنو کەوتنیش سەرسامکەرە، هەمو وشەیەك ناحاڵیبونێك دروستدەکاتو خوێندنەوەی دی بۆ دەکرێت.

سەیرترین نمونەی بەربلاوی شێوازو پێوەرەکانی پۆلیسی نهێنی لە کۆمەڵگەی تۆتالیتاریدا، دەتوانرێ لە کاروباری پەیوەست بە بارودۆخی پیشەیی بەدیبکرێ. زۆرجار سیخوری دوولایەنە (دەبڵ سیخوری) لە رژێمە تۆتالیتارەکاندا خزمەتی مەسەلەیەکی دەکرد کە دەبوایە بەهەمان ئەندازەی دەسەڵاتداران و تەنانەت لەوان زیاتریش، دژایەتی و ململانێی بکردایە. سیخوری دوو لایەنە زۆربەی کات سەوداسەری دوو بەرخواز بو: لەلایەکەوە دەیویست لەریزی حیزبە شۆڕشگێڕەکاندا بەرزبێتەوەو لەلایەکی دی پلەی بەرزتر لە دەزگا ئیدارییەکاندا بەدەست بهێنێت. بۆ ئەوەی لە هەر دوو ئاستەکەدا باڵا بکات، تەنها پێویستە هێندێك ئامرازی تایبەت بەکاربهێنێت کە لە کۆمەڵگەیەکی دروستدا ئەو ئامرازانە پەیوەندی بەخەیاڵ خاوی و نهێنی کارمەندێکی پایەنزمەوە هەیەو پێشکەوتنی پەیوەستە بەدیدوبۆچونی ئەو کەسانەی لە خۆی پلەوپایەیان بەرزترە: ئەو لە رێگەی پەیوەندییەکانی بەپۆلیسی نهێنییەوە دەتوانێت پێشبڕکێکاران و بەرپرسە حیزبیەکانی لەبەردەم خۆی لابەرێت و لەرێگەی پەیوەندی و تێکەڵبونی بە حیزبە شۆڕشگێڕەکانەوە، بەلانیکەمەوە چانسی ئەوەی دەبێت لە دەزگای پۆلیس لە بەڵای سەرۆکەکەی رزگاری بێت(114).

ئەگەر هەلومەرجی پیشەیی لە کۆمەڵگەی یەکێتی سۆڤێتی ئێستادا تاوتوێ بکەین، لێکچونێکی زۆر زەق لەگەڵ ئەو نمونەیەی لەسەرەوە وەسفمان کردوە، بەدیدەکەین. بە تەنها پایە بڵندەکان لە پلەوپایەیاندا قەرزاریاری هەڵمەتی پاکتاوکردن نین کە پایە بڵندەکانی پێش خۆیانی بەرکەنار کردوە، بەڵکو هەمو جۆرە باڵاکردنێك، لە هەمو قۆناغەکانی ژیاندا لەسەر ئەو شێوازە بەرێوەدەچێت. بەنزیکەیی هەر دە ساڵ کەرەتێك هەڵمەتێکی پاکتاوکردنی سەرتاسەری مەزن، وەزیفە بۆ نەوەی نوێی تازە دەرچو کە تینوی کارکردنە، دەدۆزێتەوە. ئالێرەدا خودی حکومەت هەلومەرجی پێشکەوتنێك دەهێنێتە ئاراوە کە پێشتر سیخوری نهێنی هەوڵی خۆڵقاندنی دەدا.

ئـەمجۆرە جێگـۆڕکێ توندوتیـژەو ڕێکخـراوە لـە هـەمو دەزگـا ئیدارییـە زەبەلاحەکاندا، ئەگەرچی ڕێگە لە گەشەپێدانی تواناو لێهاتویی دەگرێت، بەڵام خەسـڵەتو چـاکەی خۆیـشی هەیـە، لەوانـە: گـەنجێتی ڕێـژەیی فەرمانبـەران زامندەکات، ڕێگە لە سەقامگیربونی بارودۆخێك دەگرێت کە بەلانیکەمەوە، لە کـاتی ئاشـتیدا مەترسـییەکی گـەورە لەسـەر فـەرمانڕەوایانی تۆتالیتـار دروستدەکات، بەلابردنی بالآکردنو شایستەیی، ڕێگە لە نشونمای دڵسۆزییەك دەگرێـت کـە شـێوەیەکی ئاسـایی کارمەنـدی گـەنج بـە بەکارمەنـدی بەتەمـەن دەبەسـتێتەوە، ئـەو دڵـسۆزییەی لـە ئیدارەیـەکی ئاسـاییدا، پێـشکەوتنی کارمەندی گەنج لەسەر نیازپاکیو بیروباوەری کارمەندی بە تەمەن ڕاوەستاوە، هـەروەها ئـەمجۆرە گـۆڕانو جێگۆڕکێیـە یـەکجارەکی بـۆ هەتاهەتایـە مەترسـی بێکـاری لـە نێودەبـاتو بـۆ هـەر کەسـێکیش کارێـك دەسـتەبەر دەکـات لەگـەڵ توانـای پەروەردەییـدا بگونجێـت. لـە سـاڵی 1939، لـەدوای کۆتـایی هـاتنی هەڵمەتی پاکتاوکردنە مەزنەکەی یەکێتی سۆڤێت، ستالین خاترجەمانە ئەوەی تۆمـار کـرد کـە "حیـزب دەتوانێـت جێگـەی زیـاد لـە پێـنج سـەد هەزارگـەنجی بۆلـشەفیك لـە نێوەنـدە ئیدارییـەکانی دەوڵـەتو حیـزب بکاتـەوە"(115) ئـەو سـوکایەتییەی مـرۆڤ هەسـتی پێـدەکات بـەوەی بـە ناهـەق لەڕێگـەی لابردنـی مرۆڤێکی پێش خۆی، پلەوپایەی ئەوی دەستکەوتوە، هەمان شوێنەواری ئەو بەدرەوشتییەی هەبو کە لەنێوبردنی کاروپیشەی یـەهود لـە ئەڵمانیا کەوتـەوە: ئەمـەش ئـەو کەسـانەی پیـشەیەکیان دەسـکەوتوە والێـدەکات وشـیارانە هاودەستی تاوانەکانی حکومەت بکەن، ئیدی چ ئەو کارەیان پێخۆش بێت یا نـا، سـەرئەنجام ئـەم پرۆسـەیەش تـاکێکی سەرشـۆڕو ڕیـسوا ئـەوتۆ بەرهەمدەهێنێت کە تەنها بۆ ئەوەی پارێزگاری لە کارەکەی بکات زۆر دڕندانە بـەرگری لـە ڕژێـم دەکـات. بـە وتەیـەکی دی، ئـەم ڕژێمـە بـە هـەمو مانایـەك، ئاکامێکی لۆجیکی پرەنسیپی ڕێبـەرەو بە باشترین شێوە دڵسۆزی بۆ ڕێبـەر دەستەبەر دەکات. لەڕاستیدا ژیانی نەوەی نوێ پەیوەستە بە هێڵی سیاسی

رێبـەرەوە، ئـەو کەسـەی بەتـەنها دەتوانێـت دەسـت بـە هەڵمـەتی پاکتـاوکردنی خولقێنـەری وەزیفـە بکـات. ئـەم پرۆسـەیە ناسـنامەی بەرژەوەنـدی گـشتی و تایبـەتی بەدیـدەهێنێت، ئەوانـەی بـەرگری لـە یـەکێتی سـۆڤێت دەکـەن شـانازییەکی زۆری پێوەدەکـەن (بـەڵام لـە فـۆرمی نازیـدا، لـەناوبردنی جـوغزی ژیانی تایبەتی بو)، تا ئەو جێگەیەی هەر تاکێك، ئیدی پلەوپایەی چەند گرنگ بێت، تـەواوی هـەبونی بە قـەرزاری بەرژەوەنـدی سیاسـی رژێم دەزانێـت، بۆیـە کاتێك ئەو یەکبونەی بەرژەوەنـدی تاکەکەس و رژێم دادەروخێت، پاکتاوەکـەی دواتر دەیخاتەوە دەرەوەی بازنە، ئیدی رژێم دەگاتە ئـەو قەناعەتـەی لـە جهانی زیندوەکاندا جێگەی نابێتەوە. بەشێوەیەك کە زۆر جیاواز نەبو، کارمەندی دوو لایەنەی ناتۆتالیتاریش هەم لەگەڵ دەزگا ئەمنی و هەم لەگەڵ کێشەی شۆڕشـدا ئاوێتـە ببـو (چـونکە نـەبونی نـەریتێکی شۆڕشـگێڕانە دەبێتـە مایـەی ئـەوەی پیشەکەی لە دەست بدات). لەم مەیدانەشدا بە تەنها پێشکەوتنێکی درەوشـاوە بـەمردنێکی بێناونیـشان کۆتـایی دەهـات، چـونکە ئەسـتەم بـو بتوانێـت بـۆ هەتاهەتایـە ئـەم گەمـە دوولایەنەیـە بکـات. حکومـەتی تۆتالیتـار قـوڵترین گۆڕانکاری لە بواری دەروونناسی کۆمەڵایەتی ئەنجامدا، کاتێك بۆ هەر پیشەیەك جـۆرە مـەرجێکی دیـاریکرد کـە پێـشتر تـەنها لەگـەڵ خـەڵکانی پۆخڵـەواتی کۆمەڵگە دەگونجا. سایکۆلۆجیای کارمەندی دوو لایەنە کە ژیانی چەند ساڵێك لە خۆشگوزەرانی و پڕشکۆو بڵندپایە بە بەهای کورتی ژیـانی دەسـەنێت، بوە فەلسەفەیەکی نەستەقی کەسێتی نەوەی دوای شۆڕش لە روسیا و لەئەڵمانیاش لـەدوای جـەنگی جهـانی دوەم بـە پلەیـەك خـاوتر بـو، ئەگەرچـی مەترسییەکی زۆریشی هەبو.

پۆلیسی نهێنی رژێمی تۆتالیتاری لە کۆمەڵگەیەکدا خراپەکاری و گەندەڵی بڵاودەکردەوە کە پێوەرو رەوشـی ژیـانی سـەردەمانێك لەلایـەن پۆلیـسی نهێنی ناتۆتالیتارییـەوە قۆرخکرابـو. تـەنها لـە قۆنـاغی یەکـەمی رژێمـی تۆتالیتاریـدا، کاتێك ململانێ لەسەر دەسەڵات لـە ئارایـە، قوربانییـەکانی پۆلیـسی نهێنی لـەو

کەسانە بون کە گومانی ئۆپۆزیسیۆن بونیان لێدەکرا. بەڵام دواتر رژێم قۆناغی تۆتالیتاری بە راوەدونانی دوژمنی بابەتی دەستپێدەکات، دوژمنێك لەوانەیە (لەحاڵەتی نازییەکاندا) یەهودی یا پۆلۆنی بێت یا ئەوانەی بانگەشەی دژە شۆڕشیان بۆ دەکرا، " لە یەکێتی سۆڤێتدا تاوان بەجۆرێك دەخرایە پاڵ تاوانبار، تەنانەت بێئەوەی رەفتاری تاوانبارەکە هاندەری ئەوجۆرە تاوانەش بێت": رەنگە دوژمنانی شۆڕش لەو خەڵکانە بێت کە پێشتر دوکانێك یا خانوکیان هەبوبێت یا "باوكو دایك یا باپیرە گەورەیان پارچە زەوییەك یا شتێکی لەوبابەتەی هەبوبێت"[116]، یا لەریزی هێزە داگیرکەرەکانی لەشکری سوور کاریان کردبێت یا رەنگە روسی بەرەچەڵەك پۆڵۆنی بێت. فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاری تەنها کاتێك دەستبەرداری هەر دوو چەمکی دوژمنی بابەتیو تاوانی مومکینی لۆجیکی دەبن کە تۆتالیتاریزم بە کامڵترینو دوا قۆناغی خۆی بگاتو قوربانییەکانی پۆلیسی نهێنی رژێمیش، بەرێکەوتو تەنانەت بێئاراستەکردن تاوانو تەنها بەراگەیاندنی ناشایستەییان بە ژیان، هەڵبژێردرێن. بەهەر حاڵ ئەم توێژە نوێیەی "ناشایستەکان" لە حاڵەتی نازییەکاندا لەو کەسانە پێکهاتبون کە نەخۆشی دەرونییان هەبو یا نەخۆشی دڵو سنگیان لەگەڵدا بو، لەحاڵەتی یەکێتی سۆڤێتیشدا لەوجۆرە خەڵکانە بون کە رێژەیەکی دەرسەدیان لە دانیشتوان پێکدەهێناو دەبوایە دور بخرێنەوە، رێژەیەك لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی جیاواز بوو بەپێی بریاری پایە بڵندەکان پێویست بو لە شوێنی خۆیان ریشەکێش بکرێن.

بێگومان ئەم هەرەمەکییە بەردەوامە، دەتوانێت زۆر کاریگەرترو چالاکانەتر لە هەر رژێمێکی ستەمگەرانەی دی ئازادی مرۆڤ زەوتبکات. لە رژێمی تۆتالیتاریدا ئازادی بیروڕا بۆ ئەو کەسانەی ئازایەتی ئەوەیان تیایە گیانی خۆیان بخەنە مەترسییەوە، بە تەواوەتی لەنێو ناچێت. بەڵام بەکردەوە ئەمجۆرە ئازادییە بە نزیکەیی بەهای خۆی لەدەست دەدا، چونکە هەر کەسێك بە ویستی خۆی نەیاری بکات، هەمان سزا دەدرێت کە هەر تاکێکی دی، بە هەر

شێوازێك بێت، تامی دەچێژێت. بۆیە لەم رژێمەدا ئازادی بە تەنها بۆ ئەوپەڕی رادە کورت نەکراوەتەوەو نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی زامنی ئەو رەگەزانەش بکات کە قابیلی وێرانکردن نین، مەبەست لە توانای خۆکوژییە، بەڵکو ئەمجۆرە ئازادییە سیمای جیاکاری خۆی لەدەستدەدا، چونکە ئاکامی ئەمجۆرە کردەوەیە بەهەمان ئەندازەی ئەو کەسانەی ئازادی پیادە دەکەن، ئازار بە خەڵکانی بێتاوانیش دەگەیەنێت. ئەگەر هیتلەر دەرفەتی ئەوەی بۆ برەخسایە خەونی دانانی یاسایەکی گشتی تەندروستی لە ئەڵمانیا بهێنێتەدی، ئیدی کەسێك نەخۆشی سینگی هەبوایە، هەمان چارەنوسی کۆمۆنیستێکی سەرەتای سالآنی یەکەمی رژێمی نازی دەبو، یا چارەنوسی یەهودییەك لەدوا ساڵەکانی رژێمدا. بەهەمان شێوەش، ئۆپۆزیسیۆن لە رژێمی سۆڤێتیدا، دوچاری هەمان ئەو چارەنوسە دەبوەوە کە ملیۆنان خەڵکی سۆڤێت بە مەبەستی دەستەبەرکردنی پشکی دیاریکراو رەوانەی ئۆردوگای کاری زۆرەملێ دەکران. ئەو بە نەیاربونی خۆی تەنها زەحمەتی هەڵبژاردنی هەرەمەکییانەی لە کۆڵ پۆلیس دەکردەوە. لەم ناوکۆیەشدا بێتاوان و تاوانبار بەیەك ئەندازە ناشایستە بون.

لە راستیدا گۆڕینی چەمکی تاوان و تاوانبار شێوە نوێ و ترسناکەکانی پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری دەستنیشان دەکات. لە کاتێکدا تاوانباران بە تەنها سزا دەدرێن، ئەوا ناشایستەکان لەسەر رووی زەمین دەسڕێنەوە، تەنها یادەوەرییەکانیان وەك شوێنەوارێك لەکن دۆست و ناسیاوەکانیان بەجێی دەهێڵن، بۆیە یەکێك لە دژوارترین ئەرکی پۆلیسی نهێنی ئەوەیە کارێك بکات ئەو شوێنەوارەش لە نێوبەرێت کە ئەو خەڵکانە لەدوای خۆیان بەجێی دەهێڵن.

بەپێی راپۆرتی "ئۆخرانا" پۆلیسی نهێنی لەسەردەمی تزاردا (پێش G.P.U)، پۆلبەندییەکی نوێی داهێنا: بەپێی ئەو پۆلبەندییە، گومانلێکراو ناوی لە ناوەراستی کارتێکی گەورە دەنوسراو بازنەیەکی سور بەدەوری ناوەکەیدا دەکێشراو ناوی هاورێ سیاسییەکانیشی لە بازنەیەکی سوری بچوکتر دەنوسرا، بەلآم ناوی ناسیاوە ناسیاسییەکانی بە بازنەی سەوز

ئاماژەیـان پێـدەدرا، لـە بازنـەی قاوەیـشدا نـاوی ئـەو کەسـانە دیاریـدەکرا کـە پەیوەنـدییان بـە هـاورێی گومانلێکراوەکـەوە هـەبو، ئەوانـەی تەنانـەت خـودی تاوانبارەکەش نەیدەناسین و هەڵسوکەوتی لەتەکیانـدا نـەبو. پەیوەنـدی نێـوان هـاورێ سیاسـی و ناسیاسـی گومانلێکراوەکـان، لەلایەکـەوە، پەیوەنـدی نێـوان هــاورێی هاورێکــانی لەلایــەکی دی، بــە هێڵکــاری نێــوان ئــەم بازنانــە دەیاریـدەکران(117) بەرووکـەش سـنوری ئـەم شـێوازە لـە ئەنـدازەی کارتەکـە تێپەرینــەدەکرد، بــەڵام تــەنها کــارتی گومانلێکراوێــك، لــەرووی تیورییــەوە قەوارەیەکی مەزنی هـەبو، پەیوەنـدی نێـوان هـەمو دانیشتوانی روونـدەکردەوە، ئەمــەش رێــك هــەمان ئامــانجی پۆلیــسی نهــێنی تۆتالیتــاری بــو. پۆلیـسی نهـێنی تۆتالیتـار وازی لـەو خەونـە دێرینـەی پـۆلیس هێنـا کـە دەزگایـەکی درۆپێـو (کاشـف الاکاذیب) ئەوتۆ بێت توانای هاتنەدی هـەبێت: ئەو ئیدی هەوڵینەدەدا ئەوە ئاشکرا بکات کە فلانی چ جۆرە کەسێکە یا بیر لەچ شتێك دەکاتەوە. (رەنگـە دەزگـای درۆپێـو باشترین نمونەی ئەو دڵرەقییە بێت کە ئەو خەونە لەسـەر بیرو زەیـنی هـەر پۆلیسێك پیـادەی دەکـات، بـەڵام بەدڵنیاییـەوە ئـەم دەزگـا ئـاڵۆزە جگـە لـە خوێنـساردی یـا بەجۆشـهاتنی قوربانیـەکانی پـۆلیس ناتوانێـت شـتێکی دی بپێوێـت. لەراسـتیدا بەڵگـەو پاسـاوی لاواز کـە ئـەم دەزگایـە بـەرێوەدەبات، بـە تـەنها دەگەرێتـەوە بـۆ ئـەو ئارەزوە نالۆجیکیەی خوێندنەوەی فیکری مرۆڤ تاڕادەیەك لە توانا دەکات). بێگومـان ئـەو خەونـەی دێرینـە زۆر ترسـناك بـوو زۆر دەمێکـە پـۆلیس بـۆ ئەشـکەنجەدان و دزێوترین جـۆری دڵرەقی هانـدەدا، تـەنها کـارێکی هـەبو، ئەویش ئەستەمبوونی بـو. بـەڵام خـەونی پۆلیـسی تۆتالیتـاری هاوچـەرخ و تەکنیکـە هاوچـەرخەکەی، لەگـەڵ خەونە دێرینەکەی پۆلیس بەشێوەیەك ترسناك و تۆقێنەر بو کە شایانی بەراورد نیـە. ئـەمرۆ پۆلیـسی تۆتالیتـار خـەونی ئـەوەی هەیـە کـە تـەنها نیگایـەك بـە نەخـشە مەزنەکەی سەر دیواری نوسینگە بەسە بۆ ئەوەی لە هەر ساتێکدا بیـەوێت پەیوەنـدی دوورونزیکی یەکبەیـەکی تاکـەکانی کۆمەڵگـەی بـۆ رونبێتـەوە. لـەرووی تیوریـشەوە،

وادەرەكەوێت ئەم خەونە بەدینەیەت، ئەگەر چی جێبەجێ كردنی تەكنیكی روبەروی هێندێك زەحمەتی راستەقینە دەبێتەوە. ئەگەر ئەم نەخشەیە بونێكی واقعی پەیدا بكات، ئیدی خودی یادەوەریش نابێتە بەربەستێك لەبەردەم بەدیهاتنی بەرخوازی بالادەستی تۆتالیتاریزم بەسەر جهاندا، چونكە نەخشەیەكی لەوجۆرە دەتوانێت مرۆڤەكان لەسەر رووی زەمین بسرێتەوە بێئەوەی هیچ شوێنەوارێك لەدوای خۆیان بەجێبهێڵن، وەكئەوەی هەرگیز بونیان نەبوبێت.

ئەگەر مرۆڤ بتوانێت باوەڕ بە وتەی كارمەندە گیراوەكانی N.K.V.D بكات، دەبێ بڵێت، پۆلیسی نهێنی سۆڤێتی، بەشێوەیەك كە مایەی نیگەرانیە، لە بەدیهاتنی ئایدیای حوكمی تۆتالیتاری نزیك بۆتەوە. پۆلیسی نهێنی سۆڤێتی دۆسیەی نهێنی لەسەر تاكەكانی سەرتاسەری ئەو وڵاتە پانوپۆڕە هەبو كە هەمو جۆرە پەیوەندییەكی نێوان ئەو كەسەو كەسوكارو ناسیاوە راگوزەرەكانی و هاورێ راستەقینەو پەیوەندییە خێزانییەكانی تیا تۆمار كرابو، بۆیە تاوانبارەكان، تەنانەت پێشئەوەی دەستگیر بكرێن بە تاوانباری بابەتی وەسفكرابونو تەنها بە مەبەستی ئاشكراكردنی هەمان پەیوەندی زاریان وەردەگیرا. سەرئەنجام، دەربارەی بەهرەی یادەوەریش كە زۆر مەترسی لەسەر بالادەستی تۆتالیتاری هەیە، چاودێرانی بیانی پێیانوایە: "ئەگەر راست بێت (فیل) هەرگیز شتی بیر ناچێتەوە، ئەوا روسەكان پێچەوانەی (فیل)ن دەروونناسەكانی سۆڤێت هەوڵدەدەن لە بیرچونەوە بەتەواوەتی لەتوانا بكەنو بهێننەدی [118]

بۆ ئەوەی بزانرێ سرینەوەی تەواوەتی قوربانییەكان تا چ رادەیەك لەلای دەزگای بالادەستی تۆتالیتاری گرنگە، باشترە ئاماژە بەو نمونانە بكرێ كە رژێمی تۆتالیتاری لەبەر هەر هۆیەك بێت روبەروی یادەوەری ئەو كەسانە دەبێتەوە كە هێشتا لە ژیاندا ماون. لە كاتی جەنگدا یەكێك لە فەرماندەكانی دەزگای هەواڵگری نهێنی ئەڵمانیا هەڵەیەكی كوشندەی كرد بەوەی ژنێكی فەرەنسی لەوە ئاگادار كردەوە كە مێردەكەی لە یەكێك لە ئۆردوگاكانی گرتنی ئەڵمانیا گیانی لەدەستداوە،

ئەم بێئاگاییەش لێشاوێك فەرمانو رێنمایی بۆ فەرماندەی ئۆردوگاکان لێکەوتەوەو وشیاری دەکردنەوە کە چیدی نابێت لە هیچ هەلومەرجێکدا رێگە بدەن زانیاری بۆ دونیای دەرەوە دزە بکات[119] تا ئەو جێیەی پەیوەندی بەو بێوەژنە فرەنسییەوە هەبێت، مێردەکەی لە ساتەوەختی دەستگیرکردنییەوە لە ژیاندا نەمابو، یا راستتره بڵێن بیری لەوەش نەدەکردەوە کە پێشتر هەر ژیا بێت. بەهەمان شێوەش، ئەفسەرانی پۆلیسی سۆڤێتی، ئەوانەی لە رۆژی لە دایکبونیانەوە خوویان بەم رژێمەوە گرتبو، بەرامبەر بە خەڵکانی پۆڵۆنیای داگیرکراو، ئەوانەی بێهودە بەدوای چارەنوسی دۆستو کەسوکارە گیراوەکانیان دەگەڕان، جگە لەوەی مۆڕەیان لەو خەڵکە دەکرد، شتێکی دییان لەدەست نەدەهات[120]

لە وڵاتە تۆتالیتارەکاندا، هەمو شوێنێکی دەستگیرکردن کەپۆلیسی نهێنی بەریوەی دەبات، دەبێتە قەڵایەکی لە بیرچونەوەو هەر کەسێکیش بەرێکەوت رێی تێبکەوێت هیچ نیشانەیەك لە دوای خۆی بەجێناهێڵێت کە دەلالەت لە بوونی بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو نیشانەیە جەستە یا گۆڕێکیش بێت. لە روانگەی ئەو داهێنانە تازەیەی دەیەوێت لە شەڕەنگێزی مرۆڤ رزگاری بێت، شێوازە کۆنەکەی کوشتن، ئیدی سیاسی بێت یا تاوان، بەدڵنیاییەوە دەبێتە شێوازێکی ناکارا، چونکە تاوانبار بەلانیکەمەوە تەرمێك لەدوای خۆی بەجێدەهێڵێت، تەنانەت ئەگەر بشتوانێت هەمو شوێنەواری تاوانەکەی بسڕێتەوە، ئەوا دیسانەوە ناتوانێت ناسنامەی قوربانییەکە لە یادەوەری جهانێکی زیندوو بسڕێتەوە. بەپێچەوانەوە پۆلیسی نهێنی بەجۆرێك پەرجوئاسایانە کار دەکات وەکئەوەی قوربانییەکەی هەرگیز بوونی نەبوبێت.

پەیوەندی نێوان پۆلیسی نهێنیو کۆمەڵە نهێنییەکان پەیوەندییەکی ئاشکرا بو. هەر کاتێك پۆلیسی نهێنی بیویستایە پێگەی خۆی قایمو پتەو بکات، هەمیشە گۆپاڵی هەڕەشەی لەرووی بوونی کۆمەڵە نهێنییەکان رادەوەشاند. پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری یەکەمین پۆلیسە لە مێژوودا نە پێویستی بەپاساوە لەکارکەوتوەکانی گشت ستەمگەرەکانی مێژووەو نە

بەکاریـشیان دێنێـت. بەهـەر حـاڵ سـیمای گومنـاوی قوربانییـەکانی پۆلیـسی نهـێنی کـە بـە هـەمو مانایـەکی وشـە دوژمـنی رژێـم نـەبون، ئەوانـەی لـەلای بکوژەکانیـشیان ناسـنامەیەکی ناسـراویان نـەبو تـا بـە بڕیـارێکی هەرەمـەکی حکومەت لە جهانی زیندوەکان بسڕێنەوەو یادەوەرییان لـە جهانی مردوەکانـدا لـەنێوببرێت، نـەك هـەر لەسـەرووی هـەمو نهێنییەکانـەوە بـو، بـەڵکو لەسـەرووی توندترین بێدەنگیو تەنانەت لەسەرووی ژیانی ئەو سیستماتیکە دوانەییشەوە بو کە کۆمەڵە نهێنییەکان بەسەر ئەندامەکانی خۆیاندا دەیانسەپاند.

بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان لـەکاتی ململانێـی گەیشتن بـە دەسـەلاَت، بێئـەوەی دەستبەرداری کاری ئاشکرابن پێرەویان لە هێندێك دیاردەی کۆمەڵە نهێنیەکان دەکرد، ، تەنها لە دوای ئەوەی دەسەلاَتیان گرتەدەست کۆمەڵگەیـەکی نهێنیـان دروسـتکرد. کۆمەڵگـەی نهـێنی رژێمـە تۆتالیتارەکـان، جگـە لـەخودی پۆلیـسی نهێنی شتێکی دی نەبو، چونکە تاکە نهێنی کە لە وڵاتێکی تۆتالیتاریدا زۆر بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، بریتیە لەو زانیاریانەی پەیوەندی بە چالاکی پۆلیسو هەلومەرجی ئۆردەگاکانی گرتنی بە بەکۆمەڵەوە هەیە[121] هەر چەندە زۆربـەی دانیـــشتوان، بـــە تایبـــەتی ئەنـــدامانی حیـــزب، هـــەمو هێڵـــە گـــشتییەکانی بارودۆخەکـەیان دەزانـی . ئۆردوگـای گـرتنی بـە کۆمـەڵ بـوونی هەیـە، خـەڵکی وندەبێتو خەڵکانی بێتاوان دەگیرێن . بەڵام لە وڵاتـی تۆتالیتاریدا هەمو کەسێك دەزانێـت، تەنانـەت قـسەکردن لەسـەر ئـەو "نهێنیانـە"ش خۆبـەخۆ تـاوانێکی مەزنە. لەبەر ئـەوەی ناسینی هـەر یـەکێك لەسـەر جەختکردنـەوەو تێگەیشتنی هاوشێوەو هاوەڵـەکانی راوەسـتاوە، ئیـدی ئـەو زانیاریانـەی هـەموان بەشـداری تیادەکەن، هەر کەسێك لەلای خۆیـەوە پاریزگـاری لێدەکاتو هـەرگیز بۆ کـەس نایـدرکێنێت، سـیمای واقیعـی لەدەسـتدەداو بـە مۆتەیـەکی رووت دەگۆڕێـت. تەنها ئەوانەی زانیـاری زۆر نهێنیـان لەسـەر توێـژە تـازە ناشایـستەکانو لەسـەر رەوشی پراکتیکی کادرەکانی پۆلیسی نهێنی هەیە، دەتـوانن دەربـارەی ئـەوەی بـەکردەوە واقیعـی هـەمو کەسـێك دیاریـدەکات، پێکـەوە قسەبکەن. تـەنها ئـەو

کەسانە دەتوانن باوەڕ بەو شتانە بکەن کە دەزانن راستیەکی هەیە. ئەوەش نهێنیەکەیانەو بەمەبەستی پاراستنی ئەو نهێنیەش لە رێکخستنی نهێنیدا رێکدەخرێن. ئەوانە هەر بە ئەندام لەو رێکخستنە نهێنییەدا دەمێننەوە، تەنانەت ئەگەر خودی ئەو رێکخستنە دەستگیریان بکاتو ناچار بە دانپیانیان بکاتو سەرئەنجام پاکتاوی جەستەیشیان بکات. ئەوانە تا ئەو کاتەی پاریزگاری لە نهێنیەکانیان بکەن لە ریزی دەستەبژێردا دەمێننەوە، بۆیە پێڕەوی لە رێسایەکی نەگۆڕ دەکەن کە بەپێی ئەو رێسایە تەنانەت لە زیندان یا ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەڵیشدا هەرگیز ناپاکی لە رێکخستنەکەیان ناکەنو نهێنییەکانی ئاشکرا ناکەن[122]

پێشتر ئەوەمان باسکرد کە یەکێك لەو گومراییانەی روبەروی عەقلی دروستی جهانی ناتۆتالیتاری دەبێتەوە، ئەوەیە کە تۆتالیتاریزم ناعەقڵانی ئامرازە تایبەتەکانی پیلانگێری بەکاردەهێنێت. لەو دەمەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان خەباتیان بۆ دەسەڵات دەکردو بەرووکەش لەلایەن پۆلیسی نهێنییەوە روبەڕوی راوەدونان دەبونەوە، بەمەبەستی سەرنگونکردنی حکومەت زۆر بە کەمی سودیان لەئامرازە پیلانگێرە ئامێزەکان وەردەگرت، بەڵام ئەوەی لێرەدا مایەی سەرسوڕمانە، تۆتالیتاریزم لەدوای ئەوەی دەسەڵات دەگرێتەدەستو لەلایەن زۆرینەی حکوتەکانی دونیاوە بەرەسمی دەناسرێتو قۆناغی شۆرشگێڕێتی بەسەلامەتی تێدەپەرێنێت، پۆلیسێکی تەواو پێوانەیی وەك ناوکی حکومەتو دەسەڵاتەکەی دروستدەکات. بۆیە وادەردەکەوێت ئەم ناساندنە رەسمییەی رژێمی تۆتالیتاری، تەنانەت لە کارڕایی شەرمنانەی پۆلیسی رژێمی ناتۆتالیتاریش، هەڕەشەی گەورەتر لەسەر ناوەرۆکی پیلانگێری بزوتنەوەی تۆتالیتاری دروستبکات، چونکە ئەم ناساندنە، مەترسی داتەپینو لێکترازاندنی ناوەکی لەسەر رژێمی تۆتالیتاری دروستدەکات.

لەراستیدا رێبەرانی تۆتالیتاری تا چەند قەناعەتی رەهایان بەوە هەبێ کە پێویستە شێلگیرانە بەردەوام بن لەسەر ئەفسانەی تۆتالیتاریو پرەنسیپی ئەو جهانە ساختەیەی لە کاتی جەنگدا بە مەبەستی دەسەڵات گرتنەدەست

گەلاڵەدەكرا، هێدی هێدی ماناو پرەنسیپە تەواوەكانی ئەو جهانە ساختەشیان ئاشكرا دەكرد. چونكە ئیمانی ڕێبەرانی تۆتالیتار بەتوانای هەمە لایەنەی مرۆڤ و باوەڕی تەواویان بەوەی كە دەتوانرێ هەمو كارێك لەرێگەی رێكخستنەوە ئەنجام بدرێ، بەرەو تاقیكردنەوەیەكی دەبردن كە رەنگە خەیاڵی مرۆڤ بتوانێت هێڵە سەرەتاییەكانی دیاریبكات، بێئەوەی چالاكی مرۆڤ بتوانێت بەدیبهێنێت. ئاشكرابونی نادیارە دزێوەكان لە قەڵەمڕەوی كاروباری لەتوانا (مومكین) سروش لە دەربەستبونی (التزام) زانستگەرای ئایدلۆجیایەكەوە وەردەگرێ كە تا ئێستا دەركەوتوە ئەم زانستخوازییە زیاتر لە گومڕاترین تیۆرەی بانزانستیو بانفەلسەفی سەرچاوە دەگرێ، تا ئەوەی پشت بە لۆجیكو دانپیانانی واقیع ببەستێت. ئەوانە كۆمەڵگەیەكی نهێنی دادەمەزرێنن كە چیدی لە رۆژی روناكدا كارناكات. كۆمەڵگەی نهێنی پۆلیسی نهێنی یا سەربازانی سیاسی یا تێكۆشەرانی مەشقدیدەی ئایدیۆلۆجیا، بە مەبەستی ئەوە دروستدەبن تا لەرێگەی ئەوانەوە توێژینەوەی ئەزمونیو ناشیرینی تۆتالیتاری دەربارەی سنوری توانای كار، بەرەو ئەزمونی پراكتێكی ببرێت.

لەلایەكی دی، پیلانگێڕی تۆتالیتاری لەدژی جهانی ناتۆتالیتاریو بانگەشەی باڵادەستی بەسەر جهاندا، لە سایەی هەلومەرجی حوكمێكی تۆتالیتاریدا، هەروەكو چۆن لە بزوتنەوە تۆتالیتارەكاندا پێشنیازدەكرا، بە ئاشكراو كراوەیی دەمێنێتەوە. فەرمانڕەوای تۆتالیتاری چەمكی پیلانگێڕی بەسەر دانیشتوانی "لایەنگرە" سەربازەكانی لەسەر ئەو گریمانەیە پراكتیزە دەكات كە پیلانێك لەلایەن هەمو جهانەوە لەدژی وڵاتەكەیان لە ئارادایە. بنەمای پیلان لەدژی پیلان، بەشێوەیەك گەورە دەبێت كە هەمو هاوڵاتییەكی ئەڵمانی لەدەرەوەی وڵات پابەند دەكات وەك كارمەندێكی پۆلیسی نهێنی خاوەن ویژدان راپۆرت بۆ ناوەوەی وڵات بنێرێتو بەشێوەیەكیش تەماشای بیانی بكات وەكئەوەی سیخوری وڵاتەكەی خۆی بێت(123) دروستكردنی

پەردەی ئاسنین بۆ جیاکردنەوەی دانیشتوانی ولاتە تۆتالیتارەکان لە ولاتانی دی جهان، تەنها بەمەبەستی جێبەجێ کردنی ئەو بنەمایانەی سەرەوەیە، نەك لەمپەرێك بێت بۆ رێگەگرتن لە بلاوبونەوەی نهێنی دیاریکراو، ئیدی چ نهێنی سەربازی بێت یا نهێنی دی. نهێنی راستەقینەی رژێمە تۆتالیتارەکان، واتە هەمان ئەو ئۆردوگا گرتنە بە کۆمەلانەی بە تاقیگەی ئەزمونی بالادەستی گشتگیر دەژمێردرێن، هێندە لە چاوی خەلکی ولاتو هەمو جهان دەشاردرێنەوە کە چیدی شاردنەوەیان پێویستی بە پەردەی ئاسنین نیە.

زۆرجار ئاسایی بوونی جهانی ئاسایی بە سەرکەوتوترینو کاریگەرترین پاراستن لە دژی ئاشکراکردنی تاوانی بە کۆمەلی تۆتالیتاریزم دەژمێردرێت. "مرۆڤی ئاسایی تێناگات هەمو شتێك لە توانادایە"[124]، بەرامبەر تاوانە درێوەکانیش، باوەڕ بە چاو و گوێ خۆی ناکات، رێك وەك ئەو جەماوەرەی باوەڕ بە بینینو بیستنی جهانێکی ئاسایی ئەوتۆ ناکات کە جێگەی خۆی تیا نابێتەوە[125] بەلام ئەوەی رژێمە تۆتالیتارەکان والێدەکات نەتوانن تا ئەو رادەیە لە هێنانەدی جهانێکی ساختەو ئاوەژودا تاوبدەن، ئەوەیە کە جهانی دەرەوە، جهانی ناتۆتالیتاری کە بەگشتی بەشێکی گەورەی جهانی تۆتالیتاریش دەگرێتەوە، وەك خودی واقیع تەماشای ئارەزوەکانی دەکاتو واقیعییەتی شێتێکی واقعی پێقبول نیە، هەروەکو چۆن جەماوەریش جهانێکی ئاسایی پێقبول نیە. باوەڕنەکردنی عەقلی دروست بە تاوانە ناشیرینو درێوەکانی رژێمی تۆتالیتاری لەلایەن خودی فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاریشەوە گەشەی پێدەدرێ. ئەوانە رێگەنادەن هیچ ئامارێکی باوەڕپێکراو، هیچ واقعێكو هیچ ژمارەیەکی چاودێریکراو بلاوبێتەوە، بە جۆرێك تەنها هەوالی زەینی چاودێری نەکراوو ناباوەڕپێکراو، دەربارەی شوێنی زیندوە مردوەکان، بوونی هەیە.

بەخاتری ئەم سیاسەتە، تەنها بەشێك لە ئەنجامی ئەزمونی تۆتالیتاری دەناسرێتەوە. ئەگەر چی لەسەر ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەل هێندێك بەلگەنامەمان لەبەردەستە بۆ ئەوەی بتوانین جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە

بالادەستی گشتگیر لە توانایە (مومکینە)و شایانی ئەوەیە دەرفەتی ئەوەمان پێبدات، نیگایەك بە قوڵایی مومکینی رژێمی تۆتالیتاریدا بکەین، بەڵام هێشتا ناتوانین شارەزایی لەسەر ئاستی گۆڕینی کەسایەتی مرۆڤ لەمجۆرە رژێمەدا پەیدا بکەین. ئێمە هێشتا زانیارییەکی رێژەیی و ناچیزمان لەسەر ژمارەی ئەو خەڵکە ئاساییەی چواردەورمان هەیە کە ئامادەییان تیایە شێوەی ژیانی تۆتالیتاری قبوڵ بکەن. بەواتایەکی دی، بەرامبەر زامنکردنی ئەو خەونانەی تایبەتە بە پیشەکانیانەوە، قوربانی بە زۆربەی تەمەنی ژیانیان دەدەن. بۆیە زۆر بە سانایی مرۆڤ بۆی روندەبێتەوە تا چ ئاستێك راگەیاندنی تۆتالیتاری، تەنانەت هێندێك لە دەزگا تۆتالیتارەکانیشی بەدەم پێداویستییەکانی جەماوەری تازەی دەربەدەرەوە دەچێت، بەڵام ئەستەمە بزانین ژمارەی ئەو خەڵکانەی روبەروی هەڕەشەی بەردەوامی بێکاری دەبنەوە، بەسنگ فراوانییەوە "سیاسەتی دانیشتوان" قبوڵ دەکەن، ئەو سیاسەتەی وادەخوازێت ئەو خەڵکانەی لە ژمارەی پێویست زیاترن، بەشێوەیەکی سیستماتیکانە لەنێوببرێن. هەروەها هێشتا ژمارەی ئەو خەڵکانەش نازانین، لەپاشئەوەی تێدەکەن کە چیدی ناتوانن بەرگەی قورسی باری ژیانی هاوچەرخ بگرن بەخوایشتی خۆیان لەگەڵ رژێمێکدا دەگونجێن کە بۆ لەناوبردنی هەڕەمەکی و بەرپرسیارییەت دوودڵی ناکات.

بەگوزارشتێکی دی، ئەگەر چی ئێمە شێوەی چالاکی و رۆڵی تایبەتی پۆلیسی نهێنی تۆتالیتاری دەزانین، بەڵام هێشتا نازانین "نهێنی" ئەم کۆمەڵە نهێنییە، تا چ ئاستێك پەیوەندی بە حەزو پیلانگێری نهێنی جەماوەری سەردەمی ئێمەوە هەیە و لەتەکیدا دەگونجێت.

## 3 . باڵادەستیی گشتگیر

ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملیّو مەرگی رژێمە تۆتالیتارەکان وەك تاقیگەیەك، ئەو بیروباوەرە تۆتالیتارییە دەسەلمێنێت کە پێیوایە هەمو شتێك لە توانایە. لە راستیدا هەمو ئەزمونەکانی دی بە بەراورد لەگەڵ ئەم ئەزمونەدا پلەی دوەمیان هەیە . لەوانەش ئەزمونە نەگریسەکانی رایخی سێیەم لە بواری پزیشکیدا دەگرێتەوە کە وردەکارییەکانی لە دادگاییکردنی پزیشکانی رژێم خرایەروو . ئەگەرچی دەکرا لەم تاقیگەیانەدا هەمو شتێك تاقیبکرێتەوە.

باڵادەستی گشتگیر هەوڵدەدا مرۆڤەکان بە جۆرێك رێکبخات کە فرەیی و جیاوازی ناکۆتایان لە نێوبەرێت، وەکئەوەی هەمو مرۆڤایەتی تاکە کەسێك بێت: ئەمەش تەنها کاتێك لە توانادا دەبێت کە یەکبەیەکی مرۆڤەکان بەرامبەر هێندێك چالاکی دیاریکراو، پەرچەکرداری دیاریکراو و نەگۆڕ نیشانبدەن. بەمشێوەیە هەر کۆمەڵێك لەم کۆمەڵە پەرچەکردارانە دەرفەتی ئەوەی دەبێت بۆ کۆمەڵێکی دی بگۆڕێت. زەحمەتی هاتنەدی ئەم باڵادەستیە بریتیە لە دروستکردنی شتێك کە بونی نیە، واتە دروستکردنی جۆرە مرۆڤێك لەگەڵ ئاژەڵەکانی دی هاوجۆر بێت و تەنها یەك "ئازادی" هەبێت، ئەویش "پاریزگاریکردنە لەجۆری خۆی"[126]

باڵادەستیی تۆتالیتاری هەوڵدەدا لەیەك کاتدا بەدوو رێگە بەم ئامانجەی بگات: یەکەم، لە رێگەی ئامادەکردنی ئایدیۆلۆجیانەی دەستەبژێر، دوەم، لە رێگەی تیرۆری رەها لە ئۆردوگاکاندا. لە راستیدا ئەو دڕندایەتیەی پێکهاتەی دەستەبژێر دەینوێنێت، پراکتیزەکردنی تەڵقینی ئایدیۆلۆجییانەو پێویستە بە جۆرێك ئەزمونی پراکتیکی بژمێردرێت بۆ ئەوەی شایستەیی خۆی بسەلمێنێت، ئەمە لە کاتێکدا پێویستە دیمەنی ترسناکی ئۆردوگاکان وەك سەلماندنی "تیورەی" ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاری وەربگیرێت.

ئۆردوگاكـان تـەنها بـۆ لـەنێوبردن و سـوكايەتی كـردن بـە مـرۆڤ دروسـت نـەكرابون، بەڵكو كاریشیان ئـەوەبو لـە سـایەی هەلومەرجێكدا كە بەرووكـەش لەرووی زانیستیەوە لە ژێر چاودێریدابو، هەرەمەكی وەكئـەوەی گوزارشـت لـە هەڵسوكەوتی مرۆڤدەكات، لـە نـاخی مرۆڤدا لەنێوبەرن و كەسـايەتی مـرۆڤیش بەشتێكی رووت بگۆڕن و بیكەنە شتێك لـە ئاژەڵیش نەچێت، چونكە هـەروەكو دەزانین سەگەكەی پاڤلۆڤ ، بە جۆرێك پـەروەردەكرابو تەنها بە بیستنی زەنگ خـواردنی دەخـوارد، ئـەویش نـەك لەبەرئـەوەی برسـی بـو، بـەڵكو واپـەروەردە كرابو، بۆیە ئەو سەگە، ئاژەڵێك بو كە چییەتی گۆڕابو، سەگێكی ئاسایی نەبو.

بەلام لە هەلومەرجێكی ئاساییدا هەرگیز ئـەم چارەنوسە نایەتـەدی، چونكە تا ئەو كاتەی هەرەمەكی نەك تەنها بە ئازادی مرۆڤ ، بەڵكو بەخودی ژیان، واتـە تـەنها هەسـتكردن بەمانـەوە، پەیوەسـت بێـت، ناتوانرێـت بـە تـەواوەتی لـەنێو ببرێت. ئەم ئەزمونە تەنها لە ئۆردوگاكاندا لـە تواناداا دەبێت. ئۆردوگاكان بە تـەنها "ئـەو كۆمەڵگە تۆتالیتارییـە نیـە كـە تـا هەنوكـە بـەدیهاتبێت، بەڵكو بە گشتی بـە نمونـەی كۆمەڵگەیـەكی نمونـەیی بالادەسـتی گـشتگیریش دەژمێردرێـت ( David Rousset , la societe la plus Totalitaire encore Realisee). هـەروەكو چۆن سـەقامگیری رژێمـی تۆتالیتـاری پەیوەسـتە بـە گۆشـەگیركردنی جهـانی سـاختەی بزوتنەوە بە جهانی دەرەوە، ئەوا ئەزمونی بالادەستی گشتگیریش لە ئۆردوگاكانـدا پەیوەستە بەداخستنی دەرگای ئەو ئۆردوگایانە بـەرووی جهـانی ئـەوانی دی، واتـە جهـانی زینـدوەكان و تەنانـەت جهـانی دەرەوەی ئـەو ولاتـەش كـە خـودی تۆتالیتـار تیایـە بالادەسـتە. لـە راسـتیدا هـەمان گۆشـەگیری دەبێتـە مایـەی ئـەوەی هـەمو ئـەو هەوالانـــەی لـــە ئۆردوگاكانـــەوە دزەدەكـــەن بـــە نـــاواقیعی دەركـــەون و جێگـــەی بڕواپێكـردن نـەبێت. بـە هـەر حـاڵ یـەكێك لـە بەربەسـتە مەزنـەكان لەسـەر رێگـەی تێگەیـشتنی راسـتەقینەی بالادەسـتی تۆتالیتـاری كـە بـەردەوامی و كـەوتنی لەسـەر بوونی ئەو ئۆردوگایانە بەندە، لە هەمان گۆشـەگیرییەوە سەرچاوە دەگرێ، چونكە

بـەدوور نەزانـرێ ئـەو ئۆردوگایانـە، دەزگـای راسـتەقینەو ئەسـڵی دەسـەڵاتی ڕێکخستنی تۆتالیتاری بن.

ئـەو کەسـانەی لـە ئۆردوگـا زووڕەملێکـان ڕزگـار بـون، سەرگوزشـتەی جۆراوجۆر لەسەریان هەیە[127] ئەو سەربوردانەی متمانەی زیاتریان هەیە، نوسـەرەکانیان هەوڵـدەدەن کـەمتر گوزارشـت لـە شـتگەلێك بکـەن کـە درك و ئەزمونی مرۆڤ رەتیبکاتەوە، مەبەستمان لەو ئێشوئازارەیە مرۆڤ بە "ئاژەڵێکی دەستەمۆ" دەگۆڕێت[128] هیچ یەکێك لەو سەربوردانە نە تورەبونی بەرامبەر بـە تـاوان و نـە هاوسـۆزی بەرامبـەر بـە قوربـانی تیابەدیـدەکرا، ئـەو دوو هەڵوێستەی بە شێوەیەکی ئاسایی مرۆڤ بۆ خزمەتی دادخوازی هاندەدا. بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەر کەسێك قسەیەکی لەسەر ئۆردوگاکان بکردایە یا شتێکی لەسـەریان بنوسـیایە، بەچـاوی گومانـەوە تەماشـایدەکرا، تەنانـەت خـودی قـسەکەر لـەدوای گەڕانـەوەی بـۆ جهـانی زینـدوەکان، زۆرجـار دەربـارەی راستگۆیی نیازی خۆی دەکەوتە گومانەوەو لەخۆی دەپرسی نەوەکو مۆتەیەك جێگەی واقیعی گرتبێتەوە[129].

گومانی خەڵکی بەرامبەر بەخۆیان و واقیعی ئەزمونەکەیان، خاڵێك ئاشکرا دەکات کە هەمیشە نازییەکان درکیان پێدەکرد: ئەوانەی بڕیار دەدەن تاوان ئـەنجام بـدەن، لـەوە تێدەگـەن کـە باشـترە بـەجۆرێك لەسـەر بـەرفراوانترین و توندترین ئاست تاوان بکەن، مایەی باوەڕپێکردن نەبێت. ئەم کارەش نەك تـەنها هـەمو جـۆرە سـزادانێك کـە لەلایـەن سیـستمی یاساییەوە دەردەچێت، نـەگونجاو و بێمانـا دەکـات، بـەڵکو مـەزنیی رەهەنـدی تاوانـەکان و سـەلماندنی بێتـاوانی پیـاوکوژان لـە ڕێگـەی درۆکردنـەوە ئاسـانتر دەکـات و بڕواکـردن بـە راستی گوتـەی قوربانییـەکانیش زەحمـەتتر دەکـات. نازییـەکان بـە پێویـستیان نەدەزانی ئەم دوزێنەوەیە بپارێزن. هیتلەر بە ملیۆن دانە لە کتێبەکەی خۆی لـەناو خەڵکیـدا بڵاوکـردەوە کـە تیایـە هـاتبو پێویـستە لـەپێناوی سـەرکەوتندا

درۆی گەورە بكرێت. لەگەڵ ئەوەی خەڵكی ئەو وتانەی هیتلەرو بڵاونامە چەند بارەبوەكانی ناوی دەربارەی ئەوەی پێویستە یەهود وەك مێشولە بەگازی ژەهراوی لەناوببرێن، بەجیدی وەردەگرت، بەڵام دیسانەوە سەبارەت بە واقیعی كوشتنی بە كۆمەڵی یەهود لە كورەی گازدا، دوودڵو ڕاڕابو.

وەسوەسەیەكی بەهێز لە بوونماندا هەیە بۆ ئەوەی لەسەر ئەو شتانەی بە شێوەیەكی جەوهەری جێگەی بڕواپێكردن نیە، بە شیكردنەوەی لۆجیكی لیبرالیزم رازی بین. ئەوجۆرە لیبرالیزمەی بەچریكەی عەقلی دروست فریوماندەدا، لە زەینی هەر یەكێكماندا خۆی متكردوە. ڕێگەی گەیشتن بە تۆتالیتاریزم بە گەلێك قۆناغی نێوەنجیدا تێدەپەرێت كە دەتوانین زۆر لێكچونو پێشینەی جۆراوجۆر لەنێوان خۆیو قۆناغی تۆتالیتاری گشتگیردا بەدیبكەین. بێگومان تیرۆری خوێناویو ترسناك لە یەكەم قۆناغی باڵادەستی تۆتالیتاریدا، بۆ هێنانەدی یەك چارەنوس تەرخاندەكرێ، ئەویش شكست بە نەیار بهێنرێتو هەمو ئۆپۆزیسیۆنێك لە دوارۆژدا بە ئەستەمبكرێ، بەڵام تیرۆری گشتگیر لەدوای بەسەرچونی قۆناغی یەكەم دەستپێدەكات، رێك ئەو كاتەی رژێم ترسی لە هەڕەشەی ئۆپۆزیسیۆن نامێنێت. لەم ناوكۆیەدا، زۆرجار ئامارژەمان بەوە كردوە كە خودی ئامرازەكان دەگۆڕێ بە ئامانج، بەڵام لەدواجار، لەسایەی ناكۆكیو جیاوازیدا، تەنها ئەوەمان پێقبوڵە كە گوزارەی "ئامانج پاكانەی ئامراز دەكات" چیدی كارێكی شیاوو گونجاو نیە، چونكە تیرۆر "ئامانجی" خۆی لەدەستدەدا بەوەی چیدی ئامرازی خەڵك ترساندن نیە. بەپێی ئەو راڤەكردنە وادەردەكەوێت كە شۆڕش ، لەبابەت شۆڕشی فرەنسی، دەیەوێت رۆڵە تایبەتەكانی خۆی قووتبدات. لە راستیدا تیرۆر لەدوای تێپەربونی ماوەیەكی زۆر بەسەر قووتدانی هەر كەسێك، چی بەناوی كوڕی شۆڕش یا بەهەر بیانویەكی دی . بەباڵەكانی حیزبی روسیا، نێوەندی بریارو دەسەڵاتی حیزب یا سوپا یا بیروكراسی . دیسانەوە هەر بەردەوام دەبێت. زۆرێك لەو شتانەی ئەمرۆ لە تایبەتمەندی حكومەتی تۆتالیتاریە، لە مێژودا

پێـشینەیەکیان هەیـە. لـە مێـژودا هەمیـشە جـەنگی دەسـتدرێژیکارانەو دوژمنکارانـە هـەبوە، لـەدوای سـەرکەوتنیش کوشتنی بە کۆمـەڵی دانیشتوانی نـەیاری شکـستخواردو، هەمیـشە بـرەوی هـەبوە، تـا رۆمـەکان بـە داهێنـانی چەمکی لێبـوردنی دۆڕاو Parcere Subjectis ئـەوەیان کـەمێك سوککرد، بـەڵام لـەناوبردنی دانیـشتوانی رەسـەن لەگـەڵ کۆلۆنیـالیزمی ئـەمریکا، ئوسـتورالیا و ئـەفریقیا هاوکـات بـو. کۆیلایـەتی یـەکێك لـە کـۆنترین دەزگاکـانی مرۆڤایـەتیـەو هەمو ئیمپراتۆرە دێرینەکان لەسەر پایەی کاری ئەو کۆیلانە دامەزراوە کە بینـا گـشتییەکانیان دروسـتدەکرد، تەنانـەت ئۆردوگـا زۆرەملێکـانیش داهێنـانی بزوتنـەوەی تۆتالیتـاری نـەبو. ئـەو ئۆردوگایانـە یەکـەمینجار لـە جـەنگی بـوێر و سەرەتای سەدەی بیستەم بەدیارکەوتن (جەنگی بوێر، 1899 Boer War 1902، جـەنگێک کـە ئینگلیزەکـان لـەدژی بوێرەکـان یـا سـپی پێـستە کۆلۆنیانیـشینەکانی ئـەفریقیای باشـور هەڵیانگیرسـان))، لـەدوای ئـەوەش بەماوەیـەك دەسـەڵاتداران بەمەبەسـتی گلدانـەوەی "رەگـەزە ناشایـستەکان" لـە ئەفریقیای باشورو هیندستان پیادەیـان دەکـرد، ئیـدی لێرەوە بـۆ یەکەمینجار چەمکی "دەستبەسەراگرتنی خۆپاریزی" بەدیدەکەین کە دواتـر رایخـی سێیەم پـشتیپێدەبەست. لەراستیدا ئـەم ئۆردوگایانـە لـە زۆر رووەوە لەگـەڵ ئۆردوگـا تایبەتەکانی گرتنی بە کۆمـەڵی سـەرەتای سـەردەمی تۆتالیتاریـدا لەیەکدەچن، چونکە ئەمـەی دوایـی بـۆ گلدانـەوەی ئـەو "گومانلێکراوانـە" بـەکاردەهێنرا کـە نـادەتوانرا تاوانـەکانیان بـسەلمێنرێ‌و لەرێگـەی گرتنەبـەری رێـورەسمی دادخـوازی ئاساییەوە حوکمیـان بەسـەرا بـدرێت. هـەمو ئـەو شـتانە بـەروونی ئـامرازی بالادەسـتی تۆتالیتـاری بەرجەسـتە دەکـات‌و رەگـەزگەلێکـە فـەرمانرەوایانی تۆتالیتـار سـودی لێـوەردەگرن‌و لەسـەر رێـسای پرەنـسیپی هیچگەرای (نهلیزم) "هـەمو شـتێك رێگەپێدراوە" گەشـەپێدەدەن. تەنانـەت ئـەو پرەنسیپەش کـە تۆتالیتاریـەت لـە رابـردووەوە بـە میراتـی بـۆی مـابووەوە، وەك دەسـکەوتێکی خـۆی لێیـدەروانی. بـەڵام فـۆرمی تـازەی بالادەسـتی تۆتالیتـار

کاتێـك بونیـادی راسـتەقینە تۆتالیتارییـەت پەیـدا دەکـات، تەنانـەت لـەم پرەنسیپەشدا کە هێشتا پەیوەندی بە پاڵنەری سودگەرایانەی فەرمانڕەوایان و بەرژەوەنـدی کەسـایەتییانەوە هەیـە، هـەنگاوی زیـاتر دەنێـت و پێدەخاتـە بوارێکـەوە هێـشتا لـەلای ئێمـە نـەزانراوە: مەبەسـتمان ئـەو بوارەیـە کـە تیایـە "هەمو شتێك لە توانایە" بەوردی خەسڵەتی ئەم بوارە ئەوەیە کە ناتوانرێت بە هیچ هاندانێکی سودگەرا، بەرژەوەندی کەسێتی سنوردار بکرێت.

ئەوەی بەر عەقڵی دروست دەکەوێت، پرەنسیپی هیچگەرای "هـەمو شـتێك رێگەپێدراو" نیـە کـە لـە سـەدەی نوزدەهەمـدا ئامـادەگی هـەبو، بـە تایبـەتی لـە چـەمکی عـەقلی دروسـتی سـودگەرا. بـەڵام ئـەوەی عـەقلی دروسـت و خـەڵکی ئاسـایی رەتیدەکەنـەوە، بریتیـە لـە "هـەمو شـتێك لـەتواناداً" بێـت[130] لێـرەدا ئێمـە هەوڵـدەدەین لـەو فاکتـە دیاریکراوانـەی ئـەزمون یـا یـادەوەری هەنوکـەیی تێبگــەین کــە لــە ســنوری توانــای تێگەیــشتنمان بــەدەرە. لــەم ناوکۆیــەدا هەوڵـدەدەین شـتێك لەخانـەی تاوانـدا پۆلبەنـدی بکـەین کـە تـاکو ئێـستا هـیچ بابەتێکی تـاوان نـەیتوانیوە هـاورێکی شتێکی لـەوجۆرە بێـت. چەمکی کوشتن لەبەرامبـەر بەرهـەمهێنانی جەسـتەی بـە کۆمـەڵ بەکـەڵکی چـی دێـت؟ لێـرەدا هەوڵـدەدەین لـە هەڵـسوکەوتی زینـدانیـەکانی ئۆردوگـای گـرتنی بـە کۆمـەڵ و سـایکۆلۆجیای ئەنـدامانی دەسـتەی پاراسـتنی ئـەڵمانیا تێبگـەین، ئەمـە لەکاتێکدا پێویستە ئەو خاڵەش لەبەرچاوبگرین کە دەتوانرێ دەرون، بەبێ لە ناوبردنی جەستەش لەناوببرێت. لە واقیعدا وادەردەکەوێت دەرون، کاراکتـەر و تاکگـەرایی لـە هەلومـەرجی تایبەتیـدا، تـەنها بـە حـوکمی خێرایـی و خـاوی لێکترازان دەربکەون[131] بەهەرحاڵ، ئەمەش دەبێتە مایەی دەرکەوتنی مرۆڤی بێرۆح، واتە مرۆڤگەلێك کە چیدی لـەرووی دەرونناسیەوە قابیلی تێگەیشتن نیە و گەڕانەوەشیان، ئیدی چ گەڕانەوەیەکی سایکۆلۆجی بێـت یـا هـەر شـکڵێك بێـت لـە شـکڵەکانی گەڕانـەوە، تـا رادەیـەکی زۆر لـە زیندوکردنـەوەی لازاروس دەچێت (لازاروس . عـارز . پیاوێکـە لـە بیت عـەینا، لـە گوندەکـەی مـرێم، قاچـی

مەسیحی هەتوان کردوە، لەدوای مردنیشی مەسیح بە خوێنی مەسیحیبونی خۆی زیندوی کردۆتەوە، ئینجیلی یۆحنا 1/11/10 . 26). هەر جەختکردنێکی عەقڵی دروست، ئیدی چ دەروونناسی بێت یا کۆمەڵناسی، تەنها هانی ئەو کەسانە دەدا کەپێیان وایە"هەمیشە بیرکردنەوە لە نەگریسی" لە "مایەپوچی" تاکەکەسەوە سەرچاوە دەگرێ(132)

ئەگەر راست بێت ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ گرنگترین دەزگای رژێمی تۆتالیتارە، کەواتە راکردن لە "هەمیشە بیرکردنەوە لە نەگریسی" بۆ تێگەیشتن لە جەوهەری تۆتالیتاری کارێکی مەحاڵە. بەڵام یادەوەرییە راستیەکانی ئەو ئۆردوگایانە ناتوانێت هەمان کار ئەنجامبدات کە راپۆرتێکی بڵاونەکراوەی شاهیدێك دەتوانێت ئەنجامی بدات. بەهەر حاڵ ئارەزوی دورکەوتنەوە لە ئەزمون لە هەر دوو حاڵەتەکەتدا بەدیدەکرێت. نوسەرانی ئەم دوو جۆرە راپۆرتە بەتەواوەتی تێدەگەن، ئیدی چ بە سەلیقەی خۆیان بێت یا بە لۆجیك، بۆشایەکی ترسناك جهانی مردوە زیندوەکان لە جهانی راستەقینەی زیندوەکان جیادەکاتەوەو دەشزانن جگە لە زنجیرەیەك یادەوەریو روداو، ناتوانن شتێکی دی بخەنەروو، دیسانەوە ئەوەش لەلای بیسەرەکانیان جێگەی بڕوا پێکردن نیە. تەنها خەیاڵی لێوان لێو لە ترسی ئەوانەی بەوجۆرە راپۆرتە دەورروژان، وەلێ بەکردەوە ترس رەگی لەجەستەیان دانەکوتابو، ئەوانەی لە تیرۆری درندانەو نائومێدانە ئازاد بون . ئەو تیرۆرەی بێبەزەییانە هەمو ئەو کەسانەی پێشێلدەکرد کە پەرچەکرداریان بەرامبەر درزێوی واقیعی هەنوکەیی نەبوـ دەتوانێت بەوردی بیر لەو ترسە بکاتەوە. ئەمجۆرە بیرکردنەوانە تەنها لە پێناوی پەیبردن بە زەمینەی سیاسیو ئامادەسازی سەودای سیاسی سودمەند دەبێت. بەهەر حاڵ، بیرکردنەوە لە ترس بە تەنها ناتوانێت هیچ جۆرە گۆڕانێك لە کەسایەتی مرۆڤ دروستبکات، هەروەکو چۆن ئەزمونی واقیعی ترسیش گۆڕانکاری بنەرەتی لە کەسایەتی مرۆڤ ناخولقێنێت. گۆڕینی مرۆڤ بە کۆمەڵێك پەرچەکردار، چەشنی نەخۆشییەکی دەرونی، بەتەواوەتی لە

هەمو شتێکی جیادەکاتەوە کە کەسایەتی و خەسڵەتی پێکدەهێنێت. بەڵام هەر کاتێك چەشنی لازاروس لە جهانی مردوەکان هەڵدەستێتەوە، ئیدی کەسایەتی یا خەسـڵەتی، پـێش زیندوبونـەوەی چـۆن بـو، وەکخـۆی بـەبێگۆڕانکاری دەمێنێتەوە.

راسـتە هـەروەکو چـۆن تـرس یـا هەمیـشە بیرکردنـەوە لـەترس ناتوانێـت خەسڵەتی مرۆڤ بگۆڕێت و مرۆڤەکان خراپتر یا باشتر بکات، بەهەمان شێوەش ناتوانێـت کۆڵەکـەی کۆمەڵگەیـەکی سیاسـی یـا حیزبـی فەراهـەم بکـات. بۆیـە کـارێکی نـامۆ نیـە ئـەو هـەوڵ و کۆشـشانەی تێکەیـشتنێکیان بـۆ دامەزرانـدنی توێـژێکی دەسـتەبژێری ئـەوروپی، لەسـەر پایـەی ئـەزمون و ئاگـایی هاوبەشـی ئەوروپی لەبواری ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵدا هەیە، بێئاکام و نەزۆك بون، هەروەکو چۆن هەوڵەکانی دوای جەنگی جهانی، دەربارەی هەڵگۆزینی دەرس و پەنـد لـە ئـەزمونی نـەوەی نێونەتـەوەیی بـەرەی جـەنگ، بـەئاکام نەگەیـشتن و شکستیان هێنا. لە هەر دوو حاڵەتەکەدا ئەوە دەردەکەوێت کە ئەزمونی ترس، ناتوانێـت شـتێکی زیاتر لـە پروپوچی هیچگەرا بەرهەم بهێنێت[133] بەڵام لە دوای جـەنگ ئاکامـە سیاسـیەکان، چەشـنی ئاشـتیخوازی، نـەك لـە ئـەزمونی جەنگ، بەڵکو لە ترسی جەنگ سەرچاوەیان دەگرت. زانینی بونیادی جەنگە هاوچەرخەکان کـە بزوێنـەری ترسە، لـە جیـاتی ئاشـتیخوازی رووتـی دوور لـە واقیع، دەتوانێت بەو ئەنجامە بگات کە تاکە پێوەر بۆ ئـەوەی حوکم لەسـەر پێویـستی جـەنگێك بـدرێ: جـەنگ لـە دژی هەلومـەرجێك دەکـرێ کـە چـیدی مرۆڤەکان لە سایەی ئەو هەلومەرجەدا ناتوانن ژیـان بەسـەربەرن . ئەزمونەکانی ئێمە لەسەر دۆزەخی ئێشوئازاری ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵی تۆتالیتار، لە توانابونی هەلومەرجێکی لەوجۆرەمان بەجۆرێك بۆ روونەکاتەوە کە بوارێك بۆ گومـان ناهێڵێتـەوە[134] تـرس لـە ئۆردوگاکـانی گـرتنی بـە کۆمـەڵ و ئـەو دیدوبۆچـونانەی لێـوەی هەڵـدەقوڵێت سـەبارەت بـە سروشـتی باڵادەسـتی گـشتگیر، جیاوازییـە بێکەڵکـەکانی نێـوان چـەپ و راسـت پوچـەڵدەکاتەوە،

گرنگترین پێوەری سیاسیش بۆ هەڵسەنگاندنی روداوەکانی سەردەمی ئێمە، گەلاڵە دەکات کە رێگەی ئەودیوو لەسەروی ئەوجۆرە جیاوازانە دەگرێتەبەر، واتە: ئایا ئەو روداوانە هاوکاری بالادەستی تۆتالیتاری دەکەن یا نا؟

بەهەر حاڵ خەیاڵی لێوان لێو لەترس، ئەو جیاکارییە مەزنەشی هەیە کە دەتوانێت زۆرێك لەو راڤەکردنە دیالیکتیکی و سیاسییە ئالۆزانەی لەسەر خورافەی چاکە لە خراپە دەکەوێتەوە پایەدارە، دەکاتە بڵقی سەر ئاو. ئەمجۆرە سێرکی دیالیکتیکە کاتێك کەمێك پەسەند دەکرێ، مرۆڤ بتوانێت درێوترین بەلا بەسەر مرۆڤێکی دی بهێنێت، ئەویش کوشتنی بو. بەلام ئەمرۆ بە رەهایی دەزانین کوشتن بە ئاساییترین شەرەنگیزیی دەژمێردرێت. پیاوکوژێك کە مرۆڤێك دەکوژێت . لەهەمو حاڵەتێکدا دەبێ بمرێت . هێشتا لەو مەیدانی مردن و ژیانەی لەلای هەمومان ئاشنایە، هەنگاو دەنێت. چ بکوژو چ کوژراو جۆرە پەیوەندییەکی زەروریان پێکەوە هەیە کە دیالیکتیك خۆی لەسەر راگرتوە، تەنانەت ئەگەر هەردوکیان پەیوەندییەکی وشیارانەشیان لەنێواندا نەبێت. جەلاد جەستەی کوژراوێك لەدوای خۆی بەجیدەهێڵێت و هەرگیز بانگەشەی ئەوەش ناکات قوربانییەکەی بوونی نەبوبێت، تەنانەت ئەگەر شوێنەواری تاوانەکەیشی لەناوبەرێت، ئەو شوێنەوارەیە کە پەیوەندی بە ناسنامەی خۆیەوە هەیە، نەك بە یادەوەری و غەموخەفەتی ئەو کەسانەی دۆستایەتیان لەگەڵ قوربانیەکەیدا هەبوە. بکوژ ژیانی تاکێك لەناو دەبات، بەلام ناتوانێت واقیعییەتی بوونی لەناوبەرێت.

نازییەکان بەو وردەکارییەی پێیدەناسرانەوە، گشت چالاکی ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵیان لەژێر ناونیشانی "لەپشت پەردەی تاریکی شەودا . Nacht und Nebel" تۆمار دەکرد. توندی و ریشەیی کارڕاییەك کە ئەوجۆرە بەلایە بەسەر خەڵکیدا دەهێنێت، وەکئەوەی هەرگیز بوونیان نەبوبێت، بەمانای وردی وشە لەسەر رووی زەمین بیانسڕنەوە، زۆرجار لەیەکەم سەرنجدا زۆر بە ئاشکرا دەرناکەوێت، چونکە رژێمی تۆتالیتاری ئەڵمانی و روسی یەکرەنگ نین و

لەیەکناچن، بەڵکو لە کۆمەڵێك توێژی جیاواز پێکهاتون کە ڕێوشوێنی زۆر جۆراوجۆریان لەسەر پیادە دەکرێ. لە حاڵەتی ئەڵمانیادا، ئەو توێژە جیاوازانە، بێئەوەی هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندا هەبێت، پێکەوە لە ئۆردوگایەکدا ژیان دەگوزەرێنن، تەنانەت زۆرجار جوداکردنەوەی نێوان ئەم توێژانە لە جیاکرنەوەیان لەگەڵ جهانی دەرەوەدا، وردترو توندتر چاودێری دەکرێت. ئەڵمانیایەکان بەخاتری ڕەچاوکردنی هێندێك پێگەی ڕەگەزی، لەگەڵ میللەتانی ئەسکەندەناڤی بەشێوەیەکی جیاواز لە میللەتانی دی مامەڵەیان دەکرد، هەرچەندە دژایەتییەکی ئاشکرای ئەڵمانیاشیان دەکرد. بەڵام میللەتانی دی بە توێژی جیاوازی دی دابەش کرابون، سەرەتا ئەوانەی یەهود ئاسا بەرنامەی لەناوبردنیان لە کارنامەدا بڕیاری لەسەر درابو، دوەم ئەوانەی وەك پۆڵۆنی، ڕوسی و ئۆکرانییەکان لەناوبردنیان بۆ ئایندەیەکی نزیك دواخرابو، سەرئەنجام، ئەوانەشی لەبابەت فرەنسی و بەلجیکییەکان بون، هێشتا بەرنامەی لەناوبردنیان لە گەڵاڵەنامەی گشتگیری "دوا چارەسەر"ی نازی پیشبینەکرابو. لە بەرامبەر ئەوەشدا، پێویستە لەڕوسیا سێ شێوازی تا ڕادەیەك سەربەخۆ لەیەکتری جیابکەینەوە. گروپی یەکەم، ئەوانەی لە ئۆردوگاکاندا بە کاری زۆرەملێی ڕاستەقینە حوکمدرابون، سەربەخۆییەکی ڕێژەیی و سزایەکی دیاریکراویان هەبو. گروپی دوەم، ئەوانەی لە ئۆردوگاکانی گرتنی بەکۆمەڵدا زۆر بێبەزەییانە سود لە وزەی مرۆییان وەردەگیراو ڕێژەی مردن لە نێوانیاندا گەلێك بەرزبو: تەنها کارکردن ئامانجی ئەو ئۆردوگایانە بو. دوا گروپ، ئۆردوگای مردن کە زیندانیەکان تیایە بەشێوەیەکی سیستماتێك و بە بەردەوامی لەڕێگەی برسیکردن و پشتگوێ خستنەوە گیانیان لەدەستدەدا.

درێژی و ناشیرینی ڕاستەقینەی ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێ و مردن لەوەدایە کە زیندانییەکان لەمردوەکان زیاتر لە جهانی دەرەوە دادەبڕێن، تەنانەت ئەگەر بە ڕێکەوتیش لێیان ڕزگار بێت، ئەوا دیسانەوە تیرۆر پەردەی لە بیرکردن و فەرامۆشیان بەسەرا دادەداتەوە. لێرەدا کوشتن وەك کوشتنی

مێشێك كارێكی ناشەخسیە. رەنگە مردن لە ئاكامی ئەشكەنجەدان یا لەرێگەی برسـیكردنی سیـستماتیكییەوە بێـت، هــەروەكو چـۆن ئـەو مردنــەی لــە پاكتــاوكردنی زیــادبونی وزەی مرۆیــی ئۆردوگاكــان دەكەوێتــەوە. رەنگــە بەتـەواوەتی پێچەوانەكەیشی روبـدات، بـەوەی زینـدانی ئۆردوگاكـان لـەدوای ئـەوەی ژمارەیـەكی زۆریـان لـە ئاكـامی برسـی كردنـەوە گیـان لەدەسـتدەدەن، روبەروی كەمی زیندانی ببنەوە، ئیدی فـەرمان دەردەچێت بە هـەر نرخێك بوە ژمارەی مردن كەمبكرێتەوە[135] داڤید رۆسێل، گوزەراندنی رۆژانـی ژیـانی لـە ئۆردوگای گرتنی بە كۆمەڵی نازیدا بە "رۆژانی مردنمان" ناوزەدەكات، بە هـەر حاڵ هەمو شتێك لە واقیعدا رودەدا وەكئـەوەی توانایـەك هـەبێت بەردەوامی بە پرۆسەی مردن ببەخشێت و حاڵەتێك بسەپێنێت كە ژیان و مردن وەكیەك هەمو مانایەكی خۆیان لە دەست بدەن.

دەركەوتنی شەڕەنگیزی ریشەیی كە پێشتر لەلای ئێمە نادیارو نەزانراو بو، سنورێك دیاریدەكات بۆ ئەو بیرۆكەیەی پێیوایە، بەها گۆرانكاری بەسەرا دێت یا جیگۆركێی پێدەكرێت. لێرەدا نە پێوەری سیاسی و مێژوویی و نە پێوەری ئـەخلاقی لـە ئـارادا نیـە، بـەڵكو زیـاتر مەسـەلەیەك لـە سیاسـەتی هاوچـەرخدا گونجێنراوە كە پێشتر، بەمانای ئاساییەكەی، لـە سیاسـەتدا هـەرگیز لـە ئارادا نـەبوە، ئـەو مەسـەلەیەش: یا هـەمو شـتێك یـا هـیچ شـتێك. هـەمو شـتێك، واتـە ژمارەیــەكی بێــشوماری ئــەو توێــژو گروپانــەی دەیانــەوێت ژیــان پێكــەوە بگـوزەرێنن، هـیچ شـتێك، بـە مانـای هـەروەكو چـۆن بـەكارهێنانی بـۆمبی هایــدرۆجینی رەگــەزی مرۆڤایــەتی لــەنێودەبات، ســەركەوتنی شــێوازی ئۆردوگـاش بەشـێوەیەكی دی هـەمان چارەنوسـی بێبەزەییانـە بەسـەر مرۆڤـدا دەهێنێت.

نـاتوانرێ هـیچ شتێك بـە ژیـانی نـاو ئۆردوگاكانـەوە بـەراورد بكرێـت. بـەڵام دزێـوی و ناشـیرینییەكانی ئـەو ئۆردوگایانـە هـەرگیز بـە خەیاڵـدا نایـەت، لەبـەر ئەوەی لەودیوی ژیان و مردندا جێگەی خۆی كردۆتەوە. هـەروەها ناشتوانرێت

به تەواوەتی گوزارشت لەو دزێویانە بکرێت، چونکە ئەوانەی لەو ئۆردوگایانە رزگاریان بوەو بۆ جهانی زیندوەکان گەڕاونەتەوە، تەنانەت لە تواناددا نیە خۆشیان بڕوا بە ئەزمونی رابردویان بکەن. وەکئەوەی داستانی ئەستێرەیەکی دی بگێڕنەوە، چونکە لە جهانی زیندوەکاندا هیچ کەسێك زانیاری لەسەر ژیان‌و مردنی زیندانیەکان نیە، وەکئەوەی هەرگیز لەدایك نەبوبن. بۆیە هەمو بەراوردێك جۆرێك لە بەدحاڵیبوون‌و لادانی سەرنج لە تێگەیشتنی شتە سەرەکییەکانی ناو ئەو ئۆردوگایانە بەرهەمدەهێنێت. حکومدانی زیندانیەکان بە کاری تاقەتپڕوکێن‌و قورس یا کاری زۆرەملێ لە ئۆردوگا قێزەونەکاندا، دورخستنەوە یا کۆیلایەتی، لە یەکەم سەرنجدا رەگەزی بەراوردێکی بە نرخی لەگەڵ ژیانی ناو ئۆردوگاکانی کارومردن تیا بەدیدەکرێ، بەڵام لە توێژینەوەیەکی وردتردا پەی بە هیچ شوێنێك نابات.

سزادانی زیندانی بە کاری قورس، هەروەکو چۆن لەرووی قورسی کارەوە سنوردارە، لەرووی زەمەنیشەوە سنورێکی هەیە. ئەو کەسەی بە کاری قورس زیندانی دەکرێ، هێندێك ماف لەسەر جەستەی خۆی هەیەو ناخرێتە ژێر ئەشکەنجەو باڵادەستی رەهاوە. کەسی دورخراوە تەنها لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی دەگوێزرێتەوە، ئەو شوێنەیشی بۆی دەگوێزرێتەوە شوێنێکی ئاوەدانەو مرۆڤی تیایەو بە تەواوەتی لە جهانی مرۆڤ دوور ناخرێتەوە. کۆیلایەتی بە درێژایی مێژوو دەزگایەك بوە لە چوار چێوەی سیستمێکی کۆمەڵایەتیدا، کۆیلەکانیش وەك زیندانی ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ لە دیدو چاودێری هاورەگەزەکانی خۆیان بەدوور نەبون، وەك ئامرازێکی کار بەهای کەسێتی خۆیان هەبوەو وەك مەسەلەیەکی دارایش نرخێکی دیاریکراویان هەبوە. زیندانی ئۆردوگاکان هیچ بەهایەکیان نیە، مادامەکی هەمو کاتێك دەتوانرێ جێگەکەیان پڕبکرێتەوە، هەروەها کەس نازانێت بەچ کەسێکەوە پەیوەستن، چونکە هەرگیز نابینرێن. لە روانگەی کۆمەڵگەیەکی ئاساییەوە کەسێکی بە تەواوەتی زیادەیە، ئەگەر چی لە رۆژانی کەمبونەوەی

هێزی کاردا سودییان لێوەردەگیرێت، هەروەکو چۆن لە ئەڵمانیا و روسیای تۆتالیتاریشدا لەکاتی جەنگدا سود لە هەبونیان وەردەگیرا.

ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ، وەك دەزگایەك، تەنها بە مەبەستی بەرهەمهێنان لە کاری مرۆڤەکان دانەمەزرابون، بەڵکو وەزیفەی ئەو ئۆردوگایانە مایەدانی (تمویل) دەزگا تایبەتەکەی بو: کەواتە لەڕووی ئابورییەوە ئەو ئۆردوگایانە، بە پلەی یەکەم بەخاتری خۆیان بوونی هەبو. هەر کارێك لەو ئۆردوگایانە ئەنجامدەدرا، دەتوانرا لە هەلومەرجێکی دی، بەشێوەیەکی باشترو هەرزانتر ئەنجامبدرێ[136] ئەگەر لەمروەوە روسیا بە نمونە وەربگرین کە ئۆردوگاکانی دەست بەسەراگرتن وەك ئۆردوگاگەلێك بۆ پیادەکردنی کاری قورسی وەسفکراوە، بۆمان روندەبێتەوە کاری قورس مەبەستی سەرەکی ئەو ئۆردوگایانە نەبوە، هەر چەندە بیرۆکراسیەتی روسیا هەڵسوڕێنەرانی ئەو ئۆردوگایانەی لەژێر هەمان ناودا پاداشت دەکرد. لە راستیدا کاری قورس هەلومەرجێکی سروشتی ژیانی هەمو کرێکارانی روسیا بو، چونکە ئەوانە بە هیچ جۆرێك نەیاندەتوانی شوێنی کارکردنیان بە ئازادی هەڵبژێرن و حەزیان لە هەر کارێك بێت، بەخواستی خۆیان هەڵیبژێرن. بەڵام سیمای ئەو درندایەتییەی قابیلی بڕواپێکردن نیە، بە توندی بە ئاستی بێسودی ئابورییانەوە بەستراوەتەوە. لەم ناوکۆیەدا، نازییەکان ئەم بێسودییەیان بە ئاستی دژە سودگەرای ئاشکرا گەیاند، بەجۆرێك لە گەرمەی شەڕداو سەرباری کەمبونەوەی لە ڕادەبەدەری کەرەستەی بینا و ئامرازی گواستنەوە، مەزنترین و پرتێچوترین پرۆژەی قەڵاچۆکردنیان دامەزراند و راگواستنی ملیۆنان کەسیان بۆ ئەو شوێنانە رێکدەخست[137]. لەدیدی جهانی سودگەرای ناتۆتالیتارەوە، ناکۆکی نێوان ئەم شێوازە لە هەڵسوکەوت کردن و پێداویستییە سەربازییەکاندا ئەوەندە روون و ئاشکرایە کە هەمو ئەو کارانە تەنها بە شێتی پەتی راڤە دەکرێ.

ئەو کەشوهەوا ناواقیعی و ناتەندروستەی لە بزری ئامانجێکی ئاشکرا لەدایك دەبێت، پەردەیەکی ئاسنینی راستەقینەی ئەوتۆ دروستدەکات کە هەمو

جۆره ئۆردوگایەکی دەست بەسەراگرتن لە دیدی جهان دەشاریتەوە. ئەگەر مرۆڤ لە دەرەوە تەماشای ئۆردوگاو روداوەکانی بکات، تەنها لە رێگەی خەیاڵی ژیانی دوای مردنەوە Post Mortem دەتوانێت وەسفیان بکات، واتە لە رێگەی ژیانێك خەمەکانی دونیای لە دەست دابێت. لەم بارەیەوە دەتوانین لە رۆژئاوا سێ جۆر لە ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەڵ جیابکەینەوە کە بگونجێت لەگەڵ سێ چەمکی سەرەکی ژیان لە دوای مردن: هادیس یا مەملەکەتی مردنە داخراوەکان، بەرزەك و دۆزەخ. هادیس بەو ئۆردوگایانە دەوترێت کە تا رادەیەك شێوازی ساناو نەرمی تیا پیادە دەکرێت، تەنانەت سەردەمانێك لە وڵاتە ناتۆتالیتارەکانیشدا برەوی هەبو، لەو ئۆردوگایانە رەگەزە ناشایستە جۆراوجۆرەکان (پەناهەندەکان، دەربەدەرەکان، ناکۆمەڵایەتێکان و بێکاران) جیادەکرێنەوە، ئەم ئۆردوگایانە خەڵکانێکی بێفەڕو هیچ لەبارانەبوی لە خۆی دەگرت، ئەو خەڵکانەی لە جەنگدا بە سەلامەتی گیانیان دەرکردبو. بەڵام ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێی یەکێتی سۆڤێت نمونەی بەرزەکە، لەو ئۆردوگایانە پشتگوێ خستن و فەرامۆشکردنی سەلامەتی و خۆشگوزەرانی زیندانیەکان لەگەڵ کاری زۆرەملێی بێسەروبەر تێکەڵ دەبێ. نمونەی دۆزەخ، بە مانای تەواوی وشە، لەو ئۆردوگایانە بەرجەستە دەبێت کە نازییەکان گەیاندیانە دوا ئاست، لێرەدا بە مەبەستی پیادەکردنی مەزنترین ئەشکەنجە، سەرلەبەری ژیانی زیندانیەکان، زۆر بەوردی و بە مەنهەجی رێکدەخرێ.

ئەو سێ جۆرەی سەرەوە خاڵێکی هاوبەشیان هەیە: مرۆڤە دەست بەسەرگیراوەکان بەشێوەیەك لەو ئۆردوگایانە مامەڵەیان لەتەکدا دەکرا وەکئەوەی هەرگیز بوونیان نەبوبێت، کەس بەلایەوە گرنگ نەبو چییان بەسەردێت و یەکسەر مۆری مردنیشیان لێدەدرا، وەلێ رۆحێکی ئەهریمەنی پێشئەوەی بۆ ژیانی هەتا هەتاییان بەرێت، لە سنوری نێوان ژیان و مردندا گەمەی پێیان دەکرد.

دواجـار، نـەك تـەلی دڕکـاو-)، بـەڵکو هەسـتی نـاواقیعی ئەوانـەی لـەو ئۆردوگایانـە ژیـان دەگـوزەرێنن، دەبێتـە دینـەمۆی ئـەوجۆرە دڵڕەقییـەو مایـەی ئـەوەی پرۆسـەی لـەناوبردنی مرۆڤـەکان وەك کارڕاییـەکی زۆر ئاسـایی بێتەبەرچاو. بۆیـە ئـەو کردەوانـەی لـەو ئۆردوگایانـە ئەنجامـدەدران، تـەنها لـە خەیاڵێکی لادەرو شەڕەنگیزانەدا دەبنە کارێکی گونجاو. گرفتی سەرەکی لـە تێگەیشتنی روداوی ناو ئۆردوگاکانی تۆتالیتار بریتیە لەو تاوانانـەی چەشنی خەیاڵەکانی سـەرەوە لـە دونیـای وەهـم پێگـەیان گرتـوە، وەهمێك لەگـەڵ هـەمو ئەوانەشـدا، لـە دونیایـەکی هەسـتپێکراوی واقیعیـدا، دەسـتکەوتی مـادی بەدەستهێناوە، واقیعییەتی ئەم جهانـە بەرووکـەش ساختەیە لەگەڵ ئەوەی لـە دیـدی دراوە هەسـتپێکراوەکانەوە کـەموکورتیان نیـە، بـەڵام یـەکانگیری و بەرپرسیارێتی لەدەست داوە، بەبێ ئەوەش، واقیعێکمـان لـە بارستەی داتایـەك بـۆ دەمێنێتـەوە کـە قـابیلی تێگەیـشتن نیـە. دەرئـەنجامی ئـەم بارودۆخـە ساختەیەش لـە واقیعدا جێگەیـەك ئامـادە دەکـات بـۆ ئـەوەی مرۆڤەکان تیایـە ئەشکەنجەبدرێن و بکوژرێن، ئەمە لـە حاڵێکدا ئەشکەنجەدەرو ئەشـکەنجەدراو، بە تایبەتی خەڵکی دەرەوەی ئەم جێگەیە، تاکە وێنایەکیان لەسەر روداوەکـانی ئەو شوێنە هەیە: شتێك رویداوە جگە لە وازییـەکی بێبەزەییانـە یـا وڕێنەیـەکی ناماقوڵ هیچی دی نیە[138]

ئـەو فیلمانـەی هاوپـەیمانان لـەدوای کۆتـایی هـاتنی جـەنگی جهـانی لـە ئەڵمانیا و شوێنەکانی دی نمایشیان دەکرد، بە ئاشکرا ئەوە دەردەخـەن کـە نـاتوانرێ کەشـوهەوای شـێتانەو ناواقیعانـە بـە لێکۆڵینـەوەی پـەتی وەسـف بکرێت. لەلای بینەری بێلایەن، ئەو وێنانەی ئەم فیلمە دیکۆمێنتیانە لە واقیعی ئـەو ئۆردوگایانـەوە گرتبویـان، بـە ئەنـدازەی وێنـەی یەکسـەری دانیـشتنێکی نهێنیئامێزی نوسینەوەی نوشتەو جادویـەك، قایلکـەر بون[139] بە هـەر حاڵ هەسـتی هاوبـەش بـەم پاسـاوە بەجێیانـە پەرچـەکردار بەرامبـەر درێوییـەکانی بۆخنواڵـد واشـویتز نیشاندەدا: "ئـەو خەڵکانـە چ جـۆرە تاوانێکیـان کـردوە تـا

بەمشێوەیە سزا بدرێن!"، ئەمە لە کاتێکدا خەڵکی لە ئەڵمانیاو نەمسا، لەوپەڕی وەیشومەی برسێتیو زۆری ژمارەی دانیشتوانو نەفرەتی قوڵ، دەیانوت: "جێگەی داخە کە چیدی یەهود بەگاز ناکوژرێت"، بۆیە راگەیاندنی پشت بەستو بە بەڵگەنامەی ناکاراو ناکاریگەری هاوپەیمانان لە هەمو شوێنکدا روبەروی شان هەڵتەکاندنی خەڵکی دەبووەوە.

لەلایەکەوە، راگەیاندنی راستەقینە ناتوانێت مرۆڤی ئاسایی بە واقیعیبوونی ئەو تاوانانە قایل بکات، چونکە ئەو تاوانانە هێندە ترسناکن کە بۆ ئەوجۆرە مرۆڤانە قابیلی باوەڕپێکردن نین. لەلایەکی دی، کاریگەری ئەو راگەیاندنە زۆر ترسناکە لەسەر ئەو کەسانەی لە رێگەی خەیاڵی تایبەتی خۆیانەوە دەزانن چ کارێکیان بۆ دەکرێ، ئیدی بە تەواوەتی ئامادەیی ئەوەشیان تیایە بڕوا بە واقیعیك بکەن کە بەچاوی خۆیان بینیویانە. لەناکاو ئەو کۆمەڵە خەڵکە بۆیان ئاشکرا دەبێت، ئەو شتانەی خەیاڵی مرۆڤ هەزاران ساڵە لە مەڵبەندی دەسەڵاتی خۆی دووریخستونەتەوە، رێك لە هەمان شوێنو لەسەر هەمان خاك دەتوانرێ رێکبخرێو دارێژرێتەوەو دۆزەخو بەرزەك، تەنانەت تا رادەیەکیش وێنەی جاویدانەیان، بە نوێترین ئامرازی لەناوبردنو میتۆدی چارەسەری دەرون، فەراهەم دەکرێن. لە روانگەی ئەو کەسانەوە (ژمارەی ئەو خەڵکەش لە شارە گەورەکاندا زۆر لەوە زیاترە کە پێمان خۆشە وێنای بکەین) دۆزەخی تۆتالیتار تەنها ئەو واقیعییەتە دەسەلمێنێت کە توانای مرۆڤ زۆر لەوە زیاترە کە تا هەنوکە ئازایەتی وێناکردنیان بۆی هەبوە، مرۆڤ دەتوانێت هەوەسی دۆزەخیانەی بهێنێتەدی، بێئەوەی ئاسمان داڕوخێت یا زەوی شەقبەرێت.

ئەو لێکچونەی چەندین کەرەت لە حیکایەتە جۆراوجۆرەکانی جهانی مردوەکان دوبارەدەبێتەوە، وادەردەکەوێت نائومێدانە هەوڵدەدا شتێك بڵێت لەگەڵ گوتاری مرۆڤدا نەگونجێت. رەنگە هیچ شتێك ئەوەندەی لەدەستدانی ئیمان بە رۆژی حیساب نەتوانێت بە باشی جەماوەری هاوچەرخ لە جەماوەری

سەدەکانی پێشو جیابکاتەوە: خراپترین شت ترسیان لەدەستداو باشترین شتیش لەدەستدانی هیواو ئومێد بو. بۆیە ئەو جەماوەرەی نەتوانێت وەك رۆژانی رابردو بێهیواو بێترس بژێت، بەرەو رووی هەر پرۆژەیەك کێش دەکرێت کە بەڵێنی بە هەشتێکی دەستکردی مرۆڤی پێیە، ئەو بەهەشتەی زۆرجار تامەزرۆیی بوە، لەگەڵ ئەو دۆزەخەش کە زۆرجار ترسی لێی هەبوە. رێك هەروەکو چۆن هێندێك دیاردەی زانراوی کۆمەڵگەی بێچینی مارکس لێکچونی سەیرو نامۆی لەگەڵ کۆمەڵگەی سەردەمی پیامبەراندا هەیە، واقیعی ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵیش لە هەمو شتێکی دی زیاتر لەگەڵ وێنەکانی سەدەکانی ناوەراست هاوشێوەو لەیەکدەچن.

تەنها شتێك لەم وێنانەدا ناتوانرێت دابهێنرێتەوە، ئەوەیە کە چەمکی نەریتی، دۆزەخ لەلای مرۆڤ شیاو دەکات، واتە هەمان دادوەری رۆژی حیسابو ئەو بیرۆکەیەی پێیوایە پێوەرێك لە دادوەری رەها لەگەڵ توانای میهرەبانی بێکۆتا تێکەڵ بوە. سەبارەت بە مرۆڤ هیچ تاوانو گوناهێك هاوتای ئەشکەنجەدانی هەتاهەتایی دۆزەخ نیە. لێرەدا عەقڵی دروست قەڵەمی ناڕەوایی بەسەر ئەو تاوانانەدا دەهێنێتو دەپرسێت: "ئەو مرۆڤانە چ جۆرە تاوانێکیان کردوە تا بەمشێوازە نامرۆیانەیە ئازار بچێژن؟"، ئەمەش بێگوناهی رەهای قوربانییەکان دەردەخات: "هیچ مرۆڤێك شایستەی ئەمجۆرە سزا بێبەزەییانە نیە" سەرئەنجام درێوی بەرێکەوت هەڵبژاردنی قوربانی ئۆردوگاکان لە بارودۆخێکی پڕترسدا، دەخرێتە ژێر پرسیارەوە: بۆچی دەبێ ئەمجۆرە سزایە لەسەر ئەو کەسەی لەبەردەستە، پیادەبکرێت، ئیدی چ ئەو کەسە شایستەی ئەو سزایە بێت یا بە هیچ جۆرێك شایستەی ئەو سزایە نەبێت؟

ئەو پرۆسەیەی مرۆڤ بۆ ئەمجۆرە سەرئەنجامانە ئامادە دەکاتو ئەو شێوازانەی پشتی پێدەبەسترێت بۆ ئەوەی مرۆڤ لەگەڵ ئەوجۆرە حاڵەتە بگونجێنیت، ئاشکراو لۆجیکی دەردەکەوێت، ئەگەر لەگەڵ دوا سەرئەنجامی سەرشێتانەی رژێمی تۆتالیتار، واتە کۆمەڵگەی ئۆردوگا، بەراورد بکرێت.

پێشئەوەی بەرهەمهێنانی تەرمی بە کۆمەڵی واقیعی لە توانادا بێت، کۆمەڵگە خولێکی ئامادەکاری بۆ خولقاندنی تەرمی زیندوەکان بەرێخستبو، خولێك کە لە روانگەی مێژویی و سیاسییەوە پاساوی خۆی هەیە. هێزی هاندەرو لەوەش گرنگتر بێدەنگی رەزامەندئامێزی جەماوەر لەبەرامبەر ئەو هەلومەرجە بێوێنەیە، بەرهەمی روداوگەلێکی قۆناغی لێکترازان و پوکانەوەی سیاسی بو کە تیایە بەشێوەیەکی کتوپرو پێشبینینەکراو هەزاران مرۆڤ لەماڵ و نیشتمانی خۆیان دەردەکرێن و دەبن بە خەڵکانێکی یاساشکێن و ناشایستە، ئەمە لەکاتێکدا بە ملیۆنان مرۆڤی دی لەڕووی ئابورییەوە دەبن بە مرۆڤی زیادەو بێکار، لەرووی کۆمەڵایەتیشەوە بارگرانی بون. ئەم بارودۆخە تەنها لە کاتێکدا روودەدا کە ماڧ مرۆڤ بایەخی نەریتی خۆی لەدەستدەدا، ماڧێك لەدیدی فەلسەفییەوە هەرگیز دەست نیشاننەکراوەونەچۆتە بواری پراکتیکییەوە، بەڵکو تەنها داڕێژراوە، هەروەها لە رووی سیاسیشەوە هەرگیز زامننەکراوە، بەڵکو تەنها راگەیەنراوە.

کوشتنی کەسایەتی یاسایی لە مرۆڤدا، یەکەم هەنگاوی سەرەکی باڵادەستی گشتگیرە. بۆ ئەم مەبەستەش، دەسەڵاتداران چەندین کۆمەڵە خەڵك لە دەرەوەی سایەی یاسای وڵات دادەنێن و جهانی ناتۆتالیتاریش ناچار دەکەن دان بەوەدا بنێن کە ئەو خەڵکانە لەدەرەوەی یاسان، چونکە رەگەزنامەیان لێسندراوەتەوە، ئنجا ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ دەخرێنە دەرەوەی چوارچێوەی سیستمی سزادانی ئاساییەوە کە هەر تاوانێکی دیاریکراو، سزایەکی دەستنیشانکراوی هەیە. هەر لەسەر هەمان شێوەش تاوانباران، لەبەر هۆی دی، رەگەزی سەرەکی کۆمەڵگەی ئۆردوگایی پێکدەهێنن، بە گشتی تەنها بەمەبەستی تەواوکردنی سزاکانیان رەوانەی ئۆردوگاکان دەکرێن. باڵادەستی گشتگیر لە هەمو هەلومەرجێکدا هەوڵدەدا ئەو توێژانەی لە ئۆردوگا خڕیاندەکاتەوە (یەهود، نەخۆشەکان و نوێنەرانی چینەکانی روو لەمردن) لەو کەسانەبن کە هەمو ئامادەییەکیان بۆ ئەنجامدانی تاوانی ئاسایی و نائاسایی

لەدەست دابێت. ئەمەش بە گوزارەی پروپاگەندەی تۆتالیتاری مانای ئەوە دەگەیەنێت، "گرتنی خۆپارێزی" بەمەبەستی ئەوەی رێگە لە ئەنجامدانی تاوان بگرێت، پێویستە وەك "هەنگاوێکی پێشوەختی پۆلیسی"[141] لەبەرچاو بگیرێت. تاکە ئاوارتەی ئەم رێسایەش لە روسیا رویدا، پەیوەست بو بە کەمبونەوەی کارەستباری زیندانیەکانو خەونی بەدینەهاتوی رژێم لەوەی سەرلەبەری سیستمی سزایی ولات بەسیستمێکی ئۆردوگایی بگۆرێت[142].

زیندانی کردنی تاوانباران لەو ئۆردوگایانەدا، بۆ هەلمەتی رونکردنەوەی پروپاکەندەی بزوتنەوە پێویستە کە بانگەشەی ئەوە دەکات، ئۆردوگاکان بۆ بەرگرتن لە رەگەزی ناکۆمەلایەتی دامەزراون[143] تاوانباران بە هەمو مانایەکی وشە پەیوەستییان بەو ئۆردوگایانەوە نیە، لەبەرئەوەی ئەگەر کوشتنی کەسایەتی یاسایی لە مرۆڤدا ئامانج بێت، ئیدی ئەم رەفتارە دەربارەی ئەو کەسانەی بە تەواوەتی بێگوناهن زۆر ساناترە تا ئەوانەی بەهۆی تاوانێکەوە بە گوناهکار دەژمێردرێن. ئەگەر تاوانباران توێژێکی نەگۆر لە گیراوەکان پێکبهێنن، دەبێ وەك دەستدرێژی دەولەتی تۆتالیتاری بۆ سەر بریارە پێشوەختەکانی کۆمەلگە تەماشا بکرێ، بەمشیوەیە بە باشی ئامادەکاری بۆ دەکرێ تا بوونی ئەو ئۆردوگایانە بە سانایی قبول بکەن. لەلایەکی دی، بەمەبەستی ئەوەی سیستمی ئۆردوگاکان دوچاری کەموکورتی نەبێتەوەو تا ئەو دەمەی سیستمی سزادان لە ولاتدا بوونی هەبێت، باشتر وایە تاوانباران تەنها بۆ تەواوکرنی حوکمەکەیان رەوانەی ئۆردوگاکان بکرێن. نابێت لە سایەی هیچ هەلومەرجێکدا ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەل جێگەی سزای تاوانی زۆر دیاریکراو بێت.

تێکەل کردنی تاوانباران بە توێژەکانی دی، ئەو جیاکارییەشی هەیە کە خەلکە بێتاوانەکە لەگەل ئەوەی پا دەخەنە ئۆردوگاکانەوە ئەو هەستەیان لەلا دروست دەبێت کە بۆ نزمترین ئاستی کۆمەلایەتی دادەبەزن. بێگومان ماقی خۆیانە ئیرەیی بە خوێریترین دز یا تاوانبارترین کەس بەرن، هەرچەندە

نزمترین ئاستیش بەسەرەتایەکی باش دەژمێردرێت. لێرە بەدواوە، بوونی ئەو تاوانبارانە لەم ئۆردوگایانەدا، ئامرازێکی کارای شاردنەوە پێکدەهێنێت: ئەم شتانە تەنها بەسەر تاوانباراندا دێت و ئەو تاوانبارانە شایستەی ئەوەن خراپترین بەلاشیان بەسەرا بێت.

تاوانباران، ئۆرۆستۆکراسی ئۆردوگاکانیان پێکدەهێنا. (لە ئەڵمانیای سەردەمی جەنگدا، کۆمۆنیستەکان ڕێبەرایەتی ئەو ئۆرۆستۆکراتەیان گرتەدەست، چونکە لە سایەی بەڕێوەبەرایەتی ئەنارچیستانەی تاوانباراندا، ناتوانرێت نزمترین ئاستی بەرهەمی کاری عەقڵانی بەدەست بهێنرێت. ئەم کارەش بە تەواوەتی لە ئەنجامی گۆڕینی کاتیی ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەڵ بۆ ئۆردوگای کاری زۆرەملێ ڕویدابو، دیاردەیەکی بارودۆخی ئاسایی و پایەداری ئۆردوکاگانی نیشان نەدەدا)[144] ئەوەی تاوانباران والێدەکات ئیدارەی ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ بگرنەدەست، تەنها هاوبیچمی خەڵکانی چاودێریکارو رەگەزە تاوانبارەکان نەبو، لە یەکێتی سۆڤێتدا چاودێریکارانی ئۆردوگا لە پێکهاتەی دەستەی پاراستنی ئەڵمانیا نەدەچون، واتە دەستەبژێری تایبەت کە بۆ ئەنجامدانی تاوان پەروەردە کرابون [145]، بەڵکو گرتنەدەستی ئیدارە لەلایەن ئەو کەسانەوە زیاتر لەو راستییەوە سەرچاوە دەگرێ کە تاوانباران بە مەبەستی جێبەجێ کردنی کارێکی دیاریکراو رەوانەی ئۆردوگاکان دەکرێن. ئەوانە بەلانیکەمەوە لەناخی خۆیانەوە دەزانن بۆچی لە ئۆردوگاکانن، هەر لەمرووەشەوە پاریزگاری لە باقی کەسایەتی یاسایی خۆیان دەکەن. بەلام ئەم کێشەیە بۆ زیندانییە سیاسییەکان تەنها لەرووی زەینییەوە راستی تیایە، چونکە کردەوەکانیان، هەڵبەتە وەك کردەوەو کاری سیاسی، نەك وەك بیروباوەڕی رووت یا گومانی ئاڵۆزو نادیاری ئەوانی دی یا ئەندامێتی راگوزەریان لە گروپێکی سیاسی هەڵوەشاوەو ئەفرۆزکراو، بەشێوەیەکی گشتی لە نەزمێکی یاسایی وڵاتەوە دەرنەچوەو لەرووی یاسادانانیشەوە دیاریکراو نیە[146] لەپاڵ تێکەڵەی گیراوە سیاسی و تاوانبارەکان کە

ئۆردوگاکانی ئەڵمانیاو روسیا بەو کەسانە دەستیان بەکارەکانیان کرد، رەگەزی سێیەمیشی بۆ زیادکرا کە زۆر بەخێرایی بون بە زۆرینەی ئۆردوگاکان. ئەو توێژەی زۆرینەی ئۆردوگاکانیان پێکدەهێنا، لەوجۆرە کەسانە بون چ لە دیدی خۆیانو چ لەدیدی جەلادەکانیانەوە کارێکی ئەوتۆیان ئەنجامنەدابو پەیوەندییەکی بەجێی بەدەستگیرکردنەکەیانەوە هەبێت. لە ئەڵمانیا لەساڵی 1938 بەدواوە، یەهود نوێنەری رەگەزی سێیەم بون، لە روسیاش هەر گروپێك دەسەلات بەدڵی نەبوایە، تەنانەت بێئەوەی هیچ کارێکیش بکەن، نوێنەرایەتی رەگەزی ناوبراویان دەکرد. لەراستیدا ئەم گروپە کە بەمانای وشە بێگوناهبون بابەتی نمونەیی ئازمایشکردنی سڕینەوەو لەناوبردنی کەسایەتی یاسایی بون. کەواتە ئەو خەڵکانە لەرووی چەندایەتی چۆنایەتییەوە گرنگترین توێژی ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵیان پێکدەهێنا. ئەم پرەنسیپە بە تەواوەتی لەژورەکانی گازدا بەدیدەهات، چونکە لانیکەم بە هۆی مەزنی ئەو ژوورانەوە ناتوانرێ وێنای ئەوە بکرێت کە بۆ لەناوبردنی گروپێکی دیاریکراو دروستکراون، بەڵکو دەتوانرێ بوترێت ئەو ژوورانە بۆ لەناوبردنی هەمو خەڵکی ئامادەکرا بون.

لەم شێوازە بیرکردنەوەیەدا، ئەم پەیڤینەی خوارەوە پێگەی تاکی قوربانی دەهێنێتەگۆ: "دەتوانم بپرسم بۆچی ژوری گاز هەیە؟" - وەڵامەکەی زۆر سادەیە: "لەبەر ئەوەی هەر لەسەرەتاوە ئێوە بێهودە لەدایکبون"[147]، ئەم گروپی سێیەمە کە هیچ گوناهێکیان نەبو، لە ئۆردوگاکاندا دوچاری دزێوترین چارەنوس دەبونەوە. ناتوانرێ تاوانباران و سیاسییەکان لەگەڵ ئەم گروپەدا یەکسان بکرێ، چونکە ئەندامانی ئەم گروپە لە هەمو مافێکی پارێزگاری لەخۆکردن بێبەشبون، بۆیە بەوە جیادەکرانەوە بەرامبەر بەهەر کارێك روبەروی رەفتاری هەرەمەکیانە دەبونەوە. دوائامانج کە بەشێوەیەکی هەندەکی لە یەکێتی سۆڤێتدا هاتەدی و لەدوا قۆناغی تیرۆری نازیدا بە رۆشنی بەدیارکەوت، سەرئەنجام هەمو زیندانی ئۆردوگاکان لەم گروپە بێگوناهە پێکدەهاتن.

هەرچەندە زیندانیانی ئۆردوگاکان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی ڕەوانەی ئۆردوگاکان دەکران، بەلام کاتێك پێیان دەخستە ئۆردوگاکانەوە یەکسەر بەسەر گروپی دیاریکراوی بێمانا دەبەشدەکران، کەچی لەڕوانگەی ڕێکخراوەییەوە کارێکی پڕ سود بو. ئەو گروپانە لە ئۆردوگاکانی ئەڵمانیادا بریتی بون لە تاوانبار، سیاسی، ڕەگەزی ناکۆمەڵایەتی، کەمتەرخەمکارە ئاینیەکان و یەهودو هەر یەکەشیان بەنیشانەیەکی تایبەت جیادەکرانەوە. کاتێك فرەنسیەکان لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆی ئسپانیا، ئۆردوگایان بۆ دورخراوە ئسپانیەکان دروستکرد، بە باشترین شێوە پرەنسیپی تۆتالیتاریان لە تێکەڵکردنی خەڵکانی سیاسی و تاوانباران و بێتاواندا ڕەچاودەکرد، سەرباری ئەوەی لەو کارەدا بێئەزمون بون، بەلام لە داهێنانی گروپی بێماناادا زۆر لێهاتو بون[148] هەر لەسەرەتاوە ئەم گروپ بەندییە بەو مەبەستە بو ڕێگەنەدرێ هیچ جۆرە هاوسۆزییەك لەنێوان زیندانییەکاندا دروست بێت، بەکردەوەش سودمەندی خۆی سەلماند، چونکە لە ڕاستیدا هیچ زیندانییەك نەیدەزانی گروپەکەی لە گروپەکەی دی خراپترە یا باشترە. لە ئەڵمانیا ئەو گروپبەندییەی بە ڕووکەش لەڕووی ڕێکخستنەوە بە وردی بونیات نرابو، وەلێ هەمیشە جێگۆڕکێی پێدەکرا، نەیتوانی ڕێگە لە گەشەسەندنی هەستی هاوسۆزی نێوان یەهود بگرێت، چونکە یەهود لە هەمو هەلومەرجێکدا نزمترین گروپیان پێکدەهێنا. بەلام لە هەموی ناشیرینتر خودی زیندانییەکان ئاوێتەی ئەو گروپانە ببون، وەکئەوەی ئەو گروپانە دوا پاشماوەی کەسایەتی یاساییان بەرجەستە بکات. بۆیە جێگەی سەر سوڕمان نیە ئەگەر کۆمۆنیستێکی ئەڵمانی لە ساڵی 1933دا ڕەوانەی ئۆردوگا کرابێت، لەدوای دەرچونی بیروباوەرێکی کۆمۆنیستانەتری دەبێت تا کاتی گرتنەکەی، یەهودییەك، یەهودیتر دەبێت، هەروەها لە فرەنسا‌ش، ژنی سەربازی تیمێکی بیانی ئەو ڕۆژەی مێردەکەی لە ئۆردوگا دەردەچێت، بڕواو متمانەی بە ڕۆڵ و بەهای ئەو تیمە بیانییە زیاتر دەبێت. وادەردەکەوێت هەمو شتێك ڕوودەدا

وەكئــەوەی ئــەو گروپانــە دوا پــەیمانی چارەنوســێكی پێــشبینیكراو بێــتو سەرەكیترین ناسنامەی یاساییان بەرجەستە بكات.

.لقبەنـدی گیراوەكـان بـە گروپـی جۆراوجـۆر تـەنها كارپاییـەكی تـەكتیكیو رێكخراوەیی بو، ئەمە لەكاتێكدا هەڵبژاردنی هەرەمەكی قوربانییەكانی ئۆردوگا پرەنسیپی جەوهەری ئەو دەزگایانە دەردەخات. ئەگەر ئەو ئۆردوگایانە تەنها پەیوەستی بە نەیارانی سیاسیەوە هەبوایە، ئەوا لە سالانی یەكەمی رژێمە تۆتالیتارەكانـدا زیـاتر خـۆی رانـەدەگرت. ئەوەنـدە بەسـە چـاوێك بـە ژمـارەی گیراوەكانی ئۆردوگای "بۆخنواڵد"، لەدوای سالی 1936ەوە بخشێنینەوە، بۆ ئەوەی تێبگەین بوونی خەڵكانی بێتاوان لە پێنـاو مانـەوەو بەردەوامبونی ئـەو ئۆردوگایانــە چــەند پێویــست بــوە، "ئەگــەر گەســتاپۆ لــە ئۆپراســیۆنی دەستگیركردنەكانیدا تـەنها پێـوەری نـەیاری سیاسـییان لەبەرچـاو بگرتایـە، ئۆردوگاكان ئاسەواریشی نەدەمایەوە"[149] ئۆردوگای "بۆخنواڵد" لە كۆتایی 1937دا، ئەگـەر هەڵـسوراوانی پـۆگرومی Pogrom نۆڤەمبـەر بیـست هـەزار زیندانی تازەی بۆ رەوانە نەكردایە، لەبەریەكهەڵدەشایەوە، لەبەرئەوەی نزیكەی هەزار زیندانی تیا مابووە[150] زۆربەی خەڵكی بێتاوانی ئۆردوكاگانی ئەڵمانیا لـە دوای 1938وە لـە یـەهود پێكهـاتبون، ئەمـە لەكاتێكـدا زۆرینـەی زینـدانی ئۆردوگاكانی روسیا بە شێوەیەكی هەرەمـەكی لـە دانیـشتوان هەڵدەبژێردرانو ئەوەش هیچ پەیوەندییـەكی بە كـارو چالاكیانەوە نـەبو، تـەنها ئـەوە نـەبێت لـە سـۆزو بەرەكـەتی دەسـەلاتدارانی رژێـم بێبــەری كرابــون[151] لــە ئــەڵمانیا دروسـتكردنی یەكـەم ئۆردوگـای گـرتنی بـە كۆمـەڵ لەسـەر فـۆرمو شـێوازی تۆتالیتـاری كـە زۆرینـەی زیندانیـەكانی خـەڵكی بێتـاوان بێـت تـا 1938 بـە تەواوەتی سەقامگیر نەبو، ئەمە لە حاڵەتێكدا پێشینەی ئەوجۆرە ئۆردوگایانە لە روسیا بۆ سـەرەتای سییەكانی سـەدەی بیستەم دەگەرێتـەوەو هـەتا سـالی 1930یـش زۆربــەی زینـدانی ئۆردوگاكـانی گـرتنی بـە كۆمـەڵی روسـیا لــە تاوانبـاران، نـەیارانی شـۆرشو سیاسـییەكان (ئـەم گوزارەیـە ئەنـدامانی باڵـە

نەیارەکانی حیزب دەگرێتەوە) پێکهاتبون. لەو ساتە بەدواوە زۆرێك لە خەڵکانی بێتاوان خزێنرانە ئۆردوگاکانەوە، بەجۆرێك کە چیدی پۆلبەندی کردنیان زۆر زەحمەت بو، ئەو کەسانەی پەیوەندییەکی ناچیزیان بە وڵاتێکی بیانییەوە هەبو، روسە نەژاد پۆلۆنییەکان (بە تایبەتی لە نێوان ساڵانی 1936 و 1938)، ئەو جوتیارانەی بە هۆی ئابوری یا بەبێ هیچ هۆیەکی دی، گوندەکانیان خاپور کرابو، نەتەوە کۆچپێکراوەکان، سەربازەکانی سوپای سور کە خزمەتیان تەواو کردبو، ئەوانەی سەر بەو تیپانە بون کە ماوەیەکی زۆر لە دەرەوەی وڵات وەك هێزێکی داگیرکار مابونەوە، یا ئەو زیندانیانەی لە ئەڵمانیا گیرابون و هتد. بەڵام بونی نەیاری سیاسی بۆ رژێمێکی ئۆردوگایی تەنها بیانویەك بو، تەنانەت ئەگەر لە سایەی درێوترین تیرۆریشدا سەرجەمی دانیشتوان بە شێوەیەکی خۆبەخشانە ملکەچی بکەن و واز لە مافە سیاسییەکانیان بهێنن، ئەوا دیسانەوە ناتوانرێت بوترێت کە رژێمی ئۆردوگایی بە ئامانجی خۆی گەیشتوە. ئامانجی ئەم شێوازە هەرەمەکییە، لەناوبردنی مافە مەدەنییەکانی سەرجەم دانیشتوان بو، بە جۆرێك کە سەرجەم دانیشتوانی وڵات تەنانەت لەسەر خاکی خۆشیان وەك خەڵکی بێنەتەوە و بێسەروسامان لە هەمو مافێکی یاسایی بێبەشدەکرێن. لەناوبردنی مافەکانی مرۆڤ و کوشتنی کەسایەتی یاسایی، دوو مەرجی سەرەکی باڵادەستی رەهایە بەسەر مرۆڤدا. بەڵام ئەم حاڵەتە تەنها بەسەر ئەو توێژە تایبەتانەی باسمان لێکردن جێبەجێ نابێت، وەك تاوانباران، نەیارە سیاسییەکان یا یەهود یا دوەکی، ئەوانەی رژێمی تۆتالیتاری یەکەم ئەزمونی لەسەریان تاقیکردۆتەوە، بەڵکو بەسەر یەکبەیەکی ئەو مرۆڤانەدا جێبەجێ دەبێت کە لە سایەی رژێمی تۆتالیتاریدا ژیان دەگوزەرێنن. بۆیە رێکەوتنی ئازاد، هێندەی ئازادی ئۆپۆزیسیۆن بەربەست لەبەردەم رژێمی تۆتالیتاری دروستدەکات[152] بێگومان گرتنی خەڵکانی بێتاوان بەشێوەیەکی هەرەمەکی رێکەوتنی ئازاد لەناودەبات، هەروەکو چۆن ئەشکەنجەدانیش . بەپێچەوانەی مردنەوە . توانای ئۆپۆزیسۆن بون لە مرۆڤدا لەنێو دەبات.

لەبەرامبەر ئەوەشدا، هەر کۆت وبەندێك، خەسڵەتی ستەمگەری هەر چییەك بێت، بەرامبەر بە چەوسانەوەی هەرەمەکی هێندێك بیروباوەری سیاسی یا ئایینی و هێندێك رەفتاری کۆمەڵایەتی، ئیدی چ فیکری بێت یا ئیرۆتیکی و هێندێك تاوانی تازە داهێنراو، واتە دانانی هەر کۆتێك بۆ چەوسانەوەی هەرەمەکی، بوونی ئەو ئۆردوگایانە بێکەڵك دەکات، چونکە هیچ رەفتارو بۆچونێك ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لە ئاست هەڕەشە دڕێوەکانی حکومەتێکی ستەمگەر خۆی رابگرێت. بەتایبەتی ئەم کۆت وبەندە دەشێت ئاسانکاری لەدانانی شێوازی یاسای نوێ بکات، ئەگەر کەمێکیش دەرفەتی سەقامگیربونی بۆ برەخسێت، دەتوانێت کەسایەتییەکی یاسایی نوێ لە مرۆڤدا بچێنێت کە خودی ئەم کارەش بەربەست لەبەردەم تۆتالیتاری گشتگیردا دروستدەکات. لەم پێناوەشدا، بانگەشەی "بەرژەوەندی نەتەوە Volksnutzenی نازیزم کە بەردەوام لە گۆڕاندایە (ئەوەی ئەمرۆ سودی هەیە، رەنگە سبەینێ پڕ زیان بێت)و هێڵی هەمیشە گۆڕاوی حیزب لە یەکێتی سۆڤێتدا، بە گەڕانەوەیان بۆ دواوە، رۆژانە خەڵکی تازە رەوانەی ئۆردوگاکان دەکەن، باشترین زامن بۆ مانەوەی ئەو ئۆردوگایانەو پێشێلکردنی گشت مافەکانی مرۆڤ فەراهەمدەکەن.

بەڵام هەنگاوی یەکلاکەرەوەی دوەم لە ئامادەکردنی تەرمی زیندوەکان، بریتیە لە کوشتنی کەسایەتی ئەخلاقی لە مرۆڤدا. ئەمەش بە شێوەیەکی گشتی شایەتی ئەستەم دەکات کە لە مێژوی مروڤایەتیدا وێنەی نیە: "لێرەدا چەند کەس هێشتا پێیانوایە نارەزایی بەلانیکەمەوە گرنگییەکی مێژوویی هەیە؟ خولقاندنی گومان شاکاری راستەقینەو دەستکەوتێکی گەورەی دەستەی پاراستنە کە هەمو جۆرە هاوکارییەکی مرۆییان لەنێوبرد. ئالێرەدا شەو پەردە بەسەر ئایندە دادەداتەوە. کاتێك هیچ شاهیدێك نامێنێتەوە، ئیدی شایەتیش ئەستەم دەبێت. کاتێك مرۆڤ دەریدەخات کە چیدی لەتوانادا نیە رێگە لەمردن بگیرێت، واتە دەیەوێت مانایەك بە مردن ببەخشێت، بەمانای

ئەنجامـدانی کارێـك کـە مـردنیش ناتوانێـت بـەری پێبگرێـت. جوڵەیـەکی سەرکەوتو ئامێز پێویستی بە دەلالـەتێکی کۆمەڵایـەتی هەیـە. لەحاڵێکدا ئێمـە لێرەدا بەسەدان هەزار کەسمان لە گۆشەگیرییەکی رەهـادا ژیـان بەسـەر دەبـەین. هەر لەبەر هەمان سۆنگەش لە بەرامبەر هەر پێشهاتێکدا ملکەچ دەکەین"[153]

ئۆردوگاکانی تایبەت بە نەیارانی سیاسیی و کوشتنیان بە تـەنها بەشێك لـە بیرچونەوەیەکی سیستماتێك پێکدەهێنێت کە بەتـەنها مۆری بێدەنگی بەسـەر زمان و قەڵەمی بیروڕای گشتیدا ناهێنێت، بەڵکو تەنانـەت کەسوکارو دۆستانی قوربانییەکـەش دەگرێتـەوە. بۆیـە غـەم و خەفـەت و یادکردنـەوەی قوربانییـەکان قەدەغەدەکرێ. لە یەکێتی سۆڤێتدا ئەگەر پیاوێك دەستگیر بکرایە، دەمودەست ژنەکەی داوای جیابونـەوەی لێدەکرد تـا گیانی منداڵـەکانی رزگـار بکـات، بـەڵام ئەگەر مێردەکەی کەمێك چانس لەمردن رزگاری بکات، ئەوا دیسانەوە ژنەکـەی رەتیدەکاتـەوە پەیوەنـدی لەگـەڵ دروسـت بکاتـەوە، رەتکردنـەوەیـەك زیـاتر لەبێزاری و گاڵتەجارییەوە سەرچاوە دەگرت[154] تا ئێستاش جهانی رۆژئـاوا لە تاریکترین رۆژگاریدا ئەو مافە بە دوژمنە کوژراوەکەی دەدا وەك مـرۆڤ (تـەنها وەك مرۆڤ) یاد بکرێتەوە. ئاچیل Achilles لـە ئامـادەبونی رێـورەسمی ناشتنی هیکتـۆردا Hector کەمتەرخـەمی نەنوانـد، تەنانـەت سـتەمگەرترین حکومـەت یـادی دوژمنـە کوژراوەکـەی پـیرۆز رادەگرێـت، رۆمـەکان رێگـەیان بـە مەسـیحییەکان دەدا نـاوی شـەهیدەکانیان هـەڵکۆڵن و شـەهادەتنامەکانیان بنوسـن، کڵێسەش یـادی هیراکیـسە زینـدوەکانی لـە یـادەوەری مرۆڤـدا بـەرز رادەگـرت. هـەمو ئـەو کوژراوانـە لـە مێـژودا بـە زینـدویێتی مانـەوەو هـەرگیز ناتوانرێت یادگارییان لە زەینی مێژودا بسڕێتەوە. ئەگەر ئۆردوگاکانی گـرتنی بـە کۆمـەڵ مـردن بکەنـە ناسـنامەیەکی نادیـارو بێنـاونیـشان (بـەجۆرێك کـە زینـدوبون یـا مردنـی زیندانیەکـە ئەسـتەم بێـت)، ئـەوا مـردن وەك دوا خـاڵی کۆتـایی ژیـان، هـەمو مانایـەکی لێدەسەنرێتەوە. بەواتایـەکی دی، ئۆردوگاکـان مردنی تاك ناهێڵن، بەوەش دەیسەلمێنن کە هیچ شتێك بە کەسە مردوەکەوە

پەیوەست نیەو قوربانیەکەش ئینتمای بەکەسەوە نیە. کەواتە مردنی قوربانییەکە ئەوە دەسەلمێنێت، هەرگیز بوونی نەبوە[155]

ئەم هێرش‌و پەلامارە بە کەسایەتی ئەخلاقی قوربانی، رەنگە هێشتا لەگەڵ ئەو بانگەوازە ویژدانییەی مرۆڤ روبەرو بێتەوە کە پێی باشترە وەك قوربانییەك بمرێت تا لە رێگەی خزمەتکردن لە دەزگایەکی بیروکراسیی بکوژی ژیان درێژە بە ژیانی خۆی بدات. کاتێك تیرۆری تۆتالیتاری ترسناکترین سەرکەوتنی بەدەستهێنا بەوەی توانی رێگەی دەربازبون لە کەسایەتی ئەخلاقی تاك بگرێت‌و بڕیارە ویژدانیەکانی تاك بە تەواوەتی گوماناوی و ئاڵۆزو نادیار بخاتەروو. لەلایەکەوە، کاتێك مرۆڤ روبەرو دەبینێ خیانەت‌و فریودانی دۆست‌و ژن‌و منداڵەکانی، ئەوانەی بە تەواوەتی لێیان بەرپرسیارە، رەوانەی مردن دەکات، لەلایەکی دی، ئەگەر بەهۆی کارێکی خۆکوژییەوە خۆی لەو ئەرکەی بدزێتەوە، دیسانەوە دەبێتە مایەی مردنی خێزانەکەی، لە هەلومەرجێکی لەوجۆرەدا دەتوانێت چ بڕیارێك بدات؟ لەو هەلومەرجەی سەرەوە هەڵبژاردن لە نێوان چاکەو خراپە نیە، بەڵکو هەڵبژاردنی نێوان کوشتن‌و کوشتنێکە. چ کەسێك دەتوانێت ئەو بەدحاڵی بونە ئەخلاقیە مەزنەی دایکێکی یۆنانی تێیکەوتبو، چارەسەر بکات، کاتێك نازییەکان سەرپشکیان کرد یەکێك لە سێ کوڕەکەی بۆ کوشتن هەڵبژێرێت؟[156]

تۆتالیتاریزم لە رێگەی خوڵقاندنی هەلومەرجێك کە لە سایەیدا ویژدان کارایی خۆی لەدەست دەداو ئەنجامدانی کاری چاکە لە تواناداا نابێت، توانای دەست تێکەڵکردنی وشیارانەو سیستماتیکانە لەگەڵ تاوانەکانی رژێمی تۆتالیتاردا، هەمو کەسێك دەگرێتەوە، بەقوربانییەکانیشەوە، ئیدی بەمشێوەیە دەست تێکەڵکردن سیمای گشتگیری وەردەگرێت. لەم ناوکۆیەدا دەستەی پاراستن بە سپاردنی گەورەترین بەرپرسیارێتی ئیدارەی ئۆردوگاکان بە زیندانی ئۆردوگاکان بێئەوەی تاوانەکانیان لەبەرچاوبگرێت . تاوانبار، سیاسی، یەهود گیرۆدەی تاوانێکی کردبون، دەربازبونیان ئەستەم بو: یا

دەبوایە هاورێکانیان بەکوشت بدەن، یا بەشداری لە کوشتنی خەڵکانی دی بکەن، ئەوانەی لەلای ئەمان خەڵکانێکی نامۆ بون. لە هەمو حاڵەتێکدا ناچار دەکران رۆڵی پیاوکوژ وازی بکەن. لێرەدا خاڵی سەرەکی ئەوە نیە نەفرەتو رقی زیندانیەکانی ئۆردوگا لەسەر تاوانبارە ئەسڵییەکان لابرێت (هاوکارانی S.S لە خودی پیاوانی دەستەی پاراستن نەفرەت لێکراوتر بون)، بەڵکو لەم هەلومەرجەدا پێویستە هێڵی جیاکەرەوەی نێوان چەوسێنەرو چەوساوە، جەلادو قوربانی، هەمیشە بەڵێڵیو ئاڵۆزی بمێنێتەوە[157].

لەدوای کوشتنی کەسایەتی ئەخلاقی لە مرۆڤدا، تاکە بەربەستێک کە ناهێڵێت مرۆڤ بۆ تەرمی زیندو بگۆڕێت: جیاوازی نێوان تاکەکانو ناسنامەی تاکگەرای مرۆڤە. رەنگە مرۆڤ لە سایەی فۆرمێکی نەزۆکو لەرێگەی رەواقیزمێکی تۆکمەوە، بتوانێت پارێزگاری لەم تاکگەرایە بکات، بەدڵنیاییەوە زۆرێک لەو مرۆڤانەی لە ژێر سایەی فەرمانڕەوای تۆتالیتاردا ژیان دەگوزەرێنن، پێیانوایە گۆشەگیری رەهای ئەم کەسایەتیە بێماناو بێئاگایە، باشترین پەناگەی ژیانی رۆژانەیانە. بێگومان زەحمەتترین شت وێرانکردنی ئەم بەشەیە لە کەسایەتی مرۆڤدا (ئەوەی بەم زەحمەتییەش وێرانبکرێت، بە ئاسانی بونیات دەنرێتەوە)[158]، چونکە هەر لەبنەرەتەوە پەیوەستە بە چییەتیو هێزێکەوە کە ناتوانرێت بخرێتە ژێر چاودێری ئیرادەوە.

ئامرازی جۆراوجۆر بۆ روبەرونەوەی ئەم کارەکتەرە بێوێنەیە لە کەسایەتی مرۆڤدا بەکاردەهێنرێت، بەڵام لێرەدا هەوڵنادەین پێرستێکی بۆ دابنێین. سەرەتا، گواستنەوەی گیراوەکان بۆ ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ لە سایەی هەلومەرجێکی ترسناکدا ئەنجامدەدرێ: هەزاران مرۆڤی رووتو قوتو پاخاوسو تێکچڕاو لە کامیۆنی تایبەت بە گواستنەوەی ئاژەڵ بەدرێژایی چەندین رۆژ هەر بەپێوە لەم شەمەندەفەرەوە بۆ ئەوی دی دەگوێزرێنەوە، تا بۆ دواجار دەگەن بە ئۆردوگا، شۆکی یەکەم ساتی دوای گەیشتن بە ئۆردوگا کە بە باشی ئامادەکاری بۆ کراوە، بریتیە لە سەرتاشینو پۆشینی جلوبەرگی

پیس و کۆنە، تا دەگاتە ئەشکەنجەدانی دەرە باوەرپێکردن، ئەشکەنجەدانێك بە جۆرێك ئامادەکاری بۆ کرابو کە جەستە دانەوەشێنێت. ئەو رەوشانە هەمیشە یەك ئامانجیان هەیە، ئەویش بە توانایەکی لەرادەبەدەر لە ئازاردان، مامەڵە لەگەڵ جەستەی مرۆڤدا دەکرێ، تا بەشێوەیەکی بێبەزەییانە کەسایەتی مرۆڤانەی تیا بکوژرێت، وەکئەوەی هێندێك نەخۆشی دەرونی بە ئەسڵ ئۆرگانی لەناوببرێت.

لێرەدا شێتییەکی رەگداکوتاو لە سەرتاسەری ئەم رەوتە بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت. بێگومان ئەشکەنجەدان سیمایەکی سەرەکی دەزگاکانی پۆلیس و دادگای تۆتالیتاری پێکدەهێنێت و بە مەبەستی ئەوەی خەڵکی بهێننەگۆ رۆژانە پەنای بۆ دەبرێت. ئەمشێوە ئەشکەنجەدانە، بە ئەندازەی بەشداریکردن لە هێنانەدی ئامانجێکی دیاریکراو و لۆجیکی، هێندێك سنووریشی هەیە: یا زیندانی لە کاتێکی دیاریکراودا قسەدەکات، یا دەکوژرێت. ئەمجۆرە ئەشکەنجەدانە بە رووکەش عەقڵانییە، لە یەکەمین ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەڵ و کونجی زیندانەکانی گەستاپۆدا، جۆرێکی دی لە ئەشکەنجەدانی ناعەقڵانی و سادی بۆ زیاد کرا، ئەو ئەشکەنجەدانەی پێشتر بە دەستی پیاوانی یەکەی هێرش ئەنجامدەدرا، ئامانجێکی دیاریکراو و رێکخراوی نەبو، بەڵکو زیاتر پەیوەستی بە داهێنانی هێندێك رەگەزی نائاساییەوە هەبو. رێژەی مردنی ئەم ئەشکەنجەدانە بەرادەیەك بەرز بو کە ساڵی 1933، تەنها چەند کەسێکی کەم لە ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ توانیان گیان بەسەلامەتی دەربکەن. ئەمجۆرە ئەشکەنجەدانە، ئەشکەنجەدانی دەزگایەك نیە کە خاوەن دیدێکی سیاسی بێت، بەڵکو جیاکارییەکی رژێم بو بە مەبەستی خەڵاتکردنی پیاوە تاوانبارو نائاساییەکانی، ئەوانەی هەستیان دەکرد بەرامبەر بەو خزمەتەی بە رژێمیان کردوەو دەیکەن، خەڵاتدەکرێن. لە پشت دڕندایەتی و ئاژەڵێتی یەکەی هێرش، بێزارییەکی قووڵ بەرامبەر بەو کەسانە رەگی داکوتابو کە لەرووی کۆمەڵایەتی یا جەستەیی و عەقڵی لەخۆیان

باشتربون، واتە پیاوانی یەکەی هێرش کە ئێستا دەسەڵاتیان هەیەو ئەو کەسانەش کەوتونەتە ژێر دەسەڵاتیانەوە، دەیانتوانی دڵڕەقترین و دڕندانەترین خەونیان لەسەر پیادە بکەن. ئەو هەستەی هەرگیز لە ئۆردوگاکان دانەمرکابۆوە، تا ئێستاش وەك شوێنەوارێکی هەستپێکراو لە هەستی مرۆڤدا رامانەچەڵەکێنێت[159]

بەهەرحاڵ، ترسی راستەقینە کاتێك دەستی پێکرد کە دەستەی پاراستن ئیدارەی ئۆردوگاکانی گرتەدەست. دڕندایەتی هەرەمەکی پێشو جێگەی خۆی بۆ وێرانکردنی سیستماتیك و خوێنساردانەی جەستەی مرۆڤ چۆڵکرد کە ئامانجی لەنێوبردنی شکۆمەندیی مرۆڤایەتی بو. ئێستا مردن بۆ کاتێکی نادیاریکراو دوادەخرێت و لە مردنی خێراش پارێز دەکرێ. ئیدی ئۆردوگاکان سەیرانگەی ئاژەڵی بە بیچم مرۆڤ نەبون، واتە بۆ ئەو مرۆڤانەی لە راستیدا دەبوایە لە دەزگاو زیندانی تایبەت بە دەرون نەخۆشەکان پارێزگاریان لێبکرێ، بەڵکو مەسەلەکە بەپێچەوانەوە بو: ئۆردوگاکان بە "مەیدانی مەشقکردن"ی مرۆڤی بە تەواوەتی ئاسایی گۆڕابون، ئەوانەی دەبوایە بۆ بەئەندامبونی دەستەی پاراستن پەروەردە بکرێن[160]

کوشتنی تاکگەرایی و کارەکتەری بێهاوتا کە ویست، سروشت و چارەنوسی سەرجەم مرۆڤایەتی پێدەناسرێتەوەو لەپەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانیشدا مەسەلەیەکی هێندە بەڵگەنەویستە، تەنانەت دوانەیەکی بە تەواوەتی لێکچوش بەرامبەر بەیەکتری هەست بەشوناسی جیاواز دەکەن. کوشتنی ئەم تاکگەراو بێهاوتاییە جۆرە ترسێك دەخوڵقێنێت کە هەرجۆرە دەستدرێژیکردنەسەر حورمەتی کەسایەتی یاسایی، سیاسی و ئەخلاقی مرۆڤ دەخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە. هەر هەمان ترسیش بوار بەو گشتاندنە (تعميم) هیچگەرایە دەدا کە پێیوایە مرۆڤ بەشێوەیەکی جەوهەری لە ئاژەڵ دەچێت[161] لەراستیدا ئەزمونی ئۆردوگا زۆرەملێکان بەراشکاوی ئەوە نیشاندەدا کە دەتوانرێ مرۆڤ بۆ جۆرێك لە ئاژەڵ بگۆڕێت و "سروشتی" مرۆڤ تا ئەو کاتە "مرۆڤانە"یە

توانای ئەوەی پێببەخشرێت بەپلەی نایاب ببێت بە شتێکی ناسروشتی ، واتە بوون بەمرۆڤ.

لە دوای وێرانکردنی کەسایەتی ئەخلاقیو لەناوبردنی کەسایەتی یاسایی لە مرۆڤدا، لەناوبردنی تاکگەرایی شتێکی هێندە زەحمەت نیە. لەم بارەیەوە دەتوانرێ بەهێندێك یاسای دەرونناسی جەماوەری ئەو هۆیانە راڤەبکرێ کە بە ملیۆنان مرۆڤ بەبێ هیچ بەرگرییەك رەوانەی ژورەکانی گاز دەکات، ئەمە لە کاتێکدا ئەو یاسایانە تەنها دەتوانێت وێرانکردنی تاك راڤەبکات. ئەوەی گرنگتر بێت زۆر بە کەمی دەبینرێ یەکێك لەو کەسانەی بە مردن حوکمدرابون، بیری لەوە کردبێتەوە یەکێك لە جەلادەکانی لەگەڵ خۆی بەرەو ژورەکانی گاز بەرێتو زۆر بەدەگمەنتریش لەو ئۆردوگایانە راپەڕینی جیدی کراوە، تەنانەت لە کاتی رزگاربونیشدا تەنها کوشتنی هەرەمەکیو لابەلاو لەدژی خەڵکانی دەستەی پاراستن ئەنجامدەدرا. وێرانکردنی تاکگەرا لە ئاست وێرانکردنی هەرەمەکیو توانای مرۆڤە تا بە کۆمەڵو دەسپێکی توانا تایبەتەکانی خۆی، کارێکی نوێ دەست پێبکات، ئەو کارەی کە ناتوانرێت بەپێی پەرچەکرداری دەوروبەرو لەسەر روداوەکان راڤەبکرێ[162] لەم قوناغەشدا، مرۆڤ جگە لە بوکەڵەیەك بە روخساری مرۆڤانە شتێکی دی نامێنێتەوەو هەمویان چەشنی سەگەکەی پابلۆڤ رەفتار دەکەن، تەنانەت کاتێك بەرەو مردنیش دەچن بە شێوازێکی پێشبینکراو کارلێك دەکەنو جگە لە پەرچەکرداری پێشبینیکراو شتێکی دی پێشان نادەن. ئەمەش سەرکەوتنی راستەقینەی رژێمی تۆتالیتارییە: "سەرکەوتنی دەستەی پاراستن پێویستی بەوەیە کەسی قوربانی بێنارەزایی دەربرین یا رەتکردنەوە یا کەمتەرخەمی بەرەو مردن بڕوات، واتە واز لە ناسنامەی خۆی بهێنێت. ئەم مەسەلەیەش بێ بەرامبەر نایەتەدی. دەستەی پاراستن لە خۆڕا یا تەنها بە مەبەستی چێژ وەرگرتن لە ئازار، خوازیاری بۆڕدانی قوربانییەکانی نیە. دەستەی پاراستن دەزانێت ئەو رژێمەی قوربانیەکەی وێراندەکات لە پێشئەوەی بە تابوت بگات، سەرکەوتوترین رژێمە

بۆ ئەوەی حوکمڕانی وڵات بکاتو خەڵکەکەی لە دۆخی کۆیلایەتیو ملکەچی تەواودا بهێڵێتەوە. هیچ نمایشگەیەك ترسناکتر نیە لەو نمایشەی مرۆڤەکان بە ڕێپێوان، چەشنی لاشەی زیندوو بەرەو مردن هەنگاو بنێنن. تەنانەت ئەگەر کەسێك ئەو ڕێپێوانە ببینێت لەبەرخۆیەوە دەڵێت: "سەرکارەکانی ئەوانە چ دەسەڵاتو توانایەکیان هەیە کە ئەو خەڵکەیان بەو دەردە خراپە بردوە؟"، ئنجا بە ناکامیو هەناسەساردی ڕوویان لێوەردەگێڕێو یەکسەر دەستەمۆش دەبێت(163)

ئەگەر بەرخوازییەکانی تۆتالیتاریزم بەهەند وەربگرینو نەکەوینە ژێر گومڕایی ئەو عەقڵە دروستەی پێیوایە بەرخوازییەکانی سەرەوە خەیاڵییەو قابیلی بەدیهاتن نیە، بەو دەرئەنجامە دەگەین کە کۆمەڵگەی مردوەکان لە ئۆردوگاکانی تۆتالیتاردا، فۆرمی کۆمەڵگەیەکە دەتوانرێ باڵادەستی بەسەر مرۆڤدا تیا بەدیبهێنرێ. ئەوانەی خولیای باڵادەستی گشتگیریان لە مێشکدا هەیە، دەبێ هەموو جۆرە هەرەمەکییەك لەنێوبەرن کە بوونی تاکگەرایی پوخت لە مرۆڤدا دەردەخاتو تایبەتمەندترین پاشماوەی تاکگەراییەش لە نێوبەرن، بێئەوەی بەلایەوە گرنگ بێت کە ئەو پاشماوانە لایەنی ناسیاسی هەیەو هیچ زەرەرو زیانێکی بۆ ڕژێم نیە. سەگی پافلۆڤ، واتە ئەو مرۆڤەی بۆ نزمترین ئاستی پەرچەکرداری سروشتی دابەزیوەو بوە بە کۆمەڵێك پەرچەکرداری ئەوتۆ کە هەمیشە دەتوانرێ لەگەڵ کۆمەڵێك پەرچەکرداری دی ئاڵوگۆڕی پێبکرێت، بێئەوەی چوارچێوەی هەڵسوکەوتی بە هیچ جۆرێك گۆڕانکاری بەسەرا بێت، ئەوەش وێنەی "هاوڵاتیەکی" نمونەیی دەوڵەتی تۆتالیتارییەو لەتواناشدا نیە هاوڵاتیەکی لەوجۆرە لەدەرەوەی ئۆردوگاکان پەروەردە بکرێ، ئەگەر ئەوەش ڕوویدات، ئەوا بەشێوەیەکی ناتەواو دەبێت.

ئەو ئۆردوگایانە بە ڕووکەش بێسودو بێکەڵکن، کەچی لە واقیعدا بۆ پاراستنی ڕژێم لە هەموو دەزگاکانی دی سەرەکیترن. چونکە شتێکی بەڵگەنەویستە، بەبێ ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەڵو بەبێ ئەو ترسە لە

رادەبــەدەرەی ئۆردوگاکــان لــە دەرونــدا دەیــوروژێنێن و بــەبێ ئــەو مەشــقە دیاریکراوانەی لە بواری بالادەستی تۆتالیتاریدا دەستەبەری دەکەن، لە هیچ شوێنێکی دی ناتوانرێ رەهەندی ئەم بالادەستیە ئەزمون بکرێ و ئەستەمە دەوڵەتی تۆتالیتاریش بتوانێت لە نێو لایەنگرانیدا سروش بە توندڕەوی ببەخشێ و سەرلەبەری میللەتێك بپارێزێت کە لە حاڵەتی بێپەروایی کامڵدا بێت. بەبێ ئەو ئۆردوگایانە، چ سەردەست و چ ژێردەست، هەر بەزوویی دەخلیسکێنە ناو "رۆتینی بۆرجوازی کۆنەوە"، ئیدی ئەوانە لە دوای "توندرەوی" لاویێتیان، ملکەچی باری قورسی ژیانی رۆژانەو یاسا مرۆییەکانی دەبن. بەکورتی، دەبێ ئەوانە رێچکەیەك بگرنەبەر کە هەمو چاودێران، ئەوانەی خوویان بە عەقلی دروستەوە گرتەوە، بتوانن بە باشی پێشبینی بکەن. سەفسەتەی کارەساتباری هەمو ئەو پێشبینانەی لە جهانێکدا کە هێشتا لە ئەماندایە چاوی بەر روناکی هەڵدێت، بریتیە لە، سروشتی مرۆڤ لە هەمو ئانوساتێکدا یەك شتەو ناگۆڕێت، مێژووش جگە لە دەرخستنی هەمان سروشت شتێکی دی نیە، لەمەشدا ئەوە هەڵدەگۆزرێ کە ئایدیای بالادەستی گشتگیر نەك تەنها نامرۆیی، بەڵکو واقعبینانەش نیە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە ئەو وانەیە فێربوین کە توانای مرۆڤ ئەوەندە مەزنە، دەتوانێت هەمان ئەو شتە بێت کە خۆی دەیەوێت ببێت.

لە سروشتی رژێمە تۆتالیتارەکانە، بانگەشە بۆ دەسەلاتی بێسنور بکەن. بۆیە دەسەلاتێکی لەوجۆرە تەنها کاتێك دەتوانرێ دابین بکرێ کە هەمو خەڵکی، بەبێ ئاوارتە کردن بە شێوەیەکی رەها، لە هەمو بوارەکانی ژیانیاندا، بکەونە ژێر دەسەلاتێکی گشتگیرەوەو ملکەچی بکەن. لە بواری کاروباری دەرەوەشدا، پێویستە سەرزەمینە بێلایەنەکان، یەك لەدوای یەك، بکەونە ژێر رکێفی رژێمە تۆتالیتارەکانەوە، لە بواری ناوخۆشدا، گروپە مرۆییە تازەکان دەبێ لە ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵدا کە رۆژانە ژمارەیان زیاد دەکات، ملکەچ بکرێن، یا لە کاتی پێویستدا پاکتاوبکرێن بۆ ئەوەی خەڵکانی تازە

جێگەیان بگرنەوە. ئیدی مەسەلەی ئۆپۆزیسۆن، لەدەرەوەو ناوەوە گرنگی و بایەخی نامێنێت. لە سایەی ئەو واقیعەی سەرەوە، هەر جۆرە بێلایەنییەك، تەنانەت دۆستایەتیش، کاتێك دەبێتە ئایدیاییەکی هەرەمەکی، لە روانگەی بالادەستی تۆتالیتارەوە بە هەمان قەوارەی دوژمنایەتی ئاشکرا ترسناك دەبێت، چونکە هەرەمەکی بەمانای رەهاو بەمۆرکی پێشبینینەکراوی، بە گەورەترین بەربەست دەژمێردرێت لە رێگەی پیادەکردنی بالادەستی گشتگیر بەسەر مرۆڤدا. ئەو کۆمۆنیستانەی لە ولاتە ناتۆتالیتارەکانەوە بۆ مۆسکۆ رایانکرد یا لەلایەن خودی مۆسکۆوە بانگهێشت کرابون، بە تالترین و بەسوێترین ئەزمونی خۆیان تێگەیشتن کە بوونیان بۆ یەکێتی سۆڤێت بە مەترسی دادەنرێت. کۆمۆنستە ئیماندارەکان کە ئەمرۆ بە تاکە کۆمۆنیستی واقیعی جهان دەژمیردرێن، لە دیدی رژێمی روسیاوە هەم مایەی گاڵتەجاری و هەم مایەی هەرەشەبون، هەروەکو چۆن دەستەوتاقمە نازییەکەی "رۆهم" بۆ نازییە هیتلەرییەکان مایەی مەترسی بون.

ئەوەی لە بارودۆخی تۆتالیتاریدا هەمو جۆرە بیروباوەرێك پێکەنیناوی و ترسناك دەکات، ئەو واقیعەیە کە رژێمە تۆتالیتارەکان بەوە شانازی دەکەن کە چیدی پێویستیان بەو بیروباوەڕانەو هیچ جۆرە هاوکاری و کۆمەکێکی مرۆیی نیە. ئەو مرۆڤانەی بتوانن بە ئەندازەی پەرچەکرداری ئاژەڵی، کارو ئەرکەکانیان ئەنجام بدەن، سەبارەت بە رژێمە تۆتالیتارەکان خەڵکانێکی زیادو بێکەڵکن. تۆتالیتاریزم هەوڵنادات فەرمانڕەوایی ستەمگەری بەسەر مرۆڤەکاندا پیادەبکات، بەڵکو بۆ هێنانەدی رژێمێك تیدەکۆشێت کە مرۆڤ بەپێویست نازانێت. دەسەلاتی گشتگیر تەنها لە جهانی مەرجدارو ئەو قەرەقوزانەی نزمترین ئاستی هەرەمەکیان تیا نیە، دەتوانرێ بەدیبێت و بوونی بپارێزێت. بەلام لەبەر ئەوەی مرۆڤ زۆرێك سەرچاوەی هەیە، بۆیە تەنها کاتێك دەتوانرێ بالادەستی گشتگیری لەسەر پیادە بکرێ کە لەشێوەی مرۆڤێکی ئاژەڵیدا چییەتی خۆی بگۆڕێت.

لەمڕووە، کەسایەتی مرۆڤ بۆ ڕژێمی تۆتالیتاری بە هەڕەشە دەژمێردرێت، تەنانەت خودی ڕێسای نارەواترین یاساش لەمپەرێکە لەبەردەم بالادەستی گشتگیردا، بەلام تاکگەرایی کە لەراستیدا هەمەرەنگی دەخاتە نیوان مرۆڤەکانەوە، هەلوێستێکە ئەمجۆرە ڕژێمە لێبوردەیی لە بەرامبەریدا نیە. مادامەکی ڕژێمە تۆتالیتارەکان ناتوانن هەمو مرۆڤەکان بە شێوەیەکی یەکسان بکەن بە مرۆڤی بێکەلك و زیاد . تەنها لە ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەلدا ئەو شتە دێتەدی . ئامانجی بالادەستی گشتگیر نایەتەدی. دەولەتە تۆتالیتارەکان لە ڕێگەی هەلبژاردنی هەڕەمەکیانەی گروپە جۆراوجۆرەکان بە مەبەستی ڕەوانە کردنیان بۆ ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەل و پاکتاوکردنی یەك لەدوای یەك و سیستماتیکانە لە دەزگاکانی حوکم و کوشتنی بە کۆمەلدا، بەردەوام هەول دەدەن بێکەلکی و زیادی مرۆڤ بەدیبهێنن، هەرچەندە هەرگیز سەرکەوتنی تەواوەتیش بەدەست ناهێنن. ئەگەر عەقلی دروست بە نائومێدی لەمەر ملکەچی جەماوەر نارەزایی لەسەر بێکەلکی ئەم دەزگا زەبەلاحە تیرۆریستە دەربرێت، ئەوا فەرمانڕوا تۆتالیتارەکان، ئەگەر بتوانن ڕاستی بلێن، لە وەلامدا دەلێن ئەو دەزگایەی لەلای تۆ زیادو بێکەلکە چونکە هەولدەدا مرۆڤەکان زیادو بێکەلك بکات، ئەمە لە کاتێکدا ڕژێمی تۆتالیتار مرۆڤ وەك مرۆڤ بە زیاد دەزانێت.

هەول و کۆششی ڕژێمە تۆتالیتارەکان بۆ ئەوەی مرۆڤ زیادو بێکەلك بکات، تارادەیەکی زۆر ڕەنگدانەوەی بێفەڕی جەماوەری هاوچەرخی سەر خاکێکە کە جمەی لە دانیشتوان دێت. بۆیە جهانی مردوەکان کە مرۆڤ لە ڕێگەی شێوازی ژیانەوە وانەی زیادبونی پێدەوترێتەوە، وانەی سزادان پەیوەندی بەتاوانەوە نیە، چەوسانەوە بەبێ قازانج پیادە دەکرێ و کارکردن هیچ بەرهەمێکی نیە، ئەو جهانەی لە کارخانەیەك دەچێت، ڕۆژانە بێهەستی و پڕوپوچی بەرهەم دەهێنێت. لەگەل ئەوەشدا، لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاریدا، هیچ شتێك ئەوەندەی ئەو کوشتنە بە رووکەش بێبەلگەیە، بەجێ و لۆجیکی نیە،

چونکه ئەگەر زیندانیەکان لە کرمێك زیاتر نەبن، کەواتە شتێکی لۆجیکیە بە گازی ژەهراوی لەنێوببرێن، ئەگەر خەڵکانێکی بودەڵەش بن، بۆچی رێگە بدەین پــەتای گەنــدەڵیان لــەنێو دانیــشتواندا بڵاوبێتــەوە، ئەگــەر پێــشمان وابێــت "خودێکی کۆیلانەیان" هەیە (هیملەر)، کەواتە بۆچی کاتی خۆمان بۆ دوبارە پەروەردەکردنیانەوە بەفیرۆ بدەین. لە روانگەی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتارەوە، تاکە گرفتی ئەو ئۆردوگایانە بە نزیکەی بریتیە لەوەی کە زۆر ماقوڵانە کار دەکەن و ئایدیای تۆتالیتاری لەم ئۆردوگایانە زیاد لە پێویست بە یەکانگیری پیادە دەکرێ.

هەر چەندە رژێمە تۆتالیتارەکان بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوەو گاڵتەجارانە جهان لەو تاکە شتەش پوچەڵدەکەنەوە کە مانایەکی بۆ عەقڵی دروستو هەڵسەنگاندنە سودگەراکانی هەیە، لە هەمان کاتیشدا جۆرێك لە بانمانای supersense بەسەرا دەسەپێنێت کە ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتار هەمیشە دیدو جهانبینیەکانی لەسەر بونیات دەنێت، کاتێك بانگەشەی دۆزینەوەی کلیلی مێــژوو یــا چارەســەری لــوغزە گەردونیــەکانی دەکــات. لەســەروی هــەر بانبێهەستییەکی کۆمەڵگەی تۆتالیتاریدا، بانمانای گاڵتەجاری خۆڕافەیەکی ئایدیۆلۆجیاش هەیە. ئایدیۆلۆجیاکان تەنها کاتێك بێزیان و بێدەردەسەرن، کەس بە هەندیان وەرنەگرێت، بەڵام کاتێك ئەو داوا ئایدیۆلۆجیانە بەهەند وەربگیرێن، ئیدی بە نێوەندی ئەو سیستەمە لۆجیکییە دەگۆڕێت کە چەشنی سیستەمی زەینی پارانۆیی . Paranoia (جۆرە نەخۆشییەکی دەرونیە کە نەخۆش لەچوار چێوەی سیستمێکی لۆجێکیدا، بەڵام لۆجیکێکی نەخۆش و دوور لەواقعیەت پێیوایە راوەدودەنرێ بۆ ئەوەی لەنێوبرێت، چونکە لەو باوەرەدایە بەخاتری توانای لە رادەبەدەری، بوونی مەترسی هەیە)، مەسەلە زەینییــە جــۆراو جۆرەکــان یــەك لــەدوا یــەك بەشــوێن هــەمان مەســەلەی بەڵگەنەویستی سەپێنراوی یەکەمدا دێن. بەڵام شێتی ئەمجۆرە رژێمە بە تەنها لە بەڵگەنەویستی سەپێنراوی یەکەمدا نیە، بەڵکو لە لۆجێکی بونیادەکەیدا

خۆی متکردوه. لۆجێکی سەیروسەمەرەی ئیسما . Ismes و ئیمانی سادەو ساکاریان بە بەهای رزگارکەری کوێرانەی بیروباوەڕێك کە هیچ بایەخێك بۆ هۆکارە دەرەکیی و گۆڕاوەکان دانانێت، یەکەمین تۆوی نەفرەتی تۆتالیتاری لە واقیع و فاکتەکاندا دەچێنێت.

لەبەر ئەوەی عەقلی دروست ئارەزوی بیرکردنەوەی سودگەرای هەیە، بۆیە بە ئەندازەی ئەو جهانە بێمانایەی رژێمە تۆتالیتارەکان دروستی دەکەن، بەرامبەر ئەم بێمانا ئایدیۆلۆجییەش دەستەوەستان دەبێت. بێزاری ئایدیۆلۆجیا بەرامبەر بە واقیع لە وێنای بەخۆنازینی سەروەری مرۆڤ بەسەر جهاندا سەرچاوە دەگرێ و هەر هەمان بێزاری لە واقیع بوار بۆ گۆڕینی جهان خۆشدەکات و مرۆڤیش بەرەو بالاکردن دەبات. ئەوەی بێزاریی تۆتالیتاریزم لە واقیع لە خۆنازین دادەماڵێت (لەهەمان کاتیشدا، بەشێوەیەکی ریشەیی لە تیورەو هەڵوێستی شۆڕشگێڕی جیادەکاتەوە)، بریتیە لەو بانمانایەی کە هێزو تواناو لۆجیك و یەکانگیری بە بێزاری لە واقیع دەبەخشێت. ئەوەی بەم بانگەشە بۆلشەفیکییە، واتە رژێمی ئێستای روسیا لە هەر رژێمێکی دی جهان باشترە، لایەنی تۆتالیتاری راستەقینەی پێدەبەخشێت، ئەو واقیعەیە کە فەرمانڕەوای تۆتالیتار لەو بانگەشەیەی سەرەوە، ئەم دەرئەنجامە هەڵدەگۆزێت: بەبێ رژێمی کۆمۆنیستی سۆڤێت خەڵکی هەرگیز ناتوانێت کاری سەرسوڕهێنەری وەك میترۆ دروست بکەن، هەر لەم مەسەلەیەشەوە دیسانەوە ئەم دەرئەنجامە بە دەست دەهێنرێت کە هەر کەسێك زانیاری لەسەر میترۆی پاریس هەبێت، کەسێکی گومانلێکراوە، چونکە لەوانەیە خەڵکی دەربارەی ئەو مەسەلەیە بخاتە گومانەوە کە تەنها لە رێگەی بۆلشەفیکەوە دەتوانرێ شتی باش دروست بکرێ، سەرئەنجام، ئەو مەسەلەیەی سەرەوە بەم دوا دەرئەنجامە دەگات، بۆ ئەوەی بۆلشەفیکێك دڵسۆزو بە ئەمەك بۆ رژێمەکەی بمێنێتەوە، دەبێ میترۆی پاریس لەناوببرێت. لە دوای ئەوەش جگە لە یەکانگیری لۆجیکی شتێکی دی گرنگ نیە.

بێگومان لەگەڵ ئەم بونیادە تازەیەی کە لەسەر هێزی بانمانا دامەزراوەو لۆجیک دەیبزوێنێت، بە کۆتایی سەردەمی بۆرجوازی خاوەن بەرژەوەندیو دەسەلاتو کۆتایی کۆلۆنیالیستو پەرەسەندن دەگەین. بەهەر حاڵ شەرەنگیزی تۆتالیتاری لە چلێسی هێزو قازانجی رەها سەرچاوە ناگریو ئەگەر نەسرەوتانەش بەدوای پانتاییەکی تازەدا بگەرێت، نە بەمانای پەرەسەندنو نە بەمانای قازانجێکی رەهایە، بەڵکو تەنها بە هۆی ئایدیۆلۆجیایەکی رووتە، واتە بە مەبەستی جهانێکی یەکانگیرو سەلماندنی راستیو دروستی بانمانایە.

پێویستە لەسەر تۆتالیتاریزم بە ناوی هەمان بانماناو بە ناوی یەکانگیری کامڵەوە، هەمو جۆرە ئاسەوارێك لەنێوبەرێت کە خەڵکی بەشکۆمەندیو کەرامەتی مرۆڤی دەخوێنێتەوە. چونکە رێزگرتن لە کەرامەتی مرۆڤ بریتیە لە دانپیانانی مرۆڤو میللەتانی دی، وەك خەڵکانێك کە ئامادەییو کردەوەیان هەیەو وەك بونیاتنەری جهان یا بەشداری لە دامەزراندنی جهانێکی هاوبەش بکەن. هەر ئایدیۆلۆجیایەك هەوڵبدات هەمو روداوە مێژووییەکانی رابردو راڤەبکاتو رەوتی هەمو روداوەکانی ئایندەش رێکبخات، ناتوانێت پێشبینیە قبوڵنەکراوەکانی ئەو واقیعە قبوڵ بکات کە مرۆڤ بە بونەوەرێکی داهێنەر دەزانێت، هەروەها ناتوانێت ئەو واقیعەش قبوڵبکات کە مرۆڤ دەتوانێ شتی نوێی ئەوتۆ دابهێنێت، هەرگیز پێشبینی نەکرابێت.

کەواتە ئامانجی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتاری نە جهانی دەرەکی دەگۆڕێت، نە گۆڕانکاری شۆڕشگێڕانەش لە کۆمەڵگەدا دەکات، بەڵکو سروشتی مرۆڤ دەگۆڕێت. ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ وەك تاقیگەیك، گۆڕینی سروشتی مرۆڤی تیا تاقیدەکرێتەوە، بۆیە دزێویو ناشیرینی ئەو ئۆردوگایانەش بە تەنها زیندانیەکانو ئەو کەسانەی بەپێی پێوەرێکی "زانستی" ورد تاقیکردنەوەکان ئەنجامدەدەن، ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو دزێوییانە ئاراستەی هەمو مرۆڤ دەکرێت. ئەو ئێشوئازارەی لە هەژماردن نایەتو تەنانەت ژمارەی

قوربانییەکانیشی، ناوەرۆك و ئەسڵی مەسەلەکە نیە، بەڵکو سروشتی مرۆڤ بەمانای رەهای وشە لەمەحەکدایە. هەر چەندە وادەردەکەوێت ئەم تاقیکردنەوانە نەتوانن مرۆڤ بگۆڕن، بەڵکو دەتوانن ویرانی بکەن، ئەویش لەرێگەی ئەفراندنی کۆمەڵگەیەك کە بنەمای هیچگەرایانەو درندانەی "مرۆڤ گورگی مرۆڤە . Homo Homini Lupus تیا بەدیبێت، بەڵام دەبێ سنوری زەرورەتی تاقیکردنەوەیەك لەبەرچاو بگرین کە مەبەستی بە دەست هێنانی ئەنجامە گشتییەکانی پێویستی بە کۆنترۆڵکردنی جهان هەیە.

تا ئەمرۆش وادەردەکەوێت ئەو بیروباوەڕە تۆتالیتارییەی پێیوایە هەمو شتێك لەتوانادایە، تەنها یەك شتی سەلماندوە، ئەویش: دەتوانرێت هەمو شتێك وێرانبکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، رژێمە تۆتالیتارەکان لە هەوڵ و کۆششە بەردەوامەکانیان بۆ ئەوەی بیسەلمینن هەمو شتێك لە توانادایە، بێئەوەی بەخۆیان بزانن جۆرە تاوانێك ئاشکرا دەکەن، نە دەتوانرێت سزاکەی دیاریبکرێت، نە لێشیدەبورێت. چونکە کاتێك ئەستەم، لەتوانا (مومکین) دەکرێت، ئیدی خودی ئەستەم دەبێ بە شەڕێکی رەها و دەرە سزادان و لێبوردن، شەڕێك ناشیرینترین هاندەری بەرژەوەندی کەسی و گرێی هەست بە گوناهکردن و چڵێسی دەسەڵات و ترس، ناتوانێت لێی تێبگات و شیتەڵی بکات، شەڕێك نە تووڕەیی دەتوانێت تۆڵەی لێبکاتەوەو نە خۆشەویستی بەرگەی دەگرێت و نە هاورێیەتیش لێیدەبورێت. هەروەکو چۆن قوربانی کارگەکانی مردن یا زیندانی ناو ئۆردوگاکان لە دیدی جەلادەکانیانەوە بە "مرۆڤ" حیسان نەدەکران، ئەمجۆرە تاوانبارە تازانەش ئەو سنورە دەبەزێنن کە هاوکاری مرۆییانە لە ناوکۆیی تاوانەکەدا بێتەدی.

لەخودی نەریتی فەلسەفەی ئێمەدا دیدێك هەیە وێنای بوونی "شەڕێکی ریشەیی . شر جذری" لەمجۆرەی پێناکرێت، ئەم دیدە هەم دەربارەی لاهوتی مەسیح راستە کە ئەسڵێکی ئاسمانی بە خودی شەیتان دەبەخشێت، هەم

دەربارەی "کانت"یش تاکە فەیلەسوفە کە بە گوزارەی خۆی گومانی لە شەڕێکی لەوجۆرە هەبوە، بەڵام هەر زوو لە رێگەی چەمکی " ویستێکی لادەرانە. الارادە المنحرفە "وە سیمای عەقڵانیەتی پێبەخشیوە کە دەکرێ لە رێگەی ئەنگیزەی روون و ئاشکراوە شیتەڵ بکرێ. لەراستیدا شتێك نیە پشتی پێببەستین بۆ ئەوەی لە دیاردەیەك تێبگەین کە واقیعبونی بوارێك بۆ ئەوە ناهێڵێتەوە پرسیاری لەسەر بکەین و هەمو ئەو پێوەرانەش تێکدەشکێنێت کە تا هەنوکە شارەزاییمان لەسەری هەیە. لەم میانەشدا تەنها شتێك قابیلی تێگەیشتن بێت ئەوەیە، دەتوانین بڵێین شەڕی ریشەیی پەیوەندییەکی پتەوی بە رژێمێکەوە هەیە کە هەمو خەڵك بە بێکەڵك و زیاد دەزانێت. لەم بارەیەوە خودی دامەزرێنەرانی ئەم رژێمەش قەناعەتیان بە بێکەڵکی خۆیان هەیە، هەروەکو چۆن قەناعەتیان بە زیادبوونی ئەوانی دی هەیە، جەلادو بکوژە تۆتالیتارەکانیش لەو رووەوە ترسناکن کە هیچ بایەخێك بە زیندوبون یا مردنیان نادەن و لە خۆشیان ناپرسن، ئایا زەمانێك زیندوو بون یا وەکئەوەی هەرگیز لەدایك نەبوبن. ئەمرۆ لەگەڵ زۆربونی ژمارەی دانیشتوان و گەورەبونی نەدارەکان و زیادبونی لە رادەبەدەری جەماوەر، گەر دیسانەوە بە پێی گروپی سودگەرا بیر لەدونیا بکەینەوە، ئەوا مەترسی کارگەی دروستکردنی تەرم و قەڵای فەرامۆشی هێشتا لە ئارادایە. بە هەر حاڵ روداوە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابورییەکان زۆرجار دەستێکی نادیاریان لەگەڵ ئەو میکانیزمە تۆتالیتارییە هەیە کە بۆ بێکەڵك کردن و بە زیادکردنی خەڵکی دامەزراوە. ئەم وەسوەسە شاراوەیە بە جوانی لە دروستی عەقڵی سودگەرای جەماوەردا بەدیدەکرێ کە لە هێندێك وڵاتدا ئەوەندە بەرەو نائومێدی پەلکێش کراون کە چیدی ترسیان لە مردن نەماوە. نازی و بۆلشەفیکەکان بڕوای تەواویان بە سەرکەوتنی هەوڵەکانی خۆیان هەبو، چونکە پێیان وابو پێشنیازکردنی پرۆژەکانی لەناوبردن کە بۆ چارەسەری خێرای مەسەلەی چڕی دانیشتوان و چارەسەری ئەو جەماوەرە مرۆییەی لەرووی کۆمەڵایەتییەوە بێڕەگ و ریشەیە و

لـەرووی ئابوریـشیەوە بێکەڵکـە، بـە هـەمان ئـەو ئەندازەیـەی رق و کینـە دەوروژێنێـت، کـێش و چاکەشـیان هەیـە. لـە هـەر ئانوسـاتێکدا نەهێـشتنی کوێرەوەری ئابوری، سیاسـی و کۆمەڵایـەتی بـە شێوەیەکی مرۆڤانـە لـە توانـادا نـەبێت، ئیـدی رێگـە چارەی تۆتالیتـاری دەتوانێـت بەشـێوەی هـەوڵی گـەورە، تەنانەت لەدوای کەوتنی رژێمی تۆتالیتاریشەوە هەر بەردەوام بێت.

## پەراوێزەکان:

1. نازییەکان زۆر بە باشی دەیانزانی کە دەسەڵات گرتنەدەست، بەزەرورەت دەبێتە مایەی دامەزراندنی حکومەتێکی رەها. لەگەڵ ئەوەشدا حیزبی ناسیونال سوسیالیست نابێتە سەرەنێزەی ململانێی دژە لیبرالیزم بۆ ئەوەی گیرۆدەی حکومەتێکی رەها بێت و بەوەشێوەیەش تا ناکۆتا بەردەوام بێت"

Werner Best. Die deustusche polizei, p.20

بە هەر حاڵ ئەم وریاکردنەوەیە، یەکێکە لەو وریاکردنەوە بێشومارانەی لەدژی ئەو بۆچونەی بانگەشەی دەوڵەتێکی رەهای دەکرد، ئاراستە دەکرا.

2ـ تیورەکەی تروتسکی کە یەکەمینجار لە ساڵی 1905دا دەرکەوت، لەگەڵ ستراتیجی شۆڕشگێری هەمو لینینستەکانی دی جیاوازی نەبو. ئەو لینینیستانە پێیان وابو "خودی روسیا یەکەمین مەڵبەندو یەکەمین قەڵای شۆڕشی جهانیە: بۆیە دەبێ بەرژەوەندی روسیا سەر بە ستراتیجی شۆڕشگێری جهانی بێت. بەڵام ئەمرۆ سنوری روسیاو سۆسیالیزمی سەرکەوتو، بوەبە یەك سنور. (ئیسحاق دویچەر، بیوگرافیای سیاسی، نیویۆرك و لەندەن، 1949، ل243).

3ـ ساڵی 1934 بە هۆی پێگەی یاسایی تازەی حیزب کە لە کۆنگرەی حەڤدەی حیزب راگەیەنرا، بایەخێکی گەورەی هەیە: لەو یاسا تازەیە ئامارە درابو بە "پێویستە هەڵمەتی پاکتاوکردنی دەوری.. لەپێناو پاککردنەوەی حیزبدا ئەنجام بدرێ" (لە ا. ئۆڤتۆرخانۆڤ. موە وەرگیراوە، "ناکۆکی کۆمەڵایەتی و ململانێی ناوخۆی حیزب"، گۆڤاری پەیمانگەی لێکۆڵینەوە دەربارەی یەکێتی سۆڤێت"، میونیخ، 1956). بەڵام پاکتاوکردنە ناوخۆکانی ساڵانی یەکەمی شۆڕشی روسیا، هیچ روخسارێکی هاوبەشی نەبو لەگەڵ پاکتاوکردنە تۆتالیتارەکانی دوایی کە سیمای ناسەقامگیرییەکی بەردەوامی پێوەدیار بو. یەکەمین پاکتاوکردنی شۆڕشگێرانە لەژێر چاودێری لیژنە چاودێرە خۆجێیەکان و دادگا ئاواڵەکاندا بەڕیوەدەچو، ئەندامە حیزبی و ناحیزبیەکانیش بۆیان هەبو بەشداری بکەن. ئەو لیژنانە وەك دەزگایەکی چاودێری دیموکراسی لەدژی گەندەڵی ئیداری ناوخۆی حیزب دامەزرابون و "دەبوایە وەك ئەڵتەرناتیڤی هەڵبژاردنێکی واقعی کاربکەن" (دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل233 . 234). دەتوانرێ لێکۆڵینەوەی دانسقەی مێژوویی دەربارەی هەڵمەتەکانی پاکتاوکردن لە دوا وتاری ئەڤتۆرفانۆف بەدیبکەین

که تیایه ئەو قسەلۆکانە بەدرۆ دەخاتەوە کە کوشتنی کیرۆڤ ئاماژەی دەسپێکی سیاسەتێکی نوێ بێت. چونکە لە پێش کوشتنی کیرۆڤ هەڵمەتی پاکتاوکردنی گشتی دەستی پێکردبو، بۆیە کوشتنی ئەو تەنها "پاساوێکی گونجاو بو بۆ توندکردنەوەی" ئەو پاکتاوکردنە. ئەگەر مرۆڤ لە هەلومەرجی "ئاڵۆزو نهێنی ئامێزی" کوشتنی کیرۆڤ وردبێتەوە، گومانی ئەوەی لەلا پەیدا دەبێت کە "پاساوی گونجاو" دەستکردی خودی ستالین بێت و هەر خۆیشی ئامادەکاری بۆ کردبێت.
بڕوانە وتەکانی خرۆچۆف لەسەر ستالین، نیویۆرك تایمز، 5/ حوزەیران/ 1956

4ـ دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل282، یەکەمین پەلامار لەدژی "شۆڕشی بەردەوام" کە داهێنانێکی تروتسکی بو، لەگەڵ دژە وتەزای ستالین لە هێنانەدی "سۆسیالیزم لەتاکە وڵاتێکدا"، بەمانۆڕێکی سیاسی وەسفدەکات. ساڵی 1924، "چارەنوسی ستالین لەسەر بێبایەخ کردنی تروتسکی بەندبو. کاتێك دەستەی سێ نەفەری فەرمانڕەوا بە رابردوی تروتسکی دەچونەوە، کەوتن بەسەر تیورەی "شۆڕشی بەردەوام"دا کە ساڵی 1905 دایڕشتبو... ستالین لە دوتوێی گەڕان بەدوای ئەم مەسەلەیەدا گەیشتە فۆرمۆڵەی "سۆسیالیزم لە تاکە وڵاتێك"دا.

5ـ پاکتاوکردنی داروودەستەی رۆهم لە حوزەیرانی 1934، لەدوای ماوەیەکی کورت لەئارامی و سەقامگیری رویدا. رۆدۆڵف دایلز، فەرماندەی پۆلیسی سیاسی لە بەرلین دەڵێت: یەکەی هێرش لە سەرەتای ئەو ساڵەوە دەستی لە گرتنی ناقانونی "شۆڕشگێڕی" هەڵگرتوە، تەنانەت گیراوە کۆنەکانیش لێکۆڵینەوەی تازەیان لە تەکدا دەکرێ. (پیلانگێڕی نازی، حکومەتی ئەمریکا، واشنتن، 1946، جلدی پێنجەم، ل205). لە نیسانی 1934، ویلهلم فریك، وەزیری ناوخۆی رایخ، ئەندامی دێرینی حیزبی نازی، بە حوکمی "ئارامی بارودۆخی میللی" فەرمانێکی دەرکردوە کە پیادەکردنی "گرتنی خۆپارێزی" سنورداربکرێ.
**Voir das Archles. Avril 1934, p. 31.**

بە هەر حاڵ ئەو فەرمانە بە هیچ شێوەیەك بڵاونەکرایەوە (پیلانگێری نازی، جلدی حەوتەم، ل1099، بەرگی دوەم، ل259). پۆلیسی سیاسی ناوچەی پرۆس راپۆرتێکی تایبەتی لەسەر دەستدرێژییەکانی یەکەی هێرش ئاراستەی هیتلەر کردوە کە تیایە پێشنیاز دەکات هێندێك لە رێبەرانی یەکەی هێرش، ئەوانەی لە راپۆرتەکەدا ناویان هاتوە، لێپێچینەوەیان لەگەڵ بکرێ.

هیتلەر بێنەوەی پەنا بۆ رێوشوێنی شەرعی بەرێت، بە کوشتنی رێبەرانی یەکەی هێرش و کەنارگیر کردنی ئەو ئەفسەرە پۆلیسانەی روبەروی یەکەکانی هێرش بونەتەوە، مەسەلەکەی چارەسەر کرد (بڕوانە گۆشەگیر کردنی رۆدۆڵف دایلز لەسەر بنەمای سوێند خواردن، سەرچاوەی پێشو، جلدی پێنجەم، ل224). هیتلەر بەمشێوەیەو بە تەواوەتی خۆی لەبەرامبەر هەمو جۆرە شەرعییەتێك و ئارامی بارودۆخەکە دەپاراست. لەنێو زۆرێك لەو یاسادانەرانەی بە گەرمی خزمەتی ئایدیای ناسیونال سۆسیالیزم . یان کردبو تەنها ژمارەیەکی کەم درکیان بەوە

کردبو کە شتێك لە مەترسیدایە. تیودۆر ماونز کە لێکۆڵینەوەکەی ( Gestalt und Recht der polizei) "ساڵی 1943 لە هامبۆرگ دەرچوە" لەلایەن نوسەرە نزیکەکانی هیتلەر، وەك پۆڵ ورنەر پشتگیری لێدەکرا، پەیوەندی بەو گروپە یاسادانەرانەوە هەبو.

6. رۆبەرت لی، Der ueg zur ordensburg، مێژووی نیە، بە نزیکەیی ساڵی 1936 ە، چاپێکی تایبەتە بۆ "دیپلۆماتەکانی پێشەوا" بۆ فرۆشتن نیە.

7- Heinrich Himmler, "Die Schuctzstaffel" in Grundlagen aufbour und wirstsch aftsor dnung des nazionalistischen staates, Nr 7b.

زۆرجار لێکۆڵەران ئەم ریشەیی نەگۆڕە لە پرەنسیپی هەڵبژاردنی رەگەزی، لە هەمو قۆناغەکانی سیاسەتی نازیدا بەدیدەکەن. سەرەتا دەبێ یەهودی تەواو لەنێوببرێن، ئنجا نیوە یەهودو چارەکە یەهود، یا سەرەتا ئەوانەی بە تەواوەتی شێتن دەبێ لەنابرێن، ئنجا ئەو کەسانەی نەخۆشی بێدەرمانیان هەیە، سەرئەنجامیش ئەو خێزانانەی نەخۆشێکی بێدەرمانیان هەیە. پرەنسیپی "هەڵبژاردنی رەگەزی" کە هەرگیز کۆتایی نەدەهات، دەستەی پاراستنیشی دەگرتەوە. پێشەوا لە 19/ ئایار/ 1943 فەرمانیدا ئەو کەسانەی پەیوەندی خێزانیو هاوسەرێتیو دۆستایەتییان لەگەڵ خەڵکانی بیانی هەیە، پێویستە لە حیزبو دەوڵەتو سوپاو ئابوری بەرکەنار بکرێن. ئەم فەرمانە 1200 لە رێبەرانی دەستەی پاراستنیشی دەگرتەوە (بڕوانە نوسینگەی ئەرشیفی هۆڤەر، دۆسیەی هیملەر، فۆڵدەری 330).

8 . هەمو کەسێك دەزانێت لە روسیا هاورێ لەگەڵ سەقامگیربونی ئاشتی لە وڵاتدا "سەرکوتکردنی سۆسیالیستو ئانارچیستەکان" یش توندترو گەورەتر دەبو. (ئەنتۆن سیلیگا، لوغزی روسیا، لەندەن، 1940، ل244). دویچەر لە لاپەرە 218ی هەمان سەرچاوەی پێشو، پێیوایە ئەوەی بوە مایەی نەمێشتنی "گیانی ئازادیخوازانەی رۆژانی سەرکەوتنی شۆڕش"، دەشێت لە گۆڕانی هەڵوێستی جوتیاراندا بەدیبکرێ: چونکە "هەرچی زیاتر دڵنیاتر دەبون لەوەی کە دەسەڵاتی گەورە مۆڵکدارەکانو جەنەراڵە سپییەکان تێکدەشکێت" شیلگیرانەتر لە بۆلشەفیکەکان هەڵدەگەڕانەوە، بەڵام بەرامبەر بە فراوانبونی مەودای تیرۆر لە دوای ساڵی 1930ەوە، لاوازی ئەم بەڵگەیە رونتر دەبێتەوە. لەلایەکی دی، ئەو رونکردنەوەیەی سەرەوە، ئەو واقیعە لەبەرچاو ناگرێت کە تیرۆر لە سییەکان، نەك لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا پەیدابو، واتە کاتێك ئۆپۆزیسیۆنی چینی جوتیاران هیچ هۆکارێکی یەکلاکەرەوەی لەسەر بارودۆخەکە نەمابو. هەروەها خرۆچۆفیش لە هەمان کتێبدا ئاماژە بەوە دەکات کە رێوشوێنی سەرکوتکردنی توند لەدژی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی لە کاتی شەڕی تروتسکیو بۆخارین بەکارنەهێنرا، بەڵکو سەرکوتکردنی نەیاران لەدوای ماوەیەکی زۆر لە شکستی ئەو دوانەوە دەستی پێکرد.

تیرۆر لە سایەی حوکمی نازیدا تەنها لە ساتەوەختی جەنگدا گەیشتە چڵەپۆپە، واتە ئەو کاتەی کە میللەتی ئەڵمانیا بەکردەوە یەکگرتو بو. بەڵام پێشینەی تیرۆر بۆ ساڵی 1936

دەگەڕێتەوە، واتە کاتێك هەمو جۆرە بەرگرییەکی کاراو رێکخراو لەناوخۆی ولاتدا لەنێوبرا بو، دروست ئەو کاتەی کە هیملەر پێشنیازی فراوانکردنی ئۆردوگای گرتنی بە کۆمەڵی کرد. وتارەکەی هیملەر لە ساڵی 1943، لەبەردەم فەرماندەکانی دەستەی پاراستن لە خارکۆف، رۆشنترین بەڵگەیە لەسەر ئەم رۆحە سەرکوتگەرەی رژێمی توتالیتاریو بزری هەمو جۆرە بەرگرییەك: " ئێمە تەنها یەك ئەرکمان هەیە... ئەویش نەبەردی بێبەزەییانەی رەگەزییە... هەرگیز دەستبەرداری ئەو چەکە نایابو رەوشتە بەرزە ترسناکەش نابین کە لەشەڕی خارکۆفدا بەدەستمان هێناوە، بەڵکو پێویستە رۆژانە مانای تازەی پێببەخشین" (پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل 572).

9. بەمەبەستی دەرخستنی دیدوبۆچۆنی رووکەشو راگوزەری یەکێك لە دیارترین پسپۆری یاسای سەرەکی نازی بەناوی تیودۆر ماونز، دەتوانرێ لەوە تێبگەین کە تا چەند نازییەکان لە یاساو بریارەکانی خۆیاندا کە ساڵانە لەلایەن و. هۆك بەناونیشانی zelrung des kabrinets Hitler بلاودەبووە، بێئاگاو بێخەبەر بون. ئەو پێیوایە سەرباری نەبونی سیستمی یاسایەکی نوێی گشتگیر، کەچی "ریفۆرمێکی سەرتاسەری" رویدابو.

Voir Ernest R. Huber, "Die Deutsche polizei", inzeitschrift fur die gesamte staatwissenschaft, Band 101, 1940/1, p. 273 S.

10ـ ماونز، سەرچاوەی پێشو، ل49، بەرەئی من ماونز، تاکە نوسەری نازییە کە ئەم واقیعەی تۆمار کردوەو جەختیشی لەسەر کردۆتەوە. تەنها لە رێگەی خوێندنەوەی هەر پێنج جلدەکەی (Verfugungen, Anordnungen, Bekanntgaben) کە لە کاتی جەنگدا بەپێی رێنماییەکانی مارتین بۆرمان، لەلایەن راوێژکارەکانی حیزبەوە کۆکرایەوەو بە چاپگەیەنرا، دەتوانرێ دیدو تێروانینێك لەسەر ئەو ئیدارە نهێنییە پەیدابکەین کە بەکردەوە حوکمی ئەڵمانیای نازی دەکرد. ئەو جلدانە بە گوێرەی پێشەکییەکەی، "تەنها بە کەڵکی پێرەوی ناوخۆی حیزب دەهاتو دەبوایە زۆر بەنهێنی بمێنێتەوە". چوار جلدیان زۆر دانسقەیە، بەرهەمەکەی هۆك Hoche، لەسەر کۆی یاساکانی کابینەی هیتلەر، لەبەرامبەر ئەو چوار جلدە هیچ تولییەکیان تیانیە، ئێستا لە کتێبخانەی هۆڤەر دەست دەکەوێت.

11. ئەو "ئاگادارکردنەوە"یەی پێشەوا لەساڵی 1933 ئاڕاستەی یاسادانەرە نازییەکانی کردوە، هانس فرانك ئاماژەی پێکردوە

Nationalsozialistische lisissche leitsatze fur ein ein neues deutsches )
strafrecht, zweiter Teil, 1936, p. 8

12. دویچەر، هەمان کتێب، ل381، لە پێش ئەو مێژووەشەوە، هەر لە 1918 تا 1924، هەوڵو کۆشش بۆ یاسادانان هەبوە. بەڵام ریفۆرمی دەستوری ساڵی 1944، کە بەپێی ئەو

دەستورە هێندێك لە كۆمارەكانی سۆڤێت لە دەرەوە نوێنەری تایبەتی خۆیان، لەناوەوەش سوپای تایبەت بەخۆیان هەبو، لەواقیعدا جۆرە مانۆڕێكی یەكێتی سۆڤێت بو تا لە نەتەوە یەكگرتوەكان دەنگی زیاتری هەبێت.

13ـ بڕوانە دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل375. بە وردبونەوە لە وتارەكەی ستالین دەربارەی دەستوری بنەڕەتی (ڕاپۆرتەكەی ستالین لە كۆنگرەی نائاسایی هەشتەمی حیزب لە 25/ تشرینی دوەم /1936) ئەوە روندەبێتەوە كە ئەم دەستورە بۆ ئەوە ئامادە نەكرابو تا ببێتە دەستورێكی یەكلاكەرەوە، چونكە ستالین بەراشكاوی جەختدەكاتەوە لەسەر: "لەم ساتە مێژووییەی ئێستادا، ئەمە هێڵە سەرەكییەكانی دەستوری ئێمەیە. هەر لەمروەشەوە، ئەم پرۆژە نوێیەی دەستور، بەشێكە لەو ڕێگە دورودرێژەی تا هەنوكە پەیمانكردوەو كۆی ئەو دەستكەوتانەشە كەتا ئێستا بەدەستمان هێناوە" بەگوزارشتێكی دی، دەستوری بنەڕەتی نوێ دەگەڕێتەو بۆ ئەو ساتەوەختەی لەدایكبونی تیا ڕاگەیەنرا، بۆیە تەنها بەهایەكی مێژوویی هەبو. بۆ ئەوەی بسەلمێنرێ كە ئەو دیدوبۆچونەی سەرەوە، ڕاڤەكردنێكی هەڕەمەكیانە نیە، بگەڕێرەوە بۆ وتارەكەی مۆلۆتۆف. ئەو لەم دەستەواژەیەی خوارەوە، پۆختەی وتەكەی ستالین وەردەگرێت و چییەتی هەمو مەسەلەكەش پشتراستدەكاتەوە: "ئێمە لە سەرەتاییترین قۆناغی كۆمۆنیزمین، تەنانەت ئەو قۆناغەی كۆمۆنیستیش، واتە سۆسیالیزم، هێشتا كامڵ نەبوە، بەڵكو تەنها چوارچێوەكەی دروست بوە"

Voir Die Verfassung des sosialistischen staates der Arberter und Bauern. Editions pronethee, Strasbourg. 1937, p. 42 et 84.

14ـ "بەپێچەوانەی ئیتاڵیاوە، ژیانی دەستوری ئەڵمانیای نازی بە بێشەكڵییەكی تەواو دەناسرێتەوە، (فرانز نیومان، Behemoth، 1942، ل251).

15ـ لە بۆریس سۆڤارین وەرگیراوە، ستالین: "رزگاربونی بۆلشەفیكی شلۆق"، نیویۆرك، 1939، ل695.

16. ستیڤن. هـ. رۆبەرتس "ئەو خانوەی هیتلەر دروستی كردبو"، لەندەن، 1939

17. دادوەر رۆبەرت هـ. جاكسۆن لە دادگای نۆرمبۆرگ بە راشكاوی لە گوتاریكیدا، پەیكەری سیاسی ئەڵمانیای نازی، بەپێكەوە ژیانی "دوو حكومەتی واقیعی و روكەش" وەسفكرد. نازییەكان بۆ ماوەیەك شێوەكانی كۆماری ئەڵمانیان پاراست، ئەو شێوانەش، حكومەتی ئاشكراو رووكەشیان پێكدەهێنا، بەڵام دەسەڵاتی واقیعی لەسەرووی قانونەوە بو، واتە بەدەست دەستەی ڕێبەرانی حیزبی نازییەوە بو" (پیلانگێری نازی، جلدی یەكەم، ل125). هەروەها بڕوانە ئەو جیاوازییەی رۆبەرتس لە هەمان كتێبدا لەنێوان حیزب و دەوڵەتێكی مەجازیدا دیاریدەكات: "هیتلەر ئارەزویەكی ئاشكرای بۆ زیادكردنی دوالیزم لە ئەركدا هەبو".

لێکۆڵەرانی ئەڵمانیای نازی لەسەر ئەو خاڵە هاودەنگ بوون کە دەوڵەتی نازی بە تەنها دەسەڵاتێکی رووکەشی هەبو. لەم بوارەشدا ئێرنست فرانکڵ، تاکە ئاوارتەیە کە لە "دەوڵەتی دوالیزم"، لەندەن، 1941، بانگەشەی ئەوە دەکات: "دەوڵەتێکی ئاسایی و دەوڵەتێکی نایاب"، وەك "دوو رەگەزی پێشبڕکێکارو تەواوکاری رایخی ئەڵمانیا" لەبەریەککەوتنێکی بەردەوامدا پێکەوە دەژین. بەپێی وتەکانی فرانکڵ نازییەکان بە مەبەستی پاراستنی رژێمی سەرمایەداری و مۆڵکایەتی تایبەت پارێزگاریان لە دەوڵەتی ئاسایی دەکردو دەسەڵاتی بەسەر هەمو مەسەلە ئابورییەکاندا دەشکا، ئەمە لەکاتێکدا حیزب، دەوڵەتێکی نایابی دروستکردو دەسەڵاتی بەسەر تەواوی کاروبارە سیاسیەکاندا هەبو.

18. کاتێك نازییەکان نەیانتوانی کادری خۆیان لەنێوەندی دەسەڵاتی دەوڵەتدا دابنێن، ئیدی ناسیونال سۆسیالیستەکان لە نێو رێکخستنی تایبەتی حیزب "دەزگایەکی تارمایی"یان دروستکرد کە پەیوەندی راستەوخۆی بەخۆیانەوە هەبو، بەمشێوەیە توانیان دەوڵەتی دوەم لە تەنیشت دەوڵەتەوە پێکبهێنن"

19. ئۆ. جی. جایلز، گەستاپۆ، "وتاری رەخنەیی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دەربارەی کاروباری جهانی"، ژمارە 36، 1940، بەیەکاچونی (تداخل) بەردەوامی نێوان دەزگا حیزبی و فەرمانگە دەوڵەتەکان وەسفدەکات.

20. لەم ناوکۆیەدا یاداشتە نارەسمییەکەی وەزیری ناوخۆی نازی، فریك، گرنگی و بایەخی خۆی هەیە. فریك لە یاداشتەکەیدا رق و بێزاری دەردەبرێت لەسەر ئەوەی هیملەر، سەرۆکی دەستەی پاراستن دەسەڵاتی لەو زیاترە. بڕوانە، پیلانگێری نازی، جڵدی سێیەم، ل547. هەر لەم بوارەشدا، تێبینی و سەرنجەکانی رۆزنبۆرگ، دەربارەی گفتوگۆکەی ساڵی 1942 لەگەڵ هیتلەر بایەخێکی زۆری هەیە: رۆزنبۆرگ لە پێش جەنگ هیچ پۆستێکی رەسمی نەبو، بەڵکو یەکێك بو لە دۆستە نزیکەکانی هیتلەر، بەڵام هەر کەبوە وەزیری رایخ لە ناوچە داگیرکراوەکانی ئەوروپای رۆژهەڵاتدا، بەردەوام روبەروی "دەستێوەردانە راستەوخۆکانی بەرپرسە حیزبیەکان دەبووە، بە تایبەتی پیاوە بەتواناکانی دەستەی پاراستن، لەبەر ئەوەی سەرۆکی دەزگایەکی رووکەشی دەوڵەت بو، هیچ حیسابێکیان بۆ نەدەکرد. بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشو، جڵدی چوارەم، ل65. هەمان شتیش لەگەڵ هانس فرانك، فەرمانداری گشتی پۆلۆنیا رویدا. تەنها لە دوو حاڵەتدا باڵاکردن بۆ پلەوپایەی وەزاری کەمبونەوەی دەسەڵات و توانای لێنەکەوتەوە، ئەو دوو حاڵەتەش گۆبلز ـ ی وەزیری راگەیاندن و هیملەر ـ ی وەزیری ناوخۆ بو. سەبارەت بە هیملەر یاداشتێکمان لەبەردەستە کە زیاتر نوسینێکەی بۆ ساڵی 1934 دەگەڕێتەوە، ئەو شێوازە ساکارو سیستماتێکە روندەکاتەوە کە نازییەکان لەرێزبەندی پەیوەندی نێوان حیزب و دەوڵەت، مامەڵەیان لەتەکدا دەکرد. ئەم یاداشتە بەرووکەش وادەردەکەوێت کە راستەوخۆ لە

دەوروبەرەکەی هیتلەرەوە دەرچوبێت و لەمیانەی نامە تایبەتەکانی "یەهود لە سایەی رایخ دا . Reichadjudantur" نێوان هیتلەرو گەستاپۆ ئاشکرا بوە، ئەم وریاکردنەوەیەی تیا بەدیدەکرێ: نابێت هیملەر بکرێتە سکرتێری گشتی دەوڵەت لە وەزارەتی ناوخۆدا، چونکە لەم حاڵەتەدا ناتوانێت ببێت بە "سەرکردەیەکی سیاسی"و سەرئەنجام لە حیزبدا دەبێت بە کەسێکی نامۆ" لێرەدا پرەنسیپی یاسایەك بەدیدەکەین کە پەیوەندی نێوان حیزب و دەوڵەت رێکدەخات: "نابێت کارمەندێکی پایەبڵندی حیزب Reichsleiter، کارمەندێکی پایە بڵندی دەوڵەت Reichminister حوکمی بکات"

(یاداشتەکە بێبەرواری بێواژوە بەناونیشانی Die geheime staatpolizei، لە بەڵگەنامەکانی کتێبخانەی هۆڤەر پەیدا دەکرێ، بەڵگەنامەی پ. ویدمان).

21ـ بڕوانە " کورتە راپۆرتێك دەربارەی چالاکی نوسینگەی رۆزنبۆرگ بۆ کاروباری تایبەتی دەرەوەی حیزب لە ساڵی 1933 تا 1943" هەمان سەرچاوە، جلدی سێیەم، ل27.

22ـ ئەم ئیدارەیە بە فەرمانی رێبەر لە 12/ تەموز/ 1942، دامەزرا. بڕوانە Verfugungen, Anordnungen, Bakanntgaben سەرچاوەی پێشو. ژمارە ا، 42/54.

23ـ "لەپشت حکومەتی رووکەش، حکومەتێکی واقیعی هەبو"، هەروەکو ڤیکتۆر کراڤچینکۆ لە "دەزگای پۆلیسی نهێنی" بەدیدەکات، ( "من ئازادیم هەڵبژارد: ژیاننامەی ئەفسەرێکی سۆڤیەتی"، نیویۆرك، 1946، بەشی سێیەم، ل111).

24ـ بڕوانە ئارسەر رۆزنبۆرگ، "مێژووی بۆلشەفیك"، لەندەن، 1934، بەشی یازدەهەم، "لەراستیدا دوو دەزگای سیاسی لە روسیا بە شێوەیەکی هاورێك پێکەوە کاردەکەن (حکومەتی لەیبوکی سۆڤیەتەکان و حکومەتێکی واقیعی حیزبی بۆلشەفیك)"

25ـ دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل255ـ 256، راپۆرتەکەی ستالین لە دوازدەهەمین کۆنگرەی حیزبدا، دەربارەی نوسینگەی سکرتاریەتی حیزب، لە یەکەم ساڵی دەست بەکاربونی وەك سکرتێری گشتی، بەمشێوەیە کورتدەکاتەوە: "لەساڵی پێشودا لە 27٪ حاکمی هەرێمەکان ئەندامی حیزب بون. بەڵام ئەمرۆ لە 53٪ یان کۆمۆنیستن. رێژەی کۆمۆنیستەکانی ئیدارەی هەرەوەزی لە 5٪ بۆ 50٪ بەرزبۆتەوە، لە ریزەکانی سوپاشدا رێژەیان لە 16٪ بۆ 24٪ زیادی کردوە" سەبارەت بە هەمو دەزگاکانی دی هەمان دیاردە بەدیدەکرا کە ستالین وەك "هەڵقەی پەیوەندی نێوان حیزب و میللەت" دەیبینی.

26ـ ئارسەر رۆزنبۆرگ، سەرچاوەی پێشو.

27ـ ماونز، سەرچاوەی پێشو، ل12

28ـ یاسازان و ئەفسەری راوێژکاری پێشەوا، ر.هۆهن R. Hoehn بەم وشانەی خوارەوە گوزارشت لەم بیرۆکەیە دەکات: "شتێکی دی هەیە کە پێویستە بیانی و ئەڵمانیەکان خووی

پێوەبگرن، ئەویش ئەرکی پۆلیسی نهێنیە... ئەم ئەرکەش خرابووە ئەستۆی کۆمەڵە کەسێکی سەر بە بزوتنەوە، ئەوانەی دەبێ هەمیشە ریشەیان لە بزوتنەوەدا هەبێت. لەراستیدا دەستەواژەی پۆلیسی دەوڵەت گوزارشت لەم واقیعە ناکات، بۆیە نابێت لێرەدا ئەوەندە پێی لەسەر دابگیرێت".(Grundgragen der deutschen politizei). راپۆرتێك دەربارەی دانیشتنەکەی دەستور بۆ کۆمیتەی یاسای پۆلیسی تایبەت بە ئەکادیمی دادگای ئەڵمانیا. 11/ تشرینی یەکەم/ 1936، هامبۆرگ، 1937، لەگەڵ بەشداربونی فرانك، هیملەرو هۆهن).
Report on the constitutive session of the committee on police law of the Academy for german law.

29ـ بۆ نمونە، هانز فرانك،ساڵی 1939 لە کتێبی مافو حوکمو ساڵی 1941 لە دەقێکی دی بەناوی تەکنیکی دەوڵەت هەوڵیداوە بەرپرسیارییەت زۆر بەجودایی سنور بەند بکاتو رێگە لە "ئانارچیستی دەسەڵات" بگرێت. هانز لە کتێبی دوەمدا پێیوایە "گرەنتی ئاسایی"، لە "تایبەتمەندی حکومەتی لیبراڵ نیە"، هەروەها پێویستە ئیدارەش هەروەکو جاران لەژێر فەرمانڕەوایی یاساکانی رایخ بمێنێتەوە، یاسایەك کە لە بەرنامەی حیزبی ناسیونال سۆسیالیستەوە سروشو رێنمایی وەردەگرێت. لەبەر ئەوەی هیتلەر دەیویست بە هەر نرخێك بوە رێگە لە هەر سیستمێکی یاسایی نوێ بگرێت، بۆیە هەرگیز بەرنامەی حیزبی بەرەسمی نەناساند. هیتلەر بەچاوی سوکەوە تەماشای ئەو ئەندامانەی دەکرد کە گوێیان لەو جۆرە پێشنیازانە دەگرتو پێیوابو ئەوانە بۆ "هەتا هەتایە بە رابردوە پەیوەستن"و لەو جۆرە خەڵکانەن کە "ناتوانن لە سێبەری خۆیان هەنگاوی زیاتر بنێن" (فیلیکس کیرستین، Topenkopfund True، هامبۆرگ).

30ـ "ئەم 32 کەرتە Gaue هەرگیز لەگەڵ مەڵبەندە سەربازی یا ئیدارییەکان نەدەگونجان، هەروەها لەگەڵ 21 لقەکەی یەکەی هێرشو 10 ناوچەکەی دەستەی پاراستنو 23 بازنەکەی لاوانی هیتلەریش نەدەگونجان.. ئەوی مایەی سەرنج ئەوەیە کە بەڵگەیەك بۆ ئەو جیاوازیو بەیەکاچونە نیە" رۆبەرتیس، سەرچاوەی پێشو، ل98.

31ـ بەڵگەنامەی نۆرمبۆرگ (p.s.3063)، سەنتەری دیکۆمێنتی یەهود لە پاریس. ئەم بەڵگەنامەیە، راپۆرتێکی دادگای باڵای حیزبە دەربارەی "روداوو رێورەسمی دادگای باڵای حیزب کە پەیوەست بو بە خۆپێشاندانەکانی دژە یەهود لە 9/ تشرینی دوەم/ 1938" لەسەر رۆشنایی ئەو بەدواداچونو لێکۆڵینەوانەی پۆلیسو نوسینگەی وەزارەتی داد ئەنجامیان دابو، دادگای باڵا گەیشتە ئەو ئەنجامەی: "رێنماییە سەرزارەکیەکانی دەزگای راگەیاندنی رایخ، پێویستە رێبەرانی حیزب بەمشێوەیە لێی تێبگەن: حیزب نایەوێت لەبەرامبەر خەڵکانی دەرەوەی بزوتنەوە وەك دینەمۆی خۆپێشاندانەکان دەربکەوێت، بەڵام لە واقیعدا رێکخستنو رێبەرایەتی کردنی خۆپێشاندانەکان دەکەوێتە ئەستۆی حیزب... پشکنینی نوێی کادرە

فەرماندەییەکان ئەوەی دەرخستوە... نازییەکی چالاكو مەشقدیدە لە پێشئەوەی بزوتنەوە دەسەڵات بگرێتە دەست، بەو شێوەیە راهاتبو کە ئەو کارنامانەی حیزب نایەوێت وەك رێکخەر رۆڵی تیا دەربکەوێت، زۆر بەراشکاویو بە وردەکارییەوە دەرناچێت. کەواتە راهاتبو لەسەر ئەوەی رەنگە بڕیارێك مانایەکی زیاتری لە ناوەرۆکە سەرزارەکییەکەی هەبێت، هەروەها ئەم مەسەلەیە سەبارەت بە بڕیار بەدەستەکانیش کەمو زۆر هەر جۆرە بو، بڕیار بەدەست دەبێ لە پێناوی بەرژەوەندی حیزب هەمو شتێك لەبڕیارەکەی نەدرکێنێتو تەنها بەشێوەیەکی نادیار ئاماژە بە مەبەستی فەرمانەکەی بدات. بۆ نمونە بەپێی ئەو رێنماییانە تەنها گرونسپانی یەهود بە کوشتنی ڤۆم راس، هاوڕێی حیزب تاوانبار ناکرێت، بەڵکو دەبێ هەمو یەهود تاوانبار بکرێت، پێویستە هەمو خەڵکی دەمانچە هەڵگرن... لێرە بەدواوە دەبێ هەمو ئەندامێك بزانێت چ کارێك ئەنجام دەدا، ئەم فەرمانە لەلای زۆرێك لەسەرکردەکانی خوارەوەی حیزب بەو مانایە بو کە پێویستە لە بەهای خوێنی ئەو هاوڕێ حیزبییەی سەرەوە، خوێنی هەمو یەهود بڕێژرێت. کۆتایی ئەو راپۆرتە زۆر سەرنجڕاکێشە کە تیایە دادگای باڵای حیزب بەئاشکرا ئەم رەوشە ئاوارتە دەکات: "ئەوەش مەسەلەیەکی دیە کە لە پێناوی بەرژەوەندی رێبازەکە، رژێم پێی وابێت، ئەو فەرمانە نابێت دوبارەبێتەوە کە دیدی نادیارو ئاڵۆزی تیایەو بەئومێدی ئەوە دەردەکرێت تا خودی وەرگر لە نیازی بڕیاردەرەکەی تێبگاتو بەپێی ئەوەش رەفتار بکات. لێرەدا ئەو خەڵکانەی بەپێی وەسفی هیتلەر "ناتوانن لەسێبەری خۆیان هەنگاوی زیاتر بنێن"و لەسەر رێوشوێنی یاسایی پێدادەگرن، لەوە تێناگەن کە ئەمە فەرمان نیە، بەڵکو ویستی پێشەوایەو لە یاسا مەزنترو باڵاترە. ئیدی لێرەدا جیاوازی نێوان زەینی پێکهاتەی دەستەبژێرو پێکهاتەی کارگوزارانی حیزب، زۆر روونو ئاشکرا بەدیاردەکەوێت.

32. بیست لە هەمان کتێبدا، بەمشێوازە مەسەلەکە بەیاندەکات: "تا ئەو شوێنەی پۆلیس ویستی رێبەر جێبەجێ دەکات، کارەکانی لە چوار چێوەی قانوندا جێبەجێ دەکات، بەڵام ئەگەر ئیرادەی رێبەر پێشێل بکرێ، ئەوا خودی دەزگای پۆلیس لەو پێشێل کردنە بەرپرسیار نیە، بەڵکو ئەندامێکی پۆلیس بەرپرسیارێتی ئەو پێشێل کردنە، هەڵدەگرێ.

33. بڕوانە تێبینی ژمارە 31.

34. ساڵی 1933، لەدوای گرگرتنی ئەنجومەنی نوێنەرانی رایخ، "دەسەڵاتی سەرکردەکانی یەکەی هێرش، لە دەسەڵاتی نوێنەری هەرێمەکان (Gauleiter) گەورەتر بو، تەنانەت رەتیان دەکردەوە گوێڕایەڵی لە گورینگ بکەن. بڕوانە لە کارخستنی رۆدۆڵف دایلز، دانپیانانی سوێند خۆرەکان، لە کتێبی "پیلانگێری نازی"، بەشی پێنجەم، ل224، دیلز لەسەردەمی گۆرینگدا فەرماندەی پۆلیسی سیاسی بو.

35. فەرماندەکانی یەکەی هێرش لە داگرتنی پلەو پایەو دەسەڵاتیان لە زنجیرەی هەرەمی نازیدا زۆر تورەو بێزار بون و ئەندامەکانیان بە نائومێدی هەوڵیاندەدا رووکەش بپارێزن. لە گۆڤارەکانی S. A. Mann و Das Arelui و گۆڤارەکانی دی، گەلێك ئاماژە دەبینرێ کە چۆن هێندێك کەرەت بەپێچ و پەنا و هێندێك کەرەتی دی بە ئاشکرا بەشێوازێکی عەبەسی پێشبڕکێیان لەگەڵ دەستەی پاراستن دەکرد. لەوانەش گرنگتر، کاتێك یەکەی هێرش لە ساڵی 1936، هەمو دەسەڵاتێکی لە دەست دابو، هیتلەر بەمشێوەیە دڵنەوایی دەکردن: "هەمو شتێکی ئێوە لەمنەوەیە، هەمو شتێکی منیش لە ئێوەوەیە" بڕوانە ئێرنست بایەر، Die. S. A، بەرلین، 1938، لە کتێبی پیلانگێڕی نازی وەرگێراوە، جلدی چوارەم، ل782.

36. زۆرنبۆرگ لە گوتارەکەی حوزەیرانی 1941، دەڵێت: "بە بڕوای من ئەرکی سیاسیمان وادەخوازێت... ئەم میللەتانە لە نمونەی دیاریکراوی جەستەی سیاسیدا رێکبخەین... لە بەرامبەر مۆسکۆ رایانبگرین" لەگەڵ یاداشتە بێبەروارەکەی ئیدارەی ناوچە داگیر کراوەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات، بەراورد بکە کە تیایە هاتوە: "لەدوای شکست و لێکترازانی یەکێتی سۆڤێت، هیچ پێکهاتەیەکی سیاسی لەناوچەی رۆژهەڵات نامێنێتەوە... لەدوایشدا نابێت بە هاوڵاتیبونی دانیشتوانەکەیان قابیل بین"

Trial of the Major war criminals, Nurenburg, 1947 XXVI, p. 616 et 604 repectivement.

(دادگاییکردنی تاوانبارانی جەنگی مەزن، نۆرمبۆرگ، 1947، بەشی 26، 604 تا 616).

37. "وتەکانی سەرخوانی هیتلەر"، بۆن، 1951، ل213. بە گشتی هیتلەر مەبەستی لەو گەورە فەرمانبەرە نازییانە بو کە بەرامبەر بە ئاسودەیی کوشتنی ئەو کەسانەی بە "خڵتەی مرۆڤایەتی" وەسفدەکران، دەسڵەمینەوە" (Gesox) (بڕوانە ل248 و لاپەڕە جیاوازەکانی دی).

38. بۆ زانینی زیاتر لەسەر فرەیی رێکخراوە حیزبیە بەناویەکاچوەکان، بڕوانە Rang – und organisationliste der N. S. D. A. P stuttgart, 1947, et Nazi conspiracy, 1, 178

ئەم کتێبەی دوایی چوار توێژی گەورە دیاریدەکات:

1. Gliedderungen der N. S. D. A. P لە پێشنەوەی نازییەکان دەسەڵات بگرنە دەست بوونی هەبوە.

2. Angeschlossene verbabde der N. S. D. A. P ئەو کۆمەڵانە دەگرێتەوە کە پێکەوە هاوکاریان دەکرد.

3. Betreute organisationen der N. S. D. A. P

4. Weitere nationalsozialistische organisationen

مرۆڤ لەو هەمو توێژانە بە نزیکەیی رێکخراوە جۆراوجۆرەکانی خوێنکاران، ژنان، مامۆستایان و کرێکاران بەدیدەکات.

39. هیتلەر ڕێکخستنی دیوئاسای کاروباری گشتی کە لە پێشدا "ئۆدت" سەرۆکایەتی دەکردو پاشان بە ئەلبێر سپێر سپێردرا، لە دەرەوەی هەمو هەرەمییەکی حیزب و لقەکانیەوە، دروست کردبو. ئەم ڕێکخستنە دەکرا لەدژی دەسەلاتی حیزب یا ڕێکخستنەکانی حیزب بەکار بهێنرێ. شایانی باسە، سپێر لە کۆنگرەی ساڵی 1942دا، ئەوەندە ئازایەتی نواندبو کە نەك هەر دیدو سەرنجی خۆی بەرامبەر بە هیتلەر دەبڕێت بەوەی ئەستەمە سیستمی بەرهەمهێنان لە سایەی فەرماندەیی هیملەردا ڕێکبخرێ، بەڵکو داوایشی کرد بو ئیدارەی کاروباری ئۆردوگا زۆرەملێکانی بەخۆی بسپێردرێت. بڕوانە پیلانگێری نازی، جلدی یەکەم، ل916 ـ 917.

40. بۆ نمونە کۆمەڵەیەکی بێبەهاو گومناوی وەك "N. S. K. K" (ئەنجومەنی ئۆتۆمبێل سازانی نازی کە ساڵی 1930 دامەزرا)، لەناکاو ساڵی 1933 بالای کردو گەیشتە ئاشتی پێکهاتەی دەستەبژێری حیزب و بوە یەکەیەکی سەربەخۆی حیزب و هەمان جیاکاری (امتیان) دەستەی پاراستن و یەکەی هێرشی پێدرا، ئەم بالاکردنە لە زنجیرەی هەرەمی حیزبیدا هیچ بەرهەمێکی گرنگی نەبو، بەڵکو تەنها چاودێرێکی تازە بۆ دەستەی پاراستن و یەکەی هێرش داتاشرا.

41. ف. بێك، و. گۆدین، هەڵمەتی پاکتاوکردنی ڕوسیا و قسەلێدەرهێنان، 1951، ل153

42. هەمان سەرچاوە، ل159، بە پێی ڕاپۆرتەکانی دی، گەلێك نمونەی جیاواز لەسەر زۆری بێسەروبەرەیی دەزگاکانی پۆلیسی سۆڤێت هەیە، بە تایبەتی کۆمەڵە ناوچەیی و خۆجێییەکانی ڕێکخستنی لیژنەی میللی بۆ کاروباری ناوخۆ کە هەر یەکەیان سەربەخۆ لەوی دی کاریدەکردو لە تۆڕە ناوچەیی و خۆجێییەکاندا لایەنگرو کارمەندی تایبەتی بەخۆیان هەبو. بۆیە شتێکی سروشتیە زانیاریمان لەسەر بارودۆخی ڕوسیا، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە وردەکاری ڕێکخستنەوە هەبێت، بە بەراورد لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا، کەمتر بێت.

43ـ بەپێی گەواهینامەی یەکێك لە کارمەندە کۆنەکانی هیملەر (پیلانگێری نازی، جلدی شەشەم، ل461)، "یەکێك لە تایبەتمەندییە بە ڕاییەکانی هیملەر ئەوە بو کە لەیەککاتدا دوو کەسی بۆ ئەرکێك ڕادەسپارد"

44. هانز فرانك لە نامەیەکی ئاراستەکراودا کە لەسەرەوە باسی لێوەکراوە (بڕوانە تێبینی ژمارە 29)، ئەوەی ڕونکردۆتەوە کە تا چ ئاستێك دەیەوێت باری بزوتنەوە جێگیر بکات. سکالا جۆراوجۆرەکانیشی وەك فەرمانداری گشتی پۆلۆنیا، بەڵگەیە لەسەر تێنەگەیشتنی ئارەزووە ناسودگەراکانی سیاسەتی نازی. ئەو تێناگەیشت بۆچی لەجیاتی لەناوبردنی میللەتە ژێر دەستەکان، سود لە بوونیان وەرنەگیرێت. هەمان شتیش لەسەر ڕۆزنبۆرگ پیادە دەبێت کە بەگوێرەی دیدوبۆچونی هیتلەر نەدەکرا پشت بە مەسەلە ڕەگەزەییەکان ببەسترێت، چونکە ئەو دەیەویست دەوڵەتی بلۆك لە ناوچە داگیرکراوەکاندا دامەزرێنێت و دواجاریش لەو تێناگەیشت کە ئامانجی سیاسی هیتلەر لەناوبردنی دانیشتوانی ئەو ناوچانە بو.

45ـ چەمکی "ئیماراتی بچوك" کە "هەرەمی دەسەڵاتی لە دەرەوەی چواچێوەی یاسا پێکدەهێناو هیتلەریش لە لوتکەی ئەو هەرەمە بێت"، بیرۆکەی رۆبێرت هـ. جاکسۆن بو، بڕوانە بەشی دوازدەهەمی کتێبی پیلانگێری نازی. هیتلەر بۆ ئەوەی بەر لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی دەسەڵاتگەری لەو جۆرە بگرێت، ساڵی 1934 ئەم فەرمانەی دەرکرد: "شێوەی ئاخاوتنی Mein Fuhrer، تەنها تایبەتە بە فۆهرەر، بۆیە لێرەدا هەمو سەرکردەکانی .N. S. D. A. P ئاگادار دەکەمەوە کە رێگەیان پێنادرێت چ بەزارەکی یا بەنوسراو سود لەم شێوە ئاخاوتنە وەربگرن‌و تەنها بەهاوڕیی حیزب یەکتری بانگ بکەن"

Voir verfugunen, Anordnungen, Bekamtgaben, op. cit, decret du 20 aout. 1934

46. بڕوانە کتێبی organizations buch der N. S. D. A. P

47. بڕوانە خشتەی 14، جلدی سێیەم، "پیلانگێری نازی"

48ـ هەمو شێوەکانی سوێندخواردن لە حیزب‌و پێکهاتەکانی دەستەبژێر بەناوی خودی هیتلەرەوە ئەنجام دەدرا.

49. لەم بارەیەوە هیملەر لە پایزی 1944، یەکەمین هەنگاوی نا، کاتێك بە لێهاتویی خۆی فەرمانیدا کورەکانی گاز هەڵوەشێنێتەوە‌و کوشتنی بە کۆمەڵ رابگرێت. هیملەر ئەو کارەی بۆ ئەوە کرد تا گفتوگۆی ئاشتی لەگەڵ حکومەتە رۆژئاواییەکان دەست پێبکات. ئەوەی گرنگ بێت، ئەوەیە خودی هیتلەر بەروکەش زانیاری لەسەر ئەو ئامادەکارییانە نەبو، کەسیش ئازایەتی ئەوەی نەبوە پێی بڵێت: یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی جەنگ وازی لێهێنراوە. بڕوانە لیۆن پۆلیاکۆڤ، نامیلکەی کینە، 1951، ل232.

50ـ بە مەبەستی روداوەکانی دوای مردنی ستالین، بڕوانە هاریسۆن ئی. سالیزبیری، ئەمریکییەك لە روسیا، نیویۆرك، 1955

51ـ بڕوانە شیتەڵکارییە نایابەکەی بونیادی پۆلیسی نازی لە کتێبی پیلانگێری نازی، بەشی دوەم، ل250، بەتایبەتیش ل256.

52. سەرچاوەی پێشو، ل252.

53. فراتز نیومان، سەرچاوەی پێشو، ل251 دەپرسێت: "مایەی گومانە ئەڵمانیای نازی بە دەوڵەت دابنرێ، بەڵکو ئەم حکومەتە زیاتر لە کۆمەڵێك چەتە دەچێت کە سەرکردەکانیان هەمیشە ناچارن سەرباری ناکۆکی‌و ناتەبایی نێوانیان، پێکەوە رێکبکەون" بەرهەمەکانی کۆنراد هایدن دەربارەی ئەڵمانیای نازی باشترین نمونەیە لەسەر ئەو حکومەتەی چەتە پیادەی دەکات. دەربارەی دارودەستە نزیکەکەی هیتلەریش نامەکانی بۆرمان کەلەلایەن تریڤۆر رۆپێر بڵاوکراوەتەوە، لەم بارەیەوە زۆر روون‌و ئاشکرایە. لەدادگاییکردنی پزیشکاندا ( The united states Vs, karl Brandt et al, audiennce 13,mai 1947) ڤیکتۆر براك، گەواهی لەسەر

ئەوە دەدا، ساڵی 1933 بۆرمان بەبێ هیچ گومانێك بەفەرمانی هیتلەر گروپێكی رێكخست لەسەروی دەوڵەت و حیزبەوە چالاكی دەكرد.

54. ئەوەش بەراورد بكە بە گفتوگۆكەی نوسەر لەسەر مەسەلەی گوناهی ئەڵمانیا: "گوناهی سیستماتیك" گۆڤاری "یەهودی هاوتخوب . Jewish Frontier" كانونی دوەم / 1945

55ـ گوتارەكەی هیتلەر لە 23/ تشرینی دوەم/ 1939 لە "دادگاییكردنی تاوانبارە مەزنەكانی جەنگ" وەرگیراوە، جلدی 26، ل332، واقعییەتی هیستیریانەی ئەو وتەیەی سەرەوە لە گوتەكەی هیملەر لە كۆنگرەی شارەوانیەكانی پۆزن لە ئازاری / 1944، بەجوانی روندەبێتەوە (دەكرێ وێنەیەكی لە بەڵگەنامەكانی كتێبخانەی هۆڤەر، دۆسیەی هیملەر، فۆڵدەری 332). لە گوتارەكەیدا دەڵێت: "ئێمە دەتوانین چ بەهایەك بە مێژوو ببەخشین؟ بەهای میللەتی خۆمان... دوەم شت كە دەمەوێت بیڵێم و هەمیشە وتومە ئەوەیە، گەورەترین بەها لە میللەتەكەشمان مەزنتر بێت، بێهاوتایی رێبەرمان، ئەدڵۆف هیتلەرە... بۆ یەكەمین جار لەدوای دوو هەزار ساڵ وەك رێبەرێكی مەزن بۆ رەگەزی جیرمەنی رەوانە كراوە..."

56. دەربارەی ئەم مەسەلەیە بروانە لێدوانەكانی هیتلەر لە "وتەكانی سەرخوانی هیتلەر"، ل253و222: پێویستە فۆهرەری نوێ لەلایەن "ئەنجومەنی پیرانەوە" هەڵبـژێردرێت، بەڵام بەگوێرەی پرەنسیپی رێنما لە هەڵبـژاردنی فۆهرەردا، دەبێ ئەو كەسایەتیانەی بەشداری لە هەڵبژاردن دەكەن، بەدرێژایی رێورەسمی هەڵبـژاردن هیچ گفتوگۆیەك لەنێوان خۆیاندا نەكەن. دەبێ لە ماوەی سێ كاتژمێردا حیزب و گەورە فەرمانبەران سوێندی وەفاداری بۆ پێشەوای تازە بخۆن. "هیتلەر هیچ بەرچاوڵێلییەكی دەربارەی ئەو واقیعە نەبو كە هەڵبژاردنێكی لەوجۆرەی سەرۆكی باڵای دەوڵەت، نابێتە مایەی پەیدابونی فۆهرەرێكی بەرجەستە كە شایانی سەركردایەتی كردنی رایخ بێت"

57. یەكێك لە پرەنسیپە سەرەكیەكانی دەستەی پاراستن كە خودی هیملەر دایرشتبو بریتی بو لە: "هیچ ئەركێك وەك خودی ئەرك بوونی نیە"

**Voir Gunter d' Alguen, Die S.S. Geschichte, Aufgabe und organisation der schutzsffeln der N. S. D. A.P, 1939, in Schriften der Hochschule tur politik.**

58ـ بروانە داڤید ج. دالێن و بۆریس ئای. نیكۆلایڤسكی، "كاری زۆرەملێ لە روسیا"، 1947، پێیانوایە لەكاتی جەنگدا، ئەو دەمەی بە هۆی سەربازگیرییەوە هێزی كار كەمی كردبو، رێژەی مردنیش لە ئۆردوگاكانی كاركردندا ساڵانە دەگەیشتە لە 40٪. بە شێوەیەكی گشتی بە پێی خەمڵاندنەكان بەرهەمی كرێكارێكی ئۆردوگا نیوەی بەرهەمی كرێكارێكی ئازاد بو.

59ـ تۆماس ریڤی لە كتێبی "غەنیمەتی ئەوروپا"، ساڵی 1941، ئەوە دەخەمڵێنێت كە ئەڵمانیا لە ساڵی یەكەمی جەنگدا دەیتوانی خەرجی ئامادەكاری جەنگ لە 1933 تا 1939 دابین بكات.

60. ویلیام ئینستاین، دەوڵەتی نازی، ل257.

61. سەرچاوەی پێشو، ل270.

62. ئەو واقیعەی ئەم گریمانەیە پشت راستدەکاتەوە ئەوەیە کە بڕیاری کوشتنی نەخۆشە بێدەرمانەکان لە رۆژی هەڵایسانی جەنگدا دەرچوە، بەڵام لێدوانەکانی هیتلەر لەسەردەمی جەنگدا، ئەوانەی گۆبلز لە یادەوەرییەکانی یاداشتی کردوە، مەسەلەکە رۆشنتر دەکاتەوە (رۆژمێری گۆبلز، لە چاپکراوەکانی لویس. پ. لۆخنز، 1948): "جەنگ دەرفەتی چارەسەرکردنی زنجیرە مەسەلەیەکی بۆ رەخساندین کە هەرگیز لەسەردەمی ئاساییدا لە تواناڕا نەبو"، سەرئەنجام جەنگ هەر چۆنێك وەسۆڕی، "بەدڵنیاییەوە تەنها یەهود دەدۆڕێت" (ل314).

63. فەرماندەیی هێزی سوپا چەندین کەرەت هەوڵیدابو ئەوە بۆ ئۆرگانە جۆراوجۆرەکانی حیزب رونبکاتەوە کە دەرکردنی فەرمانی جەنگ بەبێ لەبەرچاوگرتنی پێداویستیە سەربازی، مەدەنی یا ئابورییەکان چ مەترسییەك لە دووتوێدا هەڵدەگرێت (بۆ نمونە بڕوانە پۆلیاکۆف، سەرچاوەی پێشو، ل321)، بەڵام تەنانەت زۆرێك لە فەرمانبەرە بڵند پایەکانی نازیش، سەبارەت بەو بارودۆخەی روبەروی دەبونەوە، بەزەحمەت دركیان بە مەترسی پشتگوێ خستنی هۆكارە بابەتی، ئابوری و سەربازییەکان دەکرد. زۆرجار بە بێهودە ئاگادار کرابونەوە لەوەی "دەبێ سەرنج و تێبینییە ئابورییەکان دوور بێت لە چارەسەرکردنی مەسەلەی یەهود (پیلانگێڕی نازی، جلدی شەشەم، ل402)، تەنانەت کاتێك روبەروی ئەو کارەش دەکرانەوە، ئەوا سکاڵایان دەکرد لەوەی: بەرنامەی نوژەن کردنەوەیەکی مەزن لە پۆڵۆنیا "راناگیرێت ئەگەر ئەو هەزاران یەهودەی کاری تیادەکەن پەلکێشی ئۆردوگاکان نەکرێن. ئێستاش بڕیار دراوە یەهود لە پرۆژەی چەکسازی دوربخرێتەوە. بۆیە هیوادارم بە زووترین کات ئەم فەرمانە هەڵبوەشێتەوە، ئەگینا بارودۆخەکە بەرەو خراپتر دەروات". ئەم هیواو ئاواتەی هانس فرانك، فەرمانداری گشتی پۆڵۆنیا، چەشنی هیواو ئاواتەکانی دواتری سەبارەت بە پیادەکردنی سیاسەتێکی نەرمتر بەرامبەر بە پۆڵۆنی و ئۆکرانیەکان، زۆر بێبەر بو. سکاڵاکانی زۆر پڕبایەخ بون (بڕوانە رۆژمێری ئەو لە پیلانگێڕی نازی، جلدی چوارەم، ل902)، چونکە لەسیمای ئەنتی سودگەرا کە سیاسەتی نازی لەسەردەمی جەنگدا پێدەناسرایەوە، زۆر تۆقیبو. زۆر دەترسم کاتێك جەنگ دەبەینەوە، پۆڵۆنی و ئۆکرانی و هەمو دەوروبەرەکەیان کەوڵ بکەین"

64. سەرەتا بە تەنها یەکە تایبەتەکانی دەستەی پاراستن. پێکهاتەی یەکەی پێشمەرگ. لە ئۆردوگا زۆرەملێکان کاریان دەکرد. پاشان دەستەی پاراستنی چەکدار جێگەی گرتەوە. لەساڵی 1944 یشەوە، هێزی چەکداری سوپا، لەدوای ئەوەی بەدەستەی پاراستنی چەکدارەوە لکێنرا، لە ئۆردوگاکاندا دەست بەکاربو (بڕوانە کارکەنار کردنی ئەفسەرە دێرینەکانی دەستەی پاراستن لە ئۆردوگای نوینگام، پیلانگێڕی نازی، جلدی حەوتەم، ل211). لەم ناوکۆیەدا یاداشتنامەی ئۆردوگای "ئۆدنانسن" بەناونیشانی "رۆژ لەدوای رۆژ" دەردەکەوێت، لەندەن، 1949، کە تیایە هاتوە چۆن لە ئۆردوگاکانی

گرتنی بە کۆمەڵدا، هەست بە ئامادەگی کارای هێزەکانی سوپا دەکرێ. جێگەی داخو پەژارەیە ئەم یادداشتە ئەوە روندەکاتەوە کە تیمەکانی سوپا بە ئەندازەی دەستەی پاراستن دڕندەو دڵڕەق بوە.

65. دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل326. ئەمە گوتەی لێبوردەترین ژیاننامەنوسی ناروسی ستالینە، بۆیە کێش و بایەخی تایبەتی خۆی هەیە.

66ـ نازییەکان بە شێوەیەکی تایبەتی پێیان خۆشبو، کارەکانیان بە هەزاران ساڵ هەڵسەنگێنن. وتەکانی هیملەر جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە پیاوانی دەستەی پاراستن تەنها "خۆیان بەو مەسەلە ئایدیۆلۆجیانەوە سەرقاڵ دەکەن کە بایەخیان بەدەیان و سەدان ساڵ دەنرخێندرێت" و "خزمەتی کێشەیەك دەکەن، هەر دوو هەزار ساڵ جارێك سەرهەڵدەدا"، بۆیە لەسەرتاسەری تەڵقیننامەکانی دەستەی پاراستندا جیاوازییەکان زۆر بەکەمی دوبارە دەبنەوە.

Hauptamt J Schulungsamt, wesen und Aufogabe der S. S md der polized, p. 160.

لەم ناوکۆیەدا، باشترین سەرچاوە سەبارەت بە فۆرمی بۆلشەفیك، بەرنامەی نێونەتەوەیی کۆمۆنیست بو، ئەو بەرنامەیەی ستالین ساڵی 1928 لە کۆنگرەی حیزب لە مۆسکۆ، دایڕشتبو. ئەوەی لێرەدا مایەی سەرنج و بایەخە بریتیە لەوەی کە یەکێتی سۆڤێت بۆ ئاستی "بنکەو پێگەی بزوتنەوەی جهانی و سەنتەری شۆڕشگێری بالا دەکات و دەبێتە گرنگترین فاکتەر لە مێژووی جهاندا" "پرۆلیتاری جهانی بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا لە یەکێتی سۆڤێت دەبێتە خاوەنی نیشتمان"، (و. هـ. چامبرلاین "چاپێکی شین لەقەڵای جهانێکی فەتحکراودا"، 1946، Blue print for world conguest و بەرنامەی نێونەتەوەیی سێیەمیش وەك دەقە ئەسڵەکەی یادکراوەتەوە).

67. ئەم گۆڕانکارییە لە هێمای رەسمیدا دەتوانرێ لە Organisationbuch der N. S. D. A. P، پەیدا بکرێ، ل7.

68. بڕوانە هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل722. هیتلەر لە 22/ تشرینی دوەم/ 1937، لە وتاریکیدا بەرامبەر بە رێبەرە سیاسیەکانی ئایندەی نازی لە ئۆردنسبۆرگ سۆنتۆفن، دەڵێت: "نە خێڵی بچوکی گاڵتەجارو نە وڵاتی بچوك، نە دەوڵەت یا رژێمە ستەمگەرەکان... بەڵکو تەنها نەژاد دەتوانێت جهان داگیر بکات. لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە ـ بەلانیکەمەوە بەمانای وشیارانەی وشە ـ هێشتا زۆرمان ماوە بۆ ئەوەی بە رەگەز بگەین". (بڕوانە وتەکانی سەرخوانی هیتلەر، ل445). هاورێ لەگەڵ ئەم فۆرمە قەشەنگەی کە بە هیچ شێوەیەك دەستەواژەیەکی راگوزەری نیە، فەرمانی 9/ تەموز/ 1941 بەدیدەکەین، ئەو فەرمانەی هیتلەر بەکارهێنانی چەمکی "رەگەزی ئەڵمانی" لە ئایندەدا قەدەغە کرد، لەبەر ئەوەی ئەم چەمکە دەبێتە مایەی "قوربانیدان بە بیرۆکەی رەگەز لە بەرژەوەندی پرەنسیپی میللی و لەناوبردنی هەمو هەلومەرجێك کە پێشتر چەمکی سیاسەتی رەگەزو نەتەوەی لەسەر بونیات نرابو"

Verfugungen, Anordnungen, Bekanntgaben.
شتێکی روون و ئاشکرایه کە چەمکی رەگەزی ئەڵمانی بەربەستێك لە رێگەی "هەڵبژاردنی رەگەزی" و لەناوبردنی رەگەزی ناشایستە، دروستدەکات و جێبەجێ کردنیان بۆ ئاینده دوا دەخات.

69. هیملەر لەبەر هەمان سۆنگە "هەر زۆر بەخێرایی لە وڵاتە جۆربەجۆرەکاندا دەستیکرد بە رێکخستنی دەستەی پاراستنی جێرمەنی" و بە کارمەندەکانی دەستەی پاراستنی دەوت: "چاوەڕوانی ئەوەتان لێناکەین ببنە ئەڵمانیەکی خۆپەرست، بەڵکو چاوەڕوانی ئەوەتان لێدەکەین ئامانجی نەتەوایەتیتان سەر بە رەگەزو مێژوویی رایخی جیرمەنی بێت" (هایدن، سەرچاوەی پێشو). ئەرکی داهاتوی ئەم رێکخستنە جێرمانییە وادەخوازێت لە رێگەی "فرەیی زاوزێوە"، "بناغەیەکی رەگەزی" ئەوتۆ دروست بکات کە لە ماوەی 20 تا 30 ساڵی ئاینده "چینێکی باڵاتر لەسەرتاسەری ئەوروپا" دروست بکات (گوتارەکەی هیملەر لە کۆبونەوەی فەرماندەکانی دەستەی پاراستن، پۆزن، 1943، پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل558).

70. هیملەر، هەمان سەرچاوەی پێشو. ل572.

71. دویچەر لە هەمان کتێبدا قسە لەسەر فرەیی هەستیاری ستالین دەکات بەرامبەر بەگشت تەوژمە دەرونیە شاراوەکان... بە ناوی هەموشیانەوە قسەیدەکرد (292). بە تەنها ناوهێنانی تیورەی "شۆڕشی جهانی" تروتسکی، دەنگدانەوەیەکی ئاگاناميزو پڕنەفرەتی لە کن ئەوەیەکی ماندوو هەبو... ستالین لە ترسی سەرچڵی و ملدادان بە چارەنوسێکی نادیار کە زۆرێك لە بۆلشەفیکەکانی گرتبووە، راستەوخۆ سودی وەردەگرت. ل291.

72. لەمڕووە هیتلەر هەر لەو ساتەوەختەی لەنێوبردنی یەهودی دەست پێکردبو، واتە لە کانونی یەکەمی / 1941، دروشمی "یەهودی پاکیزە"شی بەکاردەهێنا. چەپکێك لە "وتەکانی سەرخوانی هیتلەر"، ل346.

73ـ هیتلەر لە وتەیەکیدا بەرامبەر بە ئەندامانی فەرماندەیی گشتی سوپا (بلۆمبۆرگ، فریتش و رایدەر) و بەرامبەر بە فەرمانبەرە مەدەنییە بڵند پایەکان (نۆرت و گۆرینگ)، لە تشرینی دوەم / 1937، بە خۆیدا رایدەپەرمو بە ئاشکرا بڵێت، پێویستی بە سەرزەمینێکی چۆڵەوانی هەیە و بیرۆکەی چۆکداران بە میللەتانی دونیاش رەتدەکاتەوە. ئەو مەسەلەیەی سەرەوەش خۆبەخۆ دەبوە مایەی سیاسەتی لەنێوبردنی میللەتانی دی، ئەوەش لە خەیاڵدانی هیچ یەکێك لە گوێگرەکانیدا نەبو.

74. ئەم مەسەلەیە بە دەرچونی فەرمانی ئابی /1934 دەستی پێکرد، بەپێی ئەو فەرمانە پێگەی پاراستن بۆ ئاستی رێکخستنێکی سەربەخۆ لە نێو حیزبی ناسیونال سۆسیالیستی کرێکارانی ئەڵمانیا باڵای کردو فەرمانێکی زۆر نهێنی دی کەلە تەموزی /1938 دەرچو، ئەو بڕیارەی تەکمیل کرد، بە پێی ئەو بڕیارە پێکهاتە تایبەتەکانی دەستەی پاراستن، گروپی مردن و

هێزی تێسرەواندن Verfugung struppen سەر بە سوپاو پۆلیس نەبون. گروپی مردنی دەستەی پاراستن دەبێ "هێندێك ئەرکی دژواری تایبەت کە چییەتی پۆلیسیان هەیە، بە شێوەیەکی باشتر ئەنجام بدات"، ئەمە لە کاتێکدا "تیمەکانی هێزی تێسرەواندن، وەك یەکەیەکی چەکداری هەمیشە ئامادە لەژێر فەرمانی مندا دەبێت"، (پیلانگێری نازی، جلدی سێیەم، ل459). لەدوای ئەوەش دوو بریاری دی لە تشرینی یەکەم /1939و نیسانی/ 1940 دەرچون کە دوو تێروانینی تایبەت بوون لەسەر ئەو مەسەلە گشتیانەی پەیوەندی بە هەمو ئەندامانی دەستەی پاراستنەوە هەبو (سەرچاوەی پێشو، جلدی دوەم، ل184). لەدوای ئەوەش، ئەو بڵاونامانەی لەلایەن دەزگای تەڵقینی ئایدۆلۆجیای دەستەی پاراستنەوە بڵاودەبونەوە، ئەم دروشمانەی لەسەر بو: "تایبەتە بە پۆلیس"، "بۆ بڵاوکردنەوەی گشتی نیە"، "تایبەتە بەسەرکردەو ئەوانەی پەروەردەی ئایدۆلۆجیان دیوە". خرکردنەوەی ئەو کتێب و بڵاونامە نهێنیانەی لەسەردەمی نازیدا بەچاپ گەیەنراون و ڕێوشوێنێکی ئیداری زۆریان تیایە، گەلێك پڕ بایەخە. ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە کە لە نێو ئەو بڵاونامە جۆراجۆرانەدا، بڵاونامەیەکی تایبەت بە یەکەی هێرش نیە، ڕەنگە ئەمەش باشترین بەڵگەبێت کە یەکەی هێرش لە دوای ساڵی 1934 لەریزی پێکهاتەی دەستەبژێردا نەماوە.

75ـ ئەمەش بەراورد بکە بە فرانز بۆرکینۆ "Die neue Komintern, in der monat" بەرلین، 1949، هیفت4.

76. نمونەکان هێندە رون و ئاشکرایە پێویست بە هێناوەیان ناکات. لەگەڵ ئەوەشدا، نابێت ئەم تاکتیکە تێکەڵ بە بێوەفایی و ناراستگۆیی و بێبڕواییەك بکرێت کە هەمو ژیاننامەنوسانی هیتلەرو ستالین بە سیفاتی بەرجەستەی ئەو دوو کەسایەتییەی دەزانن.

77. بڕوانە بڵاونامەی وەزارەتی دەرەوە کە وەزیری کاروباری دەرەوە لە دەرەوەی وڵات لە بەرواری کانونی دوەم/ 1939 ئاراستەی هەمو دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیای کردوە. پیلانگێری نازی، جلدی شەشەم، ل86.

78. حکومەتی نازی لە ساڵی 1940دا فەرمانێکی دەرکرد و بەپێی ئەو فەرمانە هەمو تاوانێك هەر لە خیانەتی مەزنەوە تا "ئەندان و وشەی ناشیرین لەدژی ڕێبەرانی دەوڵەت یا حیزبی نازی"، دەبێ لە ناوچە داگیرکراوەکاندا سزادانەکەی کاریگەری بۆ لەوەو پێشیش (رجعی) هەبێت، ئیدی تاوانبارەکە ئەڵمانی بێت یا نائەڵمانی. بڕوانە جایلز. سەرچاوەی پێشو، بە مەبەستی ئەو ئاکامە کارەساتبارانەی سیاسەتی نازی Siedlungs poletik لە پۆلۆنیا و ئۆکرانیا لە دوای بەجێی هێشتبو، بڕوانە "دادگاییکردنی ..."، سەرچاوەی پێشو، جلدی 26و29.

79ـ ئەم دەستەواژەیە لە کراڤچنکۆ وەرگیراوە، سەرچاوەی پێشو، ل303، لەدوای پاکتاوکردنەکەی 1936 . 1938، بەمشێوەیە دەربارەی بارودۆخی روسیا دەدوێت: "ئەگەر

داگیرکەرێکی بیانی دەستی بەسەر ڕەوڕەوەی ژیانی سۆڤێتدا بگرتایە، ئەوا لە ڕژێمی سۆڤێتی بێبەزەییانەترو دڕێوانەتر ڕەفتاری نەدەکرد"

80 . هیتلەر لە سەردەمی جەنگدا دەیویست یاسایەکی نەتەوەیی دەربارەی تەندروستی بخاتە بواری جێبەجێ کردنەوە: "لەدوای ئەوەی هاوڵاتیان بە تیشکی X ئازمایش دەکرێن، لەسەر فۆرمەر پێویستە لیستێك لەسەر گشت نەخۆشەکان ئامادە بکات، بەتایبەتی ئەوانەی بەدەست نەخۆشی سینگ‌و دڵەوە دەناڵێنن. بەپێی ئەو یاسا تەندروستیەی رایخ... خێزانە نەخۆشەکان بۆیان نەبو لە نێوخەڵکیدا ژیان بگوزەرێنن‌و ماف زاوزێ کردنیشیان نەبو. بەڵام ئایا چی بەسەر چارەنوسی ئەو خێزانانە دەهات، ئەوا پەیوەندی بە فەرمانەکانی دواتری ڕێبەرەوە هەبو" مرۆڤ پێویستی بە خەیاڵێکی فراوان نەبو تا بزانێت فۆهرەر چ بڕیارێك دەردەکات. بۆیە ژمارەی ئەو کەسانەی بۆیان نەبو لەنێو دانیشتواندا ژیان بگوزەرێنن، زۆر بەرز بو، بەرادەیەك کە ڕێژەیەکی گەورەی لە میللەتی ئەڵمانیا پێکدەهێنا (پیلانگێڕی نازی، جلدی شەشەم، ل175).

81 . بەپێی خەمڵاندنەکان سەرجەم کوژراوەکانی ڕوسیا لە چوار ساڵی شەڕدا خۆی لە 12 تا 21 ملیۆن کەس دەدا. ئەمە لە کاتێکدا ستالین تەنها لە ماوەی ساڵێکدا نزیکەی هەشت ملیۆن کەسی لە ئۆکرانیا لە نێوبرد. بڕوانە "کۆمۆنیزم بە کردار"، حکومەتی ئەمریکا، واشنتن، 1946، دیکۆمێنتی ژمارە 754، ل140 . 141

بەپێچەوانەی ڕژێمی نازییەوە کە ئامارێکی وردی بۆ ژمارەی قوربانیەکانی دەکرد، ڕژێمی ڕوسیا ژمارەیەکی بڕوا پێکراوی لەسەر کوشتنی دەیان ملیۆن مرۆڤ نەبو. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم خەمڵاندنەی خوارەوەی سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل669، لەبەر ئەوەی لە نوسینەکەی واڵتر کریڤسکی . یەوە سەرچاوەی گرتوە، تا ئەندازەیەك ڕاستی تیایە، چونکە واڵتر ڕاستەوخۆ دەستی بە زانیاری نۆسیەکانی Guepeou دەگەیشت. بە گوێرەی سەرژمێری ساڵی 1937 یەکێتی سۆڤێت، زانایانی ئامار پێشبینی ئەوەیان دەکرد ژمارەی دانیشتوان بگاتە 171 ملیۆن کەس، بەڵام لە واقیعدا ژمارەی سەرجەم دانیشتوان لە 145 ملیۆن کەس تێپەری نەدەکرد، ئەم جیاوازییەش ئەوە دەردەخات کە 26 ملیۆن کەس لەنێوچوە، ئەم ژمارەیەش ئەو زیانانە ناگرێتەوە کە لە سەرەوە باسکراوە.

82 . دویچەر، سەرچاوەی پێشو، ل256.

83 . ب. سۆڤارین، سەرچاوەی پێشو، ل305، لە کاتێکدا تیرۆر لە ساڵی 1937، لەچڵەپۆپەدا بو، ئەم وشانە دەداتە پاڵ ستالین: "پێویستە ئەوەندە تێگەیشتنتان هەبێت کە پڕ بەهاترین‌و یەکلاکەرەوەترین گەنجینەی جهان، کادری حیزبە". هەمو ڕاپۆرتەکان ئەوە دەردەخەن کە پۆلیسی نهێنی لە ڕوسیای سۆڤیتدا وەك پێکهاتەی ڕاستەقینەی دەستەبژێری حیزب، تەماشا دەکرا. ئەوەی جێگەی سەرنجە لە سەرەتای 1920دا، کارمەندانی پۆلیسی نهێنی خۆبەخشانە وەرنەدەگیران، بەڵکو

لەنێوریزەکانی حیزبەوە هەڵدەبژێردران، لەسەروی ئەوەشەوە دەزگای پۆلیسی نهێنی نەیدەتوانی لەسەر بنەمای پیشەی رووت کارمەندانی هەڵبژێرێت (بڕوانە بێك. گۆدین، سەرچاوەی پێشو، ل160).

84. هایدن، سەرچاوەی پێشو، ل311.

85. لەبەر رۆشنایی راپۆرتەکانی دوا دانیشتنی حیزبی نازی، هیتلەر لەدوای ئەوەی تێگەیشت کە چیدی ناتوانێت پشت بە دەستەی پاراستن ببەستێت، بڕیاری خۆکوشتنی دا. بڕوانە تریڤۆر رۆپەر، دوا رۆژەکانی هیتلەر، 1947، ل116

86. زۆرجار هیتلەر "پەیوەندی نێوان دەوڵەت و حیزب "ی راڤە کردوەو هەمیشە پێی لەسەر ئەوە داگرتوە کە رەگەز یا "گروپی میللەتێکی یەککگرتو"، نەك دەوڵەت، گرنگی سەرەکی هەیە. (بڕوانە گوتارەکەی سەرەوە، لەدوای چاپکردنەوەی بوە پاشکۆی وتەکانی سەرخوانی هیتلەر). هیتلەر، ساڵی 1935 لە وتارێکیدا بۆ ئەنجومەنی حیزبەکان لە نۆرمبۆرگ، بەمشێوەیە پوختەی وتەکانی خستەروو: "دەوڵەت رێبەرایەتی ئێمە ناکات، بەڵکو ئێمە فەرمانڕەوایەتی بەسەر دەوڵەتەوە دەیکەین". کەواتە بە کردەوە شتێکی روون و ئاشکرایە کە دەسەڵاتی فەرمان دەرکردن بۆ دەوڵەت، تەنها کاتێك لە توانادا دەبێت کە دەزگا حیزبیەکان لە دەزگا دەوڵەتیەکان، سەربەخۆ بێت.

otto Gauweler, Rechtseinrichtungen und Rechtsaufgaben der Bewegung, . 87

.1939 ئۆتۆ گوایلەر، بەرلشکاوی ئاماژە بەوە دەکات کە پێگەی تایبەتی هیملەر وەك فەرماندەی دەستەی پاراستن و فەرماندەی پۆلیسی ئەڵمانیا لەلای فۆهرەری رایخ، پشت بەم واقیعە دەبەستێت: ئیدارەی پۆلیسی "یەکێتییەکی تۆکمەی لەنێوان دەوڵەت و حیزب"دا بەدیهێنابو، ئەو یەکێتییەی خەڵکانێکی زۆر بێهودە هەوڵیاندەدا لە حکومەت پێیبگەن.

88 . لە دەیەی 1920، لە ساتەوەختی راپەڕینی جوتیارانی روسیا، ڤۆرۆ شیلۆف، لەسەرکوتکردنی شۆڕشگێرەکاندا پاڵپشتی سوپای سوری نەکرد، ئەم رودلوەش بوە مایەی دامەزراندنی تیمی تایبەتی (Guepeou)، کە تایبەت بو بە هەڵمەتی سزادان. سیلیگا. سەرچاوەی پێشو، ل95.

89. ساڵی 1935، کارمەندانی گەستاپۆ لە دەرەوەی وڵات 30 ملیۆن مارك. یان وەردەگرت، ئەمە لە کاتێکدا دەزگای سیخوری سەربازی سەر بە سوپای رایخ بودجەکەی تەنها 8 ملیۆن مارك بو. بڕوانە پیار دۆهیلۆڤ، گەستاپۆ، پاریس، 1940، ل11

90. بڕوانە، پیلانگێڕی نازی، جلدی چوارەم، ل616.

91. بڕوانە تێبینی ژمارە 62.

92. مۆریس لاپۆرتی لە کتێبی " مێژووی ئۆخرانا"، پاریس، 1935، بەوپەری وردەکارییەوە، ئامرازی هاندان بە "بەردی بناغەی" بونیاتی پۆلیسی نهێنی لە قەڵەم دەدا، ل19.

لە روسیای سۆڤێتی، هاندان لەوە گەورەتر بو بە تەنها چەکێکی نهێنی بێت بە دەستی پۆلیسی نهێنییەوە، بەڵکو رژێم بۆ هەڵسەنگاندنی رای گشتی وەك میتۆدێکی راگەیاندن پەنای بۆ دەبرد. بێباکی

خەڵك سەبارەت بە بانگەوازە یەك لەدوای یەك و دووبارەكانی رژێم بۆ رەخنەكردن یا نیشاندانی پەرچەكردار بەرامبەر بە جومگە "لیبرالەكان" لە رژێمێكی تیۆردا، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جەماوەر دەیتوانی ئەوە ئاشكرا بكات كە ئەم جموجوڵانە تەنها هاندانێكی رووتەو هیچی دی. لە واقیعدا هاندان كۆپییەكی تۆتالیتاری بو بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی رای گشتی.

93. لەم بارەیەوە هەوڵو كۆششی فەرمانبەرە مەدەنیە نازییەكان بەمەبەستی كەمكردنەوەی دەسەلاتو ستاڤ گەستاپۆ لە ئەڵمانیا زۆر پڕبایەخەو پێویستە یادبكرێتەوە، ئەوانەی پێیان وابو پرۆسەی بەنازی كردنی Nazification وڵات لە قۆناغی پێشوتردا كامڵ بوە. بەلام هیملەر لەو ساتەوەختەی كە دەیویست گەشە بە دەستەی پاراستن بدات (1934)، ناچار بو دەربارەی مەترسی "دوژمنە ناوخۆییەكان" زیادەرەوی بكات. بڕوانە پیلانگێڕی نازی، جلدی دوەم، ل259، جلدی پێنجەم، ل205، جلدی سێیەم، ل547.

94. بڕوانە Gallier – Bossiere، نهێنیەكانی پۆلیسی نهێنی فرەنسا، 1938،ل234.

95. بە هەر حاڵ، كارێكی رێكەوت نەبو كە دامەزراندنی ئۆخرانا (پۆلیسی تزاری) لە ساڵی 1880 قۆناغێكی لە چالاكی شۆڕشگێڕانەی بێوێنەی لە روسیا لەگەڵ خۆیدا هێنا. پۆلیسی نهێنی تزاری لە پێناوی ئەوەی شایستەیی خۆی بسەلمێنێت، هێندێك كەرەت خۆی كوشتنی سیستماتیكانەی ئەنجام دەدا، بۆیە كارمەندەكانی "بەبێ خوایشتی خۆیان، خزمەتی ئایدیایەكیان دەكرد كە خۆیان ریسوایان دەكرد... بلاوكردنەوەی بلاونامەیەكو كوشتنی وەزیرێك لە رێگەی پۆلیسی نهێنیەوە، یەك ئاكامی هەبو" (م. لاپۆرت، سەرچاوەی پێشو، ل25). بەڵكو لەوەش گرنگتر كوشتنی ستۆلیپینو ڤۆن پلاهەف دەستچنی خودی پۆلیس بو. یەكلاكەرەوەترین هۆكار لە نەریتی شۆڕشگێڕانەدا بریتی بو لەوەی كە پۆلیس لە رۆژانی ئارامدا "هێزو وزەی شۆڕشگێڕەكانی نوێ دەكردەوەو جۆشو خرۆشی پێدەبەخشین" بڕوانە، هەمان سەرچاوە، ل71. هەروەها بڕوانە برترام د. وڵف: ئەو سێ كەسەی شۆڕشیان دروستكرد، لینین، تروتسكی، ستالین، 1948،و ئەم دیاردەیەی بە "سۆسیالیستی پۆلیس" ناو زەدە دەكرد.

96ـ هانز فرانك كە دواتر بوە فەرمانداری گشتی پۆلۆنیا، جیاوازی نمونەیی لەنێوان كەسێكی "ترسناك بۆ دەوڵەت"و كەسێكی "دوژمن بە دەوڵەت" دانا. ترسناك دەلالەت لە سیفەتی بابەتی دەكات كە سەربەخۆیە لە ویستو رەفتاری تاكەكەس، ئەمە لە كاتێكدا "پۆلیسی سیاسی نازی، بە تەنها سەروكاری لەگەڵ كرداری دژ بە دەوڵەت نیە، بەڵكو سەروكاری بە هەر هەوڵێكەوە هەیە . ئیدی ئامانجی ئەو هەڵە هەر چییەك بێت . چارەنوسی دەوڵەت بخاتە مەترسییەوە"

Voir Deutsches verwaltungsrecht, p. 420 - 430

بەپێی وتەكانی ماونز لە كتێبی "پیلانگێڕی نازی وەرگێراوە، جلدی چوارەم، ل881، سەرچاوەی پێشو، ل44: "رێوشوێنی ئەمنی بۆ لەناوبردنی كەسە ترسناكەكان، بەمانای

دورخستنەوەی مەترسییە لە گۆڕەپانی کۆمەڵەی میللی، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسانەش هیچ تاوانێکیان ئەنجام نەدابێت، ئەم هەنگاوەش بە مەبەستی خۆپارستنە لە مەترسی بابەتی"

97. ر. هۆهن، یاسادانەری نازی، ئەندامی دەستەی پاراستن، دەربارەی رینهارد هایدریش، بەمشێوەیە سەرنجی خۆی یاداشتکردوە، هایدریش پێشنەوەی ببێتە فەرمانڕەوای چیکۆسلۆڤاکیا، یەکێك بو لەخەڵکە نزیکەکانی هیملەر: "وەك تاکەکەس سەیری دوژمنەکانی ناکات، بەڵکو وەك هەڵگری رەوتگەرای ترسناك کە دەوڵەت دەخاتە مەترسییەوە، تەماشایان دەکات، سەرئەنجامیش وەك ئەفەرۆزکراوی کۆمەڵەی نهێنی بەدیاردەکەون"

In Deutsche Allgemeine Zeitung du 6juin 1946; tire de E – kohn – Bramsted, dictatorship and political police, london, 1945.

98ـ ساڵی 1941 لە بارەگای فەرماندەیی گشتی هیتلەر، لە کۆبونەوەیەکی دەستەی فەرماندەییدا، پێشنیاز کرا هەمان رێوشوێن کە یەهودەکانی بۆ ئۆردوگا زۆرەملێکان پێرەوانەکرا، لەسەر دانیشتوانی پۆڵۆنیاش پیادەبکرێ: دەکرێ ئەو رێوشوێنانە بە کەمێك گۆڕانکارییەوە لەسەر بارودۆخی پۆڵۆنییە بە رەچەڵەك ئەڵمانیەکانیش پیادەبکرێ، هەروەها بەپێی ئەو بڕیارە هەمو پەیوەندییەکی سێکسی نێوان ئەڵمانی و پۆڵۆنیەك حوکمی لە سێدارەدانی لەسەر بو. دەبێ پۆڵۆنیەکانیش وەك یەهودەکان کە نیشانەی ئەستێرەی زەردیان دادەنا، نیشانەی (P) دابنێن. بڕوانە پیلانگێری نازی، جلدی هەشتەم، ل237، و رۆژژمێری هانس فرانك، سەرچاوەی پێشو، جلدی 29، ل683.

بە هەرحاڵ دەبوایە پۆڵۆنیەکان هەست بەدڵەڕاوکێ بکەن کە لە دوای کۆتایی هاتنی پاکتاوکردنی یەهود، چییان بەسەر دێت (پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل916). سەبارەت بە نەخشەکانی هیتلەریش لەسەر میللەتی ئەڵمانیا، بڕوانە پەراوێزی ژمارە 80.

99. بێك و گۆدین، سەرچاوەی پێشو، ل87، قسە لەسەر "تایبەتمەندی بابەتی" دەستگیرکردن دەکەن لە یەکێتی سۆڤێتدا، لەنێو ئەو تایبەتمەندیانەشدا ئەندامێتی بو لە ریزی پۆلیسی نهێنیدا (ل153). وردبینی فیکر سەبارەت بە زەرورەتی گرتنی بابەتی و پێویستی دانپیانان، دەشێت زیاتر لە هەمو کەسێك لە ئەندامانی پۆلیسی نهێنی چاوەڕوان بکرێ. ئەندامێکی دەستگیرکراوی پۆلیسی نهێنی بەمشێوەیە دەدوێت: "سەرکارەکانم، من و پیشەکەم بە باشی دەناسن، بۆیە ئەگەر حیزب و دەزگای پۆلیسی نهێنی پێویستیان بەم دانپیانانەی من بێت، ئەوا حەتمەن بەڵگەی شیاویان لەبەردەستە بۆ ئەوەی بەمجۆرە رەفتار بکەن. لەبەر ئەوەش من وەك هاوڵاتییەکی بە ئەمەکی سۆڤێت، ئەرکم ئەوە نیە سەرپێچی لە دانپیانانێکی لەو جۆرەدا بکەم..." (هەمان سەرچاوەی، ل231).

100ـ ئەم حاڵەتەش لە فەرەنسا زۆر باو بو، بە جۆرێك وەزیرەکان لە ترسی دۆسیە نهێنیەکانیان کە پۆلیسی نهێنی لەلای خۆی پاریزگاری لێدەکرد، هەمیشە بە ترسەوە دەژیان. سەبارەت بە بارودۆخی روسیای تزاریش بڕوانە لاپۆرت، سەرچاوەی پێشو، ل22ـ 23:

"سەرئەنجام ئۆخرانا دەسەڵاتێکی زۆر بەرفراوانتری لە دەسەڵاتی دەوڵەت پیادە دەکرد... تەنانەت ئۆخرانا... ئەو زانیاریانەشی بە تزار دەدا کە خۆی مەبەستی بو بیزانێت"

101ـ بەپێچەوانەی ئۆخراناوە کە دەوڵەتێکی لەناو دەوڵەت پێکدەهێنا، Guepeou دەزگایەك بو لە حکومەتی سۆڤێتدا... لەچاو ئۆخرانا سەربەخۆیی چالاکی کەمتر بو. (رۆجیە باڵدۆین، "پۆلیسی سیاسی"، ئینسکلۆپیدیا . موسوعە . زانستی کۆمەڵایەتی).

102. ئەم حیکایەتەی خوارەوە، لەسەر چەمکی "گومانلێکراو"، مانایەکی نمونەیی هەیە. پۆبیدۆ نۆستیف لە "ئۆتۆکراسی روسیا: یادەوەری سیاسی"، نامە رەسمیەکان، بەڵگەنامە بڵاونەکراوەکان، 1881 . 1894، پاریس، 1927 لە ئۆخرانا، لەمەڕ داوایەك کە پارێزەرێکی یەهود دەیویست داواکە بە قازانجی نوێنەرگرەکەی (موکل) تەواو بکات، داوا لە جەنەراڵ شیریڤین کرا لە بەرژەوەندی لایەنی دوەم کە خانمێکی روسی بو خۆتێوەردان (تدخل) بکات، چونکە خەریك بو کێشەکەی دەدۆڕاند. جەنەراڵی ناوبراو دەڵێت: "هەر لەهەمان شەودا، بڕیاری گرتنی ئەو یەهودییە نەفرەتییەم دەرکرد بەبیانوی ئەوەی لە رووی سیاسیەوە کەسێکی گومانلێکراوە... هەمان کار دەربارەی هەمو یەهودییەکی بۆگەن ئەنجام دەدەم کە ئەمرۆ بێگۆناهە، وەلێ دوێنێ‌و سبەینێ گوناهکار بوەو دەبێت"

103. تاوان لە دادگاکانی مۆسکۆدا: "جەختی دەکردەوە لەسەر... پێشبڕکێی فراوانکردنی تاوانبارکردنە لەتواناکان، پێشبڕکێیەك کە بە شێوەیەکی زۆر پێکەنیناوی، شێوا بو. بەزۆری هێڵەگشتیەکانی شیکردنەوەی لۆجیکی ستالین بەمشێوەیە بو: رەنگە بیانەوێت لە رێگەی قۆستنەوەی قەیرانێك، سەرنەگومم بکەن. منیش بەوە تاوانباریان دەکەم کە هەوڵی دەست پێشخەرییەکی لەو جۆرەیان داوە... گۆڕانکاری لە حکومەت توانای جەنگی روسیا لاواز دەکات، ئەگەر لەو کارەیان سەرکەوتو بونایە، رەنگە پەیمانی ئاشتیان لەگەڵ هیتلەردا مۆربکردایە، تەنانەت دەستبەرداری بەشێك لە خاکی روسیاش دەبون... بۆیە منیش هەر لە ئێستاوە بە هاوپەیمانی خیانەتئامێزو وازهێنان لە بەشێکی خاکی روسیا، تاوانباریان دەکەم" ئەمەش لێکدانەوەیەکی درەخشانی ا. دویچەرە لەسەر دادگاییەکانی مۆسکۆ. هەمان سەرچاوە، ل377. دەتوانین نمونەیەکی شایستە لەسەر فۆڕمی نازیزم دەربارەی تاوانی لەتوانا (مومکین) لە هەمان کتێبی هانس فرانك، پەیدا بکەین: "لیستێکی تەواو لەسەر ئەو هەوڵانەی "هەڕەشە لە دەوڵەت" دەکەن، هەرگیز ئامادەناکرێ، چونکە ئەستەمە پێشبینی ئەوە بکرێ لە ئایندەدا چ مەترسییەك هەڕەشە لە رێبەرو میللەت دەکات" (پیلانگێڕی نازی، جلدی چوارەم، ل188).

104ـ بەدڵنیاییەوە ئامرازەکانی تاوانبارکردن، بە تەنها لەسەر نەریتی پۆلیسی فرەنسی قۆرخ نیە. بۆ نمونە لە نەمسا، پۆلیسی سیاسی کە لە سەردەمی ماریاتیریزو لەسەردەستی کاونتێز، رێکخرا، لە کادرانی "کۆمیسیۆنی داوێنپاکان" پێکهاتبو، لەسەر سەرانە وەرگرتن

دەژیان. بڕوانە، مۆرتیز بیرمان "ماریا تیریزاو قەیسەر جۆزیڤی دوەم، ڤییەنا . لایپزگ، 1881
نایابی ئەم سەرچاوەیە بۆ رۆبەرت بێك دەگەڕێتەوە.

105. بەدڵنیاییەوە مەزنی خەزێنەی ڕێکخراوی پۆلیسی نهێنی ستالین، بە قازانجی کاری زۆرەملێی ئۆردوگاکان دابیندەکرا; بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە، بودجەی پۆلیسی نهێنی بە تەنها لەم سەرچاوەیەوە دابین نەدەکرا. کراڤچینکۆ، لە هەمان کتێبدا ئاماژە بە دەرامەتی تایبەت دەکات کە پۆلیسی نهێنی بەسەر هاوڵاتیە حوکمدراوەکانیدا دەسەپاند، لەبەرامبەر ئەوەشدا ئازاد دەکران تا درێژە بەکارو ژیانی خۆیان بدەن.

106. بڕوانە فریتز تیسن، دارایم بەهیتلەردا، لەندەن، 1941

107ـ بڕوانە پیلانگێڕی نازی، جلدی یەکەم، ل196ـ 197 چالاکی ئابوری دەستەی پاراستن لە ئیدارەیەکی نێوەندی بۆ کاروباری ئابوری و ئیداری ڕێکخرابو. زۆرکەرەت کارمەندانی دەستەی پاراستن لە نێوەندی خەزێنەی دەوڵەت، لێدوانیان دەدا کە پارەوپولیان "موڵکی حیزبەو بۆ بەرژەوەندی تایبەتی بەکاردەبرێت"، نامەیەك لە 5/ ئایار/ 1943، لە کتێبی م. وڵفسۆن وەرگیراوە. Uebersicht der Gliederung verbrecherischer Nazi J organisationen, omgus, decembre 1974.

108ـ بڕوانە کۆهن . برامستید، سەرچاوەی پێشو، ل112 ئەنگیزەی (دافع) سەرانە وەرگرتن لەسەردەمێکدا روندەبێتەوە گەر بزانین زیادکردنی دەرامەت، هەمیشە لە شوێنی نیشتەجێ بوونی یەکە ناوچەییەکانی دەستەی پاراستنەوە ڕێکدەخرا.

Vior der wegder S.S, publie par la S.S Hauptamt - schulungsamt mondate, p. 14.

109ـ هەمان سەرچاوە، ل124، لەم بارەیەوە بەریوەبەرەکان لە هێندێك حاڵەتدا ئاسانکاریان بەرامبەر بەو پێداویستیانە دەکرد کە مۆرکی پاراستنی ئۆردوگاکانی لەخۆدەگرت و وەپێر پێداویستی کەسایەتی کارمەندانی دەستەی پاراستنەوە دەچون. بڕوانە وڵفسۆن، سەرچاوەی پێشو، نامەکەی 19/ ئەیلول/ 1941، ئۆزواڵد پۆهڵ، بەریوەبەری "بەریوەبەرایەتی ئابوری بۆ ئەفسەرانی سیاسی (wirtschats J fund verwaltumg Hauptamt) بۆ کۆمیسەری بەرپرسی رایخ لەسەر چاودێری کردنی نرخەکان. لە نامەکەوە روندەبێتەوە کە گشت چالاکیە ئابورییەکان لە ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵدا تەنها لە کاتی جەنگو لە سایەی کەمبونەوەی لە رادەبەدەری هێزیکار نشونمایان دەکرد.

110ـ گوتارەکەی هیملەر لە پۆزن لە تشرینی یەکەم/ 1943، دادگای سەربازی نێودەوڵەتی، نۆرمبۆرگ، 1945 . 1946، جلدی 29، ل146

111. بێك بۆلات Bek Bulat (ناوێکی ئەدەبی مامۆستا دێرینەکانی سۆڤێتە) توانیویتی توێژینەوە لەسەر بەڵگەنامەکانی پۆلیسی نهێنی سەر بە ڕێکخستنی باکوری قەوقازیا بکات. لە ڕێگەی

بەڵگەنامەکانەوە ئەوە ئاشکرا دەبێت کە لەحوزەیرانی 1937، واتە کاتێك هەڵمەتی پاکتاوکردنی مەزن لەچڵەپۆپەدابو، حکومەت فەرمانی بە ئەندامانی پۆلیسی نهێنی ناوچەکان دابو کە دەرسەدێك لە دانیشتوان دەستگیر بکات... ئەم دەرسەدە لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دی جیاوازی هەبو، لەو ناوچانەی کەمترین دڵسۆزیان بەرامبەر بە حکومەت نیشان دەدا، ئەو ڕێژەیە دەگەیشتە 5٪. بەڵام تێکرای ڕێژەی دەستگیرکردن لە کۆی دانیشتوانی یەکێتی سۆڤێت بە نزیکەیی دەگەیشتە 3٪. داڤید. ج. دالین، گۆڤاری "ڕێبەری نوێ"، 8/ حوزەیران/ 1949 بێك و گۆدین، سەرچاوەی پێشو، ل239، هەڵهێنجانێکی کەمێك جیاوازترو تا رادەیەکی زۆریش بەجێیان هەبو. بە گوێرەی ئەو بڕیارە دەستگیرکردنەکان، بەمشێوەیە بەرنامەڕێژییان بۆ کرابو، دۆسێکانی پۆلیسی نهێنی بەکردەوە هەمو دانیشتوانی دەگرتەوەو هەر کەسێکیش لە توێژێکدا پۆلبەندی کرابو. لەمڕووە خەڵکانی سەر بەرێکخستن و ئیدارییەکان ئاماری وردیان لەسەر هەمو شارێك هەبو کە تیایە ژمارەی لەشکری سپی و ئەندامانی حیزبە نەیارەکان و هتد، لەچوار چێوەی ژمارەی هەر شارێکدا، دەست نیشانکرابو... هەمو بەڵگەنامە تاوانییەکان لە ڕێگەی دانپیانانی زیندانیەکان کۆکرابونەوەو خرابونە دۆسیەی کەسایەتییەوەو هەمو کەسێکیش کارتێك لە دۆسێکەیدا هەبو کە ئاماژەی بەوە دەکرد ئەو کەسە تاچ ئاستێك مەترسی لەسەر دەوڵەت هەیە، ئەمەش پەیوەندی بە قەوارەی بەڵگەنامە گومانلێکراوەکان و ئاستی تاوانبارکردنیەوە هەبو کە لە دۆسیەی کەسێتیدا بەدیار دەکەوت. لەبەر ئەوەی ئامارەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕەوانەی دەسەڵاتی باڵادەکران، بۆیە لە هەمو ئانوساتێکدا دەکرا ژمارەی تەواوی ئەو کەسانە دیاری بکرێت کە پاکتاوکردن دەیگرتنەوە.

112. باڵدوین، سەرچاوەی پێشو.

113. کادرەکانی پۆلیسی نهێنی روسیا "لە ژێر رکێفی خودی ستالین" بو، هەروەکو چۆن هێزی تێسرەواندنی سەر بەدەستەی پاراستن راستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی هیتلەردا بو. ئەو دوو ڕێکخراوەی سەرەوە، تەنانەت لە کاتی جەنگیشدا کە بۆ جەنگ بانگهێشت دەکران تا شانبەشانی سوپا بجەنگن، ئەوا هەر پێڕەوییان لە یاسای تایبەت بەخۆیان دەکرد. "بڕیارە تایبەتەکانی هاوسەرێتی" کە پیاوانی دەستەی پاراستنی لە باقی هاوڵاتیان جیادەکردەوە، یەکەمین و سەرەکیترین بڕیاری هیملەر بو لە کاتی رێکخستنەوەی دەستەی پاراستن خستیە بواری جێبەجێ کردنەوە. تەنانەت پێشئەوەی بڕیاری هاوسەرێتی لەسالی 1927 دەربچێت، بە رەسمی بە دەستەی پاراستن راگەیەنرابو: نابێت بە هیچ شێوەیەك لە کۆبونەوە حیزبیەکاندا گفتوگۆ بکەن (Der wegder s.s. op. cit). هەروەها هەمان رەفتاریش کاریگەری لەسەر ئەندامانی پۆلیسی نهێنی سۆڤێت هەبو. ئەو خەڵکانە هەمیشە خۆیان لەئەوانی دی جیادەکردەوە، نەوەکو ناویان بە ناوی بەشە ئۆرۆستۆکراتەکانی حیزب ببەسترێتەوە. (بێك و گۆدین. سەرچاوەی پێشو، لاپەرە 163).

114. دەرکەوتنی ئەستێرەی سیخوری نهێنی تزار، مالینۆفسکی، کە لە کارەکەیدا بالای کرد تا بوە نوێنەری بۆلشەفیك لە پارلەمان، نمونەیەکی لەبەرچاوی ئەم دیاردەیە بو. بڕوانە برترام د. ولف. سەرچاوەی پێشو، بەشی 31.

115. لە ئەڤتۆر خانۆف وەرگیراوە. سەرچاوەی پێشو.

116. لایەنێکی تاریك لەمانگ. نیویۆرك، 1947

117. بڕوانە لاپۆرت. سەرچاوەی پێشو. ل39.

118. بێك و گۆدین. سەرچاوەی پێشو.ل127و 234.

119. بڕوانە پیلانگێڕی نازی، جلدی حەوتەم. ل84.

120. لایەنێکی تاریك لە مانگ.

121. "دەستەی پاراستن بچوکترین نهێنی نەبو، بەلام گەورەترین نهێنی دەستەی پاراستن پەیوەست بو بەو رێوشوێنانەی لە ئۆردوگا زۆرەملێکان پیادە دەکران. تەنانەت ئەندامانی گەستاپۆش بەبێ مۆڵەت بۆیان نەبو سەردانی ئۆردوگاکان بکەن" (ئۆجین کۆگۆن، دەوڵەتی دەستەی پاراستن، مینیخ، ل297).

122ـ بێك و گۆدین، سەرچاوەی پێشو، ل169، ئەوە دەگێڕنەوە کە چۆن کارمەندە دەستگیرکراوەکانی پۆلیسی نهێنی سۆڤێت "زۆر بەوریاییەوە هەڵسوکەوتیان دەکرد بۆ ئەوەی نهێنی رێکخراوەکەیان هەرگیز بۆ کەس ئاشکرا نەکەن"

123. جوانترین نمونە کە دەلالەت لەم حاڵەتە دەرونیە بکات، ئەم پەیڤینەی خوارەوەیە کە لە کتێبی "لایەنێکی تاریك لە مانگ" وەرگیراوە: "ئەو کەسانەی ماوەیەك لە دەرەوەی پۆڵۆنیا ژیانیان بەسەر بردوە، هەمیشە یەکەمین پرسیار لێیان کرابێت، بریتی بوە لە: سیخوریت بۆ ج کەسێك دەکرد؟ یەکێك لەو پۆڵۆنیانەش لە کارمەندی ئاسایشە سۆڤێتەکەی پرسی بو: ئێوەش سەرداریکەری بیانیتان لە ولاتەکەی خۆتان هەیە. ئایا پێتوایە هەمویان سیخوری بکەن؟ وەلامی ئاسایشەکەش: کەواتە پێتوایە چی بکەن؟ لەو باوەڕەی ئەوەندە ساکارو ساوێلکە بن کە ئاگاداری تەواومان لەسەر ئەو کێشەیە نەبێت؟

124. داڤید روسیە، رۆژانی مردنمان، پاریس، 1947

125ـ نازییەکان بە تەواوەتی درکیان بە دیواری پاراستنی ناباوەڕی کردبو کە پرۆژەکانی دادەپۆشی. ئەو راپۆرتە نهێنییەی دەربارەی قەتلوعام کردنی پێنج هەزار یەهودی لەساڵی 1943، ئاراستەی رۆزنبۆرگ کرابو، زۆر بە راشکاوی ئەم مەسەلەیە روندەکاتەوە: "وێنای ئەوە بکەن کە ئەم رودوانە بگاتە دونیای دەرەوەو لەلایەن ئەوانەوە بقۆزرێتەوە. بە ئەگەرێکی نزیك لە یەقین، ئەمجۆرە پروپاگەندەیە کاریگەری لەکن بیسەرانی نابێت، چونکە ئەوانەی گوێ بیستی ئەمجۆرە رودوانە دەبن یا دەیخوێننەوە، ئامادەییان نیە باوەڕی پێبکەن". (پیلانگێڕی نازی، جلدی یەکەم، ل1001).

126ـ لە "وتەکانی سەرخوانی هیتلەر" چەندین کەرەت ئەوەی دوبارە کردۆتەوە: "ئەو شەڕی فەراهەمکردنی بارودۆخێك دەکات کە مرۆڤ بە مەبەستی پاریزگاری کردن لە رەگەزی خۆی، هۆی مردن‌و ژیانی بزانێت"، ل349. هەروەها بڕوانە لاپەرە 347: "مێش بەملیۆن گەرا دادەنێت، تەنها چەند مێشێك نەبێت، هەمویان لەناو دەچن.."

127. باشترین دەق دەربارەی ئۆردوگا زۆرەملێکانی نازی بریتیە لە:

+ داڤید روسی، رۆژانی مردنمان، پاریس، 1945

+ ئۆجین کۆگۆن، پێشتر ئاماژەی پێدراوە.

+ برۆنۆ بیتلهایم Dachau et buchewald (لە ئایاری/ 1938 تاکو نیسانی/ 1939، پیلانگێری نازی، جلدی حەوتەم، ل824).

بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئۆردوگا زۆرەملێکانی سۆڤێت، بڕوانە ئەو دەقە نایابانەی کە رزگار بوە پۆلۆنیەکان لەژێر ناونیشانی "لایەنێکی تاریك لە مانگ" نوسیویانە، هەروەها بڕوانە داڤید. ج. دالین، پێشتر ئاماژەی پێدراوە، ئەم دەقە کەمتر قابیلکەرە چونکە دراوەتە پاڵ ئەو کەسایەتیە بەرجەستانەی بە گشتی مەبەستیانە وەك داتاو داوانامە سودیان لێوەربگرن.

128ـ پێشەکی لایەنێکی تاریك لە مانگ The dark side of the moon جەخت لەسەر کەموکۆرتی لایەنی پەیوەندیکردن دەکاتەوە: "ئەوانە خەبەر دەدەن، بەلام پەیوەندی ناکەن..."

129. بە تایبەتی بڕوانە برۆنۆ بیتلهایم، سەرچاوەی پێشو: "وادێتە بەرچاو قەناعەتم بەوە هێنابێت کە ئەم ئەزمونە ترسناك‌و ریسواکارە، وەك کەسێکی خاوەن زەین‌و بکەر وەرمنەگرتبێ، بەڵکو وەك بونەوەرێکی بابەتی یا وەك شتێك وەرمگرتبێت" ئەم ئەزمونە بە گوتەی زیندانیەکانی دی ئۆردوگا پشت راستکراوەتەوە... وەکئەوەی لەچاودێری کردنی روداوەکاندا دەمتوانی تەنها رۆڵێکی ئاڵۆز وازیبکەم... ئەمەش راست نیە، چونکە ئەمجۆرە کارانە بەو ساکارییە روونادەن" دەبوایە زیندانیەکان قەناعەت بە خۆیان بهێنن کە ئەمجۆرە شتانە واقیعەتیان هەیەو بەراستی رویانداوەو مۆتەکە نەبون. بەلام زۆرجار نەیاندەتوانی وێنایەکی تەواو بکێشن لەسەر ئەوەی چیێیان بەسەرا هاتوە.." بڕوانە روسیە، سەرچاوەی پێشو، ل213، "ئەوەی بە چاوی خۆت نەدیوە، ناتوانیت باوەڕی پێبکەیت. تۆ، پێشتەوەی بێیتە ئێرە، ئایا ئەو پروپاگەندانەت بەجیدی وەردەگرت کە دەربارەی ژوری گاز دەکرا؟

. وتم، نەخێر؟

. کەواتە دەبینی، ئەوانە هەمویان لە تۆ دەچن. نمونەیان لە پاریس، لەندەن‌و نیویۆرك گەلێك زۆرە، تەنانەت لە بیرکینۆ . ش Birkenau بەدوری دوو پێی لە کورەی ئادمۆزی (سوتاندن)، لە پێشتەوەی بخرێنە ئەو کورانەوە، بە پێنج خولەك، هێشتا قوربانیەکان هەر باوەڕیان بەو واقیعە ترسناکە نەدەکرد..."

130ـ داڤید روسیه له کتێبی "دونیای دەست بەسەراگرتن"، یەکەم کەس بو درکی بەم مەسەلەیە کرد، 1947

131. روسیه، سەرچاوەی پێشو، ل587.

132. بڕوانه جۆرج باتای له رەخنەی Critigue، ژمارەی کانونی دوەم، 1948، ل72.

133. کتێبی رۆسیه Rousset زۆرێك لەو تێڕوانینانەی لەسەر سروشتی مرۆڤ تیایە کە زیاتر لەسەر ئەو واقیعە خۆی راگرتوە، لە دوای تێپەربونی ماوەیەك، زۆر بە زەحمەت دەتوانرێ زەینی زیندانی ئۆردوگاکان لە زەینی پاسەوانی ئۆردوگاکان جیابکرێتەوە.

134ـ بەمەبەستی دورکەوتنەوە لە بەدحاڵی بون، پێویستە ئەوەش زیاد بکەین کە بەداهێنانی بۆمبی هایدرۆجینی سەرلەبەری مەسەلەی جەنگیش روبەروی گۆڕانکاری یەکلاکەرەوە بو. بەهەر حاڵ، قسەکردن لەسەر ئەم مەسەلەیە لە دەرەوەی بابەتی ئەم کتێبەیە.

135. ئەمە لە کۆتایی ساڵی 1942 لە ئەڵمانیا رویدا، هەر لەسەر ئەم بنەمایەش هیملەر یاداشتێکی ئاراستەی فەرماندەی ئۆردوگاکان کردوەو ئاگاداری کردونەتەوە کە بە "هەر نرخێك بوە رێژەی مردن کەمبکرێتەوە" چونکە بۆی دەرکەوتبو لە کۆی 136000 هەزار کەسی تازە رەوانەکراو، 70000 هەزار کەسیان لە دوای ماوەیەکی کورت لە ئۆردوگا گیانیان لەدەست داوە. بڕوانە "پیلانگێری نازی"، جلدی چوارەم، پاشکۆی دوو. دوا راپۆرتی ئۆردوگاکانی روسیای سۆڤێتی ئەم خاڵە پشت راستدەکاتەوە: لەدوای ساڵی 1949 . واتە هێشتا ستالین لە ژیاندا مابو . رێژەی مردن لە ئۆردوگاکان کە پێشتر دەگەیشتە لە 60٪ هێدی هێدی کەمبویەوە، لەبەر ئەوەی پێدەچێت یەکێتی سۆڤێت روبەروی کەمبونەوەیەکی کارەستباری هێزی کار بوبێتەوە. ئەم چاکبونە لە بارودۆخی ژیان، نابێت لەگەڵ قەیرانی رژێم لەدوای مردنی ستالین، تێکەڵ بکرێت، ئەو قەیرانەی بۆ یەکەمین کەرەت لە ئۆردوگاکان هەستی پێکرا.

C. F. wilhelm starlinger, Grenzen der sowjectmacht, wurzburg. 1955.

136ـ بڕوانە کۆگۆن، سەرچاوەی پێشو، ل58: "زۆربەی ئەو کارانەی لە ئۆردوگا زۆرەملێکان ئەنجامدەدران، بێسود بون، چونکە یا کارێکی زیاد بو یا ئەوەندە بە خراپی بەرنامەرێژی بۆ کرابو کە زۆرجار چەندین کەرەت دوبارە دەکرایەوە". هەروەها بڕوانە بیتلهایم، سەرچاوەی پێشو، ل831 . 832: "بە تایبەتی زیندانیە تازەکان ناچاربون کاری بێهودە ئەنجام بدەن... هەستیان بە نزمی و سوکی خۆیان دەکرد... پێیان باش بو کاری قورستر بکەن، بەڵام کارێك کە شتێکی باشتر بەرهەم بهێنێت.." تەنانەت ئیڤن دالیان کە سەرلەبەری کتێبەکەی لەسەر ئەو تێزە بونیات ناوە: مەبەست لە ئۆردوگاکانی روسیا دەستەبەر کردنی هەرزانی هێزی کار بوە، بە ناچاری ناکارایی کاری ئۆردوگاکانی قبوڵ کردوە. سەرچاوەی پێشو، ل105. ئەگەر دوا راپۆرتەکان لەسەر لێبوردنی بە کۆمەڵ و هەڵوەشانەوەی ئۆردوگا زۆرەملێکان راست بێت، ئەوا تیورە باوەکان دەربارەی سیستمی ئۆردوگاکانی روسیا وەك رێوشوێنێکی

ئابوری بە مەبەستی دەستەبەر کردنی هێزی کاری هەرزان، بە تەواوەتی رەتدەکرێنەوە. ئەگەر ئۆردوگاکان لە خزمەتی ئامانجێکی گرنگی ئابوری بوایە، ئەوا رژێمی روسیا نەیدەتوانی بە زووترین کات لەنێویان بەرێت بێئەوەی ئەو هەنگاوە ئاکامێکی ترسناکی لەسەرتاسەری سیستمی ئابوری لێنەکەوێتەوە.

137ـ بەدەر لە گواستنەوەی ملیۆنان مرۆڤ بۆ ئۆردوگاکانی قەلاچۆکردن، نازییەکان هیچ کاتێك وازیان لە پرۆژەی کۆلۆنی تازە نەهێنا. بەمەبەستی خواستی کۆلۆنیالیستی، ئەڵمانەکانیان لە ئەڵمانیا یا لەناوچە داگیرکراوەکانەوە بەرەو رۆژهەلات دەگواستەوە. ئەمەش بەربەستێکی راستەقینەی لەبەردەم ئۆپراسیۆنە سەربازییەکان و وەبەرهێنانی ئابوری پێکدەهێنا. بەمەبەستی زانیاری زیاتر لەسەر ئارگیومێنت و کێشمەکێشە بەردەوامەکانی نێوان زنجیرەی هەرەمی مەدەنی نازییەکان لەسەر زەمینە داگیرکراوەکانی رۆژهەلات و زنجیرەی هەرەمی دەستەی پاراستن، بە تایبەتی بڕوانە جلدی 29 لە "دادگاییکردنی تاوانەکانی شەڕی مەزن"، نۆرمبۆرگ، 1947

138. بیتلهایم لە هەمان کتێبدا باس لەوە دەکات کە پاسەوانەکانی ئۆردوگا لەهەمان چوار چێوەدا چەشنی زیندانیەکان هەستیان بە کەشوهەوایەکی ناواقیعی دەکرد.

139. دەست نیشانکردنی ئەو خاڵەش بێبایەخ نیە کە گشت ئەو وێنانەی لە ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵ گیراوە، دوا قۆناغەکانی رژێمی نازی دەخەنەروو، واتە ئەو ساتەوەختەی کە هێزی هاوپەیمانەکان چوە نێو ئۆردوگاکانەوە، بۆیە وێنەکان کەمێك گومڕاکەرن. لەو دەمەدا ئۆردوگاکانی کوشتن بەمانای وشە لەئەڵمانیا نەمابو، چونکە ئامێرەکانی لەنێوبردن لەبەریەکهەڵوەشابونەوە و گوێزرابونەوە. لەلایەکی دی، ئەوەی هاوپەیمانانی تورە کردو سیمای ترسێکی تایبەتی بەفیلمەکانیان دەبەخشی .واتە بینینی دیمەنی ئێسکەپەیکەری مرۆیی .بە هیچ شێوەیەك خەسڵەتی ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵی نازی نەدەخستەروو، چونکە لەنێوبردن لە ئۆردوگاکان لەرێگەی بەکارهێنانی گازەوە ئەنجام دەدرا، نەك لەرێگەی برسی کردنەوە. ئەو بارودۆخەی دوایی ئۆردوگاکان لە ئاکامی رودلوەکانی دوا مانگەکانی رژێمی نازییەوە بو: هیملەر فەرمانی چۆڵکردنی هەمو ئۆردوگاکانی لەنێوبردنی لە رۆژهەلات دەرکردبو. لەو دەمەدا ئۆردوگاکانی ئەڵمانیا جمەی لە زیندانی دەهات .بۆیە شێوازێك نەبو تا خواردنی پێویست لە ئەڵمانیاوە دابین بکرێ.

140. ژیان لە ئۆردوگاکانی گرتنی بە کۆمەڵدا، هەروەکو روسیە جەختی لەسەر دەکاتەوە رێچکەیەکی مردنی بێکۆتایە، سەرچاوەی پێشو، لەچەند شوێنێکی جۆراوجۆردا.

141. ماونز، سەرچاوەی پێشو، ل50، سورە لەسەر ئەوەی کە هەرگیز نابێت تاوانباران بەمەبەستی تەواوکردنی حوکمەکەیان رەوانەی ئۆردوگاکان بکرێن.

142. زیندانەکانی روسیا بەجۆرێك کەم ببونەوە کە سالانی 1925 . 1926 تەنها جێگەی لە 36٪ حوکمدراوەکان دەبووە. بڕوانە دالین، سەرچاوەی پێشو، ل158

143. گەستاپۆ و دەستەی پاراستن هەمیشە گرنگییەکی زۆریان بەتێکەڵ کردنی زیندانی ئۆردوگاکان دەدا. تەنانەت هیچ ئۆردوگایەك تایبەت بە توێژێکی دیاریکراو نەبو. (کۆگۆن، سەرچاوەی پێشو، ل19). بەڵام لە روسیا هەر لەسەرەتاوە زیندانیە سیاسی و تاوانبارەکان تێکەڵ دەکران. لە دە ساڵی یەکەمی حوکمی سۆڤێتدا، سیاسیە چەپەکان هێندێك جیاکاری تایبەتیان هەبو. بەڵام کاتێك رژێمی سۆڤێتی لە کۆتایی بیستەکانی سەدەی بیستەمدا، خەسڵەتی تۆتالیتاری وەرگرت، ئیدی سیاسیەکان، تەنانەت رەسمیەکانیش لە تاوانبارە نەشازو خوێڕییەکانیش خراپتر مامەڵەیان لەتەکدا دەکرا. (دالین، سەرچاوەی پێشو، ل177).

144. کەموکورتی کتێبەکەی روسیە ئەوەیە کە دەسەڵاتی کۆمۆنیستە ئەڵمانەکان، ئەوانەی لە کاتی جەنگدا ئیدارەی ناوخۆی دەزگای بۆخنواڵد. یان بەریوەدەبرد، زیاد لە پێویست گەورە دەکات.

145. بۆ نمونە بڕوانە شایەتی خاتوو بوێرنیومان (خێزانی پێشوی کۆمۆنیستی ئەڵمانی، هاینز نیومان) کە لە ئۆردوگا زۆرەملێکانی سۆڤێت و نازی بە سەلامەتی رزگاری بوە: "روسەکان وەك نازییەکان نیشانەی سادیزمیان پێشان نەدەدا، پاسەوانە روسەکان خەڵکانی ئاغرو بێئازار بون، نەك کەسانێکی سادی، بەڵام لەگەڵ ئەوانەشدا، بەوپەری دڵسۆزییەوە بڕیارە نامرۆییەکانی رژێمی روسیایان لە ئۆردوگاکاندا جێبەجێ دەکرد".

146ـ برۆنۆ بیتلهایم " رەفتارکردن لەحاڵەتی رادیکاڵییەتدا" لە گۆڤاری ناسروشتی و دەرونناسی کۆمەڵایەتی، جلدی 38، ژمارە 4، 1943، رێز لەخۆگرتنی تاوانبارو زیندانیەکان بە بەراورد لەگەڵ ئەو کەسانەی هیچ تاوانێکیان نەکردوە، وەسفدەکات: دەستەی دوایی "لەزیندانیەکانی دی کەمتر بەرگەی یەکەم شۆکیان دەگرت" و یەکەم دەستەش بون کە زۆر بەخێرایی دەروخان. بیتلهایم ئەو رەفتارەیان بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە ئەو دەستەیە سەر بەچینی نێوەنجی بون.

147. روسیە، سەرچاوەی پێشو، ل71.

148. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بارودۆخی ئۆردوگاکانی فرەنسا، بڕوانە ئەوتۆ کویستلەر، خاشاکی زەوی، 1941

149. کۆگۆن، سەرچاوەی پێشو، ل6.

150. بڕوانە، پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل800.

151ـ بێك و گۆدین، لەهەمان کتێبدا بەراشکاوی دەڵێن: "نەیارانی سیاسی رێژەیەکی ناچیزیان لە نێو زیندانیەکانی روسیا پێکدەهێنا"، (ل87) و هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەنێوان "زیندانی کردنی مرۆڤو تاواندا نەبو" ل95.

152ـ برۆنۆ بیتلهایم لە "داشۆ و بۆخنواڵد"، لەناوکۆیی لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی ئەو واقیعەی زۆرینەی زیندانیەکان "بەهای گەستاپۆیان هەڵگرتبو"، پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە

ئەو کارە لە ئەنجامی هەڵمەتی پروپاگەندەوە نەبوە... گەستاپۆ سوربو لەسەر ئەوەی بە هیچ جۆرێك ڕێگەنەدا زیندانیەکان هەستی خۆیان دەربڕن" ل834 .835.

هیملەر زۆر بەراشکاوانە هەمو جۆرە پروپاگەندەیەکی لە ئۆردوگاکان قەدەغە کردبو. "پەروەردە لە رەفتارو دیسپلینەوە سەرچاوە دەگرێ، نەك لە هیچ جۆرە پروپاگەندەیەکی ئایدیۆلۆجی". "دەربارەی رێکخستن و ئەرکی دەستەی پاراستن و پۆلیس"، لە کتێبی:

**Nationalpolitischer lehrgang der werhrmacht, 1973.**

153. روسیە، سەرچاوەی پێشو، ل464.

154. بڕوانە ژیاننامەی سێرجی مالاخۆڤ، دالین، سەرچاوەی پێشو، ل20.

155. بڕوانە ئەلبێر کامۆ "دوو کەرەت لە ساڵێکدا"، 1947

156ـ کتێبی روسیە، سەرچاوەی پێشو، بەشێکی زۆری بریتیە لەو گفتوگۆیەی لەلایەن زیندانیەکانەوە لەسەر ئەو قەیرانە کراوە.

157ـ بیتلهایم لە هەمان کتێبدا ئەو رەوتە وەسفدەکات کە چۆن پاسەوانەکانیش چەشنی زیندانیەکان خوو بە ژیانی ناو ئۆردوگاوە دەگرن و دەترسن بۆ ژیانی دەرەوەی ئۆردوگاکان بگەرێنەوە. کەواتە، روسیە لەسەر هەق بو پێدابگرێت لەسەر ئەوەی کە جەلادو زیندانی وەکویەك و بە یەکسانی خەڵکانێکی سوکن و برایەتی لەسوك و ریسواییدا، وانیەکی نەستەقی ئۆردوگاکان بو.

158. بیتلهایم لە هەمان کتێبدا باس لەوە دەکات کە چۆن "پاراستنی کسایەتی خەمی سەرەکی زیندانیە تازەکان بو"، ئەمە لە کاتێکدا گرفتی زیندانیە کۆنەکان بریتی بو لەوەی چۆن "مرۆڤ بتوانێت لە ئۆردوگاکاندا بە زیندویتی بمێنێتەوە؟"

159ـ روسیە لە هەمان کتێب و لەلاپەرە 390 دا دەڵێت: ئەندامێکی دەستەی پاراستن بەمجۆرە لاف و گەزاف بەسەر پرۆفیسۆرێکدا لێدەدا: "تاکو ئێستا تۆ پرۆفیسۆر بوی. باشە، بەڵام لێرە بەدواوە تۆ پرۆفیسۆر نیت، ئیدی تۆ کەسێکی گەورەو بەرجەستە نیت، تۆ ئێستا گیانەوەرێکی زۆر بچوك و نزمی، بەپێچەوانەشەوە ئێستا من کەسێکی گەورەو مەزنم!" 160ـ کۆگۆن لە سەرچاوەی پێشودا (ل6)، قسە لەسەر ئەو ئەگەرە دەکات کە لە ئاییندەدا ئۆردوگاکان وەك تاقیگەو کێڵگەی ئەزمونی دەستەی پاراستن دەمێننەوە. هەروەها وەسفێکی ورد دەکات لەنێوان ئەو ئۆردوگایانەی سەرەتا بە دەست یەکەکانی هێرشەوە بون، لەگەڵ ئەو ئۆردوگایانەی دواتر دەستەی پاراستن بەڕیوەی دەبرد... بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێ ژیانی ناو ئۆردوگاکان وەسف بکرێ. حیکایەتی زیندانیە دێرینەکان، ئەوانەی لە ئۆردوگاکان بە سەلامەتی رزگاریان ببو، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە یەکەکانی هێرش فۆرمێکی ئازاردەرانە ئەما، پیادەی نەکەن. بەڵام هەمو ئەو کردەوانە لەدڕندایەتی تاکەکەسەوە سەرچاوەیان گرتبو، چونکە هێشتا رژێمێکی بێبەزەییانەو خوێن سارد و رێکخراو کە مرۆڤ بکاتە ئامانجی خۆی، بە تەواوەتی سەقامگیر نەببو. ئەم رژێمەش دەستکەوتی دەستەی پاراستن بو، (ل71).

ماشینی رژێمی نوێ بە ئاستێك گەیشتبو کە هەستی بەرپرسیارێتی لەلای مرۆڤ نەهێشتبو. بۆ نمونە، کاتێك فەرمانێك دەردەچو بەوەی ڕۆژانە سەد کەس لە زیندانیەکان بکوژرێت، ئیدی جەلادەکان لە کونی دیواری زیندانەکەوە، بێئەوەی قوربانیەکە ببینن، تەقەیان لەگیراوەکان دەکرد، (بڕوانە ئێرنست فیدەر " Essai sur la psychologie de la Terreur، گۆڤاری syntheses، بروکسێل، 1946). لەلایەکی دی، کردەوەی لادەرانە بەشێوەیەکی ساختەکاری لەلایەن خەڵکی ئاساییەوە ئەنجام دەدرا. لەم بارەیەوە، روسیە لەدەمی پاسەوانێکی دەستەی پاراستنەوە ئەم حیکایەتە دەگێڕێتەوە: "زۆرجار ئەوەندە لە قوربانیەکەی بەردەستم دەدەم تا عەرەق دەردەدەم. من ژنێك و سێ منداڵم لە بەرسلۆ هەیە. پێشتر مرۆڤێکی ئاسایی بوم، ئەوانە ئەم مرۆڤەیان لێدروست کردم. هەر کاتێك مۆڵەت وەردەگرم بۆ ناو ماڵ و منداڵەکانم ناگەڕێمەوە، چونکە ناتوانم تەماشای نێوچاوانیان بکەم"، ل273.

بەڵگەنامەکانی سەردەمی هیتلەر، کۆمەڵێك شایەتی بەو مانایە تیایە کە تێکرای ئەو کەسانەی بەرنامەی لەنێوبردنیان پێسپێردرابو، خەڵکانێکی ئاسایی بون. کۆمەڵێك بابەتی لەوجۆرە لە کتێبی "چەکی دژە سامیەت"، لیۆن پۆلیاکۆڤ بەدیدەکەین کە ئۆنیسکۆ لە رایخی سێیەم، لەندەن، 1955، بڵاویکردۆتەوە. زۆرینەی ئەو یەکانەی بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنران، خەڵکانێکی خۆبەخش نەبون، بەڵکو پۆلیسی ئاسایی بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکە تایبەتە بەکاردەهێنرا. تەنانەت دەستەی پاراستنی مەشقدیدەش، بەرەکانی پێشەوەی جەنگی لەمجۆرە ئەرکانە پێباشتر بو. شایەتێك لە راپۆرتەکەیدا بەمشێوەیە کارمەندانی دەستەی پاراستن لەسەر کوشتنی بە کۆمەڵ ستایش دەکات، ئەو کەرتە ئەوەندە نمونەیی بو، تەنانەت بێئەوەی پەنا بۆ ئەلکهول بەرێت، توانی بە تەواوەتی ئەرکی لەناوبردنی قوربانیەکانی ئەنجام بدات.

نازی یا بۆلشەفیکەکان لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی لەنێوبردن هەمو جۆرە ئەنگیزەو خرۆشێکی کەسێتی لەبەیندەبەن و دڕنۆییەکانیش تا نزمترین ئاست کەمدەنەوە. تیمێك لە پزیشکان و ئەندازیاران کە ئەرکی دامەزراندنی ژوری گازیان خرابووە ئەستۆ، هەمیشە هەوڵیان دەدا بە تەنها بەرهەمهێنانی لاشە زیاد نەکەن، بەڵکو بەخێراترکردنی مردن، دەردو ئازاری قوربانیەکان کەمبکەنەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا شێوازێکە بۆ ئەوەی بێبەزەیی بگەیەنن بە ئاستێکی نزم.

161. ئەم مەسەلەیە لە نوسینەکانی روسیە بەشێوەیەکی زۆرباش خراوەتەروو. "هەلومەرجی ژیانی کۆمەڵایەتی ناو ئۆردوگاکان، زۆربەی هەرە زۆری زیندانیەکان، هەر لە ئەڵمانییەوە تا میللەتانی دی، بەبێ لەبەرچاو گرتنی پلەو پایەی پێشوی کۆمەڵایەتی و شێوازی پەروەدەبونیان، دەگۆڕێت بە خەڵکانێکی سوك و ریسوا کە تەنها بەرامبەر پێداویستیە هەرەمەکیە ئاژەڵییەکان پەرچەکردار دەنوێنن"

162. دەگمەنی خۆکوژی لەناو ئۆردوگاکاندا بۆ ئەم ناوکۆیە دەگەڕێتەوە. کاری خۆکوژی زۆرجار لە پێش گرتن و لە کاتی دوورخستنەوە رویدەدا تا لەناو ئۆردوگاکان. هەڵبەتە کەمی ئەم

کارەش بەشێوەیەکی هەندەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەرپرسانی ئۆردوگا بە هەمو شێوازێك هەوڵیاندەدا رێگە لە خۆکوژی بگرن، کە دواجار بە کردەوەیەکی هەرەمەکی دەژمێردرێت. بەپێی ئامارەکانی ئۆردوگای بۆخنواڵد (پیلانگێری نازی، جلدی چوارەم، ل800)، رێژەی خۆکوژی لەنێو سەرجەم کوژراو مردوەکاندا بەحاڵ دەگەیشتە 5ر0٪ ، واتە ساڵی تەنها دوو کاری خۆکوژی رویدەدا، ئەمە لەکاتێکدا ژمارەی کوژراوەکان لە ساڵێکدا دەگەیشتە 3516 کوژراو. راپۆرتی ئۆردوگاکانی روسیاش باس لە هەمان دیاردە دەکەن، بۆ نمونە بڕوانە ستار لینگر، سەرچاوەی پێشو، ل75.

163. روسیە، سەرچاوەی پێشو، ل525.

له بەشەکانی پێشودا چەندین کەرەت ئاماژەمان بەوە داوە کە ئامرازەکانی باڵادەستی گشتگیر بە تەنها لە ئامرازەکانی زۆردارەکی و ستەمگەری و دیکتاتۆرییەت کاریگەرترو جیاوازتر نیە، بەڵکو تۆتالیتاریزم لە جەوهەردا بە تەواوەتی لە هەمو فۆرمە سیاسییە سەرکوتکەرەکانی دی جیاوازترە، ئەو فۆرمانەی تا هەنوکە زانیاریمان لەسەریان هەیە. هەر کاتێك تۆتالیتاریزم بەدەسەڵات بگات، لەدوای ئەوەی هەمو نەریتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاساییە باوەکانی وڵات لەنێو دەبات، دەزگای سیاسی نوێ لەجێگەیان دادەمەزرێنێت. تۆتالیتاریزم زۆر بەدەگمەن گرنگی بە نەریتی تایبەتی نەتەوەیی یا سەرچاوە رۆحیە ئایدیۆلۆجیا تایبەتەکەی دەدا، چونکە هەمیشە چینەکان بە جەماوەر دەگۆڕێت، سیستمی حیزبایەتی لەنێو دەبات و لەجیاتی بزوتنەوەیەکی جەماوەری، دیکتاتۆرییەتی تاك حیزبی و دادەمەزرێنێت و نێوەندی دەسەڵات لە سوپاوە بۆ پۆلیس دەگوێزێتەوە، لە سیاسەتی دەرەوەشدا بە ئاشکرا کار بۆ کۆنترۆڵکردنی جهان دەکات. رژێمە تۆتالیتارەکانی هەنوکە پەروەردەی رژێمە تاك حیزبییەکانن و کاتێك بە راستی دەبن بە رژێمی تۆتالیتاری کە لەسەر بنەمای شێوازی بەهایەکی بە تەواوەتی جیاواز لەگەڵ هەمو شێوازەکانی دی رەفتارو هەڵسوکەوت بکەن، بەجۆرێك کە هیچ تویژێکی نەریتی یا یاسایی یا ئەخلاقی یا تویژە سودگەراکانی عەقڵی دروست نەتوانێت زانیاری پێویستمان پێبدات بۆ ئەوەی لە هێڵی کارکردنی تێبگەین، یا حوکمی بەسەرا بدەین، یا پێشبینی دەربارەی کارنامەی ئەو رژێمە بکەین.

ئەگەر راست بێت لە رێگەی شیتەڵ کردنی بەدواداچونە سیاسییەکاندا، ئەوانەی واخومان پێوەگرتوە ناوی قەیرانی سەردەمی لێبنێین، رێڕەوی مێژوو بکێشینەوە، ئەوا دەتوانین رەگەزەکانی تۆتالیتاریزم روونبکەینەوە،

بەڵام ئەوەی لەم ناوكۆیەدا خۆی دەسەپێنێت، بریتیە لەو دەرئەنجامەی كە ئەم قەیرانــە بــە تــەنها بــەری هەرەشــەیەكی دەرەكــیو ئــەنجامی سیاســەتێكی دەســتدرێژیكارانەی ئــەڵمانیاو روســیا نیــەو بــە مردنــی ســتالینو كــەوتنی ئــەڵمانیای نــازی لەنێوبــچێت. تەنانــەت رەنگــە ئــەوەش راســت بێــت كــە كێشە راستەقینەكانی ســەردەمی ئێمــە كاتێك رێگــە چارەســەرێكی گونجاو . هەڵبەتــە نــەك بــەزەرورەت ناشــیرینترینو دڵــرەقترین رێگەچارەســەر . دەدۆزنــەوە كــە مەسەلەی تۆتالیتاریزم ببێت بە مەسەلەیەكی رابردو.

لە دووتوێی هەمان بیركردنەوەدا ئەم پرسیارەش دێتەپێشەوە، ئایا رژێمی تۆتالیتــاری بــەری ئــەم قەیرانــەو رونــاكترینو دڵنیــاترین نیــشانەی رودانــی ئــەو قەیرانــــە نیــــە، ئایــــا شــــێوازی هەرەشــــەكردنو ئــــامرازی رێكخــــستنو توندوتیژییــــەكانی لــــە جبەخانــــەی سیاســــی رژێمــــە زۆردارو ســــتەمگەرو دیكتاتۆرەكانەوە ناخوازێت، ئایا بوونی ناگەڕێتەوە بۆ شكستی خەمبارانەی، وەلــێ لاوەكــی، هێــزە سیاســییە تەقلیــدی . لیبراڵــەكان، ئیــدی چ كۆنــەخواز، نەتەوەپەرســت، سوسیالیــست، كۆمــاریخواز، پاشــایەتی، دەســەڵاتگەرا یــا دیموكراسیخواز بێــت؟ ئایــا بەپێچەوانەوە، شــتێك هەیــە لــە سروشــتی رژێمــی تۆتالیتاری بچێت؟ ئایا رژێمی تۆتالیتاری جەوهەرێكی تایبەت بە خۆی هەیەو بشێت بە نمونەی رژێمەكانی دی بەراورد بكرێت، وەكئــەوەی بیری رۆژئــاوا لــە ســەردەمی فەلسفەی دێرینــەوە پــەیپێبردوەو دانییپیانــاوەو پێناسەشــی كــردوە؟ ئەگەر كارەكان بەمشێوەیە بێت، پێویستە فۆرمەكانی رێكخستنو شێوە تــازەو بێوێنــەكانی كــاركردنی تۆتالیتــاری، جــەخت لەســەر یــەكێك لــەو ئەزمونــە سەرەكییە دەگمەنانە بكەنەوە كە لە ژیانی كۆمەڵایــەتی مرۆڤەكانــەوە سەرچاوە دەگــرێو بــەكاروباری گــشتییەوە پەیوەندیــدارە. ئەگــەر ئــەزمونێكی ســەرەكی هــەبێت كــە لــە باڵادەســتی تۆتالیتارییــەوە گــوزارش لــە خــۆی بكــات، ئیــدی ئــەم شێوازە، بەحوكمی تــازەیی ئەمجۆرە رژێمــە، دەبــێ ئەزمونێكی ئــەوتۆ بێــت كــە لەبــەر هــەر هۆیــەك بــوە، هــەرگیز پێــشتر وەك بونیــادی جەســتەی سیاســی

بەکارنەهاتبێت و حاڵەتە گشتیەکەیشی . ئاشنایەتی هەرچی چۆنێك بێت هەرگیز برەوی نەبوبێت و لە خۆشگوزەرانی کردنی کاروباری گشتیدا سودی لێوەرنەگیرابێت.

لە مێژووی فیکری سیاسیدا، ئایدیای حکومەتی تۆتالیتاری هەرگیز لەئارادا نەبوە، چونکە شێوازی ئەو رژێمانەی خەڵکی لە سایەیدا ژیانیان گوزەراندوە، گەلێك کەمبوە، ئەو شێوازانەش زۆر دەمێکە لە رێگەی بیرمەندانی یۆنانیەوە ئاشکراو پلەبەندی کراوەو زۆر دەمێکیشە تا ئاستی نامۆبوون بۆیان رونبۆتەوە. ئەگەر ئێمە ئەو فۆرمە سیاسیانەی کە بونیادی ئایدیایان، سەرباری ئەو گۆڕانکارییە زۆریانەی بیست سەدەی رابردوو، هەر ئەفلاتونەوە تا کانت، هیچ گۆڕانکارییەکی سەرەکیان بەسەرا نەهاتوە، بە تۆتالیتاریزمەوە بەراورد بکەین، ئنجا دوچاری ئەو وەسوەسەیە دەبینەوە کە وەك فۆرمێکی تازەی ستەمگەری گوزراشت لە تۆتالیتاریزم بکەین، واتە رژێمێکی بێ یاسا کە تاکە کەسێك دەسەڵات قۆرخ دەکات. دەسەڵاتی هەرەمەکیانە کە بە یاساوە دەربەست نەبێت و بەپێی بەرژەوەندی ستەمگەرو لەدژی بەرژەوەندی فەرمانبەران کار بکات، لەسەر پایەی ترسی خەڵکی لە فەرمانڕەواو ترسی فەرمانڕەوا لە خەڵکی راوەستاوە. لە نەریتی سیاسی ئێمەدا، ئەم ترسە دوو لایەنەیە سیمای سەرەکی حکومەتە ستەمگەرەکان بوە.

لە جیاتی ئەوەی بڵێین حکومەتی تۆتالیتاری، حکومەتێکی بێپێشینەیە، دەتوانین بڵێین ئەمجۆرە حکومەتە، ئەو بەدواهاتنیەی بێبایەخ کردوە کە تا هەنوکە لە فەلسەفەی سیاسی تەقلیدیدا هەمو پێناسە جەوهەرییەکانی حکومەتی لەسەر بونیات نراوە، واتە بەدواهاتنی حکومەتی یاسایی و حکومەتی بێیاسا و دەسەڵاتی هەرەمەکی و دەسەڵاتی شەرعی بێبایەخ کردوە. بەڵام ئەوەی حکومەتی یاسا و دەسەڵاتی شەرعی لەلایەکەوە، حکومەتی نا یاسایی و دەسەڵاتی هەڕەمەکی لەلایەکی دی، بەجۆرێك لەم واقیعەدا پێکەوە هەڵبکەن کە جیاکردنەوەیان لە تواناذا نەبێت، هەرگیز لە خەیاڵدا نەبوە. لەگەڵ

ئەوەشدا، حکومەتی تۆتالیتاری روبەروی حکومەتێکی بە تەواوەتی جیاوازمان دەکاتەوە. ئەوەش راستە کە تۆتالیتاریزم هەمو یاسا دانراوەکان پشتگوێ دەخات، تەنانەت خودی ئەو یاسایانەش کە خۆی داینـاوە بێبایەخ دەکات (یاسای سەرەکی ساڵی 1936ی یەکێتی سۆڤێت یەکێکە لەو نمونە زەقانە)، یا ئەو یاسایانەی لە هەڵوەشانەوەی بێباك بو (هەروەکو چۆن نازییەکان سەرباری بێبایەخکردنی یاسای سەرەکی ڤایمار، بەڵام هەرگیز بەرەسمی هەڵیاننەوەشانەوە). کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، رژێمی تۆتالیتاری لە هەمو هەنگاوێکیدا پەنای بۆ یاسا دەبردو هیچ رەفتارێکی هەرەمەکیانەی نەدەکرد، چونکە هەمیشە بانگەشەی ئەوەی دەکرد، ملکەچی لەو یاسا مێژوویی و سروشتیانە دەکات کە سەرچاوە هەمو یاسا دانراوەکانە.

هەمان بانگەشەی ترسناکی رژێمی تۆتالیتار کە بە رووکەش یەکلاکەرەوەیە، دوور لە "نایاسایی" بوونی بەرەو سەرچاوەکانی دەسەڵات رێگە دەگرێتەبەر، بەجۆرێك یاسا دانراوەکانیش دوا شەرعییەتیان لەوێوە چنگدەکەوێت. هەرچەندە رژێمی تۆتالیتاری، رژێمێکی هەرەمەکی نیە، بەڵام لە هەمو رژێمەکانی پێش خۆی زیاتر ملکەچی هێزە بانمرۆییە مێژوویی و سروشتییەکان دەبێت، ئەگەر چی دەسەڵات بۆ خزمەتی بەرژەوەندی تاکەکەس بەکارناهێنێت، کەچی ئامادەیە قوربانی بە بەرژەوەندییە ژیانییە راستەخۆکانی تاك بە تاکی وڵات بدات لە پێناوی هێنانەدی ئەوەی خۆی بە یاسای مێژوویی یا بە یاسای سروشتی ناو زەدەی دەکات. بەهەند وەرنەگرتنی یاسا دانراوەکان لەلایەن تۆتالیتاریزمەوە لەسەر پایەی رەوایەتییەکی باڵاتر خۆی راگرتوە، وەکئەوەی چۆن سروش لەسەرچاوە مێژوویی و سروشتییەکان وەردەگرێت، بەوشێوەیەش دەتوانێت سەرپێچی لە رەچاوکردنی یاسا سوكو ریسواکاندا بکات. شەرعیەتی تۆتالیتار بانگەشەی ئەوە دەکات کە رێگەی سەقامگیرکردنی حوکمی دادپەروەرانەی لەسەر رووی زەوی دۆزیوەتەوە. ئەو شتەی شەرعیەتی یاسا دانراوەکان بەدانپیانانی خۆی

ناتوانێـت پێـی بگـات. هــەرگیز ناتوانرێــت جیـاوازی نێـوان ڕەوایــەتی و دادپەروەری لەنێو ببرێت، چونکە پێوەری چاکەو خراپە کە یاسا دانراوەکان سەرچـاوەی دەسـەڵاتی تایبـەتی خـۆی لەرێگەیانـەوە بەیانـدەکات . یاسـای سروشتی کە حوکمی هەمو جهان دەکات یا یا یاسای خوداوەند کە مێژووی مرۆڤایـەتی دەیخاتـەروو یـا داب و نـەریت کـە گوزارشـت لـە هەستی هاوبەشـی هـەمو مرۆڤەکان دەکـات . بـەزەرورەت پێـوەری گشتیە، دەبـێ لەسـەر حاڵـەتی بێشومارو نادیـار جێبـەجێ بکـرێ، ئەمـە لـە کاتێکـدا هــەمو حاڵـەتێکی تـاك و هەسـتپێکراو، بـارودۆخی تایبـەت بـەخۆی هەیـە، کـە رەنگـە پێـوەری گـشتی دادپەروەری نەیانگرێتەوە.

شـەرعییەتی تۆتالیتـاریزم کـە بـەرەنگاری هـەمو جـۆرە یاسـایەکی دانـراو دەبێتـەوەو لەرێگـەی حـوکمێکی راسـتەوخۆوە بانگەشـەی دەسـتەبەر کردنـی دادپەروەری لەسەر رووی زەوی دەکات، یاسای مێژوویی یـا سروشـتی پیـادە دەکات، بەبێ ئـەوەی هیچ کامیـان سـەبارەت بە هەڵسوکەوتی تـاك بـۆ پێـوەری چاکەو خراپـە وەرگێڕێـت. ئـەم مەشـروعییەتەش بـەبێ ئـەوەی هەڵسوکەوتی خەڵکی بەهەند وەربگرێت، یاسای سروشت و مێژوو راستەوخۆ بەسـەر مرۆڤدا پیادە دەکات. ئەگەر ئەم یاسایانە بە رێکوپێکی جێبەجێ بکرێت، چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکرێت وەك دوا بەرهەم جۆرێك لە مرۆڤی نوێ وەبەربهێنێت، بە هـەر حـاڵ ئـەو هیوایـەی سـەبارەت حـوکمکردنی جهـان لـە یاسـا مێـژوویی یـا سروشـتییەکان چـاوەڕوان دەکـرێ، خـۆی لەپـشت بانگەشـەی هـەمو رژێمـە تۆتالیتارەکانــەوە متکـردوە. سیاســەتی تۆتالیتــاریزم بانگەشــەی گـۆڕینی رەگـەزی مـرۆڤ بـە ئـاڵا هـەڵگرێکی چالاك و بێهەڵـەی یاسـای سروشـت و مێـژوو دەکـات، ئەگـەر چـی لـە روانگـەی تۆتالیتارییـەوە رەگـەزی مـرۆڤ لـە پـێش ئـەم گۆڕانەدا بەشێوەیەکی ئینفعالی و لەرووی ناچارییەوە، پێرەوی لـەم یاسـایانە کـردوە. ئەگـەر چـی ئـەوە راسـتە کـە بـە هـۆی تاوانـە دزێوەکـانی رژێمـە تۆتالیتارەکانـەوە پەیوەنـدی نێـوان دەوڵەتـە تۆتالیتارەکـان و جهـانی مـەدەنی

پـچڕاوە، بـەڵام ئـەوەش راسـتە کـە ئـەم تاوانانـە بـە تـەنها ناگەڕێتـەوە بـۆ شەڕەنگیزی، دڕندایەتی، بێبەزەیی، جەنگو خیانەت، بەڵکو دەشگەڕێتەوە بۆ دابڕانـی وشیارانەی "رێکەوتنی یاسایی . Consensus Juris"، یاسایەك لـە روانگەی سیسرۆنەوە "میللەتێك" دەخوڵقێنێتو وەك یاسایەکی نێودەوڵەتی، جهـانێکی مـەدەنی لەسـەردەمی هاوچـەرخدا دروسـتکردوە، تەنانـەت لـە کـاتی جەنگیشدا بەردی بناغەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان پێکدەهێنێ. بۆیـە هـەم حوکمی ئەخلاقیو هەم سزای یاسایی وەك رێسای مامەڵەکردن لەگەڵ واقیعدا، پێویستیان بەم رێکەوتنە هەیە. دادوەری رەوایانـە دەربـارەی تاوانبارێك تـەنها لەو رووەوە لەتواناداية كە ئەو تاوانکارە لەم رێکەوتنە یاساییەدا بەشدار بێت، تەنانەت خودی یاسای خوداوەندیش کاتێك دەچێتە بواری جێبەجێ کردنـەوە خەڵکی گوێی لێبگرێتو رێکەوتنێکیان لەسەری هەبێت.

کەواتـە، لێرەوە جیـاوازی سـەرەکی لـەنێوان چـەمکی یـاسایی تۆتالیتـاریو گـشت چـەمکە یاسـاییەکانی دی روندەبێتـەوە. بۆیـە سیاسـەتی تۆتالیتـاری زنجیرەیـەك یاسـا لـە جێگـەی زنجیرەیـەك یاسـای دی دادەنێتو رێکـەوتنێکی یاسـایی تایبـەت بەخۆیـشی دادەمـەزرێنێتو لـە پێنـاوی بەرژەوەنـدی شۆڕشیکیـشدا فـۆرمێکی نـوێی شـەرعییەت داداهێنێـت. تۆتالیتـاریزم بـە بەرەنگاربونەوەی هـەمو یاسا دانراوەکان، بە یاسا تایبەتـەکانی خۆیشییەوە، پێر لە تێپەڕاندنی هەمو " رێکەوتنێکی یاسایی" دەکاتـەوە، بێئـەوەی ملکەچی بـارودۆخی نایاسـاییو هەرەمـەکیو ترسـی دەوڵـەتێکی دیـسپۆتیزمی بێـت، چونکە بەڵێنی داوە جێبەجێکردنی یاسا لە کۆتو بەندی هـەر جۆرە کارێك یـا ویستێکی مرۆڤ ئازاد بکـات. تۆتالیتـاریزم پـەیمان دەدا عەدالـەت لەسـەر رووی زەوی بەدی بهێنێت، لەبەر ئەوەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەیەوێت رەگەزی مرۆڤ والێبکات بەرجەستەی یاسای مێژوویيو سروشتی بکات.

ئاوێتەبونی مرۆڤ بە یاساوە کە تۆتالیتارییـەت پێیوایە دەتوانێت جیـاوازی شـەرعییەتو دادپـەروەری نـەهێڵێت (ئـەو مەسـەلەیەی فیکـری تەشـریعی لـە

ڕۆژانی دێرینەوە بە خۆیەوە سەرقاڵ کردوە)، هیچ پەیوەندییەکی بەدیدی سروشتی . lumen natural یا بانگەوازی ویژدانەوە نیە. واتە لەگەڵ هەمان ئەو شتانەی کە سروشت یا مێژوو وەك سەرچاوەکانی دەسەلاتی ماف سروشتی ius natural یا فەرمانەکانی خوداوەند کە لە ڕەوتی مێژوودا بەدیار دەکەون دەسەلاتو توانا بەمرۆڤ دەبەخشن. ئەم ئاوێتەبونەش هەرگیز مرۆڤ لە وێنەی بەرجەستەکارێکی زیندوی یاسا ناخاتەروو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، وەك سەرچاوەی دەسەلاتێك کە خوازیاری ملکەچیو گوێرایەڵییە، جیاوازیی نێوان یاساو مرۆڤ وەکخۆی دەهێڵێتەوە. بۆیە (خەڵکیو یاسادانەرانو فەرمانڕەوایان پێکەوە) وەك دوو سەرچاوەی دەسەلاتی بەردەوامو هەتاهەتایی یاسا دانراوەکان تەماشای سروشتو مێژوو دەکەن. ئەگەر چی یاسا دانراوەکان بەپێی هەلومەرجو پێداویستیەکان دەگۆڕێنو گۆڕانکاریان بەسەرا دێت، بەلام بە بەراورد لەگەڵ کردەوە هەمیشە گۆڕاوەکانی مرۆڤدا، بەردەوامییەکی ڕێژەییان هەیە. خەڵکی ئەم بەردەوامییە کە نیشانەی سەرچاوەی دەسەلاتیانە لە ئامادەگییەکی هەتاهەتاییەوە وەردەگرێت. لەم ڕووەوە، یاسا دانراوەکان هەر لەبنەڕەتەوە بۆ ئەوە دانراون تا لەئاست کردەوە هەمیشە گۆڕاوەکانی مرۆڤدا، ڕۆڵی هۆکاری جیگیرکردن وازیبکەن.

هەمو یاساکان بەپێی ڕاڤەکردنی تۆتالیتاریزم دەبن بە یاسای بزوتنەوە. بۆیە کاتێك نازییەکان قسەیان لەسەر یاسای سروشتی دەکردو بۆلشەفیکەکانیش لەسەر یاسای مێژوو دەدوان، ئیدی نە سروشتو نە مێژوو سەرچاوەی دەسەلاتێکی ئەوتۆ نەبون کردەوەی مرۆڤە فانییەکان جڵەو بکات. تەنانەت ئەگەر مرۆڤ بە یاسای نەژادی تەماشای بیروباوەری نازیزم بکات کە مرۆڤ بە دەرکەوتەی یاسای سروشتی دەزانێت، ئەوا ئایدیای داروینی تیا بە دیدەکات، ئەو ئایدیایەی مرۆڤ بەرهەمی گۆڕانێکی سروشتییە، گۆڕانێك بە زەرورەت بە کاراکتەری ڕەگەزی مرۆڤی ئێستا قەتیس ناکرێ. ئەمەش کتومت لەسەر دیدی بۆلشەفیکەکان بەرامبەر بە مرۆڤ پیادە دەبێت، چونکە

بیروباوەڕیـان لەسـەر ململانێـی چینایەتی وەك گوزارشـتێك لـە یاسـای مێـژوو، جەخت لەسەر وێنایەك دەكات كە ماركس لەسەر كۆمەڵگەی دارشتوە، وێنایەك بەرهەمی بزوتنەوەیەكی مێژوی مەزنەو بەپێی یاسای جوڵەی خۆی تا كۆتایی قۆناغی مێژوو لە جوڵەدا دەبێت، تا سەرئەنجام خۆی لە جوڵە دەكەوێت.

جیـاوازی نێـوان ڕەوشـی مێژووگـەرای مـاركس و ڕەوشـی سروشـتگەرای داروین زۆرجـار بـە سـودی مـاركس نیشان دراوەو خراوەتـەروو، هـەر ئەمـەش وادەكـات ئـەوە پـشتگوێ بخـەین كـە تـا چ ئەندازەیـەك مـاركس سـودی لـە تیورەكـەی داروین وەرگرتـوە. مەبەسـتی ئـنگلس لـە ناولێنـانی مـاركس بـە "داروینی مێژوو"[1] زیاتر ڕێزلێنانێكی پەتی بو، چونكە لە واقیعدا دەیویست پشكی داروین لە دەستكەوتەكانی ماركسدا بخاتەروو. ئەگەر كەسێك نەك هـەر بەرهەمـە بـە فیعلـی تـەواوبوەكانیان، بـەڵكو فەلـسەفەی سـەرەكی ئـەو دوو مرۆڤـەش لەبەرچـاو بگرێـت، دواجـار بـۆی دەردەكـەوێت كـە بزوتنـەوەی سروشت و بزوتنەوەی مێژوو، لە واقیعدا یەك شتن. داروین بەداهێنانی چەمكی گـۆڕان لـە سروشـتداو پێـداگرتنی لەسـەر ئـەوەی كـە جوڵـەی سروشـت، بـە لانیكەمەوە لە بواری بایۆلۆجیدا بازنەیی نیە، بەڵكو تاك هێڵەو تا ناكۆتاش گەشە دەكات، لەواقیعدا مانای ئەوە دەگەیـەنێت كـە مێـژوو لـە زاتـی خۆیـدا سروشت قووت دەداو بەشێوەكیش سەیری ژیانی سروشتی دەكرێ وەكئەوەی لە جەوهەردا مێژوویی بێت.

بە ئەندازەی یاسای "سروشتی" داروین كە بەپێی ئەو یاسایە مانەوە بۆ خەڵكانی شایستەیەو وەك قانونێكی مێژوو بۆ خزمەتی نەتەوەپەرستی سودی لێـوەردەگیرێ، دەتـوانرێ یاسـای چـینایەتی ماركـسیش كـە دەڵێـت، پێشكەوتوترین چین شایستەی مانەوەیە، وەك قانونێك بۆ خزمەتی كۆمۆنیزم بـەكاربهێنرێ. لەلایـەكی دی، چـەمكی ململانێـی چـینایەتی مـاركس وەك داینـەمۆی مێـژوو، جگـە لەڕەنگدانـەوەی پەرەسـەندنی هێـزی بەرهەمهێنـەر

شـتێکی دی نیـە، ئـەم هێـزەش لـەلای خۆیـەوە لـە "هێـزی کـار"ی مرۆڤـەوە سەرچاوەدەگرێ. بـەڵام سـەبارەت بـە مـارکس، هێـزی کـار بـە تـەنها هێزێکـی مێژوویی نیە، بەڵکو هێزێکی بایۆلۆجیشە، کە لە "میتاپۆلیزمی مرۆڤ لەگەڵ سروشت" هەوێنو سەرچاوە دەگرێو ژیانی تاکو جۆری مرۆڤ دەپارێزێتو بـەردەوامی پێدەبەخـشێت[2] ئـنگلس زۆر بـە باشـی لێکـچونی بیروبـاوەڕی سـەرەکی مـارکسو داروینـی بـەدیکردبو، چـونکە بـە باشـی درکـی بـە ڕۆڵـی سەرەکی چەمکی پەرەسەندن لە تیوەرەکانی ئەو دوو کەسە کردبو. بێگومـان ئـەو گۆڕانکارییـە مەزنـەی فیکر کـە لـە ناوەراسـتی سـەدەی بیستەمدا روویـدا، ڕەتیـدەکردەوە تەماشـای هـەمو شـتێك بکـات وەکئـەوەی هەیـە، یـا وەکـو خـۆی قبـوڵی بکـات، هـەروەها هـەمو شـتێك وەك قونـاغێکی دواتـری پەرەسـەندن راڤەبکات. بەڵام ئەوەی کە داینـەمۆی ئـەم گۆڕانـە، بەهێزی مێـژوو یـا سروشـت ناوبنرێـت، بایـەخێکی لاوەکـی ڕێـژەیی هـەبو. چـونکە وشـەی "یاسـا" لـەم ئایدیۆلۆجیانـەدا بـە بـەردەوامی ماناکـەی گۆڕانکـاری بەسـەرا دێـت: لـەجیاتی ئـەوەی چوارچـێوەیەکی نـەگۆڕ بـۆ بـەدیهێنانی جوڵـەی مـرۆڤو کردەوەکـانی پێکبهێنێت، گوزارشتی لە خودی جوڵەکە دەکرد.

سیاسـەتی تۆتالیتـاری کـە پـەیرەوی لـە ڕەچـەتە ئایـدیۆلۆجیاکان دەکـات، چییەتی راستەقینەی ئەو بزوتنەوە ئایدیۆلۆجیانەی ئاشکرا کردوە، چونکە بە راشـکاوی ئـەوەی پیـشان داوە کـە ئـەم پرۆسـەیە خـاڵی کۆتـایی نیـە. ئەگـەر یاسای سروشت وابخوازێت هەمو شتێكو هـەمو کەسێکی ناشایستە بە ژیـان لـەنێو ببرێـت، ئـەوا خـودی سروشـتیش ڕێگـەی کۆتـا دەگرێتەبـەر، ئەگـەر چینێکـی تـازە لـە مرۆڤـە گۆشـەگیرو ناشایـستەکان بـە ژیـان نـەتوانرێ پەیـدا بکرێ. هەروەها یاسای مێژووش دەڵێت لە ململانێی چینایەتیدا دەبێ بەشێك لە چینەکان لەنێوبرێت، کەواتـە ئەگـەر چینێکـی تـازە پەیـدا نـەبێت بـۆ ئـەوەی بەدەستی فەرمانڕەوایانی تۆتالیتـار لەنێوبچێت، کۆتـایی مرۆڤایـەتیش دەبێـت بەشـتێکی حـەتمی. یاسـای کوشـتن کـە بزوتنـەوە تۆتالیتارەکـان لـە ڕێگەیـەوە

بەدەسەڵات دەگەن و پیادەی دەکەن، تەنانەت ئەگەر ئەو بزوتنەوانە بتوانن سەرجەم مرۆڤایەتیش بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، دیسانەوە وەك یاسای ئەو بزوتنەوانە هەر دەمێنێتەوە.

حکومەتی شەرعی وەك جەستەیەکی سیاسی لەپێناوی ئەوەی "ماف سروشتی" نەگۆڕ یا فەرمانە جاویدانەکانی خوداوەند بە پێوەرەکانی چاکەو خراپە وەربگێڕێ، پێویستی بە یاسا دانراوەکان هەیە. بۆیە تەنها لە سایەی ئەو پێوەرانەو کۆمەڵێك یاسای دانراوی هەر وڵاتێك، ماف سروشتی یا فەرمانەکانی خوداوەند واقعییەتی سیاسی پەیدا دەکات. بەڵام لە جەستەی سیاسی حکومەتی تۆتالیتاریدا، تیرۆری گشتگیر جێگەی یاسا دانراوەکان دەگرێتەوە، تیرۆرێك بە مەبەستی ئەوە گەڵاڵە کراوە تا واقعی خۆی بە یاسای بزوتنەوەی مێژوو یا سروشت دەبەخشێت. رێك هەروەکو چۆن یاسا دانراوەکان سەربەخۆیە لەو سەرپێچی و تاوانانەی کە پێناسەو دیاریدەکات. نەبونی تاوان لە کۆمەڵگەیەکدا، یاسای تاوان بێسودو بێکەڵك ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەلالەت لە دەسەڵاتی تەواوی ئەو یاسایانە دەکات. ئەوا لە رژێمە تۆتالیتارەکانیشدا تیرۆر تەنها ئامرازێك نیە بۆ سەرکوتکردنی ئۆپۆزیسیۆن، هەر چەندە بۆ ئەو مەبەستەش بەکاردەهێنرێت. بەڵام کاتێك تیرۆر دەبێت بە گشتگیر، ئیدی پەیوەندی بە ئۆپۆزیسۆنەوە نامێنێت. کاتێك تیرۆر حوکمی رەها بەسەر کۆمەڵگەدا پەیدا دەکات، کە چیدی کەس رێگە لە رژێمی تۆتالیتاری نەگرێت. ئەگەر شەرعییەت جەوهەری رژێمە ناستەمگەرەکان بێت و بێیاسایی جەوهەری حکومەتی ستەمگەرەکان بێت، ئەوا تیرۆریش جەوهەری باڵادەستی رژێمە تۆتالیتارەکان پێکدەهێنێت.

تیرۆر بریتیە لە بەدیهێنانی یاسای بزوتنەوەو ئامانجی سەرەکیشی ئەوەیە کە کارێك بکات تا هێزی سروشت یا مێژوو بتوانێت بە پێشێلکردنی رەگەزی مرۆڤ ئازادانە بۆ پێشەوە تاوبدات، بێئەوەی هیچ جۆرە کارێکی هەرەمەکیانەی

مرۆڤ بتوانێت ڕێ لە تاودانی بگرێت. بۆیە تیرۆر بۆ ئەوەی هێزی سروشت یا مێژوو ئازاد بکات، هەوڵدەدا مرۆڤ لە شوێنی خۆی بەند بکات. ئەوە بزوتنەوەیە دوژمنانی مرۆڤایەتی دەست نیشاندەکات، بۆ ئەوەی جڵەوی تیرۆر لەدژیان شل بکرێت، بۆیە هیچ کارێکی ئازادانە، ئیدی چ دوژمنکارانە بێت یا لایەنگرانە، ڕێگەی پێنادرێت، بەربەستێك لەبەردەم لە نێوبردنی " دوژمنانی بابەتی" مێژوو یا سروشت، دوژمنی چین یا ڕەگەز، دروست بکات. ئیدی لێرە بەدواوە بێگوناهی و گوناهکاری دەبن بە دوو چەمکی بێمانا و بێناوەرۆك: گوناهکار ئەو کەسەیە کە ڕێگرە لەبەردەم پرۆسەی سروشتی یا مێژوو، ئەو پرۆسەیەی حوکم لەسەر "ڕەگەزە نزمەکان"، ئەو تاکانەی " شایستەی ژیان نین"، ئەو "چینانەی ڕوو لەمەرگن" و "نەتەوە سوك و ڕیسواکان" دەردەکات. لەم حاڵەتەدا تیرۆر ئەو حوکمانە جێبەجێ دەکات و لە دادگاشدا چ کوژراو و چ بکوژ لەڕووی زەینییەوە خۆیان بە بێگوناه دەزانن: قوربانییەکان بێگوناهن، چونکە هیچ کارێکیان لەدژی ڕژێم ئەنجام نەداوە و بکوژەکانیش گوناهێکیان نیە، چونکە تەنها فەرمانی مردنێکیان جێبەجێ کردوە کە دادگای باڵا دەریکردوە. تەنانەت فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاریش بانگەشەی دادوەری یا حەکیمی ناکەن، بەڵکو بە تەنها یاسای سروشت یا مێژوو جێبەجێ دەکەن، ئەوانە خودی یاسا پیادە ناکەن، بەڵکو بزوتنەوەیەك بە پێی یاسای خۆی دەهێننەدی. لەم ناوکۆیەشدا تیرۆر دەبێت بە شەرعی، ئەگەر یاسا ببێتە یاسای جوڵەی هێزێکی بانمرۆڤی، واتە هێزی سروشت یا هێزی مێژوو.

تیرۆر وەك ئامرازێکی بەدیهێنانی یاسای بزوتنەوە کە دوائامانجی خۆشگوزەرانی مرۆڤ یا بەرژەوەندی تاکەکەس نیە، بەڵکو بەرهەمهێنانی ڕەگەزێکی تازەی مرۆڤە کە تاك بۆ بەرژەوەندی جۆر لەنێو دەبات و لە پێناوی "گشت"دا قوربانی بە "بەش" دەدات. لەبەر ئەوەی هێزی بانمرۆڤی مێژوو یا سروشت، سەرەتا و کۆتایی هەیە، بۆیە تەنها سەرەتا و کۆتایی ژیانی تاك

ناهێڵێت ئەم پرۆسەیە بە ئاکام بگات. شتێکی روون و ئاشکرایە کە ئەمەش سەرەتا و کۆتایی خودی ژیانی مرۆڤە.

یاسا دانراوەکان لە حکومەتە دەستورییەکاندا پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان دیاریدەکەن و شێوازی پەیوەندیشیان لە کۆمەڵدا دەست نیشاندەکەن، ئەو کۆمەڵەی خەڵکانی تازە، ئەوانەی بەردەوام لەدایك دەبن، هەڕەشەیان لێدەکات. لەگەڵ هەر لەدایك بونێکی نوێ، سەرەتایەکی نوێش دێتە جهانەوە، هاورێ لەگەڵ ئەوەشدا، جهانێکی نوێ پێدەنێتە ناو دنیای بوونەوە. سەقامگیربونی یاسا پەیوەندی لەگەڵ جوڵەی بەردەوامی کاروباری مرۆڤدا هەیە، جوڵەیەك تا ئەو کاتەی مرۆڤ لە دایك دەبێت و دەمرێت هەرگیز کۆتایی نایەت. کەواتە، یاسا دانراوەکان سنوری ئازادی هەر سەرەتایەکی نوێ دیاریدەکەن و لەهەمان کاتیشدا بۆ هەر ئامادەگییەکی نوێ و پێشبینی نەکراو کە تازە هاتۆتە دونیاوە، حەرامێك دیاریدەکەن. حەرام و سنوربەندی یاسا دانراوەکان سەبارەت بە بوونی مرۆڤی سیاسی، هەمان ئەو رۆڵە وازیدەکەن کە یادەوەری سەبارەت بە بوونی مێژووی مرۆڤ وازیدەکات. ئەو سنوربەندییانەی بوونی جهانی هاوبەشی پێش ئەو دەستەبەر دەکەن و لەگەڵ ئەو واقیعە هەمیشە گۆڕاوەی لە قەڵەمڕەوی جهانی تاکی هەر نەوەیەك هەنگاوی زیاتر دەنێت و هەمو سەرەتا تازەکان هەڵدەمژێت و هێز و قووتی لێوەردەگرێ، دەبێتە یادەوەری مرۆڤ

ئەگەر لێکۆڵەران پێیان وابێت تیۆری گشتگیر نیشانەی رژێمێکی دیسپۆتیزمە، لەبەر ئەوەیە کە رژێمی تۆتالیتاری لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا چەشنی حکومەتێکی دیسپۆتیزم رەفتار دەکات و هەمو ئەو حەرامە یاساییانەش پێشێل دەکات کە مرۆڤ دایناوە. بەڵام تیۆری گشتگیر هیچ جێگەیەك بۆ حوکمی ئەنارچیستی هەڕەمەکی ناهێڵێتەوە، هەروەها جڵەو بۆ بەرژەوەندی ویستێکی هەڕەمەکی یا بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتێکی زۆردارانە شل ناکات کە تیایە تاکە کەسێك دژایەتی هەموان دەکات، بەڵکو بەلانیکەمەوە

بۆ ئەوەی جەنگی هەموان لەدژی هەموان هەڵایسێنێ، چرنوك و ددان پێشان دەدا. ئەم تیرۆرە، سنورو شێوازی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان لەنێو دەبات و لەجێگەیدا بەزنجیرێکی ئاسن مرۆڤەکان توند پێکەوە دەبەستێتەوە، وەکئەوەی فرەییان لەتاکە مرۆڤێکی دێوئاسا بتوێنێتەوە. لابردنی بەربەستە یاساییەکان لە نێوان خەڵکیدا . هەروەکو چۆن حکومەتی دیسپۆتیزم دەیکات . هاوتای نکوڵیکردنە لە ئازادییە مرۆییەکان و لەناوبردنی ئازادی وەك واقعێکی سیاسی زیندو، چونکە ئەو مەودایەی یاسا لە نێوان مرۆڤەکان دیاریکردوە، بریتیە لە هەمان مەودای ئازادی راستەقینە. تیرۆری گشتگیر پەنا بۆ ئەم ئامرازە کۆنەی ستەمگەر دەبات و لە هەمان کاتیشدا ئەو بیابانە پڕ لەترس و گومانەی بێیاسا و ناحەرامەکان (یا بەربەستەکان) لە نێودەبات کە ستەمگەری لەکاتی تێپەربونیدا لەدوای خۆی بەجێی دەهێڵێت. بەدڵنیاییەوە ئەم بیابانەی ستەمگەری مەودای راستەقینەی ئازادی نیە، بەڵکو هێشتا شوێنێکی بۆ ئەو جوڵەو چالاکیانە تیایە کە سروش لە ترس و گومانی دانیشتوانەکەی دەکات.

تیرۆری گشتگیر مرۆڤەکان والێدەکات یەکتری بهاڕن، بەوەش مەودای نێوانیان لەنێودەبات. ئەگەر بازنەی ئاسنینی تۆتالیتار کە مرۆڤەکان بە توندی پێکەوە دەبەستێتەوە لەگەڵ بیابانی ستەمگەری بەراورد بکرێ، بیابانی ستەمگەری وەك زامنکاری ئازادی بەدیار دەکەوێت، چونکە لەم بیابانەدا، بەلانیکەمەوە پانتاییەك لەنێوان مرۆڤەکان دەمێنێتەوە. کاری حکومەتی تۆتالیتاری بە تەنها بنبڕکردنی ئازادی یا لەنێوبردنی ئازادییە سەرەکییەکان نیە، ئەگەر چی تا ئەو جێگەیەی ئێمە ئاگادارین لە بنبڕکردنی خۆشەویستی لە دڵ و دەرونی خەڵکیدا سەرکەوتو نابێت، بەڵکو ئەمجۆرە حکومەتە مەرجی سەرەکی هەمو ئازادییەك، واتە پانتایی پێویست بۆ جوڵەی تاکەکەسیش لەنێودەبات.

بوونی تیرۆری گشتگیر، کە جەوهەری رژێمی تۆتالیتارە، نە لەپێناو، نە لەدژی مرۆڤەکانە، بەڵکو ئەمجۆرە تیرۆرە زیاتر بۆ ئەوەیە کاریگەرترین ئامراز

بۆ خێراترکردنی جوڵەی هێزی سروشتی یا مێژوو فەراهەم بکات. بەڵام ئەم بزوتنەوەیە کە بەپێی یاسای تایبەت بە خۆی بەرەو پێشەوە دەچێت، لەمەودایەکی دووردا ناتوانرێت پێشی پێبگیرێت، لە کۆتایدا هێزەکانی سروشت یا مێژوو لە بە تواناترین هێزی چالاکیو ئیرادەی مرۆڤ بە تواناتر دەکەوێتەکار. بەڵام لەگەڵ هەمو ئەوەشدا، دەتوانرێ جوڵەی ئەو هێزانە خاوبکرێتەوە، لە راستیدا خاوبونەوەی تیرۆری گشتگیر، لەرێگەی ئازادی مرۆڤەوە، بەشێوەیەك کە بواری دەربازبونی تیا نیە، هەر دەبێ ئەنجام بدرێ، تەنانەت خودی فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاریش ناتوانن نکۆڵی لەوە بکەن هەرچەندە وێنایان لەسەر ئەم مەسەلەیە هەرەمەکیو لە شوێنی خۆیشیدا نەبێت . کە ئازادی خۆبەخۆ تاودانی جوڵەی ئەو هێزانە رادەگرێت، چونکە ئەم ئازادییە هاوتایە لەگەڵ واقیعی لە دایکبوونی مرۆڤ، چونکە هەر مرۆڤێکی تازە کە پێدەخاتە دونیاوە، سەرەتاو جهانێکی تازەش پێدەخاتە دونیای بوونەوە. لە روانگەی تۆتالیتاریزمەوە خودی ئەو واقیعەی مرۆڤ تیایە لە دایك دەبێتو دەمرێت، وەك بەربەستێکی نەفرەتاوی لەرێگەی هێزی باڵای سروشت یا مێژوو وەردەگیرێت. بۆیە تیرۆر وەك خزمەتکارێکی گوێرایەڵی بزوتنەوەی سروشتی یا مێژوویی، لەم پرۆسەی بزوتنەوەیەدا بە تەنها ئازادی لە نێونابات، ئیدی هەرچی مانایەکی تایبەتی پێبەخشرابێت، بەڵکو سەرچاوەی ئەو ئازادییەش لەنێودەبات کە لە واقیعی لەدایکبونی مرۆڤەکانو دەرکەوتنی سەرەتا نوێیەکان هەڵدەقوڵێن. تۆتالیتاریزم لەگەڵ بازنەی ئاسنینی تیرۆر، فرەرەنگی مرۆڤ لەنێو دەباتو تاکێك لەو فرەرەنگییە دروست دەکات، ئەو تاکەی دادەهێنێت، بەشێوەیەك رەفتار دەکات وەکئەوەی خۆی بەشداری لە رەوتی مێژوو یا سروشت بکات. بەهەمان شێوە، تیرۆری تۆتالیتار بە تەنها هێزی مێژوو یا سروشت ئازاد ناکات، بەڵکو تاودانێکی ئەوتۆیان پێدەدا، تەنانەت ئەگەر بە تەنها وازیان لێبهێنرێت، ناتوانن ئەو خێراییە بەدەست بهێنن. ئەم مەسەلەیەش بەکردەوە بەو مانایە دێت، تیرۆر، بریاری مردن کە سروشت بۆ

رەگەز یا تاکی "ناشایستە بە ژیان"، مێژوو بۆ ئەو "چینەی روو لەمردنە" دیاریکردوە، دەمودەست جێبەجێ دەکات، بێئەوی بسرەوێت تا پرۆسە لەسەرخۆو ناکاراکەی سروشت یا مێژوو ئەو کارانە ئەنجام بدەن.

لە ناوکۆی ئەو وێناکردنەدا کە جوڵە جەوهەری خودی رژێم پێکدەهێنێت، وادەردەکەوێت مەسەلە کۆنەکەی فیکری سیاسی رێگە چارەسەرێکی بۆ دۆزرابێتەوە، چارەسەرێك زیاتر لەجیاوازیو ناتەبایی نێوان شەرعییەتو دادپەروەری دەچێت کە پێشتر ئامارژەی بۆ کراوە. ئەگەر جەوهەری حکومەت بە شەرعییەت دیاریبکرێتو وەك یاساگەلێکی وێنابکەین کە سەقامگیری بە کاروباری گشتی مرۆڤەکان دەبەخشێت (ئەم مەسەلەیە هەمیشە لەو کاتەوە لە ئارادابوە کە ئەفلاتون لە کتێبی "یاساکان"دا لە زیوس، خودای سنورەکان، پاڕاوەتەوە)، ئیدی لەگەڵ مەسەلەی جیاوازی نێوان هێڵی پەیکەری سیاسیو چالاکی هاوڵاتیان روبەرو دەبینەوە. ئەگەر چی شەرعییەت کاروچالاکی سنودار دەکات، بەڵام هانیان نادات ئەوجۆرە کاروچالاکیانە ئەنجام بدەن، مەزنیو ئاکامی یاسا لە کۆمەڵگە ئازادەکاندا لەوێدایە تەنها بە تاکەکان ئەوە دەڵێت کە پێویستە چی نەکەنو هەرگیز پێیان ناڵێت دەبێ چ بکەن. بەڵام جوڵەی پێویستی پەیکەری سیاسی هەرگیز ناتوانرێ لە جەوهەریدا پەیدا بکرێ، بەلانیکەمەوە لەبەر ئەوەی ئەم جەوهەرە . دیسانەوە لەسەردەمی ئەفلاتونەوە تا هەنوکە لە ئارادا بوە . هەمیشە لەرێگەی پەیوەندی بەردەوامی بەو جوڵەیەوە پێناسە کراوە. بۆیە وادەردەکەوێت پێوەری بەردەوامبوونی زامنترین پێوەری حکومەت بێت. لەو بارەیەشەوە، مۆنتیسکۆ پێیوایە باشترین سەلماندن لەسەر بەدسیمایی رژێمێکی ستەمگەری ئەوەیە کە رژێمە ستەمگەرەکان هەمیشە لەناوەوەرا دادەروخێنو بەدەستی خۆی گۆڕی نەمانی خۆی هەڵدەکەنێت، ئەمە لە کاتێکدا سەرجەم رژێمەکانی دی تەنها بەهۆی هۆکاری دەرەکییەوە دەروخێن. بەمشێوەیە، ئەوەی پێناسەی حکومەتەکان هەمیشە پێویستیان پێی هەیە، هەمان ئەو شتەیە کە مۆنتسکیۆ ناوی

"پرەنسیپی کار"ی لێناوە. ئەم پرەنسیپەش کە لەگەڵ جیاوازی شێوەی حکومەتەکاندا جیاواز دەبێت، پێویستە لەچالاکییە گشتیەکاندا رێنمای حکومەتو هاوڵاتیان بێتو لە دادوەریکردنی هەمو کارە گشتییەکانیشدا وەك پێوەرێك دەستبەکار بێتو پێوەری شەرعییەتی نێکەتیڤ تێپەڕێنێت.

لە حکومەتێکی تۆتالیتاری کامڵدا کە گشت مرۆڤەکان بە تاکە مرۆڤێك دەگۆڕێنو ئامانج لە هەمو کردەوە مرۆییەکاندا، تاودانی جوڵەی سروشت یا مێژوو بێتو هەر کارێك، بەبێ ئاوارتەیی لەلایەن مێژوو یا سروشتەوە حوکمی لەسێدارەدانی بەسەرا بدرێتو لە بارودۆخێکدا بۆ ئەوەی سیمای بەردەوامی بە بزوتنەوە ببەخشرێت، بتوانرێ پەنا بۆ تیرۆر ببرێت، ئیدی پێویستی بەهیچ جۆرە پرەنسیپێکی کار نیە لەگەڵ جەوهەریدا جیاواز بێت. تا ئەو کاتەی سەرتاسەری گۆی زەمین نەکەوێتە ژێر فەرمانڕەوایی تۆتالیتارو هەر مرۆڤێك لە هەر جێگەیەکی جهاندا، بەهۆی بازنەی ئاسنینی تیرۆرەوە، نەبێت بە بەشێك لە جۆری تاکە مرۆڤێك، تیرۆر ناتوانێت ئەرکی دوانەیی وەك جەوهەری حکومەتو پرەنسیپی رێنمایی جوڵە، نەك کار، بە کاملی بەدیبهێنێت. هەروەکو چۆن شەرعییەت لە سیستمی دەستوریدا لە هاندانی مرۆڤ بە کارو رێنمایی کردنی کردەوەکانی وازناهێنێت، تیرۆریش لە حکومەتە تۆتالیتارەکاندا بەوەندەوە ناوەستێت کە مرۆڤ هانبداتو رێنمایی رەفتارەکانی بکات.

ئەگەر چی لە هەلومەرجی هەنوکەییدا، باڵادەستی تۆتالیتاری چەشنی شێوەی حکومەتەکانی دی، لە رێنوێنی کردنی رەفتاری هاوڵاتیەکانی لە کاروباری گشتیدا پێویستی بە رێنمایی هەیە، بەڵام ناتوانێت پرەنسیپی کار پیادە بکاتو پێویستیشی پێی نیە، مادامەکی تۆتالیتاریزم هەوڵدەدا ئەو بەهرەیە لە نێوبەرێت کە مرۆڤ بە خۆرسك بەدەستی هێناوە. لە هەلومەرجی تیرۆری گشتگیردا، تەنانەت ترسیش ناتوانێت رێنوکاری رەفتاری مرۆڤ بێت، چونکە تیرۆر، تەنها بەپێی پێداویستی بابەتی پرۆسەی مێژوو یا سروشت قوربانییەکانی هەڵدەبژێرێت، بێئەوەی کردەوەو فیکری تاکەکەس

لەبەرچاوبگرێت. رەنگە لە هەلومەرجی تۆتالیتاریدا ترس لەهەر سەردەمێکی دی بەرفراوانتر بێت، بەڵام تەنانەت ترسیش کەڵکی زانستی لە دەستدەدا، چونکە ئەو کردەوانەی لە رووی ترسەوە ئەنجام دەدرێن، چیدی ناتوانن لە روبەروبونەوەی مەترسیەکاندا دەستیاری مرۆڤ بکەن. هەمان مەسەلەش دەربارەی هاوسۆزی یا پشتیوانی کردن لەرژێم راستی تیایە، چونکە تیرۆری گشتگیر بە تەنها قوربانییەکانی بە پێی پێوەری بابەتی هەڵنابژێرێت، بەڵکو جەلادەکانیشی، بەبێ لەبەرچاوگرتنی لانیکەمی قەناعەت و هاوسۆزیان هەڵدەبژێرێت. لە روسیای سۆڤێتی و وڵاتانی بلۆکی سۆڤێتدا، لە کاتی هەڵمەتە مەزنەکانی پاکتاوکردندا، کوشتن و سڕینەوەی سیستماتیکانەی بیروباوەر، وەك دینەمۆی کارکردن، بوە واقعێکی زانراو. بە هەر حاڵ ئامانجی پەروەردەی تۆتالیتاری هەرگیز بە مەبەستی تۆکمەکردنی بیروباوەر نەبو، بەڵکو لەناوبردنی ئامادەیی شەکڵگرتنی هەمو جۆرە بیروباوەڕێك بو. هێنانەناوەوەی پێوەری بابەتی راستەوخۆ لە شێوازی هەڵبژاردنی دەستەی پاراستندا، گەورەترین داهێنانی هیملەر بو لە کاروباری رێکخستندا. هیملەر پاڵێوراوەکانی لە رێگەی وێنەی فۆتۆگرافییەوە هەڵدەبژارد، لەوەشدا پشتی بە پێوەری نەژادی رووت دەبەست. بەمشێوەیە، خودی سروشت شایستەی ئەوەیە بریار بدات نەك لەسەر ئەوانەی پێویستە لەناوببرێن، بەڵکو سەبارەت بەو کەسانەش پێویستە ئامادە بکرێن بۆ ئەوەی ببن بەجەلاد.

هیچ یەکێك لەو پرەنسیپانەی رێنمایی رەفتار دەکات، ئەوانەی لەسەروی چالاکییەکانی مرۆڤەوە پێگەیان هەیە، وەك چاکەخوازی، شەرەف و ترس، زەروری نیەو ناتوانێت سود بەوجۆرە رژێمانە بگەیەنێت، لە پێناوی ئەوەی جوڵە بەجەستەی سیاسی بدات، چونکە ئەو جەستە سیاسییە لە جەوهەردا تیرۆرە، تەنانەت ئەگەر تیرۆریش وەك ئامرازی هەرەشەکردن بەکارنەهێنرێت. تۆتالیتاریزم لە جیاتی ئەو پرەنسیپە رێنوێنیکارانەی سەرەوە، پرەنسیپێکی بە تەواوەتی نوێ دەهێنێتە نێو کاروباری گشتییەوە کە بەپێی ئەو پرەنسیپە ویستی کاری مرۆیی

به تەواوەتی پشتگوێ دەخرێو پێداویستی وادەخوازێت سوربن لەسەر جێبەجێ کردنی یاسای بزوتنەوە، یاسایەك کە تیرۆر بەپێی ئەو یاسایە کاردەکاتو هەمو چارەنوسی تاکەکانیش لەسەر هەمان یاسا راوەستاوە.

هاولاتیانی ولاتێکی تۆتالیتاری بە مەبەستی تاودانی جولەی پرۆسەی مێژوو یا سروشت فرێدەدرێنە دەرەوەی ئەو پرۆسەیە، پاشان دەهێنرێنە ناوەوە، بۆیە تەنها دەتوانن ببنە جێبەجێکار یا قوربانی یاسای بزوتنەوە. تەنها ئەم پرۆسەیە بریاردەرە لەسەر ئەو کەسانەی ئەمرۆ رەگەزە نزمەکانو ئەندامانی چینە روو لەمەرگەکان یا خەڵکانی سوكو ریسوا لەنێودەبەن، دەبێ سبەینێ قوربانی بەخۆیان بدات. ئەوەی فەرمانڕەوایانی تۆتالیتاری پێویستی پێی هەیە بۆ ئەوەی رێنمایی رەفتاری دەستوپێوەندەکانی بکات، ئامادەکردنی یەك بەکیانە بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە رۆڵی جەلادو قوربانی وازیبکەن. ئەرکی ئەم ئامادەکارییە دووجەمسەرە کە لە رژێمی تۆتالیتاریدا جێگەی پرەنسیپی کار دەگرێتەوە، دەخرێتە ئەستۆی ئایدیۆلۆجیای تۆتالیتار.

ئایدیۆلۆجیا . چەشنی ئایەت، بە مەبەستی رازیکردنی لایەنگرانی دەتوانێت هەمو شتێك و هەر روداوێك بە هەڵهێنجانی لە تاکە بەڵگەنەویستێکەوە راڤەبکات . دیاردەیەکی تازەیەو سەدان ساڵە رۆڵی ناچیز لە ژیانی سیاسیدا وازیدەکات. تەنها بە وردبینی لەدوای رودانی روداوێك دەتوانین هێندێك رەگەزی دیاریکراو لەم ئایدیۆلۆجیایە ئاشکرا بکەین کە بە تەواوەتی سودی بۆ فەرمانڕەوایانی تۆتالیتار هەیە. لە پێش ستالینو هیتلەریش توانای بەهێزو مەزنی سیاسی ئایدیۆلۆجیاکان ئاشکرا نەبوون.

ئایدیۆلۆجیاکان بەخاتری سیمای زانستیان ناسرانەوە: ئەوانە دۆزینەوەی زانستی لەگەڵ ئەو دەرئەنجامانەی چییەتی فەلسەفییان هەیە، ئاوێزان دەکەنو بانگەشەی فەلسەفەیەکی زانستییان بۆ دەکەن. وادەردەکەوت وشەی "ئایدیۆلۆجیا" بەو مانایە بێت کە ئایدیایەك دەتوانێت ببێتە بابەتی زانستێك، رێك وەکئەوەی ئاژەڵ دەبێتە بابەتی گیانەوەرناسی، چونکە پاشگری Logie .

زانست، هەروەکو وشەی ئایدیۆلۆجیا Ideo – Logie و وشەی Zoo – Logie، دەتوانێت شیکردنەوەی لۆجیکی . Logoi . بکات، واتە وتاری زانستی لە شێوەی ئایدیا . Ideo . داڕێژرابێت. ئەگەر کار بەو شێوەیە بێت، ئیدی ئایدیۆلۆجیا جگە لە فەلسەفەو زانستێکی وەهمیو درۆزنانە شتێکی دی نیەو لە یەککاتدا سنوری زانستو فەلسەفەش دەبەزێنێت. بۆیە خوداناسی . deism ـ ئایدیۆلۆجیایەکە سەروکاری لەگەڵ ئایدیای خوداوەندا هەیەو خاوەن فەلسەفەیەکە دەیەوێت بەشێوەیەکی زانستی واقعییەتی سروشتی خوداوەند بسەلمێنێت. (خوداناسی لەسەر واقعییەتی سروشتی خوداوەند خۆی ڕانەگرتوە، بەڵکو دەخوازێت خودا وەك ئایدیایەکی فەلسەفی یا زانستی بناسێنێت، ئەوەش بەهەمان قەوارەی ئەو گومڕاییو گەلحۆیی گیانەوەرناسییە کە بڕواو متمانەی بە واقعییەتی جەستەییو هەستیاری گیانەوەران نەبێت). لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە دەزانین ئەمە بەشێکە لە ڕاستی، چونکە ئەگەرچی خوداناسی نکوڵی لە سروشتی خوداوەند دەکات، بەڵام تەنها بە ڕاڤەکردنی "زانستی" ئایدیای خوداوەند وازناهێنێت، بەڵکو سود لە ئایدیای خودا وەردەگرێت بۆ ئەوەی ڕێڕەوی دونیای پێڕاڤە بکات. ئایدیا ئایەتییەکان ڕەگەز لە ڕەگەزپەرستیو خودا لە خوداناسی، هتد . هەرگیز بابەتی ئایدیۆلۆجیا پێکناهێننو پاشکۆی زانستیش . logie . هەرگیز بەڵگە نیە لەسەر ڕاڤەکردنی زانستی ئەو ئایدیانە.

ئایدیۆلۆجیا ڕێك ئەوەیە کە ناوەکەی دیاریدەکات: ئایدیۆلۆجیا، لۆجیکی ئایدیایەکە. مێژوو بابەتی ئایدیۆلۆجیایە کە ئایدیایەکی لەسەر پیادە دەکرێ. ئەنجامی ئەم پیادەکردنە، زنجیرەیەك هەواڵو ڕونکردنەوەیە دەربارەی شتێك کە بوونی نیە، بەڵکو ئاشکرا کردنی پرۆسەیەکە هەمیشە دەگۆڕێت. لە ڕاستیدا ئایدیۆلۆجیا بەشێوەیەك پەیوەندی نێوان ڕوداوەکان چارەسەر دەکات وەکئەوەی ملکەچی هەمان ئەو یاسایە بێت کە حوکمی " ئایدیاکەی" دەکات. ئایدیۆلۆجیاکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە نهێنییەکانی سەرجەم پێشکەوتنی

مێـژوو دەزانـن . نهێنییـەکانی رابـردوو، ئالۆزییـەکانی هەنوکـەو گومانـەکانی داهـاتو . چـونکە لـۆجیکی خـودی ئـەو ئایدیانـە دەناسـنەوە کـە بـەڕوداوە مێژووییەکانەوە پەیوەستە.

ئایـدیۆلۆجیاکان هـەرگیز گرنگـی بـە پـەرجوی بـوون . اعجوبـە الکینونـە نادەن، چونکە چییەتی مێژووییان هەیە، تەنانەت ئەگەر هـەوڵیش بدەن مێـژوو لـە رێگـەی "یاسـای سروشـتییەوە" راڤـە بکـەن، ئـەوا زیـاتر گرنگـی بـە بـوون و لەناوچـون، بـالاکردن و لادانـی کولتورەکـان دەدەن. بۆیـە وشـەی "رەگـەز" لـە رەگەزپەرسـتیدا، هـەرگیز بـە مانـای گـەڕانێکی راسـتگۆیانە نیـە بەرامبـەر رەگـەزەکانی مـرۆڤ، وەکئـەوەی سـەرزەمینی لێکۆڵینەوەیـەکی زانـستی بێـت، بەڵکو بیرۆکەیەکە رێگـە بـۆ راڤەکردنی بزاوتـی مێـژوو خۆشـدەکات، وەکئـەوەی پرۆسەیەکی بێوێنەو یەکانگیر بێت.

ئایـدیای ئایـدیۆلۆجیاکان . هـەر ئایدیۆلۆجیایـەك . نـە جەوهـەری جاویـدانی ئەفلاتۆنە کە بە چاوی رۆح وێنەی گیراوە، نـە پرەنسیپی رێکخـەری عـەقڵی کانـت . یشە، بەڵکو بوە بە ئـامرازێکی راڤەکردن. لەڕوانگـەی ئایـدیۆلۆجیاوە، مێـژوو لەبـەر رۆشنایی ئایدیا بە دیارناکەوێت (لە واقیعدا دەبێ بەدیدی سـەروی بزاوتـی مێـژوو تەماشای مێژوو بکرێ)، بەڵکو وەك شتێك نیشان دەدرێ کـە دەتـوانرێ رەوتـی بـە ئایدیایەك پێشبینی بکرێ. بەڵام ئەوەی "ئایـدیا" ئامادەسـاز دەکـات تـا ئـەم رۆڵـە تازەیـە وازبگـات، "لۆجێکـە" تایبەتەکەیـەتی، واتـە جوڵەیـەك کـە دەرئـەنجامی خـودی "ئایدیاکەیـە" و بـۆ جوڵەیـشی پێویـستی بـەهیچ هۆکـارێکی دەرەکـی نیـە. رەگەزپەرسـتی بیروباوەڕێکـە پێیوایـە جوڵەیـەك لـە نـاو خـودی ئایـدیای رەگـەزدا هەیـە، هـەروەکو چـۆن خوداناسـی بـاوەڕی وایـە کـە خـودی چـەمکی خوداوەنـد، جوڵەی خۆی هەیە.

لە ئایدیۆلۆجیادا، بزاوتی مێژوو و پرۆسەی لۆجیکی ئەم چەمکە، شـایانی ئەوەن خاڵ بە خـاڵ پێکـەوە بگـونجێن، وەکئـەوەی هـەر شـتێك روودەدا، بەپێی لۆجیکی تاکە "ئایدیایەك" روودەدا. تەنها جوڵـەی مـومکین لـە بـواری لۆجیکدا

بریتیە لە پرۆسەی هەڵگۆزین لە دەسپێکی بەڵگەنەویستێکەوە. بەڵام لۆجێکی دیالیکتیکی لەگەڵ پرۆسەی تێزو ئەنتی تێز تا بە ئەنجام کۆتایی دێت کە خودی ئەو تێزە تایبەتەش لەلای خۆیەوە دەبێت بە بزاوتی دیالیکتیکی، لە پرەنسیپدا لۆجیکێکی جیاواز نیە، کاتێك ئایدیۆلۆجیا ئەو شتانەی حەزی پێی نیە، ئەفەرۆز دەکات لێرەدا یەکەمین تێز دەبێتە مەسەلەیەکی بەڵگەنەویست و خەسڵەتی ئەم میتۆدە دیالیکتیکیەش سەبارەت بە راڤەکردنی ئایدیۆلۆجیا لەوەدایە وەك چرکەساتی بزاوتێکی بێوێنە، لێکچوو یەکانگیر رێگە بە دژایەتی نێوان فاکتەکان دەدا.

کاتێك لۆجیك وەك "بزاوتی فیکر" ـ نە وەك چاودێریکاری پێویستی فیکردن . لەسەر ئایدیایەك جێبەجێ دەکرێ، ئیدی ئایدیا زۆر بەخێرایی دەگۆڕێت بە بەڵگەنەویست. لە راستیدا راڤەکردنی ئایدیۆلۆجی دەربارەی جهان لەم پرۆسەیەوە سەرچاوە دەگرێ، پێشئەوەی بۆ شیکردنەوەی تۆتالیتاری سودمەند بێت. کاری کۆت‌وبەندی لۆجیکێکی نیگەتیڤی پۆخت‌و بەربەستی لۆجیك لە قبوڵکردنی واقیعی ناکۆکییەکانی جهان، بەجۆرێك بالای کردبو کە هێڵیکی فیکری نوێ لەرێگەی ئەنجامگیرییەوە (استنتاج) بەشێوەی نارەزاییەکی پەتی، داهێنان‌و گوروژمی بۆ زەین دەهێنا. ئەم پرۆسە نارەزاییە نە بەئایدیایەکی نوێ (دەتوانێت بەڵگەنەویستێکی دی لەگەڵ زنجیرەیەك دەرئەنجامی دی بەرهەم بهێنێت)، نە بەئەزمونێکی تازە، دادەبڕێت. ئایدیۆلۆجیاکان هەمیشە لەو باوەرەدان کە تاکە ئایدیایەك بەسە بۆ ئەوەی بتوانرێ هەمو شتێك لە گەشەسەندنی بەڵگەنەویستەوە روون بکرێتەوەو هیچ ئەزمونێکیش ناتوانێت شتێکمان فێربکات، چونکە هەمو شتێك تەنها لە چوارچێوەی ئەم پرۆسە لێکچوە یەکانگیرە پەی پێدەبرێت کە هەڵگۆزینی لۆجیکی لەسەر بونیات دەنرێ. مەترسی کەوتن لە چاڵی نادڵنیایی زەروری ئایدیای فەلسەفییەوە بۆ چاڵی راڤەکردنێکی گشتی تاکە ئایدیۆلۆجیایەك‌و جهانبینییەکەی (Weltanschauung)، بە تەنها کەوتن نیە بەرەو خەیاڵێکی

بەگشتی عەوامانەو هەڵنەسەنگێنراو، بەڵکو مەترسی سەرەکی ئەوەیە کە ئازادی، ئەو ئازادییەی سروشتی بیرکردنەوەی مرۆڤە، بە کۆتێکی لۆجیکی دەگۆڕێت، کۆتێك کە مرۆڤ بە دەستی خۆی دەیخاتە گەردنی خۆی‌و بە هەمان ئەندازەی کۆتی هێزێکی دەرەکی قورسایی دەخاتە سەر گەردنی مرۆڤ

خودی جهانبینی‌و ئایدیۆلۆجیاکانی سەدەی نۆزدەهەم هەڵگری تۆتالیتاریزم نەبون. ئەگەر چی رەگەزپەرستی‌و کۆمۆنیزم دوو ئایدیۆلۆجیای یەکلاکەرەوەی سەدەی بیستەم بوون، بەڵام وەك پرەنسیپ، لە ئایدیۆلۆجیاکانی دی "تۆتالیتارتر" نەبون. لەراستیدا ئەو دوو ئایدیۆلۆجیایە لەو رووەوە بون بەدوو فۆرمی تۆتالیتاری، چونکە ئەو پرەنسیپانەی ئەزمونەکان پشتیان پێدەبەست .ململانێی رەگەزەکان بۆ کۆنترۆڵ کردنی جهان‌و ململانێی چینایەتی لە پێناوی ئەوەی لەسەرتاسەری جهاندا دەسەڵات بگرنە دەست لەرووی سیاسییەوە لە هەمو ئەزمونە ئایدیۆلۆجیاکانی دی گرنگی زیاتریان هەبو. بەو مانایەی سەرکەوتنی ئایدیۆلۆجیای رەگەزپەرستی‌و کۆمۆنیزم بەسەر هەمو ئایەتەکانی دی ، پێشئەوەی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان قورسایی خۆیان بخەنە سەر ئەو دوو ئایدیۆلۆجیایە بەدەست هاتبو. لەلایەکی دی، هەمو ئایدیۆلۆجیاکان توخمی تۆتالیتارییان لەدووتوێی خۆیاندا هەڵگرتوە، بەڵام جیاوازی نێوان ئەم دوو ئایدیۆلۆجیایەو ئایدیۆلۆجیاکانی دی، تەنها لەوەدایە، ئەم دوو ئایدیۆلۆجیایە لەلایەن بزوتنەوە تۆتالیتارەکانەوە بەشێوەیەکی باش گەشەیان پێدرا. ئەمەش سەرنجێکی فریودەرانەی ئەوتۆ دەخوڵقێنێت وەکئەوەی تەنها رەگەزپەرستی‌و کۆمۆنیزم سیمای تۆتالیتارانەیان هەبێت. لەراستیدا، چییەتی راستەقینەی ئایدیۆلۆجیاکان تەنها لە رێگەی ئەو رۆڵەی لە دەزگا باڵادەستە تۆتالیتارەکان وازیدەکەن، ئاشکرا دەبێت. لەم گۆشە نیگایەوە، بوونی سێ رەگەزی تۆتالیتاری، تایبەتمەندی فیکری ئایدیۆلۆجی پێکدەهێنێت.

یەکـەم، بانگەشـەی ئایـدیۆلۆجیاکان بـۆ راڤـەکردنی هـەمو شـتێك، بەتـەنها بـۆ دەرخستنی ئەوشتانە نیە کە بوونیـان هەیـە، بەڵکو بانگەشەی ئەوەش دەکەن کە دەتـوانن ئـەوەی دەبێـت و ئـەوەی بەسـەر جهانـدا گـوزەری کـردوە و تێدەپـەرێت، راڤەبکـەن. ئـەو ئایدیۆلۆجیانـە لـە هـەمو حاڵەتێکـدا تـەنها گرنگـی بەرەگـەزی جوڵـە دەدەن، بە واتایـەکی دی، بەمێـژوو بەمانا باوەکەی. ئایـدیۆلۆجیاکان هەمیشە بەلای مێژوودا دەیشکێننەوە، تەنانـەت ئایـدیۆلۆجیای رەگەزپەرستیش کە بەرووکەش لـە مەسـەلەی سروشـتەوە سەرچـاوە دەگـرێ، لێـرەدا سروشـت تـەنها مەسـەلە مێژوویـیـەکان راڤـەدەکات و بـە مەسـەلە سروشـتییەکانی دەگۆرێـت. بانگەشـەی راڤەکردنی هـەمو شـتێك، بەڵێنی راڤـەکردنی هـەمو روداوە مێژوویـیەکان دەدا، بەڵێن دەدا رابـردوو بـە تـەواوەتی راڤەبکات و تێگەیشتنێکی تـەواوی بـۆ هەنوکـە هـەبێت و بەشێوەیەکی دیاریکراویش پێشبینی داهاتو بکات.

دوەم، فیکری ئایـدیۆلۆجی کـە بانگەشـەی راڤـەکردنی هـەمو شـتێك دەکـات، خۆی لە هەمو ئەزمونێك بە سەربەخۆ دەزانێت، ئیدی بـە پێویسـتی نازانێـت لـە هیچ دیاردەیەکی تازەوە شت فێربێت، تەنانەت ئەگەر ئەو دیاردەیەش شـتێکی راگوزەر بێت و جارێکی دی دوبـارە نەبێتـەوە. بەمـشێوەیە فیکـری ئایـدیۆلۆجی لـەو واقیعـە ئـازاد دەبێـت کـە ئێمـە لـە رێگـەی هـەر پێـنج هەسـتەکەمانەوە لێـی تێدەگەین و جەخت لەسەر واقعێکی "راستەقینەتر" دەکاتـەوە کە لەپشت شتە هەسـتپێکراوەکانەوە خـۆی متکـردوە، ئـەو واقیعـە راسـتەقینەترەی تـەنها لـە رێگـەی هەسـتی شەشـەمەوە دەتوانرێـت لێـی بـەئاگابین، لەهـەمان شـوێنی نادیـارەوە شـتە درکپێکراوەکـان دەخاتـە ژێـر رکێفـی خۆیـەوە. ئایـدیۆلۆجیا لەرێگـەی تـەڵقینی ئایـدیۆلۆجیای تایبـەت کـە لـە دەزگـا پەروەردەیییەکانـدا دەوترێتـەوە، ئـەو دەزگایانـەی، بـە مەبەسـتی ئامـادەکردنی "جـەنگاوەری سیاسـی" لـە "رێکخـستنەکانی بـەرگری" (Ordensburgen) تایبـەت بـە نازییەکان یا فێرگەکانی کۆمینترن و کۆمینفۆرم بۆ ئەم مەبەستە دامەزراون، ئەم هەستەی شەشەم دەستەبەر دەکات. پروپاگەندەی تۆتالیتاری بۆ ئازادکردنی

ئایدیا لە ئەزمون و واقیع کاردەکات، ئەو پروپاگەندەیە هەمیشە مانایەکی نهێنیئامێز بە هەمو روداوێکی گشتی یا هەست پێکراو دەبەخشێت و لە پشت هەر کارێکی سیاسی گشتییەوە گومانی نیازێکی نهێنی دەوروژێنێت. بۆیە کاتێك بزوتنەوەی تۆتالیتاری دەگات بە دەسەلات، ئیدی خۆی بۆ گۆڕینی واقعێك تەرخان دەکات لەگەڵ بانگەشە ئایدیۆلۆجیاکانیدا بگونجێت. چەمکی پیلانگێری جێگەی چەمکی دوژمنایەتی دەگرێتەوە، ئەمەش حاڵەتێکی زەینی ئەوتۆ دەهێنێتە ئاراوە کە واقیع ـ دوژمنایەتی واقیع یا دۆستایەتی واقیعی ـ چیدی ئەزمون ناکرێ و بەپێی چەمکی واقیعی درکی پێناکرێت، بەڵکو بەمانای شتێکی بەتەواوەتی جیاوازتر وێنا دەکرێ.

سێیەم، تا ئەو جێگەیەی ئایدیۆلۆجیا نەتوانێت واقیع بگۆڕێت، لە رێگەی میتۆدی سەلماندنی تایبەتەوە هەوڵدەدەن، ئایدیا لە کۆتی ئەزمون رزگار بکەن. بیرکردنەوەی ئایدیۆلۆجی فاکتەکان بەپێی رێوشوێنێکی بە تەواوەتی لۆجیکی رێکدەخات، رێوشوێنێك لە مەسەلەی بەڵگەنەویستێکەوە دەست پێدەکات، ئنجا هەمو شتەکانی دی لە هەمان مەسەلەی بەڵگەنەویستەوە هەڵدەگۆزرێت، واتە ئەم بیرکردنەوەیە لە یەکانگیرییەکی ئەوتۆدا کار دەکات کە لە هیچ بوارێکی واقیعییەتدا بوونی نیە. رێڕەوی ئەم هەڵگۆزینەی سەرەوە دەشێت لۆجیکی یا دیالیکتیکی بێت، بەڵام لە هەر دوو حاڵەتەکەدا پرۆسەی نارەزایی یەکانگیر پێیوایە دەتوانێت لە جوڵەی پرۆسەی بانمرۆڤی سروشتی یا مێژوویی تێبگات، چونکە بەپێی پرۆسەیەك بیردەکاتەوە. بۆیە زەین دەرفەتی ئەوەی بۆ دەرەخسێت لە یاسای بە روکەشی "زانستی" بزوتنەوە تێبگات، کە هێدی هێدی لەرێگەی پرۆسەی تەقلیدەوە، ئیدی چ لۆجیکی بێت یا دیالیکتیکی زەین و بزوتنەوە ئاوێتەی یەکتر دەبن. نارەزایی ئایدیۆلۆجی کە هەمیشە بە جۆرێك لە هەڵهێنجانی لۆجیکی دادەنرێت، پەیوەستە بە دوو رەگەزی ئایدیۆلۆجیاوە کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردوە ـ رەگەزی بزوتنەوە و رەگەزی رزگاربون لە واقیع و ئەزمون، یەکەم، لەبەر ئەوەی بزاوتی فیکری لە

ئەزمونەوە لە دایك نابێت، بەڵکو لە خودی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێ، دوەم، لەبەر ئەوەی ئایدیۆلۆجیا تەنها شتێك لە واقیعی ئەزمونکراوو پەسەندکراو وەردەگرێت و ئەوەش دەگۆڕێت بە مەسەلەیەکی سەرەکی و بەڵگەنەویست، لەدوای ئەوەش، ڕێگەی نارەزاییەکی پاشتر دەگرێتەبەر کە هیچ جۆرە ئەزمونێکی دی ناتوانێت بیشێوێنێت. ئایدیۆلۆجیا هەر کە مەسەلە بەڵگەنەویستەکەی کە هەمان خاڵی وزەو ورەیەتی، سەقامگیر دەبێت، ئیدی ڕێگە بە هیچ ئەزمونێك نادات دەست لە فیکری ئایدیۆلۆجی وەربدات، هەروەها ناشتوانرێ لەرێگەی واقیعەوە، ئەم ئایدیۆلۆجیایە وەربگیرێت.

ئەو میتۆدەی هەر دوو فەرمانڕوا تۆتالیتارەکە گرتیانەبەر لە پێناوی ئەوەی ئایدیۆلۆجیاکەیان بگۆڕن بە چەکێك تا لە ڕێگەیەوە رەعییەتەکەیان ناچار بکەن خۆیان لەگەڵ ڕیتمی بزوتنەوەی تیرۆردا بسازێنن، میتۆدێکی زۆر فریودەرو نەبینراو بو. ئەو دوو فەرمانڕەوایە ڕۆحی ئایدیۆلۆجیاکانیان وەرگرتبو (هیتلەر وەك بەهرەیەکی مەزن شانازی بەشیکردنەوە خوێنساردنەکەیەوە دەکردو ستالینیش بە بەبێبەزەیی دیالیکتیکەی دەینازی)، دەلالەتە ئایدیۆلۆجیاکانیان بە دوورترین ئاستی یەکانگیری لۆجیکی گەیاندبو، ئەو یەکانگیرە لۆجیکە توندڕەوەش لەکن چاودێرێکی دەرەکی بەشێوەکی "سەرەتایی" ئاڵۆزو نابەجێ دەردەکەوت، چونکە بە سەرسوڕمانەوە دەبینێ ئەو چینەی روو لەمەرگە، لەو خەڵکانە بوون کە حوکمی مردنیان بەسەر درابوو رەگەزی ناشایستەش بە ژیان، لەو رەگەزانە بوون کە دەبوایە لەنێو ببرێن. ئەو کەسەی گومانی لە بوونی "چینی روو لەمەرگ" نەبێت، وەلێ پێی نەگاتە ئەوەی کە ئەندامەکانی پێویستە لەنێوببرێن و ئەو کەسەی ماق ژیان بە رەگەز دەبەستێتەوە، بەڵام نەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە پێویستە "رەگەزی ناشایستە بە ژیان" بکوژرێت، یا گێلە پیاوە یا ترسنۆکە. ئەم لۆجیکە توندڕەوەی ئەندێشە وەك ڕێنوێنیکاری پرەنسیپی کار، سەرتاپای بونیادی بزوتنەوەو حکومەتە تۆتالیتارەکان دەخاتە

ژێر کاریگەری خۆیەوە. ئەمەش دەسکەوتی هەر یەك لە هیتلەرو ستالین بو، هەرچەندە وەك فیکر هیچ شتێکی تازەیان نەخستە سەر ئایدیاو دروشمی بزوتنەوەکەیان، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ لە ریزی گرنگترین "ئایدیۆلۆجیست"ەکان ناو زەدە بکرێن.

ئەو واقیعەی ئەم دوو ئایدیۆلۆجیستەی لەوانەی پێش خۆیان جیادەکاتەوە، کێش و شەیدا بونیان بە ئایدیۆلۆجیا نەبو . ململانێی چینایەتی و چەوسانەوەی کارگەران یا ململانێی رەگەزەکان و پاریزگاری کردن لە گەلانی ئەڵمانیا . بەڵکو ئەو پرۆسە لۆجیکییەی لە فیکرەوە لە دایك دەبو، ئەوانەی بەلای خۆیدا کێشدەکرد. بە بۆچونی ستالین، ئایدیاو لێهاتویی رەوانبێژی لینین نەبو کە گوێگرەکانی شەیدا دەکرد، بەڵکو توانای لۆجیکی دەرە رەتکردنەوەی بو. بەپێچەوانەی مارکسەوە کە پێیوابو کاتێك ئایدیا باڵ بەسەر هەمو جەماوەردا دەکێشێت، دەسەڵات لە دایك دەبێت، بۆیە دەبینین دەسەڵات لە خودی ئایدیا نیە، بەڵکو لە پرۆسە لۆجیکەکەیەتی کە لە "هەستیاری ئۆکتۆپۆسێکی (ئەختەبوت) زۆر بەهێز دەچێت و لە هەمو لایەکەوە چنگت پیابکات، تۆش توانای ئەوەت نەبێت خۆت لە دەستی رزگار بکەیت، ئیدی یا دەبێ خۆت بە دەستەوە بدەیت یا بەچاکی خۆت بۆ دۆڕاندێکی پرسوێ ئامادە بکەیت"[(3)] ئەم هێزەش تەنها کاتێك خۆی دەردەخات کە بەدیهاتنی ئامانجە ئایدیۆلۆجیاکان، واتە کۆمەڵگەیەکی بێچین و رەگەزێکی سەرورەر بکەوێتە مەترسییەوە. لە پرۆسەی بەدیهاتنی ئەو ئامانجانەدا، ئەو مادە بنەرەتیانەی ئەم ئایدیۆلۆجیانە بەمەبەستی کێشکردن و شەیداکردنی جەماوەر خۆی لەسەر بونیات ناوە . چەوسانەوەی کارگەران یا بەرخوازییە نەتەوایەتییەکانی ئەڵمان . هێدی هێدی لە دەست دەچێت، وەکئەوەی لە رێگەی خودی پرۆسەکەوە قوت بدرێت: بە گونجانێکی کامڵ لەگەڵ "شیکردنەوەی خوێنساردانە"ی هیتلەرو "هێزی دەرە رەتکەرەوەی لۆجیك"ی ستالین، کارگەرانی سۆڤێت لە سەردەمی حوکمڕانی بۆلشەفیکدا، تەنانەت ئەو

مافانەشیان لەدەستدا کە لە سەردەمی دەسەڵاتی دیسپۆتیزمی تزاردا بەدەستیان هێنابو، لەبەرامبەر ئەوەشدا، میللەتی ئەڵمانیا بەدەست جۆرە جەنگێکەوە دەیناڵاند کە هیچ بایەخێکی بەلانیکەمی هەلومەرجی پێویست بۆ مانەوەی میللەتی ئەڵمان نەدەدا. چییەتی سیاسەتی ئایدیۆلۆجیا . نەك لەپێناوی بەرژەوەندی تاکەکەس یا چڵێسی دەسەڵات . بریتیە لەوەی ناوەرۆکی واقیعی ئایدیۆلۆجیا (چینی کریکار یا میللەتی ئەڵمانیا)، کە لە بنەرەتدا ئایدیا سەرچاوەی لێوەردەگرێ (ململانێی چینایەتی وەك یاسای مێژوو یا کێشمەکێشی رەگەزی وەك یاسای سروشت)، لەرێگەی ئەو لۆجیکەوە قوتدەدرێ کە ئایدیا بەهۆیەوە بواری جێبەجێ کردن دەگرێتەبەر.

پرۆسەی ئامادەکردنی قوربانی و جەلادەکان کە تۆتالیتاریزم لە جیاتی پرەنسیپی کاری مۆنتیسکۆ، پێویستی پێی هەیە، لە خودی ئایدیۆلۆجیای رەگەزپەرستی یا ماتریالیزمی دیالیکتیکیدا نیە، بەڵکو لە سروشتی لۆجیکی ئایدیۆلۆجیادا خۆی متکردوە. فریودەرترین سەلماندن کە خودی ستالین و هیتلەر شەیدای ببون، بریتی بو لە: ئەگەر ئێوە قسە لەسەر ئەلفی ئەلفبای پیاوکوشتن دەکەن، دەبێ ب، پ، تا کۆتایی، ئەم ئەلفبایەتان لەسەر زمان بێت. لێرەدا وادەردەکەوێت کە هێزی جەبری لۆجیك سەرچاوەیەکی بۆ خۆی هەبێت، ئەم هێزەش لەو ترسەوە سەرچاوە دەگرێ کە دژایەتی خودی خۆمان بکەین. پاکتاوکردنی بۆلشەفیکەکان کە تیایە قوربانیەکان دانیان بە تاوانێکدا دەنا هەرگیز نەیانکردبو، زیاتر پشتی بەم ترسەو بەڵگەیەی خوارەوە دەبەست: ئێمە ئەو بەڵگەنەویستەمان پێقبوڵە کە مێژوو ململانێی چینایەتیەو رۆڵی حیزبیش جگە لە سەرکردایەتی ئەو ململانێیە شتێکی دی نیە. کەواتە، ئێوە دەزانن حیزب لەرووی مێژووییەوە هەمیشە لەسەر هەقە (هەروەکو تروتسکی دەڵێت: "ئێمە تەنها لەگەڵ حیزب لە رێگەی حیزبەوە لەسەر هەقین، چونکە مێژوو هیچ رێگەیەکی دی بۆ لەسەر هەقبوونمان نەهێشتۆتەوە"). ئەو ساتە مێژووییەی لەگەڵ یاسای مێژوودا یەکانگیرە، پێویستە هێندێك تاوان ئەنجام

بدرێ، لەبەر ئەوەی حیزب لەیاسای مێژوودا لە خەڵكی پڕزانیاریترو بەتواناترە، دەزانێت دەبێ تاوانبارێك سزا بدرێت. حیزب بۆ ئەنجامدانی ئەو تاوانانە، پێویستی بە تاوانبار هەیە، رەنگە حیزب زانیاری لەسەر تاوانەكان هەبێت، بەڵام هەرگیز تاوانبارەكان ناناسێت، بۆیە سزادانی تاوانباران لە ناسنامەی تاوانبارەكان گرنگترە، چونكە بەبێ سزادانی ئەوانەی بەربەست لەبەردەم رەوڕەوەی مێژوو دروستدەكەن، ئەستەمە مێژوو پێشبكەوێت، سەرئەنجام، چ بەراستی تاوانی كردبێت، یا حیزب داوات لێبكات رۆڵی جەلاد ببینیت، لە هەر دوو حاڵەتەكەدا لەرووی بابەتییەوە دەبیت بە دوژمنی حیزب. ئەگەر نەچیتە ژێربارو دان بەتاوانەكەتدا نەنێت، وەك ئەوەیە لەرێگەی حیزبەوە خزمەت بەمێژوو نەكەین، بەمەش دەبیت بە دوژمنی راستەقینە. بەڵام هێزی جەبری بەڵگەو سەلماندن لەمەی خوارەوەدا خۆی دەنوێنێت: ئەگەر تۆ ئەو كارە رەتبكەیتەوە، لەگەڵ خۆتدا دەكەویتە دژایەتییەوە، هەر لەرێگەی هەمان دژایەتیكردنیشەوە سەرلەبەری ژیانت بێمانا دەبێت. ئەو ئەلفەی خستە سەر زمانت، لە رێگەی بەدواداهاتنی لۆجیكی ب و پ تا كۆتایی، هەمو ژیانت كۆنترۆڵ دەكات.

فەرمانڕەوایانی تۆتالیتار بە تایبەتی پشت بەو جەبرە دەبەستن كە خۆمان بەسەر خۆماندا دەیسەپێنین، چونكە هێشتا پێویستیان بە هاندانی سنورداری خەڵك هەیە. ئەو جەبرە ناوەكییە هەمان ئەو ستەمگەرە لۆجیكەشە كە جگە لە توانای مەزنی مرۆڤ بۆ دەست پێكردنی كاری تازە، هیچ شتێكی دی ناتوانێت لە بەرامبەریدا خۆی رابگرێت. ئەم ستەمگەری لۆجیكە لەگەڵ ملكەچكردنی زەین بۆ لۆجیك، وەك پرۆسەیەكی بێكۆتا دەست پێدەكات، پرۆسەیەك مرۆڤ پشتی پێدەبەستێت بۆ ئەوەی فیكری تیا لەدایك بێت. مرۆڤ بە تەسلیمبوونی بە لۆجیكی ستەمگەرو بەچۆكهاتنی لە بەرامبەر حوكمی ستەمگەری دەرەوەی خۆی، نكوڵی لە ئازادی ناوەوەی خۆی دەكات، هەروەكو چۆن نكوڵی لە ئازادی جووڵەش دەكات. ئازادی وەك وزەیەكی ناوەكی مرۆڤ، هاوتای وزەی دەست

پێکردنە، هەروەکو چۆن ئازادی وەك واقعێکی سیاسی لە مەودای پێویستی جوڵەی نێوان مرۆڤەکان دەچێت. هیچ لۆجیك‌و هیچ هەڵهێنجانێکیش قابیلی رەتکردنەوە نەبێت، ناتوانێت دەسەڵات بەسەر ئەم ئامادەگی دەستپێکردنە پەیدا بکات، چونکە زنجیرەی خودی ئەم دەسپێکردنە لەگەڵ بەڵگەنەویستێکی دی دەست بەکاردەبێت. هەروەکو چۆن پێویستی تیرۆر لە ترسەوە لە دایك دەبێت، سەرەتایەکی تازەش، بەبێ لەدایك بونی مرۆڤێکی نوێ، دەنگی لە جهاندا نابیسترێ، بەهەمان شێوەش هاندانی هێزی جەبری لۆجیك لەو ترسەوە لەدایك دەبێت کە مرۆڤ دەست بەبیرکردنەوە دەکات. واتە هەمان ئازادترین‌و بێخەوشترین چالاکی مرۆیانە، رێك بەرامبەر بە رەوشی پرۆسەی هەڵگۆزینی جەبری تەواو دەوەستێتەوە. حکومەتی تۆتالیتاری کاتێك هەست بە خۆڕاگری دەکات کە بتوانێت ویستی بێگەردی مرۆڤ ببزوێنێت لە پێناوی ئەوەی ناچاری بکات بچێتە نێو بزاوتی مەزنی مێژوو یا سروشتەوە، ئەو بزاوتە مەزنەش وەك مادەیەکی خۆی کە ژیان‌و مردن ناناسێت، سود لە رەگەزی مرۆڤ وەردەگرێت.

ئەو بزوتنەوەیەی لەسەر تیرۆر بونیات نراوە بۆ ئەوەی بکەوێتە جوڵەو بەردەوام لە جوڵەدا بێت، هەم پێویستی بەجەبری تیرۆری گشتگیر هەیە، هەم بە هێزی هەڵگۆزینی جەبری لۆجیکی، یەکەم تا بە زنجیری ئاسنینی فشار بخاتە سەر جەماوەری گۆشەگیرو لەو دونیایەی لەلایان بوە بە بیابان بیانپارێزێت، دوەم تاکە گۆشەگیرەکان بۆ روبەروبونەوەی ئەوانی دی ئامادەبکات. هەروەکو چۆن تیرۆر، تەنانەت لە پێشئەوەی سیفەتی گشتگیر وەربگرێت‌و بەتەواوەتی سیفەتی ستەمگەری هەیە، پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان لەنێودەبات، زۆردارەکی فیکری ئایدیۆلۆجیاش هەمو پەیوەندییەك لەگەڵ واقیعدا دەپچڕێنێت. ئامادەکردنی مرۆڤەکان بە مەبەستی وازیکردنی رۆڵی قوربانی‌و جەلاد کاتێك سەرکەوتو دەبێت کە خەڵکی پەیوەندی لەگەڵ هاورەگەزو واقیعی دەوروبەریان لە دەست بدەن، چونکە کاتێك مرۆڤ ئەو پەیوەندیانە لەدەست دەدا، بەهرەو لێهاتویی ئەزمون‌و ئەندیشەش لەدەست دەدا. باشترین فەرمانبەری

فەرمانڕەوای تۆتالیتاری، نازیو کۆمۆنیستیکی پڕئیمان نیە، بەڵکو کەسێکە جیاوازی لە نێوان واقیعو ئەفسانە (بە واقیعی ئەزمونکردنیشەوە)و جیاوازی لەنێوان ڕاستو درۆ (بە پێوەری بیرکردنیشەوە) نەکات.

پرسێك کە لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەیە گەلاڵەمان کردوەو ئێستاش دەگەڕێینەوە سەری، بریتیە لەوەی کە چ جۆرە ئەزمونێکی سەرەکی لە ژیانی کۆمەڵانی خەڵکیدا حکومەتێك پەروەردە دەکات، جەوهەرەکەی تیرۆرەو پرەنسیپی لۆجیکی کاردنیشی لەسەر فیکری ئایدیۆلۆجیا ڕاوەستاوە؟ کارێکی ئاشکراو حەتمیە ئەمجۆرە پێکهاتەیە لە فۆڕمە جۆراوجۆرەکانی بالادەستی سیاسیدا هەرگیز لە ڕابردودا بەکار نەهاتوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەزمونی سەرەکی کە ئەمجۆرە حکومەتە جەختی لەسەر دەکات، پێویستە مرۆڤانەو لەلای خەڵکیش ناسراو بێت، چونکە تەنانەت " نوێترین دەرکەوتن"ی جۆری جەستەی سیاسی دەبێ بۆ مرۆڤ گەلالە بکرێو بە شێوەیەك لە شێوەکانیش وەلامی پێداویستیەکانی مرۆڤ بداتەوە.

زۆرجار ئاماژە بەوە کراوە کە تیرۆر تەنها لەو حاڵەتەی مرۆڤەکان گۆشەگیر دەکرێنو لەیەکتری دادەبڕێن، دەتوانێت کۆنترۆڵیان بکات، بۆیە بایەخی سەرەکی هەر سیستمێکی ستەمگەری خولقاندنی گۆشەگیرییە. گۆشەگیری سەرەتای تیرۆرەو سەرزەمینێکی بە پیتە بۆ نشونما کردنی تیرۆرو هەمیشە بە بەری تیرۆریش دادەنرێت. بەم واتایە گۆشەگیرکردن پێش قۆناغی تۆتالیتاریزم دەکەوێتو بێتوانایی و دەستەوەستانیش نیشانەی گۆشەگیرییە. تا ئەو جێگەیەی دەسەلات هەمیشە لەو مرۆڤانەوە لەدایك دەبێت کە پێکەوە کار دەکەن، یا بە گوزارەی بۆرك " هاوئاهەنگانە کار دەکەن"، ئەوا مرۆڤە گۆشەگیرەکان بەپێی ئەم پێناسەیە، هیچ دەسەلاتێکیان نیە.

گۆشەگیریو بێتوانایی، واتە بێتوانایی سەرەکیو ڕەهای کارکردن، بەردەوام خاسیەتی ڕژێمە دیسپۆتیزمەکان بوە. لە ڕژێمە دیسپۆتیزمەکاندا پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان دەپسێتو ئامادەیی مرۆڤەکان بۆ کارکردنو

پیادەکردنی دەسەڵات نەزۆك دەبێت. لەگەڵ هەمو ئەوانەشدا، ئەم رژێمە ناتوانێت بە تەواوەتی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان بپسێنێت و گشت ئامادەییان لە نێوبەرێت. بۆیە هەمو پانتاییە تایبەتەکانی ژیان لەگەڵ ئامادەیی ئەزمونکردن و داهێنان و بیرکردنەوە بەوپەری سەلامەتی دەمێنێتەوە. ئەمە لەحاڵەتێکدا ئێمە دەزانین کە زنجیری ئاسنینی تیرۆری گشتگیر، پانتاییەك بۆ ژیانی تایبەتی ناهێڵێتەوە و هێزی جەبری لۆجیکی تۆتالیتاریش ئامادەیی ئەزمونکردن و بیرکردنەوەی مرۆڤەکان لە نێودەبات، هەروەکو چۆن ئامادەیی بۆ هەمو جۆرە کارکردنێك لێدەسەنێتەوە.

ئەوەی لە پانتایی سیاسەتدا بە گۆشەگیر دەیخوێنینەوە، لە بواری پەیوەندیی کۆمەڵایەتیدا بە تەنهایی (Loneline) ناودێر دەکرێ. بەراستی گۆشەگیری و تەنهایی دوو حاڵەتی جیاوازن. مرۆڤ دەتوانێت گۆشەگیر بێت . واتە لە بارودۆخێکدا بێت کە نەتوانێت دەست بۆ هیچ کارێك بەرێت، چونکە کەس نیە کاری لەگەڵدا بکات . بێئەوەی دوچاری تەنهایی بێت. هەروەها مرۆڤ دەتوانێت بە تەنها بێت . لە هەمو جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەوانی دی بێبەش بێت . بێئەوەی گۆشەگیر بێت. گۆشەگیری جۆرە بنبەستێکە، لە سەردەمێکدا کە بازنەی ژیانی سیاسی مرۆڤەکان وێراندەکرێ، مرۆڤەکان بۆ ئەم بنبەستە پەلکێش دەکرێن، چونکە چیدی جێگەیەکیان بۆ نامێنێتەوە تا پێکەوە هەوڵبدەن پرۆژە هاوبەشەکانیان بەدیبهێنن. لەگەڵ ئەوەی گۆشەگیری، دەسەڵات و ئامادەیی کارکردنی مرۆڤەکان وێراندەکات، ئەوا نەك بە تەنها هەمو چالاکیە بەرهەمهێنەرەکانی مرۆڤ وەکخۆی دەهێڵێتەوە، بەڵکو تا ئەندازەیەکیش بۆ هێنانەدی ئەمجۆرە چالاکیانەش پێویستە. لە راستیدا مرۆڤ وەك Homo faber لە ئیشەکەیدا حەز بە گۆشەگیری دەکات، بەمانایەکی دی حەز دەکات بەشێوەیەکی کاتی واز لە بواری سیاسەت بهێنێت. دروستکردن (Poiesis، واتە دروستکردنی شتەکان) ئیدی چ لەبواری پیشەگەریدا بێت، یا لە بواری هونەری، لەلایەکەوە، لەگەڵ کردار Praxis ، لەلایەکی دی لەگەڵ کاری پەتی جیاوازی هەیە، بۆیە

هەمیشە لەگەڵ گۆشەگیرییەکی دیاریکراو لە خەمە هاوبەش و گشتییەکاندا ئەنجام دەدرێ. لە گۆشەگیریدا مرۆڤ وەك بونەوەرێکی داهێنەر پەیوەندی بەجهانەوە گرێدەدا، ئەم گۆشەگیرییەش تەنها کاتێك لەتوانابەدەر دەبێت کە سەرەکیترین شێوەی ئەفراندنی مرۆیی، واتە ئامادەیی پێشکەشکردنی شتێکی تازە بەجهان، لەنێوببرێت. ئەمەش تەنها لە جهانێکدا کە بەها مەزن و سەرەکییەکان لەلایەن کارەوە دیاریبکرێت، واتە هەمو جۆرە چالاکییەکی مرۆیی بە چالاکی کاری پەتی گۆڕابێت. لەمجۆرە هەلومەرجەدا تەنها هەوڵ و کۆششی کاری پوخت و پەتی، واتە ئەو هەوڵ و کۆششەی مرۆڤ بەزیندویێتی دەهێڵێتەوە و پەیوەندی لەگەڵ جهاندا وەك بونەوەرێکی داهێنەر لێکدەترازێت. مرۆڤێك چیدی وەك Homo Faber ناناسرێت، بەڵکو وەك Animal laborans مامەڵەی لەتەکدا دەکرێ کە میتابۆلیزمە پێویستەکەی لەگەڵ سروشتدا لەلای کەس بەهەند وەرنەگیرێ، هەم لە بواری سیاسەتدا پێگەیەکی نابێت، هەم لە جهانی شتەکانیشدا دوور دەخرێتەوە. تەنها لەو حاڵەتەدا گۆشەگیری لە شێوەی تەنهایی دەردەکەوێت. رژێمی ستەمگەر کە خۆی لەسەر گۆشەگیری راگرتوە، بەگشتی وزەی بەرهەمهێنی مرۆڤ وەکخۆی دەهێڵێتەوە، هەر چەندە ئەو رژێمە ستەمگەرەی لەسەر "کار" حوکمدەکات، چەشنی ئەو فەرمانڕوا ستەمگەرەی لە سەردەمە دێرینەکان فەرمانڕوایی کۆیلەی دەکرد، دەتوانێت هەمان فەرمانڕوایی نەك بە تەنها لەسەر مرۆڤە گۆشەگیرەکان، بەڵکو لەسەر تەنهاکان بکات و رەنگی تۆتالیتاریزمیش بگرێت.

گۆشەگیری تەنها بواری ژیانی سیاسی دەگرێتەوە، ئەمە لە کاتێکدا تەنهایی سەرتاپای ژیانی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە. بۆیە رژێمی تۆتالیتاری، چەشنی هەمو رژێمە دیسپۆتیزمەکان بەبێ لەناوبردنی بواری گشتی ژیان، واتە بەبێ لەناوبردنی وزە سیاسییەکانی مرۆڤ لە رێگەی گۆشەگیرکردنیانەوە، بوونی نابێت. بەڵام بالادەستی تۆتالیتاری، وەك شکڵی حکومەت، دیاردەیەکی نوێیە، چونکە بەتەنها بەگۆشەگیرکردنی مرۆڤەکان وازناهێنێت، بەڵکو ژیانی تایبەتیشیان لەنێودەبات. ئەمجۆرە حکومەتە خۆی لەسەر پایەی تەنهایی و

ئەزمونی پابەندنەبونی مرۆڤ بەجهانەوە راگرتوە، کە بە یەکێك لە تاڵترین و ریشەدارترین ئەزمونی مرۆڤ دەژمێردرێت.

تەنهایی وەك بنەمایەکی هاوبەشی تیرۆرو گەوهەری رژێمی تۆتالیتاری، هەروەها سەرزەمینێکی ئایدیۆلۆجی و لۆجیکی کە مرۆڤ بۆ وازیکردنی رۆڵی قوربانی و جەلاد ئامادە دەکات، پەیوەندییەکی نزیکی بە بێریشەیی و زیادبوونی مرۆڤەوە هەیە. ئەم بێریشەیی و زیادبونە، هەر لەسەردەمی شۆڕشی پیشەسازییەوە داغێك بوە بە تەوێڵی جەماوەرەوە و لەگەڵ پەیدابونی ئیمپریالیزم لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و لێکترازانی دەزگا سیاسی و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمەشدا، لایەنێکی توندوتیژی پەیدا کردوە. بێریشەیی، بەمانای لە دەستدانی هەمو جۆرە شوێنێکە لە جهاندا، ئەو شوێنەی لە لایەن ئەوانی دییەوە ناسراو و زامنکرابێت، بەڵام زیادبونی مرۆڤ بەو مانایە دێت کە هەمو جۆرە پەیوەندییەك بە جهانەوە لەدەست بدات. بۆیە دەتوانرێت بێریشەیی بە مەرجێکی سەرەتایی تەنهایی بزانرێت، هەروەکو چۆن دەتوانرێ گۆشەگیریش (بێئەوەی پێویست بکات) بە مەرجێکی سەرەتایی تەنهایی بژمێردرێت. خودی تەنهایی و بەبێ لەبەرچاوگرتنی دوا هۆکارە مێژووییەکان و رۆڵی تازەی لە سیاسەتدا، لەلایەکەوە، بەپێچەوانەی پێداویستیە سەرەکییەکانی بارودۆخی مرۆڤ هەنگاو دەنێت، لەلایەکی دی، یەکێك لە ئەزمونە گەوهەرییەکانی ژیانی هەمو مرۆڤایەتی پێکدەهێنێت. تەنانەت ئەزمونی مادی و هەستپێکراومان بە جهانەوە بە پەیوەندی ئێمە لەگەڵ مرۆڤەکانی دی و عەقڵی دروستەوە گرێدراوە. عەقڵی دروست لەسەر ئەو هەستە هاوبەشانەمان راوەستاوە کە گشت هەستەکانی دی رێکدەخات و چاودێریدەکات و بەبێ ئەوەش هەر یەکێك لە ئێمە بەسەر دراوە (داتا) هەستپێکراوە تایبەتییەکانی خۆیدا دادەخرێت کە زۆرجار قابیلی پشت پێبەستن نیە و گومڕاکەرو فریودەرە. تەنها تا ئەو کاتەی عەقڵێکی دروستمان هەیە، واتە تەنها لەبەرئەوەی تاکەکەس نین، بەڵکو مرۆڤ گەلێکین بەشێوەی

کۆمەڵ لەسەر گۆی زەمین نیشتەجێ بوین، دەتوانین پشت بە هەستە راستەوخۆکانمان ببەستین. لەگەڵ ئەوەشدا، لە پێناوی ئەوەی لە تەنهایی خۆمان تێبگەین و لەپێناوی ئەوەی ئەزمونێك بکەین کە بەپێی ئەو ئەزمونە هەمو شتێك و هەمو کەسێك ماڵئاواییمان لێدەکات، ئەوەندە بەسە رۆژێك ئەوەمان یاد بکەوێتەوە کە دەبێ ئەم جهانە هاوبەشە بەجێ بهێڵین، ئەو جهانەی بەبێ ئێمەش هەر وەکو خۆی بەردەوام دەبێت.

تەنهایی جیاوازی لەگەڵ یەکانەیی (Solitude) دا هەیە. یەکانەیی وادەخوازێت مرۆڤ بەتەنها بێت، ئەمە لە کاتێکدا تەنهایی لە باشترین حاڵەتیدا لە رێگەی تێکەڵبوونەوە دەردەکەوێت، جگە لە چەند حاڵەتێکی ئاوارتەی پەرش وبلاو . کە بەشێوەیەکی گشتی چەشنی گوتەکەی کاتۆ ( cato, marcus Porcius سیاسەتمەدارو سیناتۆری رۆما) لە گوزارەیەکی ناکۆکئامێزدا بەیان کراوە: " ئەو لە کاتێکدا کە تەنها بو، لە هەر کاتێکی دی زیاتر هەستی بە تەنهایی دەکرد" یا "ئەو لە کاتێکدا کە لە تەنهاییدا بو، کەمتر هەستی بەتەنهایی دەکرد" - num quam minus solum esse, quam cum solus esset. Reported by Cicero, de re publica, 1, 17 . ئیپیکتۆس، فەیلەسوفی یۆنانی دێرین کە لە کۆیلایەتی ئازاد بوە، یەکەم کەسە جیاوازی لەنێوان تەنهایی و یەکانەیی دەستنیشان کردوە. دۆزینەوە راگوزارییەکەی لەو پەیوەندییە رەسەنەیەوە سەرچاوەی گرتبو کە نە تەنهایی دەخواست، نە یەکانەیی، بەڵکو دەیویست بە تەنها Monos بمێنێتەوە، مەبەستی لەو تەنها مانەوەیەش، بەدەستهێنانی سەربەخۆییەکی رەها بو. هەروەکو ئیپیکتۆس دەستنیشانی دەکات (توێژینەوە، کتێبی 3، بەشی 13) مرۆڤی تەنها ئەو کەسەیە کە خۆی لەنێو مرۆڤ گەلێك دەبینێتەوە و ناتوانێت بەهیچ جۆرێك پەیوەندییان لەتەکدا ببەستێت و هەر لەو رووەشەوە پێیوایە لەلایەن ئەوانی دییەوە دژایەتی دەکرێ. بە پێچەوانەشەوە، مرۆڤی یەکانە، خودی خۆی تەنهایە، بۆیە "دەتوانێت لەگەڵ خۆیدا بێت"، مادامەکی مرۆڤ ئامادەیی ئەوەی

تیایە "گفتوگۆ لەگەڵ خۆیدا بکات". بە گوزارشتێکی دی، من لە یەکانەدا "لەگەڵ خۆمدا"م و لەگەڵ خودی خۆمدا لە خەڵوەتدام، هەر لەمڕووشەوە، دوو کەسین لە یەك جەستەدا، ئەمە لە حاڵێکدا، من لە تەنهاییدا هەر خۆمم و لەلایەن ئەوانی دییەوە بێزراوە. بەشێوەیەکی وردتر، هەر فیکرێك لە یەکانەدا شکڵ دەگرێت، بە جۆرێك گفتوگۆ لەنێوان من و خۆمدا دەژمێردرێت، بەڵام ئەم گفتوگۆ دوو کەسییەی یەك جەستەیە، پەیوەندییم لەگەڵ جهانی هاوشێوەکانم ناپچڕێنێت، چونکە ئەوانە لە خودێکدا دەردەکەونەوە کە من گفتوگۆی فیکریم لەگەڵیدا هەیە. ئەو مەسەلەیەی تاك دەیەوێت بریتیە لە: ئەو دوو کەسەی لە جەستەیەکدا بۆ ئەوەی ببەنەوە بەیەك، واتە بۆ ئەوەی ببێتەوە بە یەکێکی نەگۆڕ کە هەرگیز نەتوانرێ ناسنامەی لەگەڵ ناسنامەی ئەوانی دی تێکەڵ بکرێت، دیسانەوە پێویستی بە ئەوانی دی هەیە. بۆ ئەوەی ناسنامەی خۆم بسەلمێنم بە تەواوەتی پێویستیم بە ئەوانی دی هەیەو بەهرەی مەزن و یەکلاکەرەوەی پێکەوە ژیان بۆ مرۆڤی تاك ئەوەیە، ئەو پێکەوە ژیانە، جارێکی دی بیکاتەوە بە یەکێکی "کامڵ" و لەو گفتوگۆ ئایدیاڵەی کە کەسی قسەکەر هەمیشە تیایە بە ئاڵۆزی دەمێنێتەوە، رزگار بکات و ناسنامەی نۆژەن بکاتەوە، تا ئەو جێگەیەی بتوانێت بە دەنگی تاکە کەسێکی نەگۆڕ قسە لەسەر خۆی بکات.

رەنگە یەکانەیی بگۆڕێت بە تەنهایی، ئەوەش کاتێك روودەدا کە من لە خەڵوەتدا لەگەڵ خۆم، خودی خۆم گوم بکەم. مرۆڤی یەکانە زۆرجار هەڕەشەی مەترسی تەنهایی لێدەکرێ، ئەوەش لە کاتێکدا کە هەرگیز بەهرەی دۆستایەتییەکی رزگاربەخشی لێهەڵنەکەوێت بۆ ئەوەی لە دوانەیی و ئاڵۆزی و گومان دوری بخاتەوە. ئەم مەترسییە لەرووی مێژووییەوە نەگەیشتۆتە ئاستێکی قێزەونی ئەوتۆ کە خەڵکانی دی سەرنجی بدەن، بۆیە لەسەدەی نۆزدەهەم بە دواوە لە مێژوودا جێگیر بوە. ئەم مەترسییەش تەنها کاتێك بە راشکاوی خۆی دەرخست کە فەیلەسوفەکان لەگەڵ ئەوەی پێیان وابو یەکانەیی شێوەیەکی ژیان و مەرجی کارکردنە، ئیدی بەو واقیعە "فەلسەفە تەنها بۆ ژمارەیەك خەڵکی دیاریکراوە" رازی نەدەبون و کەوتنە گلەیی کردن لەوەی کە کەس لە وتەکانیان تێناگات". لەم ناوکۆیەدا ئەم قسە

نەستەقەش لە هیگل دەگێرنەوە کە لە سەرەمەرگدا وتویەیی: " تەنها یەك كەس لێم تێگەیشتوە، ئەویش بە باشی لێم حاڵی نەبوە"، بەر لە هیگڵ وتەیەکی لەو جۆرە نەدراوەتە پاڵ هیچ فەیلەسوفێکی مەزنی دی. لە بەرامبەر ئەوەشدا، هەمیشە مرۆڤی تەنها بەختی ئەوەی هەیە خۆی ببینێتەوەو لە خەڵوەتدا گفتوگۆیەکی فیکریانە لەگەڵ خودی خۆیدا دەست پێبکات. وادەردەکەوێت مەسەلەیەکی لەو جۆرەش لە سیلزماریا بەسەر نیچەدا هاتبێت کاتێك بیری لە زەردەشت دەکردەوە. نیچە لە هەر دوو قەسیدەی (سیلزماریاو چیا بڵندەکان) قسە لەسەر چاوەڕوانی نائومێدانەو هیوایەکی پوچی تاکی تەنها دەکات تا لەناکاو "لەکاتی نیوەڕۆدا یەکێك دەبێت بەدوو ... ئێستاش بە پشتبەستن بە سەرکەوتنی یەکگرتو جەژنی جەژنان دەگێرین، زەردەشتی دۆست، میوانی میوانەکان هات"

ئەوەی تەنهایی والێدەکات بانتوانا بێت، لەدەستدانی خودە، خودێك لە تەنهاییدا دەتوانرێ بەدی بهێنرێت، بەڵام ناسنامەکەی تەنها لەرێگەی پێکەوە ژیانێکی متمانەبەخش لەگەڵ هەمواندا دەسەلمێنرێت. مرۆڤ لەمجۆرە پێکانەدا بڕوابوون بە خودی خۆی وەك هاورێ و هاودەمی بیرکردنەوەی لە دەست دەدا، هەروەها متمانەی بە جهانیش وەك زەرورەتی هەمو ئەزمونێك لەدەست دەدا. ئیدی خودو جهان هاورێ لەگەڵ ئامادەیی بیرکردنەوەو ئەزمونکردن بە یەکجارەکی لەدەست دەچن.

تەنهایی یەکێکە لە بەهرە زەینیەکانی مرۆڤ کە نە پێویستی بەخود هەیە، نە بە ئەوانی دیو نە بەجهان بۆ ئەوەی بەدڵنیاییەوە کاربکات، ئەو بەهرەیەی سەربەخۆ لە ئەزمونو بیرکردنەوە کار دەکات، هەمان توانای شیکردنەوەی لۆجیکە کە مەسەلە بەڵگەنەویستەکەی خودێکی ئاشکرایە . self evident. بایەخی رێسای سەرەکی کە بەڵگەنەویستێکی حاشاهەڵنەگری لۆجیکی لەسەر بونیات نراوە یا ئەو راستییە بەراییەی کە دوو کەرەت دوو دەکاتە چوار، تەنانەت لە هەلومەرجی تەنهایی رەهاشدا ناتوانرێ بەهەڵە دابنرێ. ئەم

حەقیقەتە لۆجیکیە، تاکە "حەقیقەتە" کە مرۆڤ لە دوای لەدەستدانی گرەنتی بەرامبەرو عەقڵی دروست دەتوانێت پشتی پێببەستێت، ئەمە لە حاڵێکدا مرۆڤ بە مەبەستی ئەزمون و ژیان گوزەراندن و دۆزینەوەی رێگەی جهانێکی هاوبەش، پێویستی بە عەقڵی دروست هەیە. بەڵام ئەم حەقیقەتە، حەقیقەتێکی بێناوەرۆکە، یا راستترە بڵێین هەر حەقیقەت نیە، چونکە هیچ شتێك ئاشکرا ناکات. (پێناسەکردنی یەکانگیری لۆجیکی وەك حەقیقەت، هەروەکو لۆجیکیستە هاوچەرخەکان پێناسەی دەکەن، بەمانای نکوڵی کردنە لە بوونی حەقیقەت). لە هەلومەرجی تەنهاییدا، مەسەلەی خودێکی ئاشکرای لۆجیك چیدی ئەو ئامرازەی عەقڵ نیە کە پرۆسەی یەکانگیری دەست پێبکات و گەشە بەهێڵەکانی "بیرکردنەوەی" بدات. ئەو واقیعەی کە پرۆسە فیکرییەکانی بە چالاکییەکی توندی لۆجیکی خودئاشکرا دەناسرێتەوە، پەیوەندییەکی پتەوی بە تەنهاییەوە هەیە، ئەوەش رۆژگارێگ لەلایەن لۆسەرەوە رونکراوەتەوە (رەنگە هیچ کەسێك ئەوەندەی لۆسەر تەنهایی و تەریکیی ئەزمون نەکردبێت، چونکە ئەو کەسێك بو بوێری ئەوەی تیابو بۆ یەکەمین جار بڵێت: "دەبێ خوداوەندێك هەبێت، لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێویستی بە بوونێك هەیە بۆ ئەوەی باوەری پێبهێنێت"). لۆسەر لە تێبینییەکی کەم ناسراویدا دەربارەی وتەکانی کتێبی پیرۆز ئەوە بە یاد دەهێنێتەوە: " شتێکی باشە مرۆڤ بە تەنهایی نەمێنێتەوە" لۆسەر دەڵێت مرۆڤی تەنها "هەمیشە شتێك لە شتێکی دی هەڵدەگوزێت و بەدزێوترین شێوەش بیر لە هەمو شتێك دەکاتەوە"[(4)] توندرەوی بزوتنەوە تۆتالیتارەکان هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ ریشەگەرای راستەقینەدا نیە، بەڵکو بونیات نراوە لەسەر "بیرکردنەوە لە هەمو شتێك بەدزێوترین شێوە" و پرۆسەیەکی هەڵگۆزین کە هەمیشە رێگەی دزێوترین دەرئەنجام دەگرێتەبەر.

ئەوەی مرۆڤ لە جهانی ناتۆتالیتاریدا بۆ باڵادەستی تۆتالیتاری ئامادە دەکات، ئەو تەنهاییە کە پێشتر لە هێندێك هەلومەرجی پەراوێزکراوی کۆمەڵایەتیدا لەلایەن کۆمەڵێك خەڵکی وەك مرۆڤە پیرەکان ئەزمون دەکرا،

هەنوکە بوە بە ئەزمونێکی رۆژانە کە جەماوەرێکی بەرفراوانی ئەم سەردەمە بەدەستییەوە دەناڵێنن. ئەو پرۆسە بێبەزەییانەی تۆتالیتاریزم کە جەماوەری بۆ پەلکێشدەکات‌و رێکیدەخات، لە راکردنی خۆکوژی دوور لە واقیع دەچێت. لە جهانێکدا کەس جێگەی بڕواو متمانە نیەو هیچ شتێکیش مایەی دڵگەرمی نیە، "شیکردنەوەی خوێنساردانە"و "مەقاشی" پڕ هێزو هەستیاری تۆتالیتاری کە لە هەمو لایەکەوە چنگ بە مرۆڤدا دەکات، وەك دواهەمین دوو پاڵپشتگەی مرۆڤ دەردەکەوێت. بۆیە جەبری لۆجیکی کە تەنها ناوەرۆکەکەی پەرێزکردنە لە ناکۆکییەکان، ناسنامەی مرۆڤ لە دەرەوەی هەمو جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەوانی دی دەسەلمێنێت. هەر هەمان جەبریش مرۆڤ لە بازنەی ئاسنینی تیرۆر رێکدەخات، تەنانەت لەو کاتەشدا کە تەنها دەبێت، باڵادەستی تۆتالیتاری هەوڵدەدا مرۆڤ لە تەنهایی دەربهێنێت، جگە لەو حاڵەتەی کە لە کونجی زینداندا دەبێت. زۆردارەکی هەمو مەودایەك لە نێوان مرۆڤەکان لەنێو دەبات‌و لەبەرامبەر یەکتری پێشێلیان دەکات، تەنانەت توانای بەرهەمهێنانی گۆشەگیریشیان لە نێودەبات. لەگەڵ فێربوونی شیکردنەوەی لۆجیکی تەنهایی‌و بەرز راگرتنی، مرۆڤ تێدەگات کە سەرئەنجام وێڵ‌و سەرگەردان دەبێت، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ یەکەمین بەڵگەنەویستیش هاوئاهەنگ بێت، کە سەرجەم پرۆسەکان لەوێوە دەست پێدەکات. لەم حاڵەتەدا، ناچیزترین چانس بۆ گۆڕینی تەنهایی بە گۆشەگیری‌و لۆجیك بە ئایدیا، لەدەست دەچێت. ئەگەر کردەوەی رژێمی تۆتالیتاری لەگەڵ کردەوەی رژێمە ستەمگەرەکانی دی بەراورد بکەین، پێدەچێت حکومەتی تۆتالیتاری ئامرازێکی دۆزیبێتەوە بۆ ئەوەی لە رێگەیەو بیابان بهێنێتە جوڵەو زریانە لمێکی ئەوتۆ هەڵبکات کە سەرتاسەری گویٚ زەمینی پێداپۆشێت.

ئەمرۆ هەلومەرجی بوونمان لە بواری سیاسەتدا بەراستی روبەروی هەڕەشەی ئەم زریانە لمییە وێرانکارە دەبێتەوە. ئەو مەترسییەی هەڕەشەمان لێدەکات، ئەوە نیە کە تۆتالیتاریزم دەتوانێت جهانێکی سەقامگیر بونیات

بنێت. باڵادەستی تۆتالیتاری وەك هەر ڕژێمێکی ستەمگەری دی تۆوی لەناوبردنی خۆی هەڵگرتوە، ڕێك هەروەکو چۆن ئەو ترس و بێتواناییەی بەرهەمیدەهێنێت، دوو پرەنسیپی دژە سیاسەتەو مرۆڤ دەخاتە بارودۆخێکەوە لەگەڵ هەر کارێکی سیاسی ناکۆك بێت. تەنهایی و هەڵگۆزینی لۆجیکی ئایدیۆلۆجیاکەی کە بەدزێوترین شێوە بیر لە هەمو شتێك دەکاتەوە، بەرجەستەی بارودۆخێکی ناکۆك بە کۆمەڵگە دەکات و پێڕەوی لە پرەنسیپێك دەکات کە توانای لەناوبردنی هەر گروپێکی مرۆیی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا، نابێت ئەوە لە یادبکەین کە تەنهایی ڕێکخراو لە بێتوانایی نارێکخراوی ئەوانەی لە سایەی ئیرادەی فەرمانڕەوای ستەمگەرو هەڕەمەکیانەی تاکە مرۆڤێکدا ژیان دەگوزەرێنن، زۆر ترسناکترە. مەترسی تەنهایی ڕێکخراو لەوەدایە، هەڕەشەی وێرانکردن لە جیهان دەکات . ئەو جیهانەی وادەردەکەوێت لە هەمو پنتێکەوە بە کۆتایی خۆی گەیشتوە . لە پێشئەوەی سەرەتایەکی تازە دەرفەتی بۆ بلوێت لەو کۆتاییەوە لەدایك بێت.

بەدەر لەم تێبینیانە . بە حوکمی ئەوەی لە پێشبینی دەچێت، پرسودو ئارامبەخش نیە . ئەو واقیعەش وەکخۆی دەمێنێتەوە کە ئەم قەیرانەی سەردەمی ئێمەو ئەزمونە نێوەندەکانی بە تەواوەتی بۆتە مایەی دەرکەوتنی نمونەیەکی نوێی حکومەت. ئەمەش هەمیشە مەترسییەکی گەورە دروستدەکات، کە ڕەنگە لێرە بەدواوە ببێتە چارەنوسمان، هەروەکو نمونەی هەمو ڕژێمەکانی دی، پاشایەتی، کۆماری، ستەمگەری، دیکتاتۆری و زۆردارەکان، کە لە هەلومەرجی مێژوویی جیاوازو لەسەر بنەمای ئەزمونی سەرەکی جیاواز بەدیارکەوتن، بەسەدان ساڵ جگە لە نسکۆی کاتی هاوڕای ڕەگەزی مرۆڤ بوون.

بەڵام ئەوەش ڕاستە کە هەر کۆتاییەك لە مێژوودا بە زەرورەت سەرەتایەکی لە دوتوێی خۆیدا هەڵگرتوە: ئەم سەرەتایە تاکە پەیمانەو تەنها "پەیام"یشە کە هەر کۆتاییەك بتوانێت بیبەخشێت. ئەم سەرەتایە پێشئەوەی ببێتە

رووداوێکی مێژوویی، وزەیەکی مەزنی مرۆڤە، لەرووی سیاسیشەوە، ئەم سەرەتایە هاوتای ئازادی مرۆڤە. سینت ئاگۆستین دەڵێت: "بۆ ئەوەی سەرەتایەك هەبێت، مرۆڤ دروست بو"[5] ئەم سەرەتایە لەگەڵ هەر لە دایکبوونێکی نوێدا زامندەکرێ. بەراستی هەر مرۆڤێك، سەرەتایەکی تازەیە.

# پەراوێزەکان

1. ئەنگلز لە ڕێورەسمی بەخاك سپاردنی مارکسدا دەڵێت: "هەروەکو چۆن داروین یاسای گەشەکردنی ژیانی ئۆرگانی دۆزییەوە، هەر بەو جۆرەش مارکس پرەنسیپی گەشەکردنی مێژووی مرۆڤایەتی دۆزییەوە" هەروەها ڕاڤەکردنێکی لەو جۆرەش لە پێشەکییەکەی ئەنگلز بۆ چاپی مانیڤێستی کۆمۆنیست، 1890و پێشەکی "ئەسڵی خێزان، دەوڵەت و موڵکدارێتی تایبەت" بەدیدەکەین، لەوێشدا دیسانەوە "تیورەی گەشەسەندنی داروین و "تیورەی زیدەبایی مارکس"، شانبەشان پێکەوە باسدەکات.

2. بۆ زانیاری لەسەر چەمکی کار لەلای مارکس وەك "پێویستیەکی هەتاهەتایی و سروشتی کە بەبێ ئەوەش هیچ جۆرە میتابۆلیزم . ێك (الایض . Metabolisme) لەنێوان مرۆڤ و سروشت بەدینەدەهات و سەرئەنجامیش خودی ژیان نەدەبو، بڕوانە "سەرمایە"، جلدی یەکەم، بڕگەی یەکەم، بەشی 1و5.

3. گوتارەکەی ستالین لە 28/ کانونی دوەم/ 1942، لە لینینەوە وەرگیراوە، هەڵبژاردەکان، جلدی یەکەم، ل33، مۆسکۆ، 1947 ئەوەی شایانی ئاماژە بۆ کردنە "لۆجیك" یەکێکە لەو سیفەتە دەگمەنانەی خرۆچۆف لە گوتاری کۆنگرەی بیستەمدا ستالینی پێ وەسفکردوە.

4. "Ein Solcher (Sc. Einsamer) Menseh folgert immer eins aus dem audernund deukt alles zum argsten." In Erbauliche Schriften, "Warum die Einsamkeit Zu flieken?"

5. "Civitate Dei"، "شاری خوداوەند"، کتێبی دوازدەهەم، بەشی بیستەم.

## تێبینی

ئـــەم وەرگێڕانـــە لەگـــەڵ دەقـــە فارســـییەکە بـــەراورد کـــراوەو لـــە زۆر شـــوێندا ســـود لـــە دەقـــە فارســـییەکە وەرگـیراوە، بەتایبـەتیش لـەو شـوێنانەدا کـە رسـتەیەك یـا پـــەرەگرافیکی ئـــاڵۆزو نادیـــار لـــە دەقـــە عەرەبییەکـــەدا بەدیکرابێت.

# پێڕست